## بەناوی خوای جوانکاری بونەوەر


***پێناسی کتێب***

ناوی کتێب : مێژووی تەبەری

بابەت :مێژوویی

بەرگی: دووەم

**نوسینی: محمد بن حرير طبری**

**وەرگێڕانی: زانەر محمد**

نەخشەسازی: چوارچرا

نۆبەتی چاپ :چاپی یەکەم سلێمانی ٢٠١٠

چاپخانە : چوارچرا

دیزاینی بەرگ: هورێم عوسمان

تیراژ :١٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن (٢٤٥٨) ساڵی (٢٠٠٩) پێدراوە

# پێرست

## گێڕانەوەی داستانی داوود

داوود کوڕی ئەیشی کوڕی عوەید کوڕی باعز کوڕی سەلمون کوڕی نەحشون کوڕی عەمی نادب کوڕی رام کوڕی حەزرون کوڕی فارص کوڕی یەهودا کوڕی یەعقوب کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیمە.

لەوەهب کوڕی مونبە دەگێڕنەوە: داوود کورتەبالاَ و کەم موو، چاکەکار و دڵپاك بوو.

لەکوڕی زەید سەبارەت بەم ئایە: الم تر الی الذین خرجوا من دیارهم، دەگێڕنەوە: خواوەند وەحی بۆ پێغەمبەری منالّەکانی ئیسرائیل نارد: لەناو منالّەکانی فلاّن کەس پیاوێك هەیە وخواوەند جالووت لەسەر دەستی ئەو دەکوژێت. نیشانی ئەو ئەم شاخەیە کەدەیخات سەر سەر و ئاوی لێ دەرژێت. پێغەمبەر ڕۆشتە لای و وتی خواوەند وەحی بۆ من رەوانە کردووە کەلەناو منالّەکانی تۆ پیاوێك هەیە وخواوەند جالوت لەسەر دەستی ئەو دەکوژێت. ئەو پیاوە دوانزە پیاوی هێنا هاوشێوەی قەدی دارەکان. یەکێك لەوان زۆر شارەزا بوو. هەموویانی بەشاخەکە تاقیکردەوە بەلاّم هیچ شوێنەوارێکی نەبینی. دووبارە پیاوە ئازاکەیانی هێنایە و تاقیکردنەوەکەی لەگەڵ ئەنجامدا. خواوەند وەحی بۆ پێغەمبەر رەوانە کرد: ئێمە گرنگی بەروخساری پیاوەکان نادەین بەڵکو دڵەکانیان هەژمار دەکەین. پێغەمبەر وتی: خواوەندا، ئەو دەڵێت جگە لەمانە منالّی دیکەی نییە.

خواوەند فەرمووی: قسەی راستی نەوت.

پێغەمبەر پێی وت: پەروەردگار قسەی تۆ بەراست نازانێت و دەڵێت کوڕێکی دیکەت هەیە.

وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، راستت وت، کوڕێکی کورتەبالاّم هەیە وشەرم دەکەم خەڵکان بیبینن. ئەوم لەناو ڕانەمەڕەکە بەجێهێشتووە.

پێغەمبەر وتی: لەکوێیە؟

وتی: لەفلاّن دۆڵ لەفلاّن کێو.

پێغەمبەر بەرێکەوت و دۆڵەکەی بینی. لافاو تیایدا رەوانە و ببوە رێگر لەگەشتن

بەشوێنی حەوانەوەی داوود. ئەو مەڕەکان جوت جوت لەسەر شان لەلافاوەکە دەپەڕاندەوە. ئاو بەوان نەدەگەیشت. کاتێك داوودی بینی، وتی: بێ چەند و چون ئەمە خۆیەتی، ئەو بەزەیی بەئاژەڵەکەندا دێتەوە، بێ گومان بەرابەر بەخەڵکان چاکترە. شاخەکەی خستەسەر سەری داوود و ئاو کولاً..

لەوەهب کوڕی مونبە دەگێڕنەوە: کاتێك منالەکانی ئیسرائیل پاشایەتیان بەتالوت بەخشی، خواوەند بۆ پێغەمبەری منالەکانی ئیسرائیل وەحی رەوانە نارد: بەتالوت بڵێ بۆ شەڕی خەڵکی مەدیەن بەرێکەوێت و هەموو زیندووەکانی ئەو شارە کوشتار بکات. من سەرکەوتنیان پێدەبەخشم. تالوت پاشا بەرەو مەدیەن بەرێکەوت و هەموو دانیشتووانی ئەوێی کوشتار کرد جگە لەپاشاکەیان. خواوەند وەحی بۆ شەموئیل نارد: سەیری تالوت بکە، فەرمانەکانی منی بەتەواوەتی ئەنجام نەدا. پاشای مەدیەنی بەئەسیری گرت. پێی بڵێ پاشایەتی لەبنەماڵەکەی دەگرمەوە و تا رۆژی هەستانەوە پێیان نابەخشم. رێز لەکەسێك دەگرم گوێرایەڵ و ملکەچی فەرمانەکانم بێت، هەرکەس فەرمانەکانی من پشتگوێ بخات، پشتگوێی دەخەم.

شەموئیل رۆشتە لای تالوت و وتی: چیت کردووە بۆ پاشای مەدیەنت ئەسیر کرد و بۆ مەڕەماڵاتەکەت هێنا؟

تالوت وتی: مەڕوماڵاتم هێنا تا بیانکەمە قوربانی.

شەموئیل وتی: خواوەند پاشایەتی لەبنەماڵەکەت سەندەوە و تا رۆژی هەستانەوە پێتان نابەخشێت.

دواتر خواوەند وەحی بۆ شەموئیل نارد: برۆ لای ئەیشی تا کوڕەکانی نیشانی تۆ بدات. ئەوەی فەرمانت پێدەدەم، بەرۆنی پیرۆز چەوری بکە تا ببێتە پاشای منالەکانی ئیسرائیل. شەموئیل بەرێکەوت و وتی: کوڕەکانتم نیشان بدە.

ئەیشی کوڕە گەورەکەی خۆی بانگ کرد. پیاوێکی چوارشانە و جوان بەرچاو دەکەوت.

کاتێك شەموئیل ئەوی بینی، سەریسوڕما و وتی: ((الحمدالله، ان الله بصیر بالعباد.

خواوەند وەحی پێکرد: چاوی تۆ روکەش دەبینێت بەڵام گرنگی بەدڵ دەدەم و لەنهێنییەکانی ئاگادارم. ئەمەیان نییە.

پێغەمبەر وتی: پەسەند نییە، یەکێتریان بێنە.

ئەیشی شەش کوڕی نیشاندا کەسەبارەت بەهەر کامیان وتی: پەسەند نییە، یەکی دیکە بێنە.

سەرئەنجام وتی: ئایا جگە لەمانە کوڕی دیکەت هەیە.؟

وتی: بەڵێ کوڕێکی سەرخڕم هەیە کەشوانی مەڕەکانە.

پێغەمبەر وتی: بنێرە بەدوایدا.

کاتێك داوود هات، گەنجێکی سەرخڕ بوو، بەرۆنی پیرۆز چەوری کرد و بەباوکی وت: ئەمە بشارەوە چوونکە ئەگەر تالوت ئاگادار ببێتەوە، دەیکوژێت.

جالوت لەگەڵ خەڵکەکەی خۆی رووبەرووی منداڵەکانی ئیسرائیل بوویەوە، ئوردوی لێدا. تالوت هاوڕێ لەگەڵ منداڵەکانی ئیسرائیل بەرێکەوت و خۆیان بۆ شەڕ ئامادە کرد.

جالوت کەسی بۆ لای تالوت رەوانە کرد: بۆ: خەڵکەکەی من و خەڵکەکەی تۆ بکوژرێن. شەڕی دەستەویەخە لەگەڵ من بکە یا هەر کەسێك دەخوازیت بۆ شەڕی منی بنێرە. ئەگەر تۆم کوشت، پاشایەتی بۆ من بێت و ئەگەر تۆ منت کوشت، پاشایەتی بۆ تۆ بێت.

تالوت کەسی نارد و لەناو سوپاکەیدا جاریان لێدا، کێ بۆ شەڕی جالوت دەڕوات؟ درێژەی گێڕانەوە و داستانی تالوت و جالوت و کوژرانی ئەو بەدەستی داوودمان و هەڵس و کەوتی تالوت لەگەڵ داوودمان باس کرد.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: لەم گێڕانەوەیە بۆمان دەردەکەوێت خواوەند پێش ئەوەی داوود جالوت بکوژێت و پێش ئەوەی تالوت مەبەستی کوشتنی داوود بکات، پاشایەتی پێبەخشیبوو. بەڵام گێڕانەوەکانی دیکە بەمشێوەیە: داوود دوای کوژرانی تالوت و کورەکانی پاشایەتی گرتەدەست.

لەوەهب کوڕی مونبە دەگێڕنەوە: کاتێك داوود جالوتی کوشت و سوپاکەی تێکشکاند، خەڵك وتیان: داوود بکوژی جالوتە. تالوت لەسەر کار لابرا و خەڵك پێشوازیان لەداوود کرد و چیتر ناوی تالوت نەکەوتە سەر زمانەکان.

دەڵێت: کاتێك منداڵەکانی ئیسرائیل لەدەوری داوود کۆبوونەوە، خواوەند زەبووری بۆ نارد و پیشەسازی ئاسنی فێر کرد. ئاسنی بۆ ئەو نەرم و فەرمانی بەکێو

وبالندەکاندا لەکاتی پاڕانەوە و دۆعا کردن خۆیان لەگەڵ داوود هاوئاهەنگ بکەن. وەك وتوویانە خواوەند بەهیچ کام لەبەندەکانی خۆی دەنگی خۆشی هاوشێوەی داوود نەبەخشیوە و کاتێك زەبوری دەخوێندەوە، وەحشیەکانیش شەیدایی دەبوون تا ئەو جێگەی گەردنی ئەوانی دەگرت و ئەوان بەهەمان شێوە گوێیان لەداوود دەگرت. شەیتانەکان مزمار و بەربەت و سەنجیان لەناهەنگی دەنگی ئەو دروست کرد.

داوود تێکۆشەر بوو، بەردەوام سەرقاڵی خواپەرەستی بوو و دەگریا. خواوەند وەسفی داوودی بۆمحەممەدی نێردراوی خۆی دەکات و دەفەرمێت:

(( اصبر علی ما یقولون و اذکر عبدنا داود ذا الاید انه اواب. انا سخرنا الجبال معه یسبحن بالعشی و الاشراق.

واتاکەی: بۆ ئەوەی دەیڵێن، خۆڕاگری بکە و بیری بەندەکەی ئێمە داوود بکەرەوە چوونکە ئەو گەڕایەوە. ئێمە کێوەکانمان بۆ دەستەمۆ کرد کەشەوانە و لەکاتی هەڵاتنی هەتاو دەپاڕانەوە.))

دەڵێن: داوود شەوانە نوێژی و نیوەی ڕۆژەکان بەرۆژو دەبوو. شەو و ڕۆژ چوار هەزار کەس پاسەوانی ئەویان دەکرد.

دەڵێن: ڕۆژێك داوای لەپەروەردگار کرد پێگەی هاوشێوەی ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب بێت یانی وەك ئەوان تاقیبکرێتەوە و هەموو تایبەتمەندییە چاکەکانی ئەوانی هەبێت.

لەسەدی دەگێڕنەوە: داوود ڕۆژگاری بۆ سێ بەش دابەش کردبوو: ڕۆژێك لەنێوان خەڵکان داوەری دەکرد، ڕۆژێك بۆ پاڕانەوە و پەرەستنی خواوەند بەتەنیایی دادەنیشت و ڕۆژێکی لەگەڵ ژنەکانی خۆی بەسەر دەبرد. نەوەند و نۆ هاوسەری بوو و لەکتێبەکان تایبەتمەندییە چاکەکانی ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوبی دەخوێندەوە، جارێك وتی: پەروەردگاران باوەگەورێکانی من، هەموو چاکیەکانیان تایبەت کردووە بەخۆیان، لەبەخشین و چاکیەکانی ئەوانیش بەمن ببەخشە.

خواوەند وەحی بۆ نارد: باوەگەورەکانی تۆ تاقیکراونەتەوە و بەرگەی بەڵاو زیانەکانیان گرت بەڵام تۆ نا. ئیبراهیم بەکوشتنی کوڕەکەی تاقیکرایەوە، ئیسحاق کوێر بوو و یەعقوب گرفتاری خەمی دووری منداڵەکەی. بەڵام ئەم بەڵایانە بەسەر تۆدا نەهاتووە.

داوود وتی: منیش وەك ئەوان تاقیبکەرەوە و لەتایبەتمەندییەکانی ئەوان بمکەرە هاوبەش.

خواوەند وەحی بۆنارد: تۆ تاقیدەکرێیتەوە، ئاگادار بە.

دەڵێت: چەند رۆژێك تێپەڕی و شەیتان لەروخساری کۆترێکی زێڕین هات و لەبەر پێی داوودا کەوت. ئەو بۆ نوێژ وەستابوو، دەستی برد تا بیگرێت، کۆترەکە دوور کەوتەوە، داوود بەدوایدا ڕۆشت و دوورتر بوویەوە تا کەوتە کونێك. ڕۆشت تا بیگرێت. کۆترەکە لەکونەکە هەڵفڕی. داوود سەیری کرد بۆ ئەوەی بزانێت بۆ کوێوە دەڕوات و کەس بنێرێت تا بیگرێت.

دەڵێت: ژنێکی بینی لەسەر بانەکەی خۆی، خۆی دەشۆرد. زۆر جوان بوو، ژنەکە ئەوی بینی و قژی خۆی پەرێشان کرد و خۆی داپۆشی. کرداری ئەو زیاتر داوودی شەیدا کرد. بەدوایدا گەڕان و وتیان: هاوسەرەکەی لەفلاّن ئوردووگایە. کەسی بۆ لای فەرمانڕەوای ئوردووەکە رەوانە کرد و فەرمانی پێدا تا ئەهریارا بۆ شەڕی فلاّن دوژمن رەوانە بکات. رەوانەیان کرد و سەرکەوتنی بەدەست هێنا و داوودیان ئاگادار کردەوە. دووبارە کەسی رەوانە کرد بۆ ئەوەی هاوسەری ژنەکە بۆ شەڕی فلاّنە دوژمن رەوانە بکەن کەبەهێزتر بوو. رەوانەیان کرد و دوبارە سەرکەوتوو گەڕایەوە.

دەڵێت: فەرماندەی ئوردوگا بابەتەکەی بۆ داوود نوسی و وەلاّمی بۆ هاتەوە: بۆ شەڕی فیسارە دوژمن رەوانەی بکە. رەوانەی کرد و ئەمجارە هاوسەری ژنەکە کوژرا. داوود ژنەکەی کردە هاوسەری خۆی. ماوەیەکی لەگەڵ ئەودا بەسەر برد کەخواوەند دوو فریشتەی لەروخساری مرۆڤدا رەوانە کرد. ویستیان بڕۆنە لای داوود بەلاّم ڕۆژی پاڕانەوەی داوود بوو. پاسەوانەکان رێگەیان لێگرتن. بەدیواری نوێژگەکەی ئەو سەرکەوتن. داوود لەنوێژدا بوو کەئەوانی لای خۆی بینی، ترسا. وتیان: مەترسە، ئێمە دوو رکەبەرین و یەکمان ستەمی لەوەی دیکەکمان کردووە، لەنێوان ئێمەدا داوەری بکە.

وتی: داستانەکەی خۆتان باس بکەن.

یەکیان وتی: ئەمە برای منە ونەوەد و نۆ مەڕی هەیە و من یەك مەڕ. دەیەوێت مەڕەکەی منیش بگرێت تا مەڕەکانی خۆی تەواو بکات.

بەوەی دیکەی وت: تۆچی دەڵێیت؟

وتی: نەوەد و نۆ مەڕم هەیە و براکەم یەك سەر. دەمەوێت لێی بستێنم تا سەد مەڕم هەبێت بەڵام ئەو رازی نابێت.

داوود وتی: رێگەت پێنادەین ئەو کارە بکەیت.

وتی: ناتوانیت رێگەم لێ بگریت.

داوود وتی: ئەگەر ئەو کارە بکەیت، فلاَن شوێن و فیسارە شوێنت دەبڕین. بەدەست لووت و ناوچاوی خۆی نیشاندا.

وتی: ئەی داوود، ڕەوایە ئەو کارە لەگەڵ تۆ بکەن. چوونکە تۆ نەوەد و نۆ ژنت هەبوو و ئەهریا یەك ژن. بەردەوام ئەوت رووبەرووی مەترسی کردەوە تا کوژرا و ژنەکەیت کردە هاوسەری خۆت.

داوود سەیری کرد و کەسی نەبینی. زانی تاقیکراوەتەوە و گرفتاری ئەزمون بوە. کوڕنوشی بردو دەستی بەگریان کرد. تەنیا لەکاتی پێویست سەری بەرز دەکردەوە و دوبارە سوجدەی دەبرد. چل رۆژی بەمشێوەیە بەسەر برد و گریا تا ئەو جێگەی گژوگیا لەشوێنی گریانەکەی ڕوا.

دوای چل رۆژ خواوەند وەحی بۆ نارد: ئەی داوود، سەر بەرز بکەرەوە، تۆم بەخشی.

وتی: پەروەردگارا چۆن بزانم منت بەخشیوە، تۆ داوەر و دادپەروەریت و لەداوەریدا ستەم لەکەس ناکەیت. ئەهریا لەرۆژی هەستانەوە، دێتە بەردەم عەرشی تۆ و سەری خۆی بەدەستی راست و چەپی هەڵگرتووە و خوێن لەدەمارەکانی فیچقە دەکات و دەڵێت: ئەی خوایە، لەمە بپرسە لەبەر چی منی کوشت.

دەڵێت: خواوەند وەحی کرد، ئەگەر ئەو کارە بکات، ئەهریا بانگ دەکەم و داوای لێدەکەم لەتۆ خۆش ببێت و کاتێك لەتۆ خۆش بوو، بەهەشت دەکەمە جێگەی ئەو.

داوود وتی: پەروەردگارا، ئێستاکە زانیم منت بەخشیوە.

دەڵێت: داوود تا ئەو کاتەی مرد لەشەرما سەیری ئاسمانی نەکرد.

لەعەتای خوراسانی دەگێڕنەوە: داوود گوناحەکەی خۆی لەبەری دەستیا نووسیبوو تا لەبیری نەکات و کاتێك دەیبینی، دەستی دەلەرزی.

دەڵێن: هۆکاری تاقیکردنەوەکەی ئەوە بوو: رۆژێك بەخۆی وت دەتوانێت رۆژێك بەسەر ببات بێ ئەوەی هیچ گوناحێك بکات. رۆژێك کەئەو روداوە رویدا ئەو رۆژە بوو

گومانی دەکرد دەتوانێت بێ گوناح کۆتایی پێبێنێت.

ئاماژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەحەسەن دەگێڕنەوە: داوود ڕۆژەکانی بۆ چوار بەش دابەش کردبوو: ڕۆژێك بۆ ژنەکانی، ڕۆژێك بۆ پاڕانەوە، ڕۆژێك بۆ داوەری کردن لەناو منداڵەکانی ئیسرائیل، ڕۆژێك تایبەت بە منداڵەکانی ئیسرائیل کەگفتوگۆی لەگەڵ دەکردن و گوێی لەقسەکانیان دەگرت.

یەکێك لەو ڕۆژانەی تایبەت بە منداڵەکانی ئیسرائیل بوو، باسی ئەوەیان کرد ئایا دەتوانرێت مرۆڤ ڕۆژێك بەسەر ببات بێ ئەوەی گوناح بکات. داوود لەدڵی خۆیدا لێکیدایەوە تا ئەو کارە بکات. کاتێك ڕۆژی پاڕانەوە و پەرەستین گەیشت، دەرگای بەست و فەرمانیدا کەس نەڕواتە لای. سەرقاڵی خوێندنەوەی تەورات بوو و لەکاتی خوێندنەوەدا، کۆترێکی زێڕینی ڕەنگاوڕەنگ لەبەردەمی کەوت. هەستا تا بیگرێت، کۆترەکە فڕی بەڵام زۆر دوورنەکەوتەوە و ئەوی بێ هیوا نەکرد. داوود شوێن کۆترەکە کەوت تا ئەوەی ژنێکی بینی کەخۆی دەشۆرد. لەجوانییەکەی ئەوی سەری سوڕما. کاتێك ژنەکە سێبەری داوودی لەسەر زەوی بینی، قژی پەخشان و خۆی داپۆشی. ئەم کردارە داوودی زیاتر شەیدا کرد. هاوسەری ژنەکەی لەگەڵ سوپایەك ڕەوانە کردبوو، نامەی بۆنوسی تا بۆ فلان شوێن بڕوات. شوێنێك بوو کەهیچ زیندوویێك نەیدەتوانی تەندروست بگەڕێتەوە.

دەڵێت: هاوسەری ژنەکە ڕۆشت و کوژرا. داوود خوازبێنی لێکرد و ئەوی کردە هاوسەری خۆی.

قتادە دەڵێت: بیستوومە: ئەو ژنە دایکی سلێمان بوو.

دەڵێت: کاتێك داوود لەمیحرابدا دانیشتبوو، دوو فریشتە لەسەر دیوارەوە ڕۆشتنە لای. ئەوانەی کێشەیان هەبوو، لەدەرگای میحرابەکەوە دەڕۆشتنە لای داوود. بەڵام کاتێك ئەوانی بینی، لەدیوارەکەوە هاتن، ترسا. وتیان: ((لا تخف، خصمان بغى بعضنا على بعض فاحكم بيننا بالحق و لا تشطط و اهدنا الى سواء الصراط. ان هذا اخى له تسع و تسعون نعجه ولى نعجة واحدة فقال اكفلينها و عزنى فى الخطاب. قال لقد ظلمك

بسئوال نعجتك الى نعاجه و ان كثيرا من الخطا ليبغى بعضهم عله بعض الا الذين آمنوا و عملو الصالحات و قليل ماهم ظن داود انما فتناه فاستغفر ربه و خر راكعا و اناب.

واتاکەی: مەترسە، خاوەنی دو داواین کەیەکمان ستەمی لەوی دیکەمان کردووە. لەنێوان ئێمەدا بەراستی داوەری بکە و ستەم مەکە. و ڕێگەی راستمان نیشان بدە. ئەمە برای منە و نەوەد و نۆ مەڕی هەیە ومن یەك دانە. دەڵێت ئەو دانەیش بدە بەمن. بەوتەکانی دەمی منی بەزاندووە.

وتی: بەداواکردنی مەڕەکەی تۆ بۆ ئەوەی بیخاتە سەر مەڕەکانی خۆی، ستەمی لەتۆ کردووە. زۆر لەشەریکەکان ستەم لەیەك دەکەن مەگەر ئەوانەی باوەڕیان هەیە و کارە شیاوەکان ئەنجام دەدەن. ئەوان کەمن. داوود زانی تاقیمان کردۆتەوە و داوای لێخۆشبوونی لەپەروەردگار کرد، سەری کوڕنوشی دانەواند و تۆبەی کرد.))

لەموجاهید دەگێڕنەوە: کاتێك داوود گوناحەکەی ئەنجامدا، چل ڕۆژ سوجدەی بۆ خواوەند برد تا ئەوەی لەفرمێسکی چاوەکانی، سەوزە ڕەوا و سەری ئەوی داپۆشی.

دواتر ناڵاندی: پەروەردگارا، ناوچاوم ئاوسا و چاوم وشکی کرد و گوناحەکەی داوود وەك خۆی ماوەتەوە. وەحی هات: ئای برسیت تا نانت پێ بدەن یا نەخۆشی شیفات بدەن، یا ستەمت لێکراوە تا هاوکاریت بکەن.

دەڵێت: داوود بەدڵ ناڵاندی و خواوەند ئەوی بەخشی.

داوود گوناحەکەی خۆی لەبەرەدەستیا نوسیبوو. بەردەوام دەیخوێندەوە و کاتێك دەفری ئاوەی بەدەستەوە دەگرت تا بیخواتەوە، بەشێکی دەخوارد و گوناحەکەی خۆی بیردەکەوتەوە و دەگریا، زۆری نەدەما جمگەکانی لەیەك بترازێن و تا ئەو کاتەی هەموو ئاوەکەی دەخواردەوە، دەفرەکە لەفرمێسکی چاوی پڕدەبوو. دەڵێن: فرمێسکی داوود لەگەڵ فرمێسکی هەموو مرۆڤەکان بەرابەر و فرمێسکی ئادەم بەرابەری فرمێسکی داوود و هەموو مرۆڤەکان بوو.

دەڵێت: لەڕۆژی هەستانەوە داوود دێت و گوناحەکەی لەبەرە دەستیا نووسراوە و دەڵێت: پەروەردگارا، گوناحەکەی من، گوناحەکەی من، من پێش بخە. پێشی دەخەن و ئارام ناگرێت و دەڵێت: پەروەردگارا، دوام بخەن. کاتێك دوایدەخەن، ئارام ناگرێت.

ئەنس کوڕی مالك دەڵێت: لە پێغەمبەری خوام بیست، فەرمووی: کاتێك داوودی پێغەمبەر(د.خ) سەیری ژنەکەی و عاشقی بوو، دەستەیەك لە منداڵەکانی ئیسرائیلی بۆ

شەڕ ڕەوانە کرد و بەفەرماندەی دەستەکەی وت کاتێك دوژمن نزیك کەوتەوە، فلأن کەس بخەرە پێش سنوقەکە. لەو ڕۆژگارەدا منالەکانی ئیسرائیل داوای سەرکەوتنیان لەسنوقەکە دەکرد. هەرکەس لەبەردەم سنوقەکەدا بوایە، نەدەبوا بگەرێتەوە تا ئەو کاتەی دەکوژرا یا سوپاکە تێکدەشکا. هاوسەری ئەو ژنە کوژرا و دوو فریشتە ڕۆشتنە لای داوود و داستانەکەیان باس کرد. داوود زانی و سەری سوجدەی دانەواند و بۆ ماوەی چل شەو لەسوجدەدا بوو تا ئەوەی لەفرمێسکی ئەو سەوزە ڕوا و زەوی ناوچاوی ئەوی خوارد. لەکاتی سوجدە کردن دەیوت: پەروەردگارا، داوود گوناحێکی کردووە لەرۆژهەلأت و رۆژئاوا گەورەتر، پەروەردگارا ئەگەر بەزەییت بەداوودا نەیێتەوە و گوناحەکەی نەبەخشی، گوناحەکەی دەبێتە چیرۆکی داهاتووان. دوای چل شەو جبرەئیل هات و وتی: ئەی داوود، خواوەند گوناحەکەی تۆی بەخشی.

داوود وتی: دەزانم خواوەند دەتوانێت گوناحەکەی من ببەخشێت بەلأم ئەگەر لەرۆژی هەستانەوە فلأن کەس بێت و بلێت، پەروەردگارا، داوود خوێنی منی ڕشتووە، چی ڕوودەدات؟

جبرەئیل وتی: لەخواوەندم نەپرسی و ئەگەر بخوازیت دەپرسم.

داوود وتی: بپرسە.

دەلێت: جبرەئیل بۆ ئاسمان گەڕایەوە و سوجدەی برد و تا ئەو کاتەی خواوەند ویستی لەسوجدەدا بوو. دواتر جبرەئیل هات و وتی: ئەی داوود لەخواوەندم پرسی و فەرمووی بەداوود بلێ، لەرۆژی هەستانەوە هەردووکتان کۆدەکاتەوە و دەفەرمێت: خوێنی خۆت بەمن ببەخشە، دەلێت: خواوەندا، تۆ خاوەنی خوێنی منیت. خواوەند دەفەرمێت: لەجیاتی ئەوە، هەرچی بخوازیت لەبەهەشت بەتۆ دەبەخشرێت.

بەگومانی شوێنکەوتەکانی کتێب، داوود دوای تالوت پاشایەتی گرتەدەست تا ئەوەی داستانی ژنی ئەوریا ڕوویدا. داوود گوناحی کرد و سەرقالی تۆبە کردن بوو. منالەکانی ئیسرائیل ئەویان ڕیسوا کرد و ئەبشا کوڕەکەی دژی باوکی ڕاپەڕی و دوو ڕووەکانی منالەکانی ئیسرائیل لەدەوری کۆبونەوە. کاتێك خواوەند بەتۆبەکەی داوود ڕازی بوو، دەستەیەك لەکەسەکانی شوێنی کەوتن و لایەنگیریان لێکرد. شەڕی لەگەڵ کوڕەکەی خۆی کرد تا ئەوی تێکشکاند. یەکێك لەسەردارەکانی خۆی بەشوێن ئەودا ڕەوانە کرد بەلأم فەرمانی پێدا خوێنی نەرێژێت و ئەسیری بکات. سەردار، شوێنی

کەوت. کوڕی داوود پەنای بۆ دارێك برد. قژی درێژی ئەو لەلقەکانی دارەکەوە ئالاّ و ئەوی گرت. سەردار گەیشت و بەپێچەوانەی فەرمانەکەی داوود خوێنی ڕشت. داوود خەمبار و ڕەخنەی لەسەردارەکەی گرت.

هەروەها لەڕۆژگاری داوود تاعونێکی گەورە لەناو منالّەکانی ئیسرائیل بلاّوبوویەوە. ئەوان ڕۆشتنە شوێنی بیت المقدس و پاڕانەوە و خواوەند زیانی تاعوونی هەلّگرت. دۆعاکەیان گیرابوو. ئەو شوێنەیان کردە مزگەوت و ئەمە لەسالّی یانزەیەمی پاشایەتی داوود ڕوویدا. پێش ئەوەی کاری دروست کردنی مزگەوتەکە کۆتایی پێبێت، داوود مرد و وەسیەتی لای سلێمان کرد. سلێمان وەسیەتی باوکی بەکار برد و بکوژی براکەی کوشت. کاتێك سلێمان باوکی بەخاك سپارد، فەرمانەکانی بەکار بەست یانی سەردارەکەی کوشت و تەواو کردنی مزگەوتەکەی کۆتایی پێهێنا.

سەبارەت بەبینای مزگەوتەکە وەهب کوڕی مونبە دەلێت: داوود ویستی ژمارەی منالّەکانی ئیسرائیل بزانێت. کەسانی ڕەوانە کرد بۆ ئەوەی لەژمارەی خەلّك ئاگاداری بکەنەوە. خواوەند سەرکۆنەی کرد و فەرمووی: تۆدەزانی بەلێنم بەئیبراهیم داوە بەرەکەت بخەمە ناو منالّەکانی و ژمارەی ئەوان بەژمارەی ئەستێرەکان زیادە بکەم بەجۆرێك کەس نەتوانێت بیانژمێرێت. تۆ مەبەستی زانینی ژمارەی شتێکت کرد کەمن فەرموومە ژمارەی نییبە. کەواتە یەکێك لەم سێ شتە هەلّبژێرن: یا سێ سالّ گرفتاری برسیەتیتان دەکەم، یا بۆ ماوەی سێ مانگ دوژمنێك بەسەر ئێوەدا زالّ دەکەم، یا بۆ ماوەی سێ ڕۆژ مەرگ بەسەر ئێوەدا زالّ دەبێت؟

داوود لەگەلّ منالّەکانی ئیسرائیل ڕاوێژی کرد و وتیان: ناتوانین بۆ سێ سالّ برسیەتی خۆڕاگر بین و زالّبوونی سێ مانگەی دوژمن بەسەر ئێمە، کەسمان لێ ناهێلێتەوە. ئەگەر ناچار بین مەرگ هەلّدەبژێرین چوونکە بەدەستی خوایە نەك کەسێکی دیکە.

وەهب دەلێت: لەیەك کاژێر لەڕۆژ هەزاران کەس لە منالّەکانی ئیسرائیل مردن کەژمارەیان زانراو نییە. کاتێك داوود ئەمەی بینی، نەیتوانی بەرگەی ژمارەی فراوانی مردوەکان بگرێت، لەخوا پاڕایەوە و وتی: تاوانێکە من ئەنجامم داوە و دەبێت منالّەکانی ئیسرائیل باجەکەی بدەن. من فەرمانی بژاردنی منالّەکانی ئیسرائیلم دا و گوناحەکەی لەئەستۆی مندایە، لە منالّەکانی ئیسرائیل خۆش ببە.

خواوەند دۆعاكەی گیرا كرد و مەرگی لەسەر منداڵەكانی ئیسرائیل هەڵگرت. داوود فریشتەكانی بینی شمشێریان دەخستە ناو كێلاْن و لەسەر پەیژە زێڕینەكان بۆ ئاسمان سەر دەكەوتن. داوود وتی: دەبێت لێرەدا مزگەوتێك دروست بكەین. مەبەستی ئەوەی كرد بینای مزگەوتەكە دەست پێبكات و خواوەند وەحی نارد: ئەمە ماڵێكی پیرۆزە و لەبەر ئەوەی دەستی تۆ بەخوێن پیس بووە، نابێت دامەزرێنەرەكەی بیت بەلاْم دوای خۆت پاشایەتی بەكوڕەكەت دەبەخشین و لەخوێنرێژی بەدووری دەگرین و رایدەسپێرم تا ئەم مزگەوتە دروست بكات. كاتێك سلێمان بەپاشایەتی گەیشت، ماڵەكەی دروست كرد و رێزی لێگرت.

تەمەنی داوود وەك لەحەدیسەكانی پێغەمبەر(د.خ) ئاماژەی پێدراوە، سەد ساڵە بەلاْم شوێنكەوتەكانی كتێب وتوویانە تەمەنی حەفتا و حەوت ساڵە و بۆ ماوەی چل ساڵ پاشایەتی كرد.

## وتار سەبارەت بە سلێمان کوڕی داوود

سلێمان کوڕی داوود دوای باوکی پاشایەتی مناڵەکانی ئیسرائیلی گرتەدەست. خواوەند جنۆکە و ئاگر و با و باڵندەی بۆ دەستەمۆ و وەك پێغەمبەریش هەڵیبژارد. سلێمان داوای لەخواوەند کرد پاشایەتییەکەی پێببەخشێت دوای ئەو کەس هاوشێوەی ئەو پاشایەتییەی نەبێت. خواوەند دۆعاکەی گیرا و پاشایەتییەکەی لەو چەشنەی پێبەخشی.

لەوەهب کوڕی مونبە دەگێڕنەوە: کاتێك سلێمان لەماڵەکەی خۆی بەرەو بارەگایی خوایی بەرێدەکەوت، باڵندەکان لەسەر سەری بوون و جنۆکە و مرۆڤەکان پاسەوانیان دەکرد تا لەسەر تەختەکەی دادەنیشت.

دەڵێن: سلێمان سپی پێست و چوارشانە و جوان روخسار و تووکن و جل و بەرگی سپی لەبەر دەکرد. کاتێك سلێمان گەورە بوو، داوود لەکاروبارەکان راوێژی پێدەکرد. داستانی ئەو و باوکی سەبارەت بەداوەری کردن لەبارەی ئەو مەڕانەی لەکێڵگەیەکی کشتوکاڵی لەوەڕابوون بەو شێوەیە کەخواوەند لەقورئان ئاماژەی پێداوە و دەفەرمێت:

(( و داود و سليمان اذيحكمان فى الحرث اذنفشت فيه غنم القوم و كن لحكمهم شاهدين، ففهمنا سليمان و كلا آتينا حكما و علما.

واتاکەی: داوود و سلێمان بیربێنەرەوە ئەو کاتەی لەکێڵگەیەکی کشتوکاڵی کەمەڕەکانی خەڵك تیایدا لەوەڕابوون، داوەریان دەکرد و ئێمە شایەتی داوەری کردنی ئەوان بووین. حوکمی راستیمان بەسلێمان وت و هەردووکیان لەلایەن ئێمەوە زانست و فرەزانیان پێبەخشرا بوو.))

لەکوڕی مەسعود دەگێڕنەوە، سەبارەت بەم ئایە وتی: ڕەزێك بۆ لە ترێکانی پێگەیشت و بەهۆی لەوەڕینی مەڕەکانەوە لەناوچوو. داوود وتی مەڕەکان بۆ خاوەن ڕەزەکە بێت.

سلێمان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەمە نابێت.

داوود وتی: ئەی چۆن؟

وتی: ڕەزەکە بەخاوەنی مەڕەکان بدە تا ئاوەدانی بکاتەوە هاوشێوەی خۆی و مەڕەکان بەخاوەنی ڕەزەکە بدە تا کەڵکیان لێ وەربگرێت و کاتێك ڕەزەکەی چاککرایەوە، مەڕەکان بۆ خاوەنەکەی و ڕەزەکە بۆ خاوەنەکەی بگێڕیتەوە.

سلێمان پیاوێکی شەڕخواز و بەردەوام لەشەڕدا بوو. لەهەر شوێنێکی زەوی پاشایەك بوونی هەبوایە، دەڕۆشت و سەرکوتی دەکرد.

دەڵێن: کاتێك بە مەبەستی شەڕ بەرێدەکەوت، دەیوت دارێك بێنن و خێوەتێکی لەسەر هەڵبدەن و هەموو خەڵك و چوارپێکان و کەرەستەکانی شەڕی لێ بار بکەن. فەرمانی بەبا دەدا بڕواتە ژێر دارەکە و بیبات و بەرەبەیانی ڕێگەی یەك مانگە ببڕێت و شەوانە ڕێگەی یەك مانگە بگەڕێتەوە. خواوەند لەمبارەوە دەفەرمێت:

((فسخر ناله الريح تجري بامره رخاء حيث اصاب.

واتاکەی: بامان ب دەستەمۆی و بۆ هەر شوێنێك مەبەستی دەکرد بەفەرمانی ئەو بەنەرمی ڕێگەی دەبڕی.))

هەروەها دەفەرمێت: ((و لسليمان الريح غدوها شهرورواحها شهر.

واتاکەی: بامان بۆ سلێمان دەستەمۆ کرد کەبەرەبەیان ڕۆشتنی یەك مانگە و شەوانە ڕۆشتنی یەك مانگ ڕێگە بوو.))

دەڵێن: لەنزیك دیجلەماڵێکی لێیە ولەوێ دەستەیەك لەهاوەڵانی سلێمان لەجنۆکە یا مرۆڤ خەتێکیان نووسیوە بەم ناوەرۆکە: ئێمە بۆ ئێرە هاتووین، دروستمان نەکرد بەڵکو دروستکرابوو، بەرەبەیان لەئیستەخرەوە بەرێکەوتین و لەکاتی نیمەڕۆ لێرە بووین و بەخواستی خواوەند دەڕۆین و شەو لەشام دەبین.

لەمحەممەد کوڕی کەعبی قورەزی دەگێڕنەوە: ئوردوگای سلێمان یەکسەد فەرسەخ بوو، بێست و پێنج فەرسەخی لەمرۆڤەکان، بیست و پێنج فەرسەخ لەوەحشیەکان، بیست و پێنج فەرسەخ لەباڵندەکان و بیست و پێنج فەرسەخی لەجنۆکەکان پێکهاتبوو. هەزار ماڵی لەئاوێنە بوو لەسەر دار کەسێسەد ژنی مارەکراو و حەوت سەد ژنی پاشاکانی دیکە لەناو ئەو خانووانەدا ژیانیان بەسەر

دەبرد. با ئەوانی دەبرد و هەر کاتێك یەکێك لەوان لەنێوان ئاسمان و زەوی بەرز دەبووبیەوە، خواوەند وەحی بۆ دەنارد: ئەم پاشایەتییەم بەسنوری پاشایەتی تۆ زیاد کرد بۆ ئەوەی هەرکام لەبوونەوەرەکان قسەیەك بکات، با قسەکەی بەگوێی تۆ بگەیەنێت.

لەکوری عەباس دەگێڕنەوە: لەکوڕی سلێمان کوڕی داوود شەشسەد کورسی دادەنرا کەگەورەی مرۆڤەکان لای سلێمان دادەنیشتن و گەورەی جنۆکەکان لەتەنیشت ئەوان جێگەیان دەگرت. دواتر بەباڵندەکانی دەوت سێبەریان بۆ دروست بکەن. دواتر فەرمانی بەبا دەدا، هەڵیانبگرێت و بەیەك ڕۆژ ڕێگەی یەك مانگیان ببات.

## وتار سەبارەت بەشەرەکانی سلێمان و ئەو شەڕەی نامەی بۆ بەلقیس نووسی

ناوی بەلقیس وەك ڕەچەڵەك ناسان ئاماژەیان پێداوە، یەلقەمە کچی ئەلیەشرحە و دەستەیەکی دیکە وتوویانە کچی ئیلی شەرحە. بەوتەیەك کچی زی شەرح زی جەدەن کوڕی ئیلی شەرح کوڕی حارس کوڕی قەیس کوڕی صەیفی کوڕی سەبا کوڕی یەشجب کوڕی یەعرب کوڕی قەحتانە و بێ شەڕ بۆ لای سلێمان ڕۆشت.

هۆکاری نامەنووسینی سلێمان بۆ بەلقیس ئەود بوو: ڕۆژێك لەرێگە داوای شانەبەسەری کرد. نیازمەندی ئاو بوو و نەیاندەتوانی ئاو بدۆزنەوە. ئامادەبووان وتیان تەنیا شانەبەسەر دەتوانێت ئەم کارە بکات بەڵام شانەبەسەر لەوێ ئامادە نەبوو.

دەڵێن: سلێمان داوای شانەبەسەری کرد لەبەر ئەوەی لەپێغەمبەرایەتی ئەو کێشە دروست بوو.

داستانی سلێمان و بەلقیس بەو شێوەیە لەگێڕانەوەی کوڕی عەباسدا هاتووە: کاتێك سلێمان کوڕی داوود لەسەفەردا بوو یا مەبەستی سەفەری دەبوو، لەسەر تەختەکەی دادەنیشت و لەراست و چەپی ئەو کورسیان دادەنا. مۆڵەتی دانیشتنی بەمرۆڤەکان دەدا و دوای ئەوان جنۆکەکان دادەنیشتن. دواتر مۆڵەتی دانیشتنی بەشەیتانەکان دەدا، دواتر فەرمانی بەباڵندەکان دەدا سێبەریان بۆ دروست بکەن. بەبای دەوت ئەوان ببات. سلێمان لەسەر تەختەکەی دانیشتبوو و خەڵکان لەسەر کورسیەکان. بەرەبەیان ڕێگەی یەك مانگیان دەبڕی و شەوانە ڕێگەی یەك مانگ. دەگەڕایەوە و نەسیم بوو نەك تۆفان. سلێمان لەهەر کام لەباڵندەکان دەستەیەکی دەستنیشان دەکردو هەر کاتێك دەیویست شتێك لەباڵندەکان بپرسێت، لەگەورەی ئەوانی دەپرسی. ڕۆژێك سلێمان لەرێگە لەبیابانێك دابەزی و پرسیاری قووڵی ئاوی کرد. مرۆڤەکان پێیان وت: نازانین. سلێمان تووڕە بوو و وتی: تا نەزانم قولآیی ئاو چەندە لێرە ناڕۆم. شەیتانەکان وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، تووڕە مەبە ئەگەر کەسێك شتێك لەمبارەوە بزانێت، تەنیا شانەبەسەرە. سلێمان وتی: شانەبەسەر

بێنن. ئەویان نەدۆزیەوە و سلێمان وتی:

((ما لی اری الهدهد ام کان من الغایبین. لا عذبنه عذابا شدیدا اولا ذبحنة اولیاء تینی بسلطان مبین.

واتاکەی: بۆ شانەبەسەر نابینم. مەگەر ئەو لێرە نییە. سزای دەدەم سزایەکی سەخت. سەری دەبڕم یا بەڵگەیەکی روون و ئاشکرا دەهێنێتەوە.))

سەرئەنجامی باڵندەکان بەو شێوە بوو کەباڵی ئەوانی لێدەکردەوە و دەیخستنە بەرهەتاو. چیتر نەیاندەتوانی بفڕن و دەبونە خزۆك یا ئەوی دەکوشت. سلێمان بەمشێوەیە سزای باڵندەکانی دەدا.

دەڵێن: شانەبەسەر لای کۆشکی بەلقیس تێپەڕی و لەپشتی کۆشکەکە بێستانێکی بینی، لەوێ دابەزی و شانەبەسەری بەلقیسی بینی و وتی: لێرە چی دەکەیت، بۆ نایەیێت بۆ لای سلێمان؟

شانەبەسەری بەلقیس وتی: سلێمان کێیە؟

شانەبەسەری سلێمان وتی: خواوەند پێغەمبەرێکی رەوانە کردووە بەناوی سلێمان و باو جنۆکە و مرۆڤ و باڵندەکانی بۆ دەستەمۆ کردووە؟.

شانەبەسەری بەلقیس وتی: چی دەڵێیت؟

شانەبەسەر وتی: هەر ئەوەی باسم کرد.

شانەبەسەری بەلقیس وتی: سەیرە و سەیرتر لەوە کەپاشای ئەم خەڵکە ژنێکە و هەموو شتێکی هەیە. تەختێکی گەورەی هەیە و لەجیاتی پەرەستینی خواوەند کوڕنوش بۆ هەتاو دەبات.

دەڵێت: شانەبەسەر، کەوتە بیری سلێمان و هەڵفڕی. کاتێك گەیشتە ئوردوی سلێمان، باڵندەکان دەوریان گرت و وتیان: سلێمان هەڕەشەی لێکردیت. لەوتەکانی سلێمان ئاگاداریان کردەوە.

شانەبەسەر وتی: پێغەمبەر هیچ مەرجێکی دانەنا.

وتیان: وتوویەتی مەگەر بەڵگەیەکی روون و ئاشکرای پێبێت.

دەڵێت: شانەبەسەر ڕۆشتە لای سلێمان وپێی وت: بۆ لێرە نەبوویت؟

وتی: (( احطت بمالم تحط به وجئتك من سبأبنبأ يقين. انی وجدت امراة تملكهم و اوتيت من كل شيئی و لها عرش عظيم. وجدتها و قومها يسجدون للشمس من دون الله و زين لهم الشيطان اعمالهم فصدهم عن السبيل فهم لا يهتدون. الا يسجدوا لله الذی يخرج الخب فی السموات و الارض و يعلم ما تخفون و ما تعلنون الله لا اله هو رب العرش العظيم. قال ستنتظر اصدقت ام كنت من الكاذبين. اذهب بكتابی هذا فالقه اليهم ثم تول عنهم فانظر ماذاير جعون.

واتاكەی: شتێكم بينيوە كەنەتبينيوە. بۆ تۆ لەسەبا هەواڵێكی راستم هێناوە. ژنێكم بينی سەڵتەنەتی ئەوانی دەكرد، هەموو شتێكی هەیە. تەختێكی هەیە. ئەوم بينی لەگەڵ خەڵكەكەی جگە لەخوا، يانی كوڕنوش بۆ هەتاو دەبات و شەيتان كردەوەكانی بۆ ئەوان رازاندۆتەوە و لەرێگەی راست دووری خستوونەتەوە ورێنوێنی نەكراون. تا كوڕنوش بۆ ئەو خوایە ببەن كە لەئاسمان و زەوییەكان نهێنییەكان ئاشكرا دەكات و ئەوەی ئاشكرای دەكەن، دەيزانێت. خوای تاقانە كەجگە لەو خوایەك نییە و پەروەردگاری عەرشی گەورەیە. وتی: دەبينين ئايا راست دەكەيت يا لەدرۆزنەكانيت. ئەم نامە ببە و لای ئەوان فڕێبدە و دواتر دووركەوەرەوە، بزانن چی دەڵێن.

كاتێك شانەبەسەر بەڵگەی خۆی نيشاندا و داستانی بەلقيس و خەڵكەكەی باس كرد كە لەشانەبەسەرەكەی تر بيستبووی، سلێمان وتی: بيانوويەكی باشت هەیە، دەبينين راستگۆ دەبيت يا لەدرۆزنەكان، ئەم نامەيان بۆ ببە و فڕێبدە.

شانەبەسەر ڕۆشت و كاتێك بەلقيس لەناو كۆشكەكەی دانيشتبوو، نامەكەی فڕێدا. نامەكە كەوتە كۆشی، ترسا و نامەكەی هەڵگرتەوە و بەجلەكانی خۆی دایپۆشی و فەرمانيدا تا تەختەكەی ببەنەدەر. ڕۆشتەدەر و لەسەر تەختەكەی دانيشت و بەخەڵكەكەی خۆی وت:

(( يا ايها الملاء انی القی الی كتاب كريم. انه من سليمان و انه بسم الله الرحمن الرحيم. الا تعلوا علی و أتونی مسلمين. قالت يا ايها الملاء افتونی فی امری ما كنت قاطعة امرا حتی تشهدون. قالوا نحن اولوا قوة و اولوا بأس شديد.والامر اليك فانظری ماذا تأمرين. قالت ان الملوك اذادخلوا قرية افسدوها و جعلوا اعزة اهلها اذلة

و كذلك يفعلون. و انى مرسله اليهم بهديه فناظرة بم يرجع المرسلون. فلماجا سليمان قال اتمدونن بمال فما آتانى الله خير مما اتاكم بل انتم بهديتكم تفرحون. ارجع اليهم فلنأ تينهم بجنود لا قبل لهم بها و لنخرجنهم منها اذلة و هم صاغرون.

واتاکەی: وتی ئەی گەورەکان، نامەیەکی بەرێزیان بۆ من فرێداوە و لەلایەن سلێمانەوەیە و بەناوی خواوەندی رەحمانی رەحیمە. خۆتان بەگەورەتر و بەهێزتر لەمن مەزانن وگوێرایەڵ و ملکەچ وەرنە لای من. وتی: ئەی گەورەکان بۆچونی خۆتانم پێبڵێن چوونکە من بیّ ئێوە چارەسەرکەری هیچ کارێك نەبووم. وتیان: ئێمە بەهێزین و شەڕکەرانی تێکۆشەر و کاروبارەکان لەئیرادەی تۆدایە. بابزانین فەرمانی تۆچییە؟ وتی: پاشاکان کاتێك دەڕۆنە ناو گوندێگ، وێرانی دەکەن و ئازیزەکانیان زەلیل و ریسوا دەکەن. ئەمە کاریانە. من دیارییەك بۆ ئەوان دەنێرم تا بزانم نێردراوان چ هەواڵێکم بۆ دێننەوە. کاتێك ڕۆشتە لای سلێمان، وتی بەسامان هاوکاری من دەکەن؟ ئەوەی خواوەند بەمنی بەخشیوە باشتر لەوەیە بەئێوەی داوە. ئێوەن بەدیارییەکەی خۆتان دڵخۆش دەبن. بۆ لای ئەوان بگەڕێرەوە. سوپاییەك دەکەینە سەر ئێوە نەتوانن بەرگەی بگرن و لەویّ بەریسوایی دەرتان دەکەین تا پەست و لاواز بن.

دەڵێت: بەلقیس مۆرەیەکی دەستلێنەدراوی بۆ سلێمان نارد و پێی وت ئەمە کون بکە. سلێمان لەمرۆڤەکانی پرسی بەلأم زانستی ئەو کارەیان نەبوو. دواتر لەشەیتانەکانی پرسی و وتیان: داوای مۆریانە بکە. کاتێك مۆریانە هات، مویەکی بەدەمیەوە گرت و ڕۆشتە ناو مۆرەکە و دوای چەند ساتێك کونی کرد. کاتێك نێردراوەکانی بەلقیس گەڕانەوە، ترسا. بەرەبەیان بەرێکەوت و خەڵکەکەی هاورێیەتیان دەکرد.

کوڕی عەباس دەڵێت: هەزار سالار هاورێیەتی بەلقیسیان دەکرد کەهەر سالارێك دەهەزار کەسی لەژێر دەستا بوو و بەوتەیەك هەر سالارێك دەهەزار هەزار کەسی لەژێردەستا بوو.

لە عەبدالله کوڕی شەداد دەگێڕنەوە:سلێمان پیاوێکی خاوەن شکۆ بوو.

هەرگیز قسەی دەست پێنەدەکرد تا پرسیاری لێبکەن. ڕۆژێك هاتەدەر و لەسەر تەختەکەی دانیشت. لەو نزیکانە تەپ و تۆزێکی بینی و پرسی: ئەوە چییە؟

وتیان: ئەی پێغەمبەر، بەلقیس هاتووە.

سلێمان وتی: لێرە دابەزیوە؟

موجاهید دەڵێت: کوڕی عەباس شوێنەکەی بۆ وەسف کرد و دەستنیشانمان کرد . یەك فەرسەخ لەنێوان کوفە و حیرەیە.

دەڵێت: سلێمان ڕووی کردە سوپاکەی خۆی و وتی: ((ایکم یأتینی بعرشها قبل ان یأتونی مسلمین. قال عفریت من الجن انا آتیك بەقبل ان تقوم من مقامك و انی علیه لقوی امین.

واتاکەی: ئەی گەورەکان، کامتان پێش ئەوەی ملکەچانە بێنە لای من، تەختەکەی ئەوم بۆ دێنێت. دێوێك لەجنۆکەکان وتی: پێش ئەوەی لەشوێنەکەی خۆت هەستیت، تەختەکەت بۆ دێنم و بۆ ئەم کارە بەتوانا و ئەمینم.))

سلێمان وتی: کێ زووتر دەیهێنێت؟

((قال الذی عنده علم من الکتاب انا آتیك بەقبل ان یرتد الیك طرفك.

واتاکەی: ئەو کەسەی زانستی کتێبی کۆن لای ئەو بوو، وتی: پێش ئەوەی پێڵووبخەیتە سەر یەك، دەیهێنمە لای تۆ.))

سلێمان سەیری نەکرد و کاتێك قسەکەی تەواو بوو، سەیری تەختەکەی خۆی کرد و تەختی بەلقیسی بینی کە لەژێر کورسیەکەی دەرکەوتووە، کاتێك بینی، وتی: ئەمە لەبەخشینەکانی پەروەردگارە و دەیەوێت من تاقیبکاتەوە کەئایا سپاس گوزاری دەبم یا نە.

دەڵێت: تەختەکەی بەلقیسیان بۆ هێنا و کاتێك هات و لەگەڵ سلێمان دانیشت، پێی وت: ئایا تەختەکەی تۆ بەمشێوەیە؟

کاتێك تەختەکەی بینی، وتی: دەڵێی خۆیەتی.

دواتر وتی: من لەناو قەڵاکانی خۆم بەجێم هێشت و سوپاکەم لەدەوری بوون، چۆن هێنایان بۆ ئێرە؟

بەسلێمانی وت: دەمەوێت پرسێك لەتۆ بپرسم.

سلێمان وتی: بپرسە.

وتی: ئاوێکی ڕوونە بەڵام نە لەزەوییەوە دێت نە لەئاسمان؟

دەڵێت: کاتێک سلێمان شتێکی نەدەزانی، سەرەتا لەمرۆڤەکانی دەپرسی ئەگەر نەیاندەزانی لەجنۆکەکانی دەپرسی و ئەگەر نەیاندەزانی لەشەیتانەکانی دەپرسی.

شەیتانەکان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەمە زۆر ئاسانەن بڵێ ئەسپەکان غار بدەن و دەفرێک لەئارەقی ئەوان پڕبکەن.

سلێمان لەوەڵامی بەلقیسدا وتی: ئارەقی ئەسپەکان.

بەلقیس وتی: ڕاستت وت.

ئەوسا وتی: پەروەردگار چ ڕەنگێکی هەیە؟

کوڕی عەباس دەڵێت: سلێمان لەسەر تەختەکەی هاتەخوار و کوڕنوشی برد و بەوتەی حەسەن لەهۆش خۆی چوو و لەتەختەکەی کەوتە خوار.

کوڕی عەباس دەڵێت: سلێمان هەستا و سوپاکەی بڵاوەیان لێکرد. فریشتەی خوا هات و وتی: پەروەردگار دەفەرمێت چیت بەسەر هات؟

سلێمان وتی: پرسیارێکی لەمن پرسی کە توانای دووبارە کردنەوەییم نییە.

فریشتە وتی: پەروەردگار دەفەرمێت بگەڕێرەوە بۆ سەر تەختەکەت و بەلقیس و سوپاکەی بانگ بکە و هەموو سوپاکەی خۆت بێنە و لەو و لەوان بپرسە کەپرسیارەکەیان چی بوو؟

دەڵێت: سلێمان ئەو کارەی کرد و کاتێک هەموویان هات، بەبەلقیسی وت: پرسیارەکەت چی بوو؟

بەلقیس وتی: پرسیاری ئاوێکی ڕوونم کرد کە نە لەزەوییەوە بێت نە لەئاسمان.

سلێمان وتی: وەڵامەکەت ئارەقی ئەسپەکان بوو. چ پرسێکی دیکەت پرسی؟

بەلقیس وتی: پرسی دیکەم نەپرسی؟

سلێمان وتی: ئەی من بۆ لەسەر تەختەکەم کەوتمە خوار.

بەلقیس وتی: نازانم بۆ.

پرسیاری لەسوپاکەی بەلقیس کرد و هەمان وەڵامی دەستکەوت.

هەروەها لەسوپاکەی خۆی لەجنۆکە و مرۆڤ و باڵندە و هەموو ئامادەبووانی پرسی و هەموویان وتیان: ئەی پێغەمبەر جگە لەپرسی ئاوە روونەکە هیچی لەتۆ نەپرسی. فریشتەی خواوەند بەسلێمانی وتبوو: خواوەند دەفەرمێت، بۆ شوێنەکەی خۆت بگەڕێرەوە چوونکە کێشەت نەما.

دەڵێت: سلێمان بەشەیتانەکانی وت: کۆشکێك دروست بکەن تا بەلقیس لەو کۆشکەدا بێتە لای من. شەیتانەکان لەگەڵ یەك قسەیان کرد و وتیان: خواوەند هەموو شتێکی دەستەمۆی سلێمان کردووە و بەلقیس پاشای سەبایە و ئەو دەکاتە هاوسەری خۆی و کوڕێك دەهێنێتە دنیا و ئێمە هیچ کات لەکۆیلایەتی رزگارمان نابێت.

دەڵێت: رانەکانی بەلقیس تووکن بوو. سلێمان بەشەیتانەکانی وت کۆشکێکی بۆ دروست بکەن تا ڕانی ئەو ببینێت و دواتر بیکاتە هاوسەری خۆی. کۆشکێکیان لەئاوێنەی سەوز دروست کرد و چەندین قات ئاوێنەیان دانا وەك بڵێی ئاو بوو. لەناو دڵی قاتەکان لەهەموو جۆرە ئاژەڵەکانی دەریا لەماسی و شتەکانی دیکەیان دانا و دایانخست و بەسلێمانیان وت: برۆنە ناو کۆشکەکە. کورسییەکیان لەوپەڕی کۆشکەکە بۆ سلێمان دانا و کاتێك ڕۆشت و شوێنەکەی بینی، بەرەو کورسییەکە بەرێکەوت و دانیشت و وتی: بەلقیس بێننە لای من.

بە بەلقیسیان وت: برۆ ناو کۆشکەکە. کاتێك ڕۆشت ماسی و ئاژەڵەکانی لەناو ئاودا بینی، گومانی کرد ئەستێلکە، ڕانەکانی خۆی رووت کرد تا لەئاوەکە بپەڕێتەوە. مووەکان بەڕانییەوە نووسابوون. کاتێك سلێمان بینی، چاوی لەسەر هەڵگرت و پێی وت ئەمە بینایەکە لەئاوێنە. بەلقیس دەستی لەجلەکانی بەردا و وتی:

((رب انی ظلمت نفسی و اسلمت مع سلیمان لله رب العالمین.

واتاکەی: پەروەردگارا، ستەمم لەخۆم کرد ئێستا هاوشێوەی سلێمان ملکەچی فەرمانەکانی خواوەندی جیهانیان دەبم.))

دەڵێت: سلێمان داوای مرۆڤەکانی کرد و وتی: ئەمە چەندە ناشیرینە، چۆن دەتوانین ئەو تووکە زیادە نەهێڵن؟

وتیان: ئەی پێغەمبەر، بەتیغ.

وتی: تیغ رانی ژنەکە دەبڕێت. ئەوسا جنۆکەکانی بانگ کرد و لەوانی پرسی.

وتیان: نازانین.

شەیتانەکانی بانگ کرد و وتی: بەچی دەتوانین ئەمە پاك بکەینەوە؟

وتیان: بەتیغ.

وتی: تیغ رانی ژنەکە دەبڕێت.

زۆریان ئەندێشە کرد تا نۆرەیان بۆ دروست کرد.

کوڕی عەباس دەڵێت: یەکەم جار بوو نۆرە بەکار دەبرا.

سلێمان بەلقیسی وەك هاوسەری خۆی هەڵبژارد.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: کاتێك نێردراوەکانی بەلقیس گەڕانەوە و لەوتەکانی سلێمان ئاگاداریان کردەوە، وتی: سوێند بەخوا دەزانم ئەو پاشا نییە و ئێمە ناتوانین لەبەرابەر ئەو خۆڕاگری بکەین. کەسی بۆ لای سلێمان رەوانە کرد و وتی: من لەگەڵ شاکانی وڵاتەکەی خۆم دێمە لای تۆ تا بزانم کاری تۆ چییە و ئەو دینەی بانگەشەی بۆ دەکەیت چۆنە. فەرمانیدا تا تەختەکەی کە بەزێڕ و بەمرواری و یاقوت دەوری گیرابوو لەناو ماڵێکدا دابنێن. ماڵەکە حەوت دەرگای بوو. دەرگاکانی قوفڵ کرد. ژنەکان خزمەتی ئەویان دەکرد. شەشسەد ژن خزمەتکاری ئەو بوون و بەجێگرەکەی خۆی وت: تەختەکە بپارێزە بۆ ئەوەی کەس نەڕواتە لای و نەیبینێت تا دەگەرێمەوە. لەگەڵ دوانزە هەزار سالار لەشاکانی یەمەن بەرێکەوت کە هەر سالارێك هەزاران کەسی لەگەڵدا بوو. سلێمان جنۆکەکانی رەوانە کردبوو تا شەو و رۆژ لەرێگەکەی بەلقیس ئاگاداری بکەنەوە. کاتێك نزیك کەوتەوە، هەموو مرۆڤ و جنۆکە و فەرمانبەرەکانی خۆی کۆکردەوە و وتی: کامتان پێش ئەوەی خەڵکەکەی بەلقیس بگەن، دەتوانێت تەختەکەی بێنێتە لای من؟

دەڵێت: بەلقیس باوەڕی هێنا.

دەڵێن: کاتێك بەلقیس باوەڕی هێنا و سلێمان لەکاری ئەو تەواو بوو، وتی: یەکێك لەخەڵکەکەت هەڵبژێرە تا تۆ بیکەمە هاوسەری ئەو.

وتی: ئەی پێغەمبەر، کەسێکی وەك منی پاشا و خاوەن دەسەلات ببمە ژنی

پیاوان!

سلێمان وتی: بەڵێ، ڕەسمی ئیسلام بەمشێوەیە و شیاو نییە ئەو شتەی خواوەند حەڵاڵی کردووە، حەرامی بکەیت.

بەلقیس وتی: ئەگەر بۆ ئەو کارە ناچارم من بکەرە هاوسەری زووتەبع پاشای غەمدان.

سلێمان ئەوی کردە هاوسەری زووتەبع و بۆ خەڵکی یەمەنی نارد. هاوسەرەکەی ئەوی کردە فەرمانڕەوای یەمەن و زوبعە ئەمیری جنۆکەکانی یەمەنی بانگ کرد و وتی: هەرکاتێك زووتەبع بۆ کاروباری خەڵکەکەی تۆی بەکار برد، هاوکاری بکە. ئەویش بۆ زووتەبع لەیەمەن کاری دەکرد. زووتەبع پاشای یەمەن بوو و هەر کارێك ئارەزووی دەکرد، ئەنجامی دەدا.

کاتێك سلێمان کوڕی داوود کۆچی دوایی کرد و ساڵێك تێپەڕی و جنۆکەکان لەمەرگی ئەو ئاگادار نەبوونەوە، یەکێك لەوان هات و لەتەهامە تێپەڕی و کاتێك گەیشتە ناوەڕاستی یەمەن، بەدەنگی بەرز هاواری کرد، ئەی دەستەی جنۆکەکان، سلێمان پاشا مرد. دەست هەڵبگرن. شەیتانەکان بەخەت لەسەر دوبەردی گەورە نووسیان: ئێمە سەلیحینمان لەماوەی حەفتا و حەوت پاییزی بەردەوامی کار کردن دروست کرد و صرواح و مەراح و بینون و هند و هیند و تلسوومان دروست کرد. ئەمانە ناوی قەڵاکان بوو کەشەیتانەکان بۆ زووتەبع دروستیان کرد. دوای ئەوە دەستیان هەڵگرت و ڕۆشتن و پاشایەتی زووتەبع و بەلقیس هاوڕێ لەگەڵ پاشایەتی سلێمان کوڕی داوود کۆتایی هات.

## ئاماژەدان بەشەڕەکانی سلێمان لەگەڵ باوکی ژنەکەی خۆی یانی جەرادە و داستانی ئەو شەیتانەی ئەنگوستیلەکەی هەڵگرت.

لەوەهب کوڕی مونبە دەگێڕنەوە: سلێمان بیستی لەیەکێك لەدوورگەکانی دەریا بەناوی صیودن پاشایەکی گەورە ژیان بەسەر دەبات کەکەسەکان ڕێگەی چوون بۆ لای ئەویان نییە چوونکە شوێنەکەی لەدەریادایە. خواوەند هێزێکی بەسلێمان بەخشیبوو کەهیچ شتێك لەدەریا و وشکانی نەیدەتوانی لەبەرابەر ئەو خۆڕاگری بکات. لەبەر ئەمە مەبەستی ئەو شارەی کرد. با ئەوی بەسەر ئاوەکە برد تا ئەوەی هاوڕێ لەگەڵ سوپاکەی خۆی بەجنۆکە و مرۆڤەکانەوە لەوێ دابەزی. پاشاکەی کوشت و خەڵکەکەی ئەسیر کرد. لەناو ئەسیرەکان کچی پاشاکە دەبینرا و لەجوانیدا کەس هاوشێوەی نەبوو. ئەوی تایبەت کرد بەخۆی و پێشنیاری ئیسلامی پێکرد. کچەکە بەنابەدڵی باوەڕی هێنا. سلێمان ئەوی زیاتر لەهەموو ژنەکانی خۆش دەویست. لەگەڵ ئەو پێگەی لەناو دڵی سلێماندا بووی، بەردەوام چاوبەگریان و خەمبار بوو. کاتێك سلێمان ئەوی بەمشێوەیە بینی، پرسی: ئەم خەم وگریانە بۆچییە؟

ژن وتی: کاتێك بەسەرهاتی باوکم بیردەکەوێتەوە، خەمبار دەبم.

سلێمان وتی: خوا پاشایەتییەکی گەورەتر لەپاشایەتی باوکتی بەتۆ بەخشیوە و بۆ ئیسلام ڕێنوێنی کردوویت کە لەهەموو شتێك باشترە.

ژن وتی: ڕاستە، بەڵام کاتێك بیری دەکەومەوە، خەمبار دەبم، ئەگەر فەرمان بدەیت شەیتانەکان ڕوخساری باوکم لەماڵەکەدا دروست بکەن بۆ ئەوەی هەموو کاتێك بیبینم، هیوادارم خەمەکانم بڕەوێنەوە و دڵم ئارام بگرێت. سلێمان فەرمانی بەشەیتانەکاندا تا ڕوخساری باوکی لەماڵەکەیدا بکێشن. ئەو کارەیان کرد و باوکیان بەهەمان شێوەی خۆی بەڵام بێ گیان دروست کرد. جل و بەرگیان لەبەر کرد. کاتێك سلێمان لەماڵەکەی دەڕۆشتەدەر، ژن لەگەڵ کەنیزەکانی خۆی سوجدەیان بۆ دەبرد بەهەمان شێوە کە لەڕۆژگاری پاشایەتی باوکی ئەو کارەیان دەکرد. هەموو شەوێك ئەو کارەی دەکرد و سلێمان ئاگادار نەبوو تا ئەوەی چل ڕۆژ تێپەڕی. ئەم هەواڵە بەگوێی ئاصف کوڕی

بەرخیا گەیشت کەهاورێی سلێمان بوو. ئاصف هەر کاتێك بیویستایە بەئامادە بوون یا نەبوونی سلێمان دەڕۆشتە ناو ماڵەکانی. ڕۆشتە لای سلێمان و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، تەمەنم درێژ بۆتەوە و ئێسقانەکانم لاواز بوون. تەمەنم بەسەرهاتووە و کاتی کۆچ کردنمە. حەز دەکەم پێش مردن، ئاماژە و وەسفی پێغەمبەرە کۆنەکان و ئەو شتانەی باس بکەم کەخەڵکان نایزانن.

سلێمان وتی: ئەو کارە بکە. خەڵکی کۆکردەوە و ئاصف دەستی بەقسە کردن کرد. باسی پێغەمبەرە کۆنەکانی کرد و تایبەتمەندی ئەوانی نیشاندا تا گەیشتە سلێمان و وتی: لەکاتی گەنجی خۆڕاگر و خواپەرەست وچاکەکار بوویت، لەگەنجیدا کاروبارەکانت بەهێز بوو، لەگەنجیدا لەناڕەوایی بەدوور بوویت.

سلێمان ڕەنجا و تورە بوو. کاتێك بۆ ماڵ گەڕایەوە، داوای ئاصفی کرد و وتی: باسی هەموو پێغەمبەرە کۆنەکانت کرد. وەسفی هەموویانت هێنایە سەرزمان و کاتێك گەیشتیتە من، باسی چاکەکاری دەورانی گەنجی منت کرد بەڵام باسی تەمەنی پیری منت نەکرد. مەگەر لەکۆتاییەکانی تەمەنی خۆم چیم کردووە؟

ئاصف وتی: لەچل ڕۆژ پێش لەئێستا لەماڵەکەی تۆدا شتێك جگە لەخوا پەرەستش دەکەن.

سلێمان وتی: لەماڵەکەی من؟

وتی: لەماڵەکەی تۆ.

سلێمان انا لله ی وت و زیادی کرد: زانیم کەشتێك بووە بۆیە بەو شێوەیە قسەت کرد.

دواتر ڕۆشتە ماڵەوە و بتەکەی شکاند و سزای ژنەکەی و کەنیزەکانیدا و وتی تا جل و بەرگی پاك لەبەر بکەن. جل وبەرگێك بوو کەکچەکان دروستیان دەکرد. کچان دەیانڕست و کچان دەیانشۆرد. ژنێك کەخوێنی بینیبوو، دەستی لێنەدەدا. جلەکانی لەبەر کرد و بەتەنیا ڕێگەی بیابانی گرتەبەر فەرمانیدا تا خۆڵەمێشیان هێنا. لەسەر خۆڵەمێش دانیشت و ناڵاندی و لەخوا پاڕایەوە و پەشیمانی خۆی دەربڕی. بەردەوام لەناو خۆڵەمێشەکەدا دەتلایەوە ودەیوت: پەروەردگارا، ئەمە ئەزموونی بنەماڵەی داوودە کەکەسێك جگە لەتۆ بپەرەستن. بەم شێوەیە تا شەو گریا و پاڕایەوە و ئەوسا بۆ ماڵ گەڕایەوە.

ژنێك لەماڵی سلێماندا بوو بەناوی ئامینە. هەر کاتێك سلێمان دەڕۆشتە سەرئاو، یا مەبەستی نزیك بوونەوەی لەگەڵ ژنێك دەکرد، ئەنگوستیلەکەی بەئامینە دەدا تا پاك بێت. تەنیا بەلەشی پاك دەستی لەئەنگوستیلەکە دەدا. پاشایەتی ئەو پەیوەست بوو بەو ئەنگوستیلە. ئەو ڕۆژە وەك هەمیشە ئەنگوستیلەکەی بە ئامینە سپارد و ڕۆشتە سەرئاو. شەیتانی دەریا کەناوی صەخرە، لەڕوخساری سلێمان هاتە لای ئامینە و ئەنگوستیلەکەی وەرگرت و ڕۆشت و لەسەر تەختی سلێمان دانیشت. باڵندە و جنۆکە و مرۆڤەکان لەدەوری کۆبونەوە.

کاتێك سلێمان هات و داوای ئەنگوستیلەکەی لەئامینە کرد، وتی: تۆ کێیت؟

وتی: من سلێمان کوڕی داوودم.

ئامینە وتی: درۆ دەکەیت، تۆ سلێمان کوڕی داوود نیت. سلێمان هات و ئەنگوستیلەکەی وەرگرت و هەنووکە لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشتووە.

سلێمان زانی سەرئەنجامی گوناحەکەی دەرکەوتووە. ڕۆشتەدەر و لای ماڵی مناڵەکانی ئیسرائیل تێدەپەڕی و دەیوت: من سلێمانم. خۆڵیان بەسەر و ڕوخساردا دەپرژاند و جوێنیان پێدەدا و دەیانوت: سەیری ئەم شێتە بکەن گومان دەکات سلێمان کوڕی داوودە. کاتێك ئەمەی بینی، بەرەو دەریا بەڕێکەوت و ماسی بۆ خەڵکی دەریا دەبردە بازار. ڕۆژانە دوو ماسیان پێدەدا. شەوانە یەکیانی بەنان دەگۆڕی و ئەویتریانی دەبرژاند و دەیخوارد. چل ڕۆژ بەمشێوەیە تێپەڕی بەئەندازەی ئەو ڕۆژانەی لەماڵەکەی ئەودا بتیان پەرەستبوو. ئاصف و گەورەکانی منالەکانی ئیسرائیل لەو چل ڕۆژەدا لەفەرمانڕەوایی دوژمنی خوا سەریان سوڕمابوو. ئاصف وتی: ئەی منالەکانی ئیسرائیل، ئایا ئێوەیش وەك من جیاوازیتان لەفەرمانڕەوایی سلێمان کوڕی داوود بینیوە؟

وتیان: بەڵێ.

وتی: ڕێگەم بدەن بڕۆمە لای ژنەکانی و لەوانیش سەبارەت بەجیاوازییەکان پرسیار بکەم. ڕۆشت و بەهاوسەرانی سلێمانی وت: ئایا لەهەڵس و کەوتی کوڕی داوود، هەستتان بەهیچ گۆڕانکاریەك کردووە؟

وتیان: خراپتر لەهەموو شتێك ئەوەی کەتەنانەت لەکاتی نەخۆشی سووڕی مانگانە، چاوپۆشیمان لێ ناکات و دواتریش غوسڵ لەخۆی دەرناکات.

ئاصف انالله ی وت و زیادی کرد: ئەمە بەلاَیەکی گەورەیە. گەڕایەوە بۆ لای منالەکانی ئیسرائیل و وتی: هەڵس و کەوتی ئەو لەگەڵ کەسە نزیکەکانی خۆی خراپتر لەخەڵکانە.

کاتێك چل رۆژەکە تەواو بوو، شەیتان لەتەختەکەی رایکرد و لای دەریا تێپەڕی. ئەنگوستیلەکە کەوتە ناودەریا و ماسییەك قووتیدا. یەکێك لە ڕاوچیانی ماسی، ماسییەکەی بینی و گرتی. سلێمان ئەو رۆژە کاری بۆ ئەو کردبوو. کاتێك شەو داهات، دوو ماسی پێدا کەیەکیان ئەو ماسییە بوو ئەنگوستیلەکەی قووتدابوو. سلێمان دوو ماسییەکەی خۆی برد. یەکیانی بەنان گۆڕیەوە و ماسیەکەی تری پاك کرد تا بیبرژێنێت. ئەنگوستیلەکەی لەسکیدا دەرهێنا و کوڕنوشی برد. باڵندە و جنۆکە و مرۆڤ لەدەوری کۆبوونەوە و خەڵك زانیان ئەنجامی ئەو بەلاَیە بەهۆی رووداوەکەی ناو ماڵەکەی خۆیەوە روویداوە. لەگوناحەکەی خۆی تۆبەی کرد و فەرمانی بەشەیتانەکاندا تا شەیتانی دەریا بێنن. گەڕان و دۆزیانەوە و هێنایان. سلێمان ناوسکی بەردێکی خالَی کرد و شەیتانەکەی لەناو بەردەکەدا جێگە کردەوە. بەبەردێکی دیکە بەستی و بەئاسن و سورب قایمی کرد و فەرمانیدا تا بیخەنە ناو دەریا.

سەدی سەبارەت بە ئایەی و لقد فتنا ی سلێمان دەڵێت: ئەو پەیکەرەی خرایە سەرتەختەکەی سلێمان، شەیتان بوو کە بۆ ماوەی چل رۆژ لەسەر تەختەکەی ئەو دانیشت.

دەڵێت: سلێمان سەد ژنی هەبوو. ناوی یەك لەوان جەرادە بوو کە لەهەموو هاوسەرەکانی، زیاتر خۆشی دەویست و زیاتر لەهەموان لەو نزیك بوو. کاتێك ناپاك بوو یا بۆ سەر ئاو دەڕۆشت، ئەنگوستیلەکەی خۆی دەردەهێنا و بەوی دەسپارد چوونکە جگە لەو باوەڕی بەکەسیتر نەبوو. رۆژێك جەرادە ڕۆشتە لای سلێمان و وتی: براکەی من لەگەڵ فلاَن کەس کێشەی هەیە. دەمەوێت کاتێك هاتە لای تۆ، لەبەرژەوەندی ئەو داوەری بکەیت. سلێمان وتی: ئەو کارە دەکەم. بەلاَم نەیکرد. کاتێك گیرۆدەی تاقیکردنەوە بوو و ئەنگوستیلەکەی بەجەرادە سپارد و ڕۆشتە سەرئاو، شەیتان لەروخساری سلێمان ڕۆشتە لای جەرادە و وتی: ئەنگوستیلەکەم پێبدە. ئەنگوستیلەکەی وەرگرت و ڕۆشتە سەر تەختەکەی سلێمان دانیشت. دوای ئەوە

سلێمان هات و داوای ئەنگوستیلەکەی کرد. جەراد وتی: مەگەر وەرتنەگرت؟

وتی: نە. سلێمان لەشوێنەکەی خۆی سەرگەردان ڕۆشتەدەر.

دەڵێت: شەیتان بۆ ماوەی چل ڕۆژ لەناو خەڵکا داوەری کرد. خەڵکان لەفەرمانەکانی ئەو سەریان سوڕما. قوڕئان خوێن و زاناکانی منداڵەکانی ئیسرائیل کۆبوونەوە و ڕۆشتنە لای هاوسەرانی سلێمان، وتیان: ئێمە لەم کارانە سەرمان سوڕماوە، ئەگەر سلێمان بێت، ئاوزی لەدەستداوە و فەرمان و حوکمەکانی سەرسوڕهێنەرە. ژنان گریان. زاناکان ڕۆشتن و زەق سەیری سلێمانیان کرد و تەوراتیان خوێندەوە. شەیتان لەبەرچاوی ئەوندا فڕی، گەشتە لای پەنجێرەکە و ئەنگوستیلەکەی پێبوو. هەڵفڕی تا گەیشتە دەریا. ئەنگوستیلەکە کەوتە ناو دەریا و یەکێك لەماسیەکان قووتیدا.

سلێمان سەرگەردان ڕۆشت تا گەیشتە یەکێك لەماسیگرانی دەریا. برسی بوو و داوای خواردنی لەماسیگرەکە کرد، وتی: سلێمانم. یەکێك لەماسیگران بەداردەست لێیدا و سەری شکاند. سلێمان لەکەنار دەریا دەستی بەشۆردنی خوێنەکەی خۆی کرد. ماسیگران سەرکۆنەی هاورێکەی خۆیان کرد و وتیان: کارێکی خراپت کرد سەری ئەوت شکاند.

وتی: گومان دەکات سلێمانە.

دەڵێت: دوو ماسیان پێدا. ڕۆشتە کەنار دەریا و سکی ئەوانی هەڵدڕی و دەستی بەشۆردنیان کرد. ئەنگوستیلەکەی خۆی لەناو سکی ماسییەکەدا دۆزییەوە. لەپەنجەی کرد و خواوەند دووبارە شکۆ و مەزنی بۆ گەراندەوە. باڵندەکان لەدەوری ئەو دەستیان بەهەڵفڕین کرد و ماسیگرەکان زانیان ئەو سلێمانە. داوای لێبوڕدنیان لەکارەکەی خۆیان کرد. وتی: نەوەسفی ئەم کارەتان دەکەم و نە بۆ لێدانی خۆم سەرکۆنەتان دەکەم، چوونکە ئەوەی دەبوا، روویدا. بۆ پاشایەتی گەڕایەوە و فەرمانیدا و شەیتانیان هێنا. لەو ڕۆژەوە با و شەیتانەکان دەستەمۆی ئەو کران. پێشتر دەستەمۆ نەبوون. خواوەند لەگێڕانەوەی وتاری ئەو دەفەرمێت:

((وهب لی ملکا لا ینبغی لاحد من بعدی انك انت الوهاب.

واتاکەی: پاشایەتییەك بەمن ببەخشە دوای من کەس نەیبێت چوونکە تۆ بەخشندەیت.))

دەڵێت: کاتێك شەیتانیان هێنا، فەرمانیدا بیخەنە ناو سنوقێکی ئاسنین و بەستیانەوە و قوفڵیان کرد. بەئەنگوستیلەکەی خۆی مۆری لێدا و فەرمانیدا و بیخەنە ناو دەریا. شەیتان بەهەمان شێوە دەمێنێتەوە تا ڕۆژی هەستانەوە بگات. ناوی ئەم شەیتانە حەبقیقە.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: سلێمان لەسەر تەختی پاشایەتی کەخواوەند پێی بەخشیبوو، مایەوە و هەرچی ویست لەمیحراب و پەیکەر و دەفر و قازانە گەورەکان و شتەکانی دیکە، جنۆکەکان بۆیان دروست کرد. شەتانەکانی سزادا و کاتێك سەردەمی مەرگی گەیشت، خواوەند ئەوی بۆ لای خۆی گەڕاندەوە.

داستانی مەرگی سلێمان بەو شێوەیە ولەگێڕانەوەی کوڕی عەباس لەپێغەمبەر(د.خ) ئاماژەی پێدراوە، فەرمووی: سلێمان هەر کاتێك لەنوێژدا بوو، دارێکی لەبەردەم خۆیدا دەبینی و لێی دەپرسی: ناوی تۆ چییە؟

وەڵامی دەبیست، فلاَن و فیسار

دەیوت: بۆ چ کارێك، بۆ ڕواندن تا بتڕوێنن یا بۆ دەوا تا بنوسن؟

ڕۆژێك سەر قاڵی نوێژخوێند بوو، دارێکی لەبەردەم خۆیدا بینی، وتی: ناوی تۆ چییە؟

وتی: خروب.

وتی: چ کەڵکێکت هەیە؟

وەڵامی دایەوە: بۆ وێران کردنی ئەم ماڵە.

سلێمان وتی: خواوەندا، مەرگی من لەجنۆکەکان بشارەوە. مرۆڤەکان بزانن بەلاَم جنۆکەکان نا. لەو دارە داردەستێکی تاشی و ساڵێك دوای مەرگ پشتی پێدەبەست. جنۆکەکان سەرقاڵی کاری خۆیان بوون. مۆرانە داردەستەکەی خوارد و پەیکەری سلێمان کەوت. مرۆڤەکان زانیان. ئەگەر جنۆکەکان شارەزایی غەیب دەبوون، لەئازابە ریسواکەرەی خۆیان رزگاریان دەبوو.

لەکوڕی مەسعود دەگێڕنەوە: سلێمان یەك ساڵ و دوو مانگ یا کەمتر یا زیاتر لەبیت المقدس بەتەنیا دادەنیشت و خواردن و خواردنەوەی لەگەڵ خۆی دەبرد. کاتێك زەمانی مەرگی نزیك بوویەوە، ڕۆشتە بیت المقدس. ڕۆژانە دارێك لەوێ دەڕوا، سلێمان دەڕۆشتە لای دارەکە و دەیپرسی: ناوی تۆ چییە؟ دارەکە وەڵامی دایەوە:

ناوم فلاّنە. سلێمان پرسی: بۆ چ مەبەستێك رواوییت؟ وەلاّمی دایەوە: بۆ فلاّن و فلاّن. دارێك ڕوا بەناوی خروبە و کاتێك پرسی: بۆ چ مەبەستێك رواوییت. وەلاّمی دایەوە: بۆ وێران کردنی ئەم مزگەوتە. سلێمان بەخۆی وت: خواوەند ئەم مزگەوتە لەکاتی ژیانی مندا وێران ناکات. مەرگی من و وێرانی بیت المقدس لەدەستی تۆدایە. دارەکەی هەڵکەند و لەناو باخێکدا ڕواندی. دواتر ڕۆشتە میحراب و بۆ نوێژ وەستا و پشتی بەداردەستێك دەبەست. مرد و شەیتانەکان نەیانزانی و بەهەمان شێوە وەك جاران کاریان بۆ دەکرد. دەترسان لەوەی سلێمان بێتەدەر و سزایان بدات.

دەڵێت: شەیتانەکان لەدەوری میحراب کۆدەبوونەوە. میحرابەکە لەپێش ودواوە کونی تیا بوو. ئەو شەیتانەی دەیویست نموونە بێت دەیوت، لەملاوە دەڕۆم و لەو لا دێمەدەر و چوست و چالاك دەبم. یەکێك لەشەیتانەکان هات و تێپەڕی. ئەگەر شەیتانێك میحرابەکەی سلێمانی دەبینی، ئاگری دەگرت. ئەو شەیتانە تێپەڕی و هیچ دەنگێکی لەسلێمان نەبیست. جارێکی دیکە ڕۆشتە میحرابەکە و نەسووتا. سلێمانی بەمردووی بینی. ڕۆشتەدەر و خەڵکانی لەمردنی سلێمان ئاگادار کردەوە. دەرگایان کردەوە و جەستەی ئەویان هێنایەدەر. بینیان مۆرانە داردەستەکەی خواردووە. نەیانزانی چ ماوەیەك بەسەر مردنەکەی ئەو تێدەپەڕێت. مۆرانەیان لەسەر داردەست دانا بۆ ئەوەی یەك شەو و ڕۆژ لێی بخوات. لەرووی ئەوەوە خەملاّندیان و زانیان کەساڵێك پێشتر مردووە. خەڵك دڵنیا بوون لەوەی جنۆکەکان شارەزایی غەیب نین و ئەگەر غەیبیان دەزانی، دوای مەرگی سلێمان لەسەر کار کردن بەردەوام نەدەبوون.

دەڵێت: دوای ئەوە شەیتانەکان بەمۆرانەیان وت ئەگەر خواردنت خوارد، باشترین خواردن بۆ تۆ ئامادە دەکرا و ئەگەر خواردنەوەت دەویست، باشترینی دەخرایە بەردەستی تۆ بەلاّم تەنیا ئاو و گڵت بۆ دێنێن. مۆرانە لەهەر شوێنێك بێت، ئاو و گڵی بۆ دەبەن. ئەم گڵەی لەناو دارەکان دەیبینن، ئەوەیە شەیتانەکان بۆ سپاس کردنی مۆرانە بۆیان برد.

تەمەنی سلێمان پەنجا و چەند ساڵ بوو. لەچوارەم ساڵی پاشایەتی خۆی بینا کردنی بیت المقدسی دەستپێکرد.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: هەنووکە ئاماژە بەو پاشایە دەدەین کەدوای کەیقوباد پاشا فەرمانڕەوایی هەرێمی بابل و ڕۆژهەلاّتی گرتەدەست.

## دوای کەیقوباد کەیکاوس پاشایەتی گرتەدەست

کەیکاوس کوڕی کیسە کوڕی کەیقوبادە.

دەڵێن: ئەو ڕۆژەی کەیکاوس پاشایەتی گرتەدەست، وتی: خواوەند ئەم زەوییە و بوونەوەرکانی بەئێمە سپارد تا بۆ پەرەستینی ئەو زیاتر هەوڵ بدەین.

ئەو دەستەیەك لەگەورەکان سنوری فەرمانڕەوایەتی خۆی کوشت و وڵات و مسکێنەکانی لەدەستدرێژی دوژمنانی دەوروبەر پاراست.

شوێنی نیشتەجێ بوونی کەیکاوس بەڵخە. کوڕێکی بۆ هاتەدنیا کە لەجوانی و کردار چاکی لەدەورانی خۆی هاوتای نەبوو. ناوینا سیاوەخش. سیاوەخشی بەرۆستەمی دەستان کوڕی برامان سپەهبۆدی (سوپاداری) سیستان و دەوروبەری سپارد تا پەروەردە کردنی ئەو بگرێتە ئەستۆ. ڕۆستەم، سیاوەخشی بردە سیستان و پەروەردەی کرد. سیاوەخش لای ڕۆستەم مایەوە. تا منالٚ بوو، پەرەستار و دایەنی لەدەوری کۆکردەوە و کاتێك گەورە بوو و گەشەی کرد، مامۆستاکانی بۆ پەروەردە کردنی ئەو هەڵبژارد و کاتێك توانای سوارکاری دەستکەوت، فێری سوارکاری کرد تا ئەوەی لەهەموو زانستەکان شارەزا بوو. پیاوێکی تەواو بوو کاتێك بردییە لای باوکی. کەیکاوس کوڕەکەی تاقیکردەوە و ئەوی بەشیاو و شارەزا بینی و ڕەزامەندی خۆی نیشاندا.وەك دەڵێن: کەیکاوس کچی فراسیات پاشای تورکەکانی کردبووە هاوسەری خۆی و بەوتەیەك ئەو ژنە کچی پاشای یەمەن بوو بەناوی سودابە. جادووگەر و خۆشەویستی سیاوەخش کەوتە دڵیەوە. داوای نزیك بوونەوەی لێکرد بەڵام سیاوەخش ڕازی نەبوو. بەسەرهاتی ئەو و سیاوەخش دووروودرێژە. سەرئەنجام، کاتێك سودابە بینی سیاوەخش ڕازی نابێت، دڵی باوکی لێ ڕەش کرد. سیاوەخش داوای لەڕۆستەم کرد داوا لەکەیکاوس بکات بۆ شەڕی فراسیات ڕەوانەی بکات لەبەر ئەوەی پاشای تورکان کاتێك کچێکی کردبووە هاوسەری کەیکاوس، ڕێزی لەبەڵێنەکانی خۆی نەگرتبوو. سیاوەخش دەیوست لەباوکی دوور بکەوێتەوە بۆ ئەوەی لەزیانی سودابە بەدوور بێت.

ڕۆستەم ئەو کارەی کرد و مۆڵەتی لەکەیکاوس وەرگرت. کەیکاوس سوپایەکی

گەورەی کردە هاوڕێی سیاوەخش. سیاوەخش بۆ شەڕ لەدیاری تورکەکان بەڕێکەوت و کاتێك گەیشت، لەنێوان ئەو و فراسیات ئاشتی سەقامگیر کرا. سیاوەخش باوکی لەڕوداوەکان ئاگادار کردەوە.

باوك فەرمانی پێدا و بۆی نوسی ئەگەر فراسیات ڕێزی لەبەڵێنەکانی خۆی نەگرت، شەڕی لەگەڵ بکات. سیاوەخش وتی شەڕ کردن لەگەڵ فراسیات دوای ئەو ئاشتییەی لەنێوانیاندا سەقامگیر بووە، کارێکی ناپەسەندە. فەرمانی باوکی ئەنجامنەدا و زانی ئەم فەرمانە لەپیلانگێڕی سودابەوە سەرچاوە دەگرێت. نامەی بۆ فراسیات نوسی و داوای ئەمانی لێکرد تا بڕواتە لای و باوکی بەجێبێڵێت. فراسیات ڕازی بوو. ئەو کەسەی لەنێوان ئەوان هاتوچۆی دەکرد یەکێك لەگەورەکانی تورك بوو بەناوی فیران کوڕی ویسغان.

کاتێك سیاوەخش ئەم کارەی کرد، سوپاییەکان ئەویان بەجێهێشت و بۆ لای کەیکاوس گەڕانەوە. کاتێك سیاوەخش گەیشتە لای فراسیات، ڕێزی لێگرت و کچی خۆی بەناوی وەسەفافەریدی کردە هاوسەری سیاوەخش. ئەو دایکی کەیخوسرەونەیە. فراسیات ڕێزی لەسیاوەخش گرت و کاتێك ئەدەب و جوامێری و ئازایەتی ئەوی بینی، لەپاشایەتی خۆی ترسا. گومانی خراپی کرد و دوو کوڕەکەی فراسیات و براکەی بەناوی کیدەر کوڕی فشەنگان گومان و دڵ ڕەشی ئەویان زیاد کرد. ڕژدیان بەسیاوەخش دەبرد و لەپاشایەتی خۆیان دەترسان. فراسیات مۆڵەتی کوشتنی سیاوەخشی پێدان. ئەم داستانە دوور ودرێژە. سیاوەخشیان کوشت و ئەندامەکانیان بڕییەوە. هاوسەری سیاوەخش بەکەیخوسرونە دووگیان بوو. هەوڵیاندا تا منداڵەکەی لەبار ببەن، بەڵام نەکرا.

کاتێك فیران کەئاشتی نێوان سیاوەخش و فراسیاتی سەقامگیر کرد، لەمەرگی ئەو ئاگادار بوویەوە، ئەم کارەی فراسیاتی پەسەند نەکرد و ئەوی لەسەرئەنجامی خیانەتەکەی ترساند. لەتۆڵە سەندنەوەی کەیکاوس و ڕۆستەم ئاگاداری کردەوە. داوای لەفراسیات کرد وەسفافەرید بەو بسپێرێت تا ئەو کاتەی منداڵەکەی دەبێت، بیکوژێت و فراسیات ئەو کارەی کرد.

کاتێك وەسفافەرید، منداڵەکەی هێنایە دونیا، فیران بەزەیی بەخۆی و منداڵەکەیدا

هاتەوە و لەکوشتنی ئەو چاوپۆشی کرد. ئەم کارەی بەنهێنی هێشتەوە تا ئەوەی کوڕەکە گەیشتە تەمەنی بلۆق. وەك وتوویانە کەیکاوس ((بی)) کوڕی گودەرزی بۆ دیاری تورکان ڕەوانە کرد تا بەدوای منداڵەکەی سیاوەخشدا بگەڕێت و هاوڕێ لەگەڵ دایکی، بۆ لای کەیکاوسیان ببات. بی هات و ماوەیەك بەنهێنی بەدوای منداڵەکەدا گەڕا بەڵام کەس لەشوێن و جێگەی منداڵەکە ئاگاداری نەکردەوە. سەرئەنجام ئەوانی دۆزییەوە و هاوڕێ لەگەڵ دایکی ئەوانی بۆ سەرزەمینی کەیکاوس برد.

دەڵێن: کاتێك کەیکاوس لەمەرگی کوڕەکەی ئاگادار بوویەوە، دەستەیەك لەسالارەکانی خۆی و لەناو ئەوان ڕۆستەمی دەستان و توس کوڕی نوزەران کەئازا و بوێری شەڕکەران بوون، ڕەوانەی کردن. ژمارەیەکی زۆریان لەخەڵکانی تورك کوشت و ئەسیریان گرت و چەندین شەڕی دووروودرێژیان لەگەڵ فراسیات دەستپێکرد. ڕۆستەم، شەهر و شەهرە، دوو کوڕەکەی فراسیاتی بەدەستی خۆی کوشت و توس، کیدەری برای فراسیاتی کوشت.

دەڵێن: شەیتانەکان ملکەچی کەیکاوس بون و بەگومانی زاناکۆنەکان، شەیتانەکان بەفەرمانی سلێمان کوڕی داوود کاروبارەکانی ئەویان ڕادەپەڕاند. کەیکاوس فەرمانیدا و شارێکیان بۆ دروست کرد. ناوی نا کیدەر و بەوتەیەك قیقدور. درێژی شارەکە وەك وتوویانە هەشتسەد فەرسەخ بوو. فەرمانیدا تا دیوارێك لەسورب و دویارێك لەمس و دیوارێك لەسواڵەت و دیوارێك لەزیو و دیوارێك لەزێر بەدەوری شارەکەدا دروست بکەن. شەیتانەکان شارەکەیان بەهەموو چوارپێ و خەزێنە و ماڵ و خەڵکەکانی لەنێوان ئاسمان و زەوی بەرز دەکردەوە.

وەك دەڵێن کەیکاوس دەیخوارد و دەیخواردەوە بەڵام نەدەڕۆشتە سەرئاو.

دواتر خواوەند کەسێکی ڕەوانە کرد تا شارەکەی کەیکاوس وێران بکات. کەیکاوس فەرمانی بەشەیتانەکانی خۆیدا تا ڕێگە لەو کەسە بگرن کەمەبەستی وێران کردنی شارەکەی بوو، بەڵام نەیانتوانی. کەیکاوس کاتێك بینی شەیتانەکان توانای خۆڕاگریان نییە، گەورەکانی ئەوانی کوشت.

کەیکاوس بەردەوام سەرکەوتوو بوو. ڕووبەڕووی هەر پاشایەك بوویەوە،

سەرکەوتنی بەدەست هێنا. بەمشێوەبوو تا ئەو کاتەی مەبەستی ئەوەی کرد بۆ ئاسمان بڕوات.

لەهوشام کوڕی محەممەدی کەلبی دەگێڕنەوە: کەیکاوس لەخوراسانەوە هاتە بابل و وتی دەستم بەسەر هەموو زەمیندا گرتووە و دەبێت کاری ئاسمان و ئەستێرەکانیش بزانم. خواوەند هێزێکی پێبەخشی کە لەگەڵ کەسەکانی خۆی لەهەوادا بەرز بوونەوە تاگەشتنە هەورەکان. ئەوسا خواوەند هێزەکەی لەوان سەندەوە و کەوتنە خوار و هەموویان لەناوچوون. کەیکاوس رزگاری بوو، ئەو رۆژە رۆشتە سەرئاو و پاشایەتییەکەی بەرەو رووخان ڕۆشت. زەوی بڵاوەی لێکرد وژمارەی پاشاکان زیادی کرد. روبەرووی هەر پاشایەك دەبوویەوە، هەندێ کات سەرکەوتنی بەدەست دەهێنا و هەندێك کات شکستی دەخوارد.

دەڵێت: کەیکاوس بەمەبەستی شەڕ روویکردە دیاری یەمەن. لەو کاتەدا پاشای یەمەن زو الازەعار کوڕی ئەبرەهە زوئەلمەنار کوڕی رائیش بوو. کاتێك گەیشتە یەمەن، زوالازەعار رووبەرووی بوویەوە. ئەو ئیفلیج بوو. پێشتر هیچ کات بەمەبەستی شەڕ کردن نەدەڕۆشتەدەر. کاتێك کەیکاوس و سوپاکەی بەمەبەستی شەڕ روویان لەسەرزەمینەکەی کرد، لەگەڵ حەمیر و نەوەکانی قەحتان بەرێکەوت و رووبەروی کەیکاوس بوویەوە و سەرکەوتنی بەدەستهێنا و کەیکاوسی ئەسیر کرد. ئوردوی سوپاکەی تالان و کەیکاوسی خستە ناو چاڵێك و سەرەکەی نایەوە.

دەڵێت: پیاوێك بەناوی رۆستەم، کەبوێر و ئازا بوو، لەگەڵ هاورێکانی خۆی لەسیستانەوە هات و بەگومانی فارسەکان سەرزەمینی یەمەنیان بڕی و کەبوس یان کەهەمان کەیکاوسە، لەزیندان رزگار کرد.

دەڵێت: بەگومانی خەڵکانی یەمەن، کاتێك زوالازەعار لەهاتنی رۆستەم ئاگادار بوویەوە، هاورێ لەگەڵ سوپاکەی رووبەروی بوویەوە. هەردوولا لەدەوری خۆیان خەندەکیان هەڵکەند چوونکە لە لەناوچونی سوپاکەیان نیگەران بوون. دەترسان ئەگەر هێرش بکەنە سەریەك، کەس نەمێنێتەوە لەبەر ئەوە ئاشتیان کرد بەو مەرجەی کەیکاوس بەرۆستەم بسپێرن و شەڕ هەڵنەگیرسێت.

رۆستەم، کەیکاوسی بردە بابل. کەیکاوس رۆستەمی لەبەندایەتی پاشا ئازاد

کرد و سیستان و زابولستانی پێبەخشی. کلاوێکی بەزێرچنراوی پێدا و تاجی کردەسەر تا لەسەر تەختێك لەزیو دانیشێت کەپایەکانی زێڕ بێت. تا مەرگی کەیکاوس و ماوەیەك دواتریش، ئەو ویلایەتانە لەدەستی ڕۆستەمدا بوو.

دەڵێت: پاشایەتی کەیکاوس سەد و پەنجا ساڵی خایاند.

بەگومانی زانا فارسەکان یەکەم کەس کە لەپرسەدا جلی ڕەشی پۆشی، شادوس کوڕی گودەرز بوو کە لەپرسەی سیاوەخش سەراپا ڕەشی پۆشی. ئەمە لەکاتێکدا بوو هەواڵی مەرگی سیاوەخش بەکەیکاوس گەیشت. شادوس ڕەشی پۆشی و ڕۆشتە لای پاشا و وتی: ئەو کارەی کردووە چوونکە ڕۆژێکی ڕەش و تاریکە.

حەسەن کوڕی هانی لەهۆنراوەکەی خۆی سەبارەت بەوتاری کوڕی کەلبی لەبارەی ئەسیر کرانی کەیکاوس، قسەکانی پشت ڕاست دەکاتەوە لەو شوێنەی دەڵێت: کاووس بۆ ماوەی حەوت ساڵ لەزنجیری ئێمەدا بوو.

## دوای ئەو کە یخوسرەو کوڕی سیاوەخش پاشایەتی گرتە دەست

کاتێك بی کوڕی گودەرز کەیخوسرەوی لەدیاری تورکەوە هێنا، کەیکاوس پاشایەتی پێبەخشی. کاتێك پاشایەتی گرتەدەست، تاجی لەسەرنا و وتارێکی پاراوی بۆ مسکێنەکان خوێندەوە و وتی کەتۆڵەی خوێنی باوکی لەفراسیات وەردەگرێت. دواتر فەرمانی بۆ گودەرز سوپاسالاری ئیسفەهان و ناوچەکانی دەوروبەری نوسی، بڕواتە لای. کاتێك هات، مەبەستی تۆڵەسەندنەوەی لەگەڵ باس کرد. فەرمانی پێدا سی هەزار پیاوی شەڕکەر لەناو سوپاکەی خۆی هەڵبژێرێت و پەیوەستی توس کوڕی نەوزەرانی بکات تا بەرەو دیاری تورکەکان بەرێکەوێت. گودەرز ئەو کارەی کرد و هەڵبژاردەی سوپاکەی پەیوەستی توس بوون. لەناو ئەو کەسانەی پەیوەستی توس بوون، برزافرە کوڕی کەیکاوس مامی کەیخوسرەو و (بی) کوڕی گودەرز و زۆر لەبراکانی ئەو دەبینران. کەیخوسرەو بەتوسی وت مەبەستی کوشتنی فراسیات و تەرخانەکانی ئەو بکات و لەو ناوچە لەسەرزەمینی

تورکان کەبراکەی فروز کوڕی سیاوەخش، لەوێیە، تێنەپەڕێت. فروز لەژنێك بەناوی بەرزئافەرید، لەدایك بوو کەسیاوەخش لەکاتی ڕۆشتن بۆ لای فراسیات لەیەکێك لەشارەکانی تورك لەکاتی دووگیاتی ژنەکە ئەوی بەجێهێشتبوو.

دەڵێن: توس سەرپێچی ئەم فەرمانەی کرد و کاتێك لەشارەکەی ئەو تێپەڕی، بەهۆکارێکی نەزانراو شەڕ لەناو ئەوان دەستی پێکرد و فرود کوژرا. کاتێك کەیخوسرەو ئاگادار بوویەوە، نامەی بۆ مامەکەی خۆی یانی بەرزئافرە نوسی و هەواڵی سەرپێچی کردنی توس کوڕی نوزەران و کوژرانی فرودی پێدا و فەرمانیدا توس زیندانی و ڕەوانەی دەربار و خۆی سوپا بەرەو شوێنی مەبەست پێشڕەوی پێ بکات. کاتێك نامەکە بەبەرزئافرە گەیشت، گەورەکانی سوپای کۆکردەوە و نامەکەی بۆ خوێندنەوە و فەرمانی گرتنی توسی دەرکرد و لەگەڵ نێردراوە باوەڕپێکراوەکانی خۆی بۆ دەرباری کەیخوسرەوی ڕەوانە کرد. کاروباری سوپای گرتەدەست و لەرووباری ناوداری کاسرود پەڕییەوە. ئەم هەواڵە بەئەفراسیاب گەیشت و دەستەیەك لەبراکان و تەرخانەکانی خۆی بۆ شەڕی بەرزئافرە ڕەوانە کرد. لەشوێنێك بەناوی واش لەسەرزەمینی تورکان، دوو سوپاکە ڕووبەڕووی یەك بوونەوە.

فیران کوڕی ویسغان و براکانی وەتراسف کوڕی گودەرز زاوای فراسیات و هەماسف کوڕی فشەنگان لەناو سوپاکەدا بوون. شەڕێکی قورسیان کرد و بەرزئافرە کاتێك قورسی شەڕەکە و زۆری کوژراوانی بینی، لاواز بوو و ئالأی بۆ سەر کێوە برد و کاری براکانی گودەرز پەرێشان و لەیەك ڕۆژدا حەفتا کەس لەوان کوژرا. لەهەر دوو سوپا ژمارەیەکی زۆر کوژران. بەرزئافرە لەگەڵ هاوەڵانی بۆ لای کەیخوسرەو گەڕانەوە. خەم و خەفەتیان بەرادەیەك گەورە بوو هەموویان ئارەزووی مەرگیان دەکرد. ترسیان لەتوڕە بوونی کەیخوسرەو زیاتر بوو.

کاتێك گەیشتنە لای کەیخوسرەو، سەرکۆنەی بەرزئافرەی کرد و وتی: بۆیە شکستتان خوارد چوونکە فەرمانەکانی منتان جێبەجێ نەکرد و دژایەتی کردنی فەرمانی پاشاکان، ئەنجامی خراپی لێدەکەوێتەوە و پەشیمانی بەدواوە دێت. ڕوداوەکەی ئەوان بەرادەیەك کاریگەری لەسەر کەیخوسرەو دانا کەروخساری ڕەش

هەڵگرا و خواردن و خەوتنی لێ حەرام بوو.

دوای چەند ڕۆژێك لەگەڕانەوەیان کەسی بەدوای گودەرزدا ڕەوانە کرد. کاتێك هات، هاوخەمی خۆی بۆ دەربڕی. گودەرز سکاڵای لەبەرزنافرە کرد و وتی هۆکاری شکستی ئێمە، ئەو بووە. کەیخوسرەو وتی: تۆ خزمەتت بەباوکانی ئێمە کردووە و سوپا و خەزێنەی ئێمە بۆ تۆڵە سەندنەوە لەخزمەتی تۆدایە. فەرمانی پێدا بۆ شەڕ لەگەڵ فراسیات و کوشتن و وێران کردنی دیاری تورکەکان ئامادە بێت.

گودەرز کاتێك وتەکانی کەیخوسرەوی بیست، هەستا و دەستی ماچ کرد، وتی: ئەی پاشای بەختەوەر! ئێمە بەندە و مسکێنی تۆین. زیان و بەڵا باشترە بەسەر بەندەکانا ببارێت تا پاشاکان. کوڕە کوژراوەکانی من قوربانی تۆبن. ئێمە تۆڵە لەفراسیات دەستێنینەوە و دیاری تورکەکان وێران دەکەین. پاشا، لەوەی لەدەستمان ڕۆشتووە، خەمبار نەبێت و لەخۆش گوزەرانی دوور نەکەوێتەوە چوونکە شەڕ سەروژێری هەیە. ڕایگەیاند فەرمانەکانی بەکار دەبات و ڕەزامەند، دەرباری کەیخوسرەوی بەجێهێشت.

ڕۆژی دواتر، کەیخوسرەو فەرمانیدا تا سەرانی سوپا و گەورەکانی وڵات کۆببنەوە. کاتێك کۆبونەوە، وتی مەبەستی شەڕ لەگەڵ تورکەکانی هەیە و بۆ لێپرسراوانی خۆی لەهەموو ناوچەکان نامەی نوسی تا لەکاتی دیاریکراو لەسارای شا ئەستونی بەڵخ کۆببنەوە.

سەرکردەکانی سوپا لەوێ کۆبونەوە و کەیخوسرەو لەگەڵ سوپاسالارەکان و هاوەڵانی ئەوان و بەرزنافرە و بنەماڵەی خۆی و گودەرز و کوڕەکانی بەرەو ئەوێ بەڕێکەوت و کاتێك سوپاکە ئامادە و سنوردارەکان کۆبونەوە، کەیخوسرەو، بەناو سوپاکەدا گەڕا تا ئەندازە و ژمارەیان بزانێت و لەکاروباریان ئاگادار ببێتەوە. گودەرز کوڕی کشوادگان و میلاد کوڕی گورگین و ئەغس کوڕی کەنیزی (ناوی شوماهان بوو)) سیاوەخشی بانگ کرد و وتی مەبەستی ئەوەی هەیە لەچوار قۆڵەوە سوپا ڕەوانە بکات تا لەدەریا و وشکانییەوە گەمارۆ بخەنە سەر وڵاتی تورکەکان. سالاری سوپا بەگودەرز دەدات و زۆربەی سوپاکە لەگەڵ ئەودا دەبێت کە لەناوچەی خوراسانەوە دەڕوات. بەرزنافرە و بی کوڕی گودەرزی پەیوەستی ئەو کرد و ئاڵای

گەورەی بەو سپارد کە بەئاڵای کابیان ناسراوە.

دەڵێن: پێشتر هیچ کام لەپاشاکان ئەم ئاڵایەی بەهیچ سەردارێك نەداوە و تەنیا لەکارە گەورەکان بەشازادەکانیان سپاردووە.

بەمیلادی وت لەلای چینەوە بەرێکەوت و دەستەیەك لەسەرانی گودەرزی پەیوەستی سوپاکەی میلادی کرد. دەستەیەکی هاوشێوەی دەستەی میلاد کردە هاورێی ئەغس و فەرمانی پێدا لەناوچەی خەزەرەوە بەرێکەوێت. براکان و کوڕە مامەکانی خۆی لەگەڵ سی هەزار سوپایی پەیوەستی سوپاکەی شوماهان کرد و وتی لەشوێنێك لەنێوان رێگەی گودەرز و میلاد بەرێکەوێت.

دەڵێن: کەیخوسرەو شوماهانی بۆ شەڕ رەوانە کرد لەبەر ئەوەی لەسیاوەخشەوە نزیك و نەزری کردبوو تۆڵەی ئەو بستێنێتەوە.

هەموو سەرکردەکان بەرێگەی خۆیاندا ڕۆشتن. گودەرز لەناوچەی خوراسانەوە ڕۆشتە ناو سەرزەمینی تورکان و لەفیران کوڕی ویسغانەوە دەستیپێکرد. شەڕێکی قورس لەنێوان ئەواندا روویدا کە لەناویدا بیژەن کوڕی بی خمان کوڕی ویسغان لەشەڕی دەستەویەخەدا کوژرا. گودەرز فیرانی کوشت. دوای ئەوان مەبەستی فراسیاتی کرد و سێ سوپا هەرکام لەقوڵێکەوە هێرشیان برد. کەیخوسرەو لەرێگەی گودەرزەوە بەدوای سوپاکەدا بەرێکەوت و کاتێك بەسوپاکەی گودەرز گەیشت کەزۆر لەسەرکردەکانی تورك و لەناو ئەوان فیران سەرسوپاسالاری فراسیات کەپاڵێواری یەکەمی جێگری ئەو بوو، لەگەڵ دەستەیەك لەبراکانی فیران وەك خمان و ئەوستهن و گوڵباد و سیامەك و بەهرام و فەرشخاز و فەرخلاد لەگەڵ کوڕەکەی روبن و دەستەیەك لەبراکانی فراسیات وەك زیدرای و ئەندرمان و ئێسفەخرم و ئەخست، کوژرا بوون. بروا کوڕی فشەنگان بکوژی سیاوەخش بەئەسیری گیرابوو.

گودەرز کوژراوان و ئەسیر و تاڵانییەکانی بژارد. سی هەزار ئێستری دەستکەوتبوو. پێنسەد و شەست و چەند هەزار کەس کوژرا بوون. ژمارەی ئەسپ و زیو و سامانەکان بێ ئەژمار بوو. بەهەموو سەرکردەکانی خۆی وت تا ئەسیر و کوژراوەکانی خۆیان لەژێر ئاڵای خۆیان کۆبکەنەوە تا کاتێك کەیخوسرەو دێت،

ببینێت. کاتێك کەیخوسرەو گەیشت، پیاوان ریزیان بەست و گودەرز و سوپاسالارەکانی دیکە پێشوازیان لێکرد. کاتێك ڕۆشتە ناو ئوردووگاکە، یەك یەك ئالآکانی بینی. یەکەم جەستەی کەبینی، جەستەی فیران بوو کە لەژێر ئالآکەی گودەرز دانرا بوو. کاتێك سەیری کرد، وەستا و وتی: ئەی کێوی بەرز و لوتکەی دوورەدەست! مەگەر نەموت بەشداری ئەم شەڕە نەکەیت و دژی فراسیات و لایەنگری ئێمە بیت، مەگەر گیانی خۆم بەتۆ نەبەخشی و پاشایەتی خۆم پێشکەش بەتۆ نەکرد، بەڵام هەڵبژاردنەکەت ناڕاست بوو. مەگەر تۆی راستگۆ، بەرگریکاری براکان و رازداری ئەوان نەبوویت. مەگەر تۆم لەفرت و فێڵ و بێ وەفایی فراسیات ئاگادار نەکردەوە. بەڵام گوێت لەوتەکانم نەگرت و ئاناگا بوویت تا شێرە شەڕکەرەکان لەتۆ نزیك کەوتنەوە. فراسیات بارودۆخێکی بۆ دروست کردیت و لەدنیا کۆچت کرد و بنەماڵەی ویسغانت لەناو برد. هاوار لەئاوز و بیری تۆ. هاوار لەراستگۆیی و جوامێری تۆ کەئێستا خەمی بۆ دەخۆین.

کەیخوسرەو بەهەمان شێوە وەسفی فیرانی دەکرد تا گەیشتە ژێر ئالآکەی بی کوڕی گودەرز. کاتێك وەستا و سەڕی بڕوا کوڕی فشەنگانی بینی کە بەدەستی بی ئەسیر کرابوو، سەبارەت بەو پرسیاری کرد. وتیان: ئەو بکوژی سیاوەخشە و لەکاتی کوشتن ئەندامەکانی ئەوی بڕییەوە. کەیخوسرەو لێی نزیك کەوتەوە و بۆ سپاس کردنی خواوەند سەری دانەواند و وتی: بڕوا، سپاس بۆ خوا کەوتیتە بەردەستی من، تۆ بوویت سیاوەخشت کوشت و ئەندامەکانی ئەوت بڕی. تۆ بوویت جوانیت لەو سەندەوە و لەناو تورکەکان کوشتنی ئەوت گرتە ئەستۆ و بەم کارە قێزەونی خۆت داری دوژمنیت ڕواند و ئەم شەڕەت هەڵگیرساند. تۆ بوویت کەروخساری ئەوت گۆڕی و هێزت لەو سەندەوە. ئەی تورك، بۆ لەجوانی و گەورەیی ئەو نەترسایت و بۆ لەبەر نووری روخساری، رزگارت نەکرد. ئازایەتی و بوێری تۆ چی بەسەر هات. بۆ برا جادووگەرەکەت هاوکاریت ناکات. ئاتکوژم لەبەر ئەوەی سیاوەخشت کوشتووە بەڵکو بۆیە دەتکوژم چوونکە کارێك کرد نەدەبوا بکرێت. بکوژی سیاوەخش لەبەر یاخیگەری و خیانەت دەکوژم.

فەرمانیدا تا ئەندامەکانی ببڕنەوە و دواتر بیکوژن. بی، ئەو کارەی کرد.

کەیخوسرەو لەژێر ئەم ئالاّ بۆ ئەو ئالاّ و لای ئەم سوپاسالار بۆ لای سوپاسالارێکی دیکە دەڕۆشت و لای هەرکام هاوشێوەی ئەوانی دیکە وتەی دەهێنایە سەرزمان تا گەیشتە شوێنەکەی خۆی. کاتێك ئارامی گرت، داوای بەرزئافرەی مامی کرد. کاتێك هات ئەوی لای دەستی راستی دانیشاند و لەوەی گوڵباد کوڕی ویسغانی لەشەڕی دەستەویەخەدا کوشتبوو، رەزامەندی خۆی نیشاندا و خەلاّتی کرد. فەرمانڕەوایی کرمان و مەکران ودەوربەری بەبەرزئافرە سپارد.

ئەوسا گودەرزی بانگ کرد. کاتێك هات، وتی: ئەی سوپاسالاری بوێر، ئەم سەرکەوتنە لەخواوە بوو نەك لەچارەسەر و هێزی ئێمە. تۆ خزمەتی ئێمەت کرد و گیایینی خۆت و منالّەکانت لەرێگەی ئێمەدا بەخشی. ئەمەمان لەبیر دەبێت. ئێستا تۆ بۆ پلەو پێگەی ((بۆزۆرگ فەرمەزارا)) وەزارەت بەرز دەکەینەوە و ئێسفەهان و گورگان و کوێستانەکان بەتۆ دەبەخشین. پارێزگاری لەخەڵکەکەیان بکە.

گودەرز سپاسی کرد و رەزامەند لای کەیخوسرەو گەڕایەوە. دواتر فەرمانیدا سوپاسالارە گەورەکانی هاورێی گودەرز کەبۆ شەڕ و کوشتنی تەرخانە گەورەکان و منالّەکانی فشەنگان و ویسغان تێکۆشابوون کۆبکەنەوە وەك گورگین و کوڕی میلادان و بی شادوك و لەخام و گەدمیر کوڕی گودەرز و بیژەن و برازە کوڕی بیفغان و فرەوزە کوڕی فامدان و زیندە کوڕی شابریغان و بەستام کوڕی کەژدهەمان و فرتە کوڕی تەفارغان. کاتێك کۆبونەوە، فەرمانڕەوای بەشێك لەویلایەتەکانی بەدەستەیەکیان سپارد و ئەوانی دیکەی بۆ پلە وپێگەی خزمەت کردنی شایانە بەرز کردەوە.

زۆری نەخایاند نامەکانی میلاد و ئەغس و شوماهان یەك لەدوای یەك گەیشتن کە هەوالّی کوشتاری تورکەکان و شکستی سوپاکەی فراسیاتیان تیا نووسرا بوو. فەرمانی پێدان لەشەڕ کردن دژی تورکەکان تێبکۆشن و لەشوێنێك کە لەسەرزەمینی تورکەکان دیاری کرد، پەیوەستی ببن.

دەڵێن: کاتێك چوارسوپا گەمارۆیان خستە سەر فراسیات و کوشتاریان کرد و ئەسیریان گرت و وێرانیان دروست و کاروبارەکانیان لەو دژوار کرد و لەمنالّەکانی جگە لەشیدە کەس نەمایەوە. جادووگەر بوو، ئەوی لەگەڵ سوپا و کەرەستەکانی

شەڕ بۆ لای کەیخوسرەو ڕەوانە کرد. کاتێك نزیك کەوتەوە، کەیخوسرەو زانی ئەوی بۆ فرت و فێڵ ڕەوانە کردووە. سوپاسالارەکانی خۆی کردەوە و ئاگاداری کردنەوە تا ئاگایان لەبارودۆخ بێت.

دەڵێن: کەیخوسرەو ترسی شیدە کەوتە دڵیەوە و ترسا. گومانی کرد توانای خۆراگری لەبەرابەری ئەوی نییە. چوار ڕۆژ شەڕ بەردەوام بوو. یەکێك لەکەسە تایبەتەکانی کەیخوسرەو بەناوی گورد کوڕی گورهەمان سوپاکەی کەیخوسرەوی ڕازاندەوە. کوشتار لەهەر دوولا فراوان بوو. پیاوانی خەنارس بەگیان هەوڵیان دەدا و شیدە دڵنیا بوو ناتوانێت خۆڕاگری بکات و هەڵات. کەیخوسرەو و سوپاکەی شوێنی کەوتن. گورد پێی گەیشت و بەگورزێك لێیدا وکوشتی. کەیخوسرەو لەسەر جەستەکەی وەستا و بەزبر و تورەی بینی. کەل و پەلەکانی تورکان تالآن کرا.

فراسیات ئاگاداری بوویەوە و لەگەڵ هەموو تەخانەکانی خۆی بەرێکەوت و کاتێك ڕووبەڕووی کەیخوسرەو بوویەوە، شەرێکی قورس دەستی پێکرد کەهاوشێوەی نەبینراوە. پیاوانی خەنارس ڕووبەڕووی تورکەکان بوونەوە و شەڕ درێژەی کێشا. خوێن هەموو شوێنێکی گرتەوە. گوردەرز و کوڕەکانی و گورگین و گورد و بەستام ئەسیری زۆریان گرت. فراسیات ئەوانی بینی وەك شێر بەرگری لەکەیخوسرەو دەکەن، لەبەر ئەمە هەڵات. کوژراوەکانیان بژاد کەژمارەیان سەد هەزار کەس بوو.

کەیخوسرەو و هاوەڵانی شوێن فراسیات کەوتن و ئەو بەردەوام لەویلایەتێك بۆ ویلایەتێکی دیکە هەڵدەهات تا گەیشتە ئازەربایەجان و لەچاڵی خاسف خۆی شاردەوە.

ئەویان گرت و کاتێك بردیانە لای کەیخوسرەو، کوت و بەندی ئاسنینی کردە دەست و پێی. سێ ڕۆژ حەوایەوە و ئەوسا داوای فراسیاتی کرد و لەهۆکاری کوشتنی سیاوەخشی باوکی پرسی. هیچ بەڵگەیەکی نەبوو. فەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکرد و کوشتیان. بی کوڕی گودەرز هەستا و سەری بڕی بەهەمان شێوە کەسەری سیاوەخشی بڕیبوو. خوێنی ئەوی بردە لای کەیخوسرەو، دەستی کردە خوێنەکە و وتی: ئەمە لەتۆڵەی سیاوەخش و ئەو ستەمی لەوتان کرد. کەیخوسرەو سەرکەوتوو و ڕەزامەند هاوڕێ لەگەڵ تالآنییەکی زۆر لەئازەربایەجان گەڕایەوە.

دەڵێن: چەند کەسێك لەمناڵەکانی کییە باوەگەورێی گەورەی کەیخوسرەو و مناڵەکانیان لەشەڕی تورکەکان هاورێیەتی ئەویان کرد وەك کەی ئەرش کوڕی کییە شای خوزستان و ناوچەکانی بابل و دەوروبەری و کەی بەئەرش شای کرمان و دەوروبەری وکەی ئوجی کوڕی کیمنوش کوڕی کیفاشین کوڕی کیسە شای فارس. کەی ئوجی باوکی کەی لوهراسپی پاشایە.

دەڵێن: یەکێك لەبراکانی فراسیات بەناوی کش شراسف دوای ئەوەی کەیخوسرەو براکەی ئەوی کوشت بەرەو دیاری تورکان بەرێکەوت و دەستی بەسەر تاج و تەختی براکەیدا گرت. کوڕێکی بوو بەناوی خرزاسف کەدوای باوك پاشایەتی تورکەکانی گرتەدەست. پیاوێکی ستەمکار و خوێنرێژ بوو. ئەم برازایەی فراسیات بوو لەگەڵ مەنوچێهر و گودەرز شەڕی کرد. گودەرز کوڕی کشوادگان کوڕی دەسحرە کوڕی فەرحین کوڕی حسر کوڕی رسود کوڕی ئورەب کوڕی داح کوڕی ریسك کوڕی ئەرس کوڕی وندنگ کوڕی رەعر کوڕی بودراحا کوڕی مسواگ کوڕی نەوزەر کوڕی مەنوچێهر بوو.

کاتێك کەیخوسرەو تۆڵەی خوێنی باوکی وەرگرتەوە و لەسەرزەمینەکەی خۆی ئارامی گرت، چیتر ئارەزوومەندی کاروباری پاشایەتی نەبوو. خۆی بەخواپەرەستیەوە سەرقاڵ کرد. بەگەورەکانی بنەماڵە و وڵاتەکەی راگەیاند کەدەیەوێت دەست لەکار بکێشێتەوە. ئەوان ترسان و پاڕانەوە و داوایان لێکرد وەك پاشا بمێنێتەوە. بەڵام قسەکانیان ئەنجامی نەبوو. کاتێك بێ هیوا بوون، وتیان ئێستا کە بۆ دەست لەکار کێشانەوە پێداگری دەکەیت، یەکێك وەك پاشا بناسێنە تا وەك پاشای خۆمان بیناسین. لەهراسف ئامادە بوو, کەیخوسرەو بەدەست ئەوی نیشاندا و وتی جێگر و میرات هەڵگری منە. لەهراسف رازی بوو. خەڵکان ئەویان وەك پاشای خۆیان ناسی و کەیخوسرەو لەبەر چاوان ونبوو. دەستەیەك وتوویانە خەڵوەتی هەڵبژارد و کەسی نەیزانی لەکوێ مرد و دەستەیەك پێچەوانەی ئەمە باس دەکەن.

دوای کەیخوسرەو، لەسەر راسپاردەی خۆی لەهراسف پاشایەتی گرتەدەست. مناڵەکانی کەیخوسرەو کاماس و ئێسپەهر و رەمی و رەمین بوون. ماوەی پاشایەتی ئەو شەست ساڵی خایاند.

## هەنووکە دەگەڕێینەوە بۆ داستانی منداڵەکانی ئیسرائیل دوای سلێمان کوڕی داوود

دوای سلێمان کوڕی داوود کوڕەکەی بەناوی رەحبعەم بوو بەپاشای هەمووی منداڵەکانی ئیسرائیل و ماوەی حەفدە ساڵ پاشایەتی کرد. دوای ئەو پاشایەتی منداڵەکانی ئیسرائیل بلاّو بوویەوە و رەحبعەم پاشایەتی نەوەکانی یەهوودا و بنیامینی دەکرد و نەوەکانی دیکە یوربەعم کوڕی نابتیان وەك پاشای خۆیان هەڵبژارد. ئەمە بەهۆی ئەو قوربانییەوە بوو جەرادە هاوسەری سلێمان لەماڵەکەی ئەو بۆ بتی کرد و خواوەند فەرموو بووی بەشێك لەپاشایەتی منداڵەکانی ئەوی پێدەبڕێت. ماوەی پاشایەتی رەحبعەم وەك وتوویانە سێ ساڵ بوو.

دوای ئەو ئاسا کوڕی ئەبیا وەك باوکی پاشایەتی نەوەکانی یەهودا و بنیامینی گرتەدەست و ماوەی پاشایەتی ئەو چل و یەك ساڵ درێژەی کێشا.

## وتار سەبارەت بەداستانی ئاسا کوڕی ئەبیا زەرجی هیندی

لەوەهب کوڕی مونبە دەگێڕنەوە: یەکێك لەپاشاکانی منداڵەکانی ئیسرائیل بەناوی ئاسا کوڕی ئەبیا پیاوێکی خۆپارێز بوو. قاچی شەل ویەکێك لەپاشاکانی هیند بەناوی زەرج ستەمکارێکی خراپەکار و پێشنیاری پەرەستینی خۆی بەخەڵکان دەکرد. ئەبیا بتپەرەست بوو. دوو بتی بوو و لەجیاتی خوا پەرەستشی ئەوان وپێشنیاری پەرەستینی ئەوانی بەخەڵکان دەکرد. منداڵەکانی ئیسرائیلی بەرەو گومرای برد وتا ئەو کاتەی مرد، بتی دەپەرەستی.

دوای ئەو کوڕەکەی ئەسا پاشایەتی گرتەدەست. جارچییەکانی رەوانە کرد تا جاڕ بدەن کفر و کافر مردن و باوەڕ و باوەڕدار مانەوە. بت و بتپەرەستی رووخا و پەرەستینی خواوەند جێگەی ئەوانی گرتەوە. لەئێستا بەدواوە هەر کەس لە منداڵەکانی ئیسرائیل لەپاشایەتی من و لەرۆژگاری من کافر بێت، خوێنی دەرێژم چوونکە تۆفان و

نوقم بوونی دنیا و رووخانی گوندەکان و بارینی بەرد و ئاگر لەئاسمانەوە بەهۆی سەرپێچی کردن لەفەرمانەکانی خواوەند روویانداوە. لەبەر ئەمە پێویستە دەست لەگوناح هەڵبگرین وبۆ پەرەستینی خواوەند تێبکۆشین تا ئەو کاتەی زەوی لەگوناح پاك دەکەینەوە و لەگەڵ نەیارانی دەجەنگین و لەدیاری خۆمان دەریاندەپەڕێنین.

کاتێك خەڵك ئەم وتانەیان بیست، ناڵاندیان و پەسەندیان نەکرد. ڕۆشتنە لای دایکی پاشا و لەهەڵس و کەوتی ئەو لەگەڵ خواکانی خۆیان سکاڵایان کرد کەدەیەوێت ئەوان لەدینەکەیان دوور بکاتەوە و بۆ پەرەستینی خواوەند ناچاریان بکات. دایکی پاشا بەڵێنیدا قسەی لەگەڵ بکات و بۆ پەرەستینی بتەکانی سەردەمی باوکی ناچاری بکات.

کاتێك پاشا دانیشتبوو و گەورەکانی خەڵك لای ئەو بوون، دایکی هات. پاشا بۆ ڕێزگرتن لەدایکی لەشوێنەکەی هەستا و ویستی لەجێگەکەی خۆی داینیشێنێت بەڵام دایکی رازی نەبوو و وتی: کوڕی من نیت ئەگەر بەداواکەی من رازی نەبیت و ئەوەی دەیڵێم ئەنجامی نەدەیت چوونکە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی من دەبێتە هۆی بەختەوەری و نافەرمانی کردن دەبێتە هۆکارێك بۆ زیان. کوڕم! بیستوومە کارێکی گەورەت دەست پێکردووە و فەرمانت داوە خەڵکەکەت لەدینەکەیان پاشگەز و بەخواکانی خۆیان کافر بن و نەریتی باو و باپیرانیان پشت گووێ بخەن، نەریت و دیاردەیەکی تازەت هێناوەتە گۆڕ و گومان دەکەیت شکۆ و گەورەیی تۆ زیاد و دەسەڵاتت فراوانتر دەکات. کوڕم! بەمەڵەدا چوویت و گوناحت ئەنجام داوە و خەڵکان بۆ شەڕی خۆت هاندەدەیت. دەتەوێت ئازادەکان بکەیتە بەندەی خۆت و لاوزاەکان دژی خۆت بەهێز بکەیت، بۆچوونی زاناکانت پشتگوێ خست و بەرێگەیەکی جیاواز لەرێگەی ئەواندا ڕۆشتوویت و شوێن بۆچوونی نەزانەکان کەوتوویت. ئەم کارانەت بەهۆی نەزانی و منالی خۆتەوە ئەنجامداوە. ئەگەر بەوتەکانی من رازی نەبیت و مافی من بخەیتە ژێر پێ، لەوەچەی باوکت نیت و کەسێکی وەك تۆ شیاوی پاشایەتی نییە. کوڕم! خەڵکەکەی خۆت بەرەو کوێ دەبەیت؟ ئەگەری هەیە وشەی هاوشێوەی موسا بۆتۆ هاتبێتەخوار کە بەهۆیەوە فیرعەونی نوقم و خەڵکەکەی خۆی لەتاریکی رزگار کرد.

ئەگەری هەیە هێزێکی هاوشێوەی داوودیان پێبەخشیبێتیت کەشێری کوشت و

دەمی گورگی هەڵدری و جالوتی ستەمکاری بۆ ئەو دنیا رەوانە کرد یا پاشایەتی و زانستێکی هاوشێوەی سلێمان کە زانای زاناکان و زانست و حیکمەتی ئەو نموونە هەموو خەڵکانە. کوڕم ئەگەر چاکە بەرەو رووی تۆ بێت من زیاتر لەهەمووان بەهرەی لێدەبەم و ئەگەر جیاواز لەمە بێت لەهەموان زیاتر چارەڕەشم.

کاتێك پاشا، ئەم قسانەی بیست، توڕە و دڵتەنگ بوو، وتی:

دایکە، رەوا نییە لەگەڵ دۆست و دوژمن لەسەر یەك سفرە دانیشم وڕەوا نییە جگە لەپەروەردگار بپەرەستم. ئەگەر گوێ لەفەرمانەکانی من بگرێت، رێگەت نیشاندەدرێت و گەرنە گومڕا دەبیت. دەبێت خواوەند بپەرەستیت و حاشا لەهەموو خواکانی دیکە بکەیت. هەرکەس بەم وتەیە رازی نەبێت دوژمنی خوایە و من هاوکاری خواوەند دەکەم چوونکە بەندەی ئەوم.

دایکی پاشا وتی: من دەست لەبتەکانی خۆم هەڵناگرم و پشت ناکەمە دینی باوکانی خۆم و بۆچوونی خۆم بەگوێ گرتن لەوتەکانی تۆ ناگۆڕم و خوایەکی دیکە ناپەرەستم.

پاشا وتی: دایکە، ئەم وتەیە پەیوەندی من و تۆی پچڕاند. فەرمانیدا ئەویان دەرکرد و زیندانیان کرد. ئەوسا بەپەردەدار و پاسەوانەکانی خۆی وت ئەگەر پێداگری لەسەر کارەکەی خۆی بکات، بیکوژن. کاتێك نەوەکانی دەوروبەری ئەمەیان بیست، لەبەهێزی برواکەی ترسان و ملکەچی بوون. هیچ رێگە چارەیەکی دیکەیان نەدەبینی، وتیان: کەسێك فەرمان بەکوشتنی دایکی خۆی بدات، ئەگەر ئێمە دژایەتی ئەو بکەین، چیمان لێ دەکات؟ فرت و فێڵی زۆریان بەکار برد و خوا هەموو فرت و فێڵەکانی ئەوانی پووچەڵ کردەوە.

کاتێك نەیانتوانی بەم کارە رازی بن و پشت بکەنە دینەکەی خۆیان، بڕیارياندا لەوڵاتەکەی ئەو رابکەن و لەدیارێکی دیکە نیشتەجێ بن. مەبەستی رۆشتن بۆ سەرزەمینی زەرج، پاشای هیندیان کرد تا بۆ دژایەتی کردنی ئاسا و شوێنکەوتەکانی ناچاری بکەن. کاتێك ڕۆشتنە لای زەرج، کڕنوشیان بۆ برد. وتی: ئێوە کێن؟

وتیان: بەندەکانی تۆ.

وتی: لە کام دەستە لەبەندەکانی منن.

وتیان: ئێمە لەسەرزەمینی تۆین، لەشامەوە هاتووین و شانازی بەپاشایەتی تۆوە

دەکەین. پاشایەکی کەم تەمەن و نەزان لەناو ئێمەدا دەرکەوت و دینەکەی ئێمەی گۆڕی. بۆچوونەکانی ئێمەی بەفیڕۆ لەقەڵەمدا و باوکانی ئێمەی بەکافر دانا و لەتوڕەیی ئێمە ترسی نەبوو. ئێستاکە هاتووین تا ئەم بەسەرهاتە بۆ تۆ باس بکەین چوونکە بۆ پاشایەتی شیاوتریت. ئێمە گەورەی خەڵکەکەی خۆمانین. سەرزەمینەکەی ئێمەماڵەکانی فراوان و خەڵکەکەی لاواز و ئاوەدانییەکان فراوان و گەنجەکانی زۆرە و سێ پاشامان هەیە. ئەم خەڵکە بوون کەیوشەع کوڕی نوون جێگری موسایان بۆ دەریا برد. ئێمە و زەمینەکەمان تایبەتین بەتۆ. دیاری ئێمە دیاری تۆیە و کەس لەوێ نەیاری تۆ نییە و بێ شەڕ کردن بەگیان و سامان تەسلیمی تۆ دەبین.

زەرج وتی: بەداواکەی ئێوە رازی نابم و شەڕ لەگەڵ خەڵکانێك ناکەم کەئەگەری هەیە لەئێوە گوێرایەڵتر بن تا کاتێك نێردراوە باوەڕپێکراوەکان لەخەڵکەکەی خۆم رەوانە بکەم. ئەگەر بەو شێوە بێت باسی دەکەن لەبەرژەوندی ئێوەدا دەبێت و ئەگەر وتەکانتان درۆ بێت، سزایەکی شیاوی درۆزنەکانتان پێدەبڕێت.

وتیان: دادپەروەیت ئەنجامدا و فەرمانەکەت دادپەروەرانەیە و رازین.

زەرج وتی تا رۆژێیەکی دیاریکراویان پێببەخشن و لەخەڵکەکەی خۆی چەند کەسێکی بڕواپێکراوی دیاری کرد تا بۆ هەواڵ پرسین رەوانەیان بکات.پێشنیار و هەڕەشی لێکردن کەئەگەر درۆ بکەن سزا دەدرێن و ئەگەر راست بێننە سەرزمان، چاکەیان لەگەڵدا دەکات. وتی: بۆیە ئێوە رەوانە دەکەم چوونکە ئەمین و دیندار و ئەندێشە پاکن تا بەدوای شتێك لەسەرزەمینەکەی مندا بگەرێن و لەزانستی خەڵك و پاشا و سوپاکەی و ژمارەی ئاوەکان و دۆڵەکان و رێگە و دەربەندەکان ئاگادارم بکەنەوە بەشێوەیەك وەك بڵێی بەچاوی خۆم بینیوومە. لەخەزێنە بەئەندازەیەك یاقوت و مەرجان و جل و بەرگ ببەن کەکاتێك ببینن ئارەزوومەند بن و لەئێوەی بکڕن. ئەوانی بۆ خەزێنە نارد و شتەکانیان هەڵگرت. کەل وپەلی وشکی و دەریای پێدان. ئەو خەڵکەی رۆشتبوونە لای پاشا، رێگەکانیان بۆ وەسف کردن و شوێنەکانیان نیشاندان. هاوشێوەی بازرگانان بەرێکەوتن تا لەکەناری دەریا دابەزین. لەوێ سوار کەشتی بوون و گەشتنە کەنارەکانی ئیلیا و رۆشتنە ناو شارەکە و باریان کردەوە و کالاکانی خۆیان خستە بەرچاوی خەڵکان. پێشنیاری کڕینیان بەخەڵکان کرد بەلام کەس پێشوازی لەکالاکانی ئەوان نەکرد. لەبەرابەر شتێکی کەم شتێکی بەهاداریان

دەدا بۆ ئەوەی لەوێ بمێننەوە و گوێ لەباس و خواسەکان بگرن و لێکۆڵینەوە لەکارەکەیان و مەبەستەکەی پاشاکەیان ئەنجام بدەن.

پاشای ئاسا فەرمانیدا هەریەك لەژنانی منالەکانی ئیسرائیل کەهاوسەری نەبێت بەلام بڕواتە ریزی ژنانی هاوسەردار، بیکوژن یا بۆ دوورگەکانی کەنار دەریا دووریان بخەنەوە چوونکە ئیبلیس بۆ فریودانی باوەڕداران هیچ فریودەرێکی باشتری لەژنان نییە. بەم شێوەیە ژنانی بێ مێرد بەدەمامك و جل و بەرگی کۆنە دەرۆشتنەدەر تا کەس نەیانناسێتەوە. کاتێك بڕواپێکراوانی پاشای هیند لەکالاکانی خۆیان شتێکیان دەفرۆشت بەیەك درەم کەبەهاکەی سەد درەم بوو، ژنانی منالەکانی ئیسرائیل شەوانە و بەشێوەیەکی نهێنی دەهاتن و دەیانکڕی بەشێوەیەك باوەڕداران نەزانن. کالای خەلکەکەی خۆیان دەفرۆشت و ئەوەی دەیانویست، دەیانکڕی و بەمشێوەیە لەژمارەی قەلاکان و باس و خواسەکانی ناو شار ئاگادار بوونەوە. کالا بەهادارەکانی خۆیان وەك مەرجان و یاقوت بۆ پاشا هەلگرتبوو. لەدانیشتووانی شار سەبارەت بەو پرسیاریان کرد چوونکە شا هیچی لەوان نەکریبوو، وتیان: ئەگەر شا بەتوانایە، بۆ هیچ لەئێمە ناکرێت لەکاتێکدا ئەم هەموو کالا نایابەمان هەیە و ئەوەی دەیەوێت، هاوشێوەکەی لەخەزێنەکەیدا نابینێت، ئەگەر بەتوانا نییە، بۆ کالاکانی ئێمە نابینێت کە بێ بەها پێی ببەخشین. خەلکی شار وتیان: پاشا بەردایەك گەنج و خەزێنەی هەیە کەهاوشێوەی نەبینراوە. ئەو خەزێنانەی موسا لەمیسرەوە هێنای هاورێ لەگەل ئەو زێر و خشلانەی منالەکانی ئیسرائیل لەفیرعەونییەکانیان وەرگرت و ئەو تالانییانەی یوشەع کوڕی نوون کۆی کردەوە و ئەو سامانەی سلێمانی بیرمەند لەدەفرە کەم وێنە و شتەکانی دیکە کۆی کردەوە، لای پاشای ئێستایە.

بڕواپێکراوانی پاشای هیند وتیان: شەڕی ئەو چۆنە؟ شکۆ و گەورەیی ئەو لەچیدایە و سوپاکەی چەندە. ئەگەر پاشایەك بەمەبەستی لەناو بردنی پاشایەتییەکەی رووبەرووی ببێتەوە، چۆن شەڕ دەکات و ژمارەی سوپاکەی چەندە و چەندە سوارکار دێنێتە ناو گۆڕەپان. ئایا گەورەیی و هێزی ئەو لەخەزێنەکانەوە سەرچاوە دەگرێت یا لەسوپاییەکانی؟

خەلکان لەوەلامدا وتیان: سوپای پاشا ئاسا کەمە و هێزەکەی کەمتر بەلام هاورێیەکی هەیە ئەگەر لەخوا بپارێتەوە کێوەکان لەسەر رێگە لاببات، دەتوانێت.

نێردراوان وتیان: هاورێی پاشا کێیە و ژمارەی سوپاکەی چەندە و شەڕ کردنی ئەو بەچ شێوەیەکە. ئایا سوپا و کەشتی هەیە؟ شوێنی نیشتەجێ بوونی کوێیە؟

وەڵامیان دایەوە: شوێنی ئەو لەئاسمانەکانە و لەسەر عەرشەکەی خۆی دانیشتووە و سوپاکەی ژمارەی نییە چوونکە هەموو ئافرێنراوەکان بەندەی ئەون. ئەگەر فەرمان بەدەریا بکات دەڕژێتە ناو وشکانی و ئەگەر فەرمان بەرووبارەکان بدات بەناو خۆیاندا ڕۆچن، ڕۆدەچن. کەس ناتوانێت شوێنی ئەو ببینێت و بناسێت. ئەو هاورێ و پشتیوانی ئاسایە.

نێردراوان هەموو باس و خواسەکانیان نوسی. دەستەیەك لەوان ڕۆشتنە لای پاشا و وتیان: ئەی پاشا، لەکاڵاکانی خۆمان دیاریەکمان پێیە و دەمانەوێت پێشکەش بەتۆی بکەین یا لەئێمەی بکڕیت.

پاشا وتی: بیهێنن با ببینم. کاتێك هێنایان وتی: ئایا ئەمە دمێنێتەوە و خاوەنەی دەمێنێتەوە؟

وتیان: نان لەناو دەچێت و خاوەنەکەی لەناو دەچێت.

ئاسا وتی: پێویستم پێی نییە، شتێکم دەوێت برەوی خۆی لەدەست نەدات و بمێنێتەوە و خاوەنەکەی بمێنێتەوە.

نێردراوان لای ئەو ڕۆشتن. دیارییەکەی ئەوانی گەڕاندەوە. نێردراوان لەبیت المقدس بۆ لای زەرج پاشا گەڕانەوە. کاتێك گەیشتنە لای پاشا، دەفتەرەکەی خۆیان کردەوە و ئەوەی لەباس و خواسەکانی منداڵەکانی ئیسرائیل بیستبوویان، گێڕایانەوە و باسی هاورێ و پشتیوانەکەی ئاسایان کرد.

کاتێك زەرج وتەکانی ئەوانی بیست، ئەوانی بەگەورەیی خۆی و هەتاو و مانگ (کەدەیانپەرەست) سوێندا لەوەی لە منداڵەکانی ئیسرائیل بینیویانە، هیچ شتێك نەشارنەوە. ئەوانیش ئەو کارەیان کرد و کاتێك لەگێڕانەوەی قسە و باسەکان تەواو بوون و باسی ئاسا و بەسەرهاتەکەیان کرد، زەرج وتی: لەبەر ئەوەی منداڵەکانی ئیسرائیل زانیویانە ئێوە بەمەبەستی سیخوڕی ڕۆشتونەتە ئەو وڵاتە و لەکارەکانی ئێوە ئاگادار بوونەتەوە، درۆیان کردووە و ویستوویانە بەمشێوەیە بتانترسێنن کە هاورێی ئاسا هێز و سوپای زیاتری لەمن هەیە. نەتەوەکەی ئەو دلێرتر و بوێرتر لەخەڵکەکەی من نین و ئەگەر هەزار کەس بۆ ڕووبەڕوو بونەوەی من ڕەوانە بکات، من

کەسانی زیاتر رەوانە دەکەم. دواتر فەرمانی بۆ هەموو شوێنکەوتەکانی نوسی لەویلایەتەکان سوپاییەکان کۆبکەنەوە و داوای هاوکاری لەیاجوج وماجووج و تورك و فارس و نەتەوەکانی دیکەی ملکەچی خۆی کرد هاوکاری بکەن. نوسی:

لەزەرج، ستەمکار و پاشای سەرزەمینەکان، بۆ هەرکەس نامەکەی من بەدەستی دەگات، زەوییەکم هەیە بەرهەمەکەی پێگەیشتوەو دەمەوێت بەکرێگیراوان رەوانە بکەن تا دروێنە وبیکەمە تالآنی خۆیان. ئەم خەڵکە لەمنەوە دوورن و دەستیان بەسەر بەشێك لەسەرزەمینەکەی مندا گرتووە و بەندەکانی منیان سەرکوت کردووە. ئەوان بەکەسانێك دەبەخشم کە لەگەڵ من دژی ئەوان راپەڕن. ئەگەر کەل و پەلی شەڕتان نییە، کەل و پەلی شەڕتان لای منە و دەرگای خەزێنەکانی من داخراو نییە.

خەڵکان لەویلایەتەکانەوە لەدەوری ئەو کۆبوونەوە و ئەسپ و سوارە و پیادە کەرەستەکانی شەڕیان هێنا. کاتێك کۆبوونەوە لەخەزێنەکانی خۆی کەرەستەی شەڕی پێدان و وتی ژمارەیان بخەملێنن. یەك هەزار هەزار و یەك سەد هەزار سوار بوون جیاواز لە سوپاکەی سەرزەمینەکەی خۆی. فەرمانیدا سەد کەژاوە ئامادە بکەن و ئێسترەکانیان چوارچوار بەستەوە. لەسەر هەر چوار ئێستر تەخت و کەژاوەیەکیان دانا و لەهەر کەژاوەیەك کەنیزێکیان دانیشیاند. دەخزمەتکار و پێنج فیلیان کردە هاورێی هەر کەژاوەیەك. هەر سوپایەکی بوو بەسەد هەزار کەس. یەك سەد کەس لەگەورەکانی ئەوانی تایبەت کرد بەخۆی کە لەگەڵ ئەو سوار بوون و رێگەیان بڕی. بۆ هەر سوپایەك کەسانێکی دیاری کرد تا وتار بخوێننەوە و بۆ شەڕ هانیان بدەن. کاتێك ژمارەی زۆری خەڵکانی بینی، لەگەڵ ئەوان بەرێکەوت و شکۆ و گەورەیی لەدڵی ئامادەبوواندا زیادی کرد.

ئەوسا زەرج وتی: هاورێکەی ئاسا لەکوێیە؟ ئایا دەتوانێت لەدەستی من رزگاری بکات؟ کەس ناتوانێت بەسەر مندا زاڵ ببێت. ئەگەر ئاسا و هاورێکەی سوپاکەی من ببینن، بوێری شەڕکردنیان دەست ناکەوێت چونکە لەبەرابەر هەر سوپاییەکی ئەو هەزار سوپاییم هەیە. بەم زوانە ئاسا ئەسیر دەکرێت و خەڵکەکەی دەبێتە کۆیلەی من. زەرج ئیهانەی ئاسای دەکرد و بەردەوام بەشێوەیەکی ناڕەوا قسەی دەهێنایە سەرزمان.

کاتێك وتەکانی زەرج و کردەوەکانی بەگوێی ئاسا گەیشت، لەپەروەردگار پاڕایەوە

و وتی:

((خواوەندا تۆ کەئاسمان و زەوی و بوونەوەرەکانت بەهێزی خۆت ئافراند و هەموو شتێك لەدەسەلاّتی تۆدایە، تۆ کەهەم نەرمیت هەیە و هەم سەختی، داوا لەتۆ دەکەم سەیری هەڵەکانی ئێمە نەکەیت و سزای گوناحەکانمان نەدەیت و بەزەیی و رەحمەتی خۆت کەتایبەتە بەچاکەکاران، تایبەت بکەیت بەئێمە. سەیری لاوازی ئێمە و هێزی دوژمن بکە، کەمی ئێمە و زۆری دوژمن ببینە، خەم و دڵتەنگی و شادی و خۆش ئەوان ببینە و زەرج و سوپاکەی بەهەمان شێوە کەفیرعەون و سوپاکەیت لەناو دەریادا نوقم کرد، بخنکێنە. لەتۆ دەپارێمەوە تا بەشێوەیەکی لەناکاو ئازابی خۆت بەسەر زەرج و سوپاکەیدا ببارێنیت.

لەوەلاّمدا بەئاسا وترا: وتەکانی تۆمان بیست وپارانەوەی تۆ بەگوێی ئێمە گەیشت. من لەسەر عەرشەکەی خۆمم و ئەگەر زەرجی هیندی وسوپاکەی نوقم بکەم منالّەکانی ئیسرائیل نازانن چ بەلاّیەکم بەسەر ئەواندا هێناوە. بەلاّم سەبارەت بەزەرج و خەڵکەکەی هێزی خۆمیان نیشان دەدەم تا زەحمەت و رەنجیان پێببرێت و تالاّنییەکان دەکەمە بەشی تۆ وسوپاییەکانیان دەخەمە بەردەستی تۆ تا دوژمنان بزانن هاورێی ئاسا، هاورێکەی خۆی لەبیر ناکات و سوپاکەی لەناو ناچێت و ملکەچی فەرمانەکانی ئەو بێ هیوا نابێت. مۆڵەتی پێدەدەم تا کارەکەی خۆی تەواو بکات، دواتر وەك بەندە دەیهێنمە لای تۆ و سوپاکەی دەبنە بەندەی تۆ و خەڵکەکەت.

زەرج و سوپاکەی هاتن و لەکەنارەکانی تەرشیش دابەزین. لەیەك رۆژدا جۆگەکانیان وشك کرد و سەوزەلاّنییەکانیان لەناو برد. باڵندەکان لەسەر ئەوان نیشتنەوە و وەحشیەکان نەیانتوانی لەدەستیان رابکەن. کاتێك گەیشتنە دوو مەنزڵی ئیلیا، زەرج لەوێ سوپاکەی خۆی لەئیلیا بلاّو کردەوە و دەشت و کێوەکان لەوان پڕ بوو. خەڵکانی شام ترسان و لەناوچوونی خۆیان بەچاو بینی.

ئاسا داستانەکەی بیست و دەستەیەك لەخەڵکەکەی خۆی بۆ ئاگادار بوون لەچۆنییەتی کاروبار و ژمارەی سوپاکەی ئەوان رەوانە کرد. کاتێك نێردراوانی ئاسا رۆشتن و لەسەر تەپۆڵکەکانەوە ئەوانیان بینی، بۆ لای ئاسا گەرانەوە و وتیان: تا ئێستا چاو و گوێی منالّەکانی ئادەم هاوشێوەی فیل و ئەسپ و سوارەکانی ئەوانی نەبینیوە و نەبیستوە. باوەرمان نەدەکرد سوپایەکی بەمشێوەیە و بەم ژمارەیە بوونی

هەبێت کەئاوزی ئێمە لەبژاردنیان ناتەوان بێت. توانای خۆراگری لەبەرابەر ئەوانمان نییە و هیچ هیوایەك بەدی ناکەین.

کاتێك خەڵکی شار ئەمەیان بیست، جل و بەرگی خۆیان دڕاند و خۆڵیان کرد بەسەری خۆیاندا و لەکۆڵان و بازارەکان گریان و ماڵئاواییان لەیەك کرد.

ڕۆشتنە لای پاشا و وتیان: ئێمە بۆ لای ئەم خەڵکە دەڕۆین و دەستی ملکەچی و گوێڕایەڵی خۆمانیان بۆ درێژ دەکەین ئەگەری هەیە بەزەییان بەئێمەدا بێتەوە و ڕێگە بدەن لەدیاری خۆمان بژین.

پاشا وتی: خوا نەکات دەست بخەینە ناو دەستی دوژمن و کافرەکان و ماڵ و کتێبی خواوەند بەوان بسپێرین.

وتیان: کەواتە بیر لەرێگە چارەیەك بکەرەوە و لەهاوڕێ و پەروەردگارەکەت داوای هاوکاری بکە. ئەگەر ئەم بەڵایە لەسەر ئێمە هەڵنەگرێت دەست دەخەینە ناو دەستی دوژمن ئەگەری هەیە لەمردن رزگارمان بێت.

ئاساوتی: پەروەردگاری من بەگریان و پاڕانەوە نەرم نابێت.

وتیان: دۆعابکە ئەگەری هەیە دۆعاکەت گیرابێت و بەزەیی بەلاوازی ئێمەدا بێتەوە چوونکە هاوڕێ لەم حاڵەدا پشت ناکاتە هاوڕێکەی خۆی.

ئاسا ڕۆشتە نوێژگە و تاجی لەسەر داکەند. عابایەکی لەبەر کرد و لەسەر خۆڵەمێش دانیشت. دەستی بۆ دۆعا بەرز کردەوە و بەدڵێکی خەمبار و چاوێکی گریاناوی لەخواوەند پاڕایەوە، وتی: خواوەندا، پەروەردگاری حەوت ئاسمان و پەروەردگاری عەرشی مەزن. خواوەندی ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و نەوەکانیان، تۆ لەهەر شوێنێك بخوازیت لەخەڵکان خۆت بەدوور دەگریت. کەس شوێن و جێگەی تۆ نازانێت و ناتوانێت هەست بەگەورەی و مەزنی تۆ بکات. تۆ ئەو بێدارەیت هیچ کات ناخەویت و ئەو تازەی بەتێپەڕینی شەو و ڕۆژ کۆن نابێت. خواوەندا بەو وشانە دۆعا دەکەم کەئیبراهیمی خەلیل دۆعای کرد و ئاگرت بۆ ئەو کوژاندەوە و ئەوت خستە ریزی چاکەکاران، بەو وشانەی موسای کەلیم لەتۆ پاڕایەوە و مناڵەکانی ئیسرائیلت لەتاریکی و ستەم رزگارو لەدەریاوە ئەوانت گەیاندە وشکانی و فیرعەون و کەسانیت نوقم کرد. بەو گریانەی بەندەکەی تۆ داوود کردی و دۆعاکەیت گیرا کرد و دوای لاوازی هێزت پێبەخشی و بەسەر جالوتی ستەمکار سەکەوتووت

کرد. بەو دۆعای سلێمان کردی و زانستت پێبەخشی و پێگەییت بەرز کردەوە و کردت بەپاشای هەموو بوونەوەرەکان. تۆ کەمردووان زیندوو دەکەیتەوە و کۆتایی بەجیهان دێنیت و تەنیا و تاقانە دەمێنیتەوە و نامریت و هەمیشە تازەیت، خواوەندا دەمەوێت بەزەییت بەمندا بێتەوە و دۆعاکەم گیرا بکەیت چوونکە نیازمەندم و لەهەموو بەندەکانی تۆ لاوازتر وگرفتاری بەلاّ و ئەزموونێکی گەورەم و کەس جگە لەخۆت ناتوانێت شوێنەواری بسڕێتەوە. ئێمە جگە لەهێزی تۆ هیچ کەرەستەیەکمان نییە. بەزەییت بەلاوازی ئێمەدا بێتەوە چوونکە هەر کەس بخوازیت لەبەخششەکانی خۆت بەهرەوەری دەکەیت.

زاناکانی منالەکانی ئیسرائیل لەدەرەوە دۆعایان دەکرد و دەیانوت: خوایە، دۆعای بەندەکەی خۆت گیرا بکە. پەنای بۆ تۆ هێناوە و رادەستی دوژمنی مەکە و بیرت بێت هەمیشە لەبیری تۆدا بووە و لەدایك و هەموو شوێنکەوتەکانی جگە لەباوەڕداران خۆی بەدوور گرتوە.

خواوەند لەنوێژگەکە، ئاسای خەواند. ئەوسا نێردراوی خوایی هات و وتی: ئەی ئاسا، هاوڕێ، هاوڕێکەی خۆی تەسلیمی دوژمن ناکات. خواوەند دەفەرمێت خۆشەویستی خۆم بەتۆ دەبەخشم و هاوکاری کردنی تۆ بەپێویست دەزانم و زیانی دوژمن لەتۆ دووردەخەمەوە. هەرکەس پشت بەمن ببەستێت ریسوا و لاواز نابێت و هەرکەس من هێزی پێبببەخشم، بێهێز نابێت. تۆ لەکاتی ئاسوودەی لەبیری مندا بوویت و من لەکاتی گرفتاری بەتەنیا جێی ناهێڵم. خواوەند دەفەرمێت سوێند دەخۆم ئەگەر ئاسمان و زەوی و هەموو بونەوەرەکان نەیاری تۆبن، رێگە چارەیەك بۆ تۆ دەدۆزمەوە و لەفریشتەکانی خۆم رەوانە دەکەم تا دوژمنانی تۆ لەناو ببەن. من لەگەڵ تۆم ودەستی هیچ کەس بەتۆ و هاوەڵانت ناگات.

ئاسا دەم بەبزە لەنوێژگە هاتەدەر و لەپەیامی خواوەند ئاگاداری کردنەوە. باوەڕداران وتەکانی ئەویان پشتراست کردەوە و دووروەکان بەدرۆزنیان زانی. بەیەکیان وت: ئاسا بەشەلی رۆشت و بەشەلی گەڕایەوە. ئەگەر راست دەکات و خواوەند دۆعاکەی ئەوی گیرا کردووە، پێویستە قاچیشی چاك بووبێتەوە. بەلاّم ئەو فریومان دەدات و بەهیواوە سەرقاڵمان دەکات تا شەڕ روودبدات و لەناو بچین.

لەو کاتەی پاشا سەبارەت بەخشینە خواییەکان قسەی لەگەڵ خەڵکان دەکرد،

نێردراوانی زەرج هاتن و ڕۆشتنە ناو ئیلیا. نامەی زەرجیان بۆ ئاسا هێنابوو کەتیایدا ئیهانەی خۆی و خەڵکەکەی دەکرد و حاشای لەبوونی خوا و نوسیبووی: داوای هاوکاری لەهاورێکەی خۆت بکە کەبۆتە هۆکاری گومڕایی خەڵکەکەت بۆ ئەوەی هاورێ لەگەڵ سوپاکەی خۆی بۆ شەڕی من بێت و لەبەرابەر من خۆی نیشاند بدات. دەزانم نە ئەو و نەکەسی دیکە توانای خۆراگری لەبەرابەر منی نییە چوونکە من زەرج پاشای هیندم.

کاتێك ئاسا نامەکەی خوێندەوە، فرمێسك لەچاوەکانی هاتەخوار. گەڕایەوە بۆ نوێژگە و لەبەرابەر پێشگای خواوەند نامەکەی کردەوە و وتی: خواوەندا، هیچ شتێکم لەدیداری تۆ پێخۆشتر نییە، بەڵام دەترسم ئەم نوورەی لەرۆژگاری من داگیرساوە، بەرەو کوژانەوە بڕوات. شایەتی ئەم نامەیت و دەزانی چی تیا نوسراوە. ئەگەر مەبەستەکەی من دەبووم، گرنگ نەبوو بەڵام بەندەکەت زەرج مەبەستی دژایەتی کردنی تۆی لەسەردایە، جوێن دەدات و بەناڕەوا شانازی بەخۆیەوە دەکات و بەناڕاست وتە دێنێتە سەرزمان. تۆ شایەت و بینەری هەموو شتەکانیت.

خواوەند وەحی بۆ ئاسا نارد: وشەکانی من گۆڕانی بەسەردا نایەت و بەڵێنەکەی من دەبرێتەسەر. فەرمانەکانم ناگۆڕێن. لەنوێژگە بڕۆدەر و فەرمان بەسوپاکەت بدە خۆیان ئامادە بکەن و لەگەڵ شوێنکەوتەکانی خۆت بڕۆن و لەشوێنێکی بەرز بوەستن.

ئاسا ڕۆشتەدەر و پەیامی خوای بەخەڵکان ڕاگەیاند. دوانزە کەس لەسەرکردەکانی منالەکانی ئیسرائیل رۆشتنەدەر. هەرکامیان چەند کەسێکیان لەگەڵدا بوو. لەکاتی ڕۆشتن بەخەڵکیان دەوت سەرقاڵی کاروباری دنیا نەبن و لەسەر تەپۆڵکەیەکی نزم رووبەری زەرج بوونەوە و لەوێوە سوپاکەی ئەویان بینی.

کاتێك زەرج ئەوانی بینی، گاڵتەی پێکردن و وتی: بۆ ئەمانە سوپام هێناوەتە ئێرە و سامانی خۆم خەرج کرد. ئەو کەسانەی بانگ کرد کەوەسفی ئاسا و خەڵکەکەیان کردبوو، وتی: درۆتان لەگەڵ من کرد کاتێك وتتان ژمارەی ئەم خەڵکە فراوانە. فەرمانی کوشتنی ئەوان و نێردراوە باوەڕپێکراوەکانی خۆی دەرکرد.

لەم ناوەدا ئاسا بەردەوام دەپاڕایەوە و داوای هاوکاری لەخواوەند دەکرد.

زەرج وتی: نازانم چی لەگەڵ ئەم خەڵکە بکەم. ژمارەیان لەبەرابەر ئێمەدا ئەوەندە کەمە شەڕ کردن لەگەڵ ئەوان ڕەوا نییە. کەسی بۆ لای ئاسا رەوانە کرد و پەیامیدا:

هاورێکەت کەبەپشت بەستن بەو هەرەشەت لەئێمەدەکرد و گومانت دەکرد دەسەڵاتەکەی لەزیانی ئێمە دوورت دەخاتەوە، لەکوێیە؟ ئایا تەسلیمی من دەبن تا فەرمانی پێویست لەبارەی ئێوە بدەم یا چاوەڕوانی شەڕ کردن لەگەڵ منن؟

ئاسا وەڵامی دایەوە ئەی چارەڕەش نازانیت چی دەڵێیت مەگەر دەتەوێت بەلاوازی خۆت بەسەر پەروەردگاردا زاڵ ببێت یا بەژمارەی کەمی خۆت بەسەر ئەودا سەرکەویت؟ ئەو لەهەموو شتەکان بەتواناتر و گەورەترە و بەندەکان لەوە لاوازتر و بێ هێزترن بەشێوەیەکی ئاشکرا ببینن. ئێستا ئەو لەگەڵ مندایە و هەرکەس خوای لەگەڵدا بێت، هیچ کات شکست ناخوات. ئەی بەدبەخت، هەموو سوپاکەت بێنە بزانە چ بەڵایەکت بەسەردا دێت.

کاتێك سوپاکەی زەرج ریزیان بەست و لەشوێنی خۆیان جێگەیان گرت، زەرج فەرمانی بەتیرهاوێژەکانی خۆیدا تیرهاویشتن دەست پێبکەن. خواوەند لەهەر ئاسمانێکەوە فریشتەکانی بۆ هاوکاری ئاسا و خەڵکەکەی رەوانە کرد. ئاسا ئەوانی لەشوێنی خۆیان جێگیر کرد و کاتێك ناباوەڕان تیریان دەهاویشت، لەنێوان هەتاو و زەوی دیوارێکیان دروست کرد هاوشێوەی هەورێك. فریشتەکان تیرەکانیان لەئاسا و خەڵکەکەی دوور خستەوە. دواتر فریشتەکان تیرەکانیان بۆ سوپاکەی زەرج هاویشت. هەرکەس تیری هاویشتبوو، تیرێکی بەرکەوت و هەموو تیرهاوێژەکان کوژران.

لەم کاتەدا ئاسا و خەڵکەکەی سپاسی خوایان کرد. فریشتەکان دەرکەوتن و کاتێك زەرج ئەوانی بینی، ترس کەوتە دڵیەوە و رێگەچارەی نەزانی، وتی: ئایا فریوێکی گەورە و جادوویەکی مەزنی هەیە. منداڵەکانی ئیسرائیلیش بەمشێوەن. هیچ زانایەك بەرگری فریوی ئەوان ناگرێت. ئەم کارە لەمیسرییەکانەوە فێر بوون و بەهاوکاری ئەوان لەدەریا پەڕینەوە.

دواتر پاشای هیند هاواری لەسوپاکەی خۆی کرد تا شمشێرەکان دەربکێشن و هێرش بەرن. هیندیەکان شمشێریان دەرکێشا و هێرشیان کردە سەر فریشتەکان. فریشتەکان ئەوانیان کوشت و جگە لەزەرج و ژنەکانی کەس رزگاری نەبوو.

کاتێك زەرج ئەمەی بینی، لەگەڵ کەسەکانی خۆی هەڵات و بەردەوام دەیوت: ئاسا دەبینرا و ئاشکرا بوو بەڵام هاورێکەی بەنهێنی سوپاکەی منی لەناو برد. خۆی و هاورێکانیم بینی کەوەستا بوون و شەڕیان نەدەکرد و شەڕ لەناو خەڵکەکەی مندا

دەستیپێکردبوو.

کاتێك ئاسا هەلاتنی زەرجی بینی، وتی: خوایە زەرج هەلات، بەلام ئەگەر بەربەستێك لەنێوان ئێمە و ئەودا دروست نەکەیت، جارێکی دیکە هێرش دەکاتە سەرمان.

وەحی هاتەخوار: تۆ هیندیەکانت نەکوشت بەڵکو من کوشتم. لەشوێنی خۆتا بمێنەرەوە چوونکە ئەگەر من نەبم ئێوە لەناو دەبەن. زەرج لەدەستی مندایە و هیچ کەس لەلایەن منەوە هاوکاری ئەو ناکات و لەدەستی من رزگاری نابێت. من ئوردوگای ئەوم بەهەموو زێر و زیو و چوارپێکانەوە بەتۆ بەخشی. ئەمە پاداشتی تۆیە کەپشتت بەمن بەست و کرێم ناوێت بۆ ئەوەی هاوکاری تۆم کرد.

زەرج ڕۆشت تا گەشتە کەنار دەریا. ویستی لەوێوە رابکات. سەد هەزار کەسی لەگەڵدا بوو. کەشتیەکانیان ئامادە کرد و سواری بوون. کاتێك لەدەریادا بەرێکەوتن خواوەند لەزەوی و دەریاکانەوە باکانی رەوانە کرد. شەپۆلەکان بەرز بوونەوە و کەشتییەکانی تێکشکاند. هەر کەس لەگەڵ زەرجدا بوو، نوقم بوو. شەپۆلەکان بەئەندازەیەك پەرێشان بوون خەڵکی شارەکانی دەوروبەر ترسان. زەوی لەرزی. ئاسا کەسی رەوانە کرد بۆ ئەوەی باس و خواسەکانی بۆ بێنێت. خواوەند وەحی بۆ رەوانە کرد: تۆ و خەڵکەکەت دابەزن و تالانییەکان کەخواوەند پێی بەخشیون، کۆبکەنەوە و سپاسی خواوەند بکەن. هەرکەس لەم ئوردووگایە هەرچی هەڵگرێت، حەلاڵە بۆی.

خەڵکی ئاسا هاتنەخوار و سپاسی خوایان بەجێهێنا. بۆ ماوەی سێ ساڵ تالانییەکانی ناو ئوردوگاکەیان بۆ گوندەکەی خۆیان دەبرد و خوا زاناترە.

دوای ئاسا یەهو شافازی کوڕی پاشایەتی گرتەدەست و بۆ ماوەی بیست و پێنج ساڵ پاشایەتی کرد و ئەوسا مرد.

دواتر عەتلیا و بەوتەیەك عەزلیا کچی عەمرەم دایکی ئەخزیا پاشایەتی گرتەدەست و منالی پاشاکانی منالەکانی ئیسرائیلی کوشت و جگە لەیەواش کوڕی ئەخزنا کەس نەمایەوە و ئەویش خۆی داشاردبوو.

دواتر یەواش و هاورێکانی عەتلیایان کوشت. پاشایەتی ئەو حەوت ساڵ درێژەی کێشا.

دوای ئەو یەواش کوڕی ئەخزیا پاشایەتی گرتەدەست و سەرئەنجام بەدەست

هاورێکانی خۆی کوژرا.

دوای ئەو ئەموصیا کوڕی یەواش پاشایەتی گرتەدەست و بۆ ماوەی بیست و نۆ ساڵ پاشایەتی کرد و سەرئەنجام بەدەستی هاورێکانی خۆی کوژرا.

دوای ئەو عوزیا کوڕی ئەموصیا پاشایەتی گرتەدەست. عوزیایان بەغوزیایش ناو بردووە. ماوەی پاشایەتی ئەو پەنجا و دوو ساڵ و دواتر مرد.

دوای ئەو یوتام کوڕی عوزیا بوو بەپاشا و بۆ ماوەی شەش ساڵ پاشایەتی کرد تا مرد.

ئەحاز کوڕی یوتام دوای باوکی پاشایەتی گرتەدەست و شانزە ساڵ پاشایەتی کرد تا مرد.

حزقیا کوڕی ئەحاز بەپاشایەتی گەیشت. دەڵێن: ئەو هاوڕێی شۆعیا بوو کەباسی کۆتایی هاتنی تەمەنی ئەوی کرد. ئەو لەپەروەردگار پاڕایەوە و خواوەند تەمەنی ئەوی زیاد کرد و شۆعیا ئەوی لەفەرمانەکەی پەروەردگار ئاگادار کردەوە. بەڵام بەوتەی کوڕی ئیسحاق هاورێی شۆعیا کە ئەم داستانە تایبەتە بەو، ناوی صدیقەیە.

## وتار سەبارەت بەخاوەنی داستانی شۆعیا و سە نحاریب

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: خواوەند موسای لەرووداوەکانی منداڵەکانی ئیسرائیل ئاگادار کردبوویەوە و فەرموو بووی: (( و قضینا الی بنی اسرائیل فی الکتاب لتفسدن فی الارض مرتین و لتعلن علوا کبیرا. فاذاجاء وعد اولیهما بعثنا علیکم عبادا لنا اولی باس شدید فجاسوا خلال الدیار و کان وعدا مفعولا. ثم رددنا لکم الکرة علیهم و امددناکم باموال و بنین و جعلناکم اکثر نفیرا ان احسنتم احسنتم لا نفسکم و ان اسأتم فلها فاذاجاء وعد الاخرة لیسوء وجوهکم و لیدخلوا المسجد کما دخلوة اول مرة و لیتبروا ما علوا تتبیرا عسی ربکم ان یرحمکم و ان عدتم عدنا و جعلنا جهنم للکافرین حصیرا.

واتاکەی: لەو کتێبەدا بە منداڵەکانی ئیسرائیلمان ڕاگەیاند دووبارە لەسەر ئەم زەمینە خراپەکاری دەکەنە پیشە و سەرپێچی دەکەن، سەرپێچییەکی گەورە. کاتێك کاتی دیاریکراوی یەکەم هات، بەندە خۆڕاگر و بەهێزەکانمان کردە فەرمانڕەوای ئەوان تا لەناو دیارەکەیان کوشتاریان بکەن و ئەمە بەڵێنێکی ئەنجامدراو بوو. دواتر دژی ئەوان دەوڵەتمان بەئێوەدا و هاوکاری ماڵ و منداڵەکانتانمان کرد و کاتەکەی ئێوەمان درێژ کردەوە. ئەگەر چاکە بکەن لەگەڵ خۆتان چاکە دەکەن و ئەگەر خراپە بکەن لەگەڵ خۆتان دەیکەن و کاتێك کاتی دیاریکراوی دووەم هات، ((ئەوانمان ڕاسپارد)) تا گەورەکانتان ڕیسوا بکەن و بڕۆنە ناو ئەم مزگەوتە بەهەمان شێوە کەجاری یەکەم ڕۆشتن و بەسەر هەر شتێکدا زاڵبوون، لەناوی ببەن لەناو بردنێکی گشتی. ئەگەری هەیە خواوەند بەزەیی پیاتانا بێتەوە و ئەگەر دووبارە ئەو کارە بکەن، ئێمەیش دەیکەین. جەهەننەمان کردۆتە زیندانی کافرەکان.))

گوناح و ڕوداوەکان لەلایەن منداڵەکانی ئیسرائیلەوە ئەنجام دەدرا و خواوەند لەگەڵ ئەوان چاکەکار و بەخشندە بوو. یەکێك لەرووداوەکانیان داستانی صدیقەیە کەیەکێك بوو لەپاشاکانی منداڵەکانی ئیسرائیل. بەشێوەیەك بوو کاتێك خواوەند پاشایەتی منداڵەکانی ئیسرائیل بەیەکێك دەبەخشی، پێغەمبەرێکی لەگەڵ ئەودا ڕەوانە دەکرد تا ڕێنوێنی بکات و لەنێوان پاشا و خواوەند ببێتە نێوەنجیگەر و لەکاروباری تایبەت بەخەڵکان ڕاوێژی پێبکرێت. ئەم پێغەمبەرانە کتێبی تایبەت بەخۆیانیان نەبوو بەڵام ڕاسپێردرابوون فەرمانەکانی تەورات ئەنجام بدەن و ڕێگەی گوناح و خراپەکاریان

لەخەڵکان دەگرت و بۆ پەرەستینی خواوەند هانیان دەدان. کاتێك ئەم پاشایە، پاشایەتی گرتەدەست، شۆعیا کوڕی ئەمصیا لەگەڵ ئەو وەك پێغەمبەر رەوانە کرا. ئەمە پێش لەدایك بوونی عیسا و زەکەریا و یەحیا بوو. شۆعیا ئەو کەسەیە مژدەی لەدایك بوونی عیسا و محەممەدی بەخەڵکاندا. ئەم پاشایە بۆ ماوەیەك پاشایەتی منداڵەکانی ئیسرائیل و بیت المقدسی لەدەستا بوو. کاتێك ڕۆژگاری تەمەنی ئەو بەکۆتاییەکەی گەیشت و ڕووداوە گەورەکان ڕوویدا و شۆعیا هاوڕێی ئەو بوو، خواوەند سەنحاریب پاشای بابلی دژی ئەوان قووت کردەوە. ئەو شەشسەد هەزار ئاڵای هەبوو. سەنحاریب بەرێکەوت و لەکەنارەکانی بیت المقدس دابەزی. پاشا نەخۆش و قولاپەی پێی بریندار بوو. شۆعیای پێغەمبەر ڕۆشتە لای و وتی: ئەی پاشا، سەنخاریب پاشای بابل هاوڕێ لەگەڵ سوپاکەی و شەشسەد هەزار ئاڵا دابەزین و خەڵکان ترساون.

ڕووداوەکە بۆ پاشا دژوار بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا سەبارەت بەم ڕووداوە وەحی هاتۆتە خوار کەخواوەند چی لەئێمە و سەنخاریب و سوپاکەی دەکات؟

پێغەمبەر پێی وت: وەحی لەمبارەوە بەمن نەگەیشتووە.

لەم ناوەدا خواوەند وەحی بۆ شۆعیا رەوانە کرد: برۆ لای پاشای منداڵەکانی ئیسرائیل و پێی بڵێ وەسیەتی خۆی بکات و لەبنەماڵەکەی خۆی بەئارەزوی خۆی کەسێك وەك جێگر دەستنیشان بکات. شۆعیا ڕۆشتە لای صدیقە پاشا و وتی: پەروەردگار وەحی بۆ من رەوانە کرد تا پێت بڵێم وەسیەت بکەیت و یەکێك لەبنەماڵەکەی خۆت بەپەسەندی خۆت وەك جێگر دەستنیشان بکەیت چوونکە دەمریت.

کاتێك شۆعیا پەیامی خوای بەصدیقە گەیاند، ڕووی کردە قیبلە و نوێژی خوێند، پاڕایەوە، دۆعای کرد و بەکوڵ گریا و بەدەم گریان و بەدڵێکی پاکەوە داوای لەخواوەند کرد: ئەی خواوەندا! ئەی پەروەردگاری پەروەردگاران و ئەی خوای خواکان، ئەی پیرۆزی پیرۆزەکان، ئەی ڕەحمان، ئەی ڕەحیمی بەخشەر، ئەی مێهرەبان کەخەو و خواردنت نییە، کردەوە چاکەکانی منت لەگەڵ منداڵەکانی ئیسرائیل لەبیر بێت کەهەمووی سەرچاوەکەی لەتۆیە و باشتر لەمن دەزانیت کەنهێنی و ئاشکرای من لەتۆیە.

خواوەند دۆعاکەی گیرا کرد چوونکە بەندەیەکی خۆپارێز بوو. وەحی بۆ شۆعیا رەوانە کرد و فەرمانی پێدا بەصدیقە پاشا بڵێت خواوەند دۆعاکەتی گیرا کرد، بەزەیی بەتۆدا هاتەوە کاتێک گریانی تۆی بینی و مەرگی تۆی بۆ پانزە ساڵی دواتر دواخست و تۆ لەدوژمنەکەت سەنحاریب و سوپاکەی رزگار دەکات.

کاتێک شۆعیا ئەم قسەی بەپاشا وت، خەمەکانی ڕەوینەوە، کوڕنوشی برد و وتی: ئەی خوا من و باوکانم! کوڕنوش و سوجدە بۆ تۆ دەبەم و چاکە و وەسفی تۆ دەهێنمە سەر زمان، تۆ کەپاشایەت و بەهەر کەس بخوازیت دەبەخشیت و لەهەر کەس بخوازیت وەردەگریتەوە. هەرکەس بخوازیت، مەزنی پێدەبەخشی و هەرکەس بخوازیت، ریسوای دەکەیت. زانای غەیب و ئاشکراییت، سەرەتا و کۆتایی و رووکەش و ناخ تۆییت کە بەداواکەی من رازی بوویت و بەزەییت بەگریانی مندا هاتەوە.

کاتێک پاشا سەری بەرز کردەوە، خواوەند وەحی بۆ شۆعیا رەوانە کرد بەپاشا صدیقە بڵێ فەرمان بەیەکێك لەبەندەکانی خۆی بدات ئاوی هەنجیر بێنێت و بیخاتە سەر برینەکەی تا شیفای بدرێت و چاك ببێتەوە. پاشا ئەم کارەی کرد و چاك بوویەوە.

پاشا بەشۆعیای پێغەمبەری وت: داوا لەخوا بکە پێمان بڵێت چ بەلایەك بەسەر دوژمنەکەماندا دێنێت.

خواوەند بەشۆعیای پێغەمبەری فەرموو: بەپاشا بڵێ زیان و بەلای ئەو لەتۆ دوور دەکەمەوە و تۆ لەدەستی ئەو رزگار دەکەم. بەرەبەیان هەموو سوپاکەی جگە لەسەنحاریب و پێنج لەدەبیرەکانی دەمرن.

بەرەبەیان جارچییەك ڕۆشتە لای دەروازەی شار و جاڕیدا: ئەی پاشای منالەکانی ئیسرائیل، خواوەند بەلای دوژمنی لەتۆ دوور کردەوە و سەنحاریب و سوپاکەی لەناوچوون.

کاتێک پاشا هاتەدەر و بەدوای سەنحاریبدا گەڕا و لەناو مردووەکاندا نەیبینی، کەسی بۆ شوێنپێ هەڵگرتنی ئەو رەوانە کرد. ئەویان لەگەڵ پێنج دەبیرەکەی کەیەکیان بەخت نەسر بوو، لەناو ئەشکەوتێکدا دۆزییەوە. زنجیریان لەدەست وپێیان کرد و بردیانە لای پاشای منالەکانی ئیسرائیل. کاتێک ئەوانی بینی، کوڕنوشی برد. لەکاتی هەلاتنی هەتاو تا کاتی ئاوا بوون، لەسوجدەدا بوو. دواتر بەسەنحاریبی وت:

فەرمانی پەروەردگاری ئێمە چۆن دەبینیت. ئێمە ئاگا بووین و ئەو بەمێزی خۆی ئێوەی کوشت.

سەنحاریب وتی: پێش ئەوەی لەدیاری خۆمەوە بەرێکەوم، بیستبووم پەروەدگارەکەتان هاوکاریتان دەکات بەڵام گوێم لەو وتانە نەگرت و لەسەرکێشی خۆم بەدبەخت بووم. ئەگەر بەوتەکان رازی و ئاوزم دەبوو، بۆ شەڕی ئێوە نەدەهاتم، بەڵام چارەڕەشی بەسەر خۆم و سوپاکەمدا زاڵبوو.

پاشای مناڵەکانی ئیسرائیل وتی: سپاس بۆ خوای بەتوانا بەهەمان شێوە کەئێمەی لەبەڵای ئێوە رزگار کرد. ئەوەی تۆ و هاورێکانتی بەزیندوویی هێشتەوە لەبەر رێزگرتن لەئیوە نەبوو بەڵکو لەبەر ئەوەیە تا خراپتر لەوە ببینن و لەم دنیا و لەو دنیا چارەڕەشی ببێتە بەشتان. خەڵکەکەی خۆتان ئاگادار بکەنەوە خواوەندی ئێمە چ بەڵایەکی بەسەر هێنان تا ببنە وانەی داهاتووان. ئەگەر بەمشێوە نەدەبوو، خواوەند ئێوەی بەزیندوویی نەدەهێشتەوە چوونکە خوێنی تۆ و هاورێکانت لای خواوەند لەخوێنی عەنتەرەکان کەم بەهاترە.

پاشای مناڵەکانی ئیسرائیل فەرمانی بەسالاری پاسەوانەکانی خۆیدا و دەست وپێی ئەوانیان بەزنجیر بەستەوە و بۆ ماوەی حەفتا و دوو رۆژ بەناو بیت المقدسدا سوڕاندیانن. رۆژانە دوو نانی جۆیان بەهەر کامیان دەدا؟

سەنحاریب بەپاشای مناڵەکانی ئیسرائیلی وت: کوژران لەو کارەی لەگەڵ ئێمە دەیکەیت، باشترە، فەرمانی ئەو کارە بدە. پاشا ئەوانی بۆ زیندانی ئیعدام رەوانە کرد. خواوەند وەحی بۆ شۆعیای پێغەمبەر رەوانە کرد: بەپاشای مناڵەکانی ئیسرائیل بڵێ سەنحاریب و هاوەڵانی ئازاد بکات تا خەڵکەکەی خۆیان بترسێنن. رێزیان لێبگرێت و چوارپێیان پێبدات تا بگەنە وڵاتەکەی خۆیان.

شۆعیا پەیامی خواوەندی بەپاشا راگەیاند. پاشا ئەو کارەی کرد و سەنحاریب و هاوەڵانی ڕۆشتن تا گەیشتنە بابل. کاتێک گەشتنە بابل، خەڵکی کۆکردەوە و بەوانی وت کەخوا چ بەڵایەکی بەسەر سوپاکەیدا هێناوە. کاهینان وجادووگەران پێیان وت: ئەی پاشای بابل، ئێمە داستانی پەروەردگاری ئەوان و پێغەمبەرەکەیانمان بەو وەحی یەی بۆ خەڵکی رەوانە کردبوو، بۆ تۆ باس کرد بەڵام بەوتەکانی ئێمە رازی نەبوویت. کەس ناتوانێت رووبەرووی خواوەندی ئەم خەڵکە ببێتەوە.

هێرشەکەی سەنحاریب منالّەکانی ئیسرائیلی ترساند. خواوەند زیان و بەلأی ئەوی لەسەر هەلّگرتن تا ببنە وانەیەك بۆ داهاتووان. سەنحاریب دوای ئەو رووداوە حەوت سالّی دیکە ژیا و مرد.

دەستەیەك لەشوێنکەوتەکانی کتێب گومانیان کردووە پاشای منالّەکانی ئیسرائیل کەسەنحاریب هێرشی کردەسەر، شەل بوو. شەلی ئەو بەهۆی عەرەقی النسا ء وە بوو. سەنحاریب بەهۆی لاوازی و نەخۆشی ئەو چاوی تەماحی بڕییە ولأتەکەی. پێش سەنحاریب یەکێك لەپاشاکانی بابل بەناوی لیفر هێرشی کردبووە سەر. بەخت نەسر کوڕە مام و دەبیری ئەم پاشایە بوو. خواوەند بایەکی رەوانە و سوپاکەی ئەوی لەناو برد. پاشا و دەبیرەکەی گیانیان دەربرد. ئەم پاشایە بەدەستی کوڕەکەی کوژرا و بەخت نەسر لەکوژرانی هاورێکەی خۆی تورە و کوڕی باوککوژی کوشت. دوای ئەوە سەنحاریب کەنیشتەجێی نەینەوا بوو، لەگەلّ پاشای ئازەربایەجان هێرشی کردە سەر پاشای منالّەکانی ئیسرائیل . پاشای ئازەربایەجان سەلمانی چەپ دەست بوو. ئاژاوە لەنێوان سەنحاریب و سەلمان روویدا و شەڕی یەکیان کرد تا ئەوەی سوپاکەیان لەناوچوو و کالأکانیان لەلایەن منالّەکانی ئیسرائیلەوە تالأن کرا.

دەستەیەك گومان دەکەن ئەوەی بۆ شەڕی حەزقیا هاورێی شۆعیا ڕۆشت، سەنحاریب پاشای مەرصلّ بوو و کاتێك لەگەلّ سوپاکەی خۆی گەمارۆی خستە سەر بیت المقدس، خواوەند فریشتەیەکی رەوانە کرد و سەد و هەشتا و پێنج هەزار لەسوپاکەی کوشت. ماوەی پاشایەتی پاشای منالّەکانی ئیسرائیل بیست و نۆسالّ درێژەی کێشا.

دوای ئەو مەنشا کوڕی حەزقیا بۆ ماوەی سی و پێنج سالّ پاشایەتی کرد.

ئامون کوڕی مەنشا دوانزە سالّ لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت تا ئەوەی بەدەستی هاوەلأنی خۆی کوژرا.

دوای ئامون، یوشیا کوڕی ئامون سی و یەك سالّ پاشایەتی کرد تا بەدەستی فیرعەونی لووت براو و ناتەوانی میسر کوژرا.

دوای ئەو یاهو ئەحاز پاشایەتی گرتەدەست و فیرعەونی لووت براو بۆ شەڕی ئەو لەشکری کێشا. ئەوی گرت و بردی بۆ میسر و یوقاقیم کوڕی یاهوا ئەحازی وەك پاشا کردە جێگری باوکی. خەراجی لەسەر دانا. یوقاقیم خەراجی لە منالّەکانی ئیسرائیل

وەردەگرت و پاشایەتییەکەی بۆ ماوەی دوانزە ساڵ بەردەوام بوو. دوای ئەو یویاحین پاشایەتی گرتەدەست. سێ مانگ دوای دەسپێکی پاشایەتی، بەخت نەسر بەمەبەستی شەڕ کردن هێرشی کردەسەر. ئەوی گرت و بردی بۆ بابل و مەتنیا مامی ئەوی وەك پاشا دەستنیشان کرد و بەصدیقیا ناوی برد. صدیقیا دژایەتی بەخت نەسری کرد. بەخت نەسر هێرشی کردەسەر. ئەوی گرت و منالەکەی لەبەرچاوی خۆیدا سەربڕی. شارەکەی وێران کرد و منالەکانی ئیسرائیلی ئەسیر کرد و لەگەڵ پاشا ئەسیر کراوەکە ئەوانی بۆ بابل برد. لەوێ بوون تا کورووش کوڕی جاماسپ کوڕی ئەسب، بەهۆی پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ ئەوان، دووبارە ئەوانی بۆ بیت المقدس گەڕاندەوە چوونکە دایکی کورووش جاویل و بەوتەیەك حاویل ئیسرائیلی بوو. ماوەی پاشایەتی صدیقیا لەگەڵ سێ مانگ پاشایەتییەکەی یوحیا دە ساڵ و سێ مانگ بوو.

دوای ئەوە پاشایەتی بیت المقدس و شام کەوتە دەستی لەهراسب و دەستنیشاندەی ئەو، بەخت نەسر بوو.

لەمحەممەد کوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: کاتێك صدیقە پاشای منالەکانی ئیسرائیل کەپێشتر ئاماژەمان بەداستانەکەیدا، مرد، کاروباری منالەکانی ئیسرائیل شلەژا. دژایەتی یەکتر و یەکتریان کوشتار کرد. شۆعیا پێغەمبەر رەوانە کراو بوو بەڵام گوێیان لەوتەکانی نەگرت و خوایان نەپەرەستی. کاتێك لەسەر کارەکانیان بەردەوام بوون، خواوەند بەشۆعیای فەرموو لەناو خەڵکەکەت بۆ وتاردان بوەستە تا لەزمانی تۆوە وەحی بکەم. کاتێك بۆ وتاردان هەستا، خواوەند زمانی بۆ وەحی گوڕی، ئامۆژگاری کردن وئاگاداری کردنەوە و لەرووداوەکان ئەوانی ترساند. نیعمەتەکانی خواوەندی ژمارد و فەرمووی رووبەرووی مەترسییەکان بوونەتەوە. کاتێك شۆعیا کۆتایی بەقسەکانی هێنا، هێرشیان کردەسەر تا بیکوژن. لەدەست ئەوان هەڵات و گەیشتە دارێك. دارەکە قەڵشتی برد و ڕۆشتە ناو دارەکە. شەیتان گەیشت و سوچێکی جلەکانی گرت و نیشانی خەڵکانیدا. بەمشار دارەکەیان بڕییەوە و ئەویان لەگەڵ دارەکە کرد بەدوو کەرت.

داستانی شۆعیا و ئەو نەتەوەی ئەویان کوشت، لەمحەممەد کوڕی سوهەیلی بوخاری بیستوومە.

## گێرانەوەی رووداوەکانی لەهراسب و کوڕەکەی بەشتاسب و وێرانی بیت المقدس لەسەر دەستی بەخت نەسر

دوای کەیخوسرەو، لەهراسب کوڕی کەی وەجی کوڕی کەی مەنوش کوڕی کەیفاشین پاشایەتی فارسەکانی گرتەدەست. کەیخوسرەو ئەوی وەك پاشا دەستنیشان کردبوو. کاتێك تاجی لەسەر نا، وتی: ئێمە چاکە پێش هەموو کارەکانی دیکە دەخەین. لەسەر تەختی جەواهیر نیشان و رازاوە بەجۆرەکانی خشڵ، دانیشت و فەرمانیدا تا لەسەرزەمینی خوراسان بناغەی شاری بەڵخیان داڕشت و ناوی نا حەسنا. دیوانەکانی دروست کرد و پاشایەتی بەهێز بوو. سوپایەکی بۆ خۆی دروست کرد و زەوییەکانی ئاوەدان کردەوە. خەراجی وەرگرت تاخەرجی سوپاکەی بدات. بەخت نەسری دەستنیشان کرد کە بەوتەیەك ناوی ئەو بەفارسی بەختەرشە بوو.

لەهوشام کوڕی محەممەدی کەلبی دەگێڕنەوە: لەهراسب برازای کاووس بوو و بناغەی شاری بەڵخی داڕشت. لەرۆژگاری ئەو شکۆ و مەزنی تورکەکان فراوان بوو. شوێنی نیشتەجێ بوونی لەهراسب بەڵخە کەلەوێوە شەڕی لەگەڵ تورکەکان دەکرد. دەڵێت بەخت نەسر لەرۆژگاری لەهراسب و سوپاسالاری رۆژئاوای دیجلە لەنێوان سەرزەمینی ئەهواز تا سەرزەمینی رۆم لەدەست ئەودا بوو. بەرێکەوت تا گەیشتە دیمەشق و خەڵکەکەی بەئاشتی لەگەڵی رێککەوتن. یەکێك لەسەردارەکانی خۆی بەرەو بیت المقدس رەوانە کرد و لەگەڵ پاشای منداڵەکانی ئیسرائیل کە لەمنداڵەکانی داوود بوو، پەیمانی ئاشتی بەست. چەندین کەسی وەك بارمتە وەرگرت و لەوێوە گەڕایەوە. کاتێك گەیشتە تەبەریە، خەڵکانی منداڵەکانی ئیسرائیل هێرشیان کردە سەرپاشاکەی خۆیان و خوێنیان ڕشت و وتیان: بارمتەت بەبابلییەکاندا و ئێمەت ریسوا کرد. خۆیان بۆ شەڕ ئامادە کرد وسەردارەکەی بەخت نەسر ئەوی لەرووداوەکان ئاگادار کردەوە. وەڵامی بۆ گەڕایەوە کەبارمتەکان بکوژێت و لەشوێنی خۆی بمێنێتەوە تا خۆی دەگات. بەخت نەسر بەرێکەوت تا گەیشتە بەیت المقدس و بەزۆر دەستی بەسەر شارەکەدا گرت. شەڕکەرانی کوشت و ژن و منداڵەکانی ئەسیری کرد.

دەڵێن: بەخت نەسر ئەرمیای پێغەمبەری لەناو زیندانی منداڵەکانی ئیسرائیلدا بینی. خواوەند ئەوی وەك پێغەمبەر رەوانە کردبوو تا منداڵەکانی ئیسرائیل لەرووداوی

بەخت نەسر ئاگادار بکاتەوە و پێیان بڵێت ئەگەر تۆبە نەکەن و دەست لەکار و کردەوەکانی خۆیان هەڵنەگرن، خوا کەسێك دەکاتە فەرمانڕەوای ئەوان کەشەڕکەرانیان بکوژێت و ژن و منداڵەکانیان بەئەسیری ببات.

بەخت نەسر بەئەرمیای وت: داستانەکە چییە؟

ئەرمیا وتی: خواوەند ئەوی ڕەوانە کردووە تا خەڵکەکەی لەچارەنوسی ئەوان ئاگادار بکاتەوە. ئەویان بەدرۆزن ناوبرد و خستیانە زیندانەوە.

بەخت نەسر وتی: چ خەڵکانێکی خراپ بوون کەنافەرمانی نێردراوی خوایان کرد. ئازادی کرد و ڕێزی لێگرت.

لاوازەکانی منداڵەکانی ئیسرائیل، لەدەوری ئەرمیا کۆبونەوە و وتیان: خراپەمان کرد وستەممان کردە پیشە، ئێستا لەوەی کردوومانە تۆبە دەکەین و پەشیمانی خۆمان دەردەبڕین. داوا لەخواوەند بکە بەتۆبەکەی ئێمە ڕازی ببێت. ئەرمیا لەپەروەردگار پاڕایەوە. وەحی هاتەخوار: ئەو کارە ناکەن، ئەگەر ڕاست دەکەن لەگەڵ تۆدا لەشار بمێننەوە. ئەرمیا لەفەرمانی خواوەند ئاگاداری کردنەوە. وتیان: چۆن لەشارێك کەوێران بووە وخوا لەخەڵکەکەی توڕەیە، بمێنینەوە. نەیانویست بمێننەوە و بەخت نەسر بۆ پاشای میسر نامەی نوسی کەدەستەیەك لەبەندەکانی من بۆ لای تۆ هەڵاتوون، ئەوان بۆ من بگەڕێنەرەوە وەگەرنە بۆ شەڕی تۆ بەرێدەکەوم و دیاری تۆ وێران و لەژێر سمی ئەسپەکانم دەشێلم. پاشای میسر لەوەڵامدا بۆی نووسی: ئەوانە بەندەی تۆ نین بەڵکو ئازادەکانن.

بەخت نەسر هێرشی کردەسەر و کوشتی و خەڵکی میسری ئەسیر کرد. لەوێوە بۆ سەرزەمینی مەغریب بەرێکەوت و گەیشتە دوورترین ناوچەی مەغریب. دوای ئەوە زۆریەك لەخەڵکانی فەلەستین و ئەردەنی ئەسیر کرد کەدانیال و پێغەمبەرەکانی دیکە لەناویاندا دەبینران.

دەڵێت: لەو رۆژگارەدا منداڵەکانی ئیسرائیل بڵاوببونەوە و دەستەیەکیان لەسەرزەمینی حیجاز لەیەسرب و وادی ئەلقورا و شوێنەکانی دیکە نێشتەجێ بوون.

دەڵێت: خواوەند وەحی بۆ ئەرمیا نارد: دووبارە بیت المقدس ئاوەدان دەکەمەوە، بڕۆ و لەوێ دابەزە. ئەرمیا ڕۆشت. ئەو شارە وێرانە بوو، بەخۆی وت: سبحان الله، خواوەند فەرمانی پێداوم، لەم شارە دابەزم چوونکە ئێرە ئاوەدان دەکاتەوە، ئێرە چۆن

دەتوانرێت ئاوەدان بکرێتەوە و چۆن خواوەند دوای مردن زیندووی دەکاتەوە. ئەوسا سەری خستە سەرزەوی و خەوی لێکەوت. کەرەکەی خۆی و سەوەتەیەک خواردەمەنی پێبوو، بۆ ماوەی حەفتاساڵ لەخەودا مایەوە تا ئەوەی بەخت نەسر و پاشاکەی لەناوچوون.

ماوەی پاشایەتی لەهراسب سەد و بیست ساڵ درێژەی کێشا و دوای ئەو بەشتاسبی کوڕی پاشایەتی گرتەدەست و ئاگادار بوویەوە کەدیاری شام وێران و درندەکان لەسەرزەمینی فەلەستین فراوان و لەمرۆڤەکان کەس لەوێ نەماوەتەوە. لەناو منداڵەکانی ئیسرائیل لەبابل جاریدا هەرکەس دەخوازێت بۆ شام بگەرێتەوە. یەکێك لەبنەماڵەی داوودی کردە پاشای ئەوان و فەرمانی ئاوەدان کردنەوەی بیت المقدس و سەر لەنوێ دروست کردنەوەی مزگەوتەکەی پێدل. ئیسرائیلیەکان باریان بەست و بیت المقدسیان ئاوەدان کردەوە. خواوەند چاوەکانی ئەرمیای کردەوە و سەیری شارەکەی کرد کەچۆن ئاوەدان دەبوویەوە و بناغەی دەگرت. لەخەودابوو تا ئەوەی سەد ساڵ تێپەری. ئەوسا خواوەند لەخەو بەئاگای هێنایەوە و گومانی دەکرد کاژێرێك زیاتر نەخەوتووە. شارەکەی بەچۆڵ و خاڵی لەدانیشتووان بینیبوو، کاتێك سەیری کرد وتی: دەزانم خواوەند بۆ هەموو شتێك بەتوانایە.

دەڵێت: منداڵەکانی ئیسرائیل لەبیت المقدس نیشتەجێ بوون. کاروباریان ساماندرا و ژمارەیان زیادی کرد تا لەدەورانی پاشایی تیرەکان، رۆمیەکان بەسەریاندا زاڵبوون و دوای ئەوە چیتر هیچ کات کۆنەبوونەوە و یەکیان نەگرتەوە.

هوشام دەڵێت: دەرکەوتنی زەردەشت کەئاگر پەرستەکان ئەو بەپێغەمبەری خۆیان دەزانن، لەرۆژگاری بەشتاسب بوو. بەگومانی دەستەیەك لەزاناکانی شوێنکەوتەی کتێب، زەردەشت لەخەڵکانی فەلەستینە و خزمەتکاری یەکێك لەقوتابیەکانی ئەرمیا بوو. لەو نزیك کەوتەوە و خیانەت و درۆی لەگەڵ کرد. نفرینی کرد و گول و گەڕ بوو و لەوێوە بەرەو دیاری ئازەبایەجان بەرێکەوت و بناغەی ئایینی ئاگرپەرەستی دارشت. لەوێوە رۆشتە لای بەشتاسب کەنیشتەجێی بەلخ بوو. کاتێك رۆشتە لای و دینەکەی خۆی بۆ ئاشکرا کرد، بەشتاسب دینەکەی پەسەند و خەڵکی بۆ رازی بوون بەو ئایینە تازەیە ناچار کرد. لەسەر ئەم کارە ژمارەیەکی زۆر لەکەسانی ژێر دەست و خەلکانی کوشت تا ئەوەی بەئایینی زەردەشتی رازی بوون.

بەلأم زاناکانی شوێنکەوتەی هەوالْ و شارەزایانی مێژوو وتوویانەی کەی لەهراسب لەگەڵ خەڵکەکەی هەڵس و کەوت و کردەوەیەکی پەسەند کراوی گرتەبەر و پاشاکانی دەوروبەری ئێرانشاری بەسەختی سەرکوت کرد و بەخشش و رێزی فراوانی لەهاوەلأنی خۆی دەگرت. بۆ هەڵکەندنی چاڵەکان و بینا کردنی بیناکان و ئاوەدانی شارەکان هەوڵی زۆری دەدا. پاشاکانی رۆم و مەغریب و هیند و شوێنەکانی دیکە سالأنە باجیان پێدەدا و لەنامەکان رێزی ئەویان دەگرت و ئەویان بەشای شاکان ناو دەبرد چوونکە لەهێز و شکۆی ئەو دەترسان.

دەڵێن: بەخت نەسر لەئورشەلیمەوە گەنج و سامانی فراوانی بۆ برد و کاتێك هێزی ئەو بەرەو لاوازی رۆشت، کوڕەکەی خۆی بەشتاسبی کردە پاشا و خۆی لەپاشایەتی بەدوور گرت و کاروباری ولأتەکەی بەو سپارد. ماوەی پاشایەتی لەهراسب وەك ئاماژەیان پێداوە، سەد و بیست ساڵ درێژەی کێشا.

دەڵێن: بەخت نەسر کەشەری لەگەڵ منالْەکانی ئیسرائیل کرد، ناوی بەخترەشەیە و پیاوێك بوو لەعەجەمەکان و لەمنالْەکانی گودەرز. سالْەکانی تەمەنی درێژ بوویەوە و لەسێسەد تێپەری. خزمەتی لەهراسب باوکی بەشتاسبی دەکرد. لەهراسب ئەوی بۆ شام و بیت المقدس رەوانە کرد تا جوولەکەکان لەوێ دەربەرێنێت. رۆشت و گەڕایەوە و دوای لەهراسب خزمەتی کوڕەکەی یانی بەشتاسبی کرد و دوای ئەو خزمەتی بەهمەن و بەهمەن نیشتەجێی شاری بەلْخ بوو و بەلْخیان بەحەسنا ناو دەبرد. بەهمەن فەرمانی بەبەخت نەسردا بڕواتە بیت المقدس و جولەکەکان دەربکات. هۆکارەکەی ئەوە بوو فەرمانڕەوای بیت المقدس هێرشی کردبووە نێردراوانی بەهمەن و چەند کەسێك لەوانی کوشتبوو. کاتێك بەهمەن ئاگادار بوویەوە، بەخترەشەی بانگ کرد وئەوی وەك شای بابل دەستنیشان کرد و فەرمانی پێدا بڕواتە بابل و لەوێوە بڕواتە شام و بیت المقدس و هێرش بکاتە سەر جوولەکەکان وپیاوەکانیان بکوژێت وژن و منالْەکانیان ئەسیر بکات. سەرپشکی کردتا هەرکەسێك لەگەورەکان کەدەخوازێت بکاتە هاورێی خۆی و ئەو لەبنەماڵەی پاشایەتی داریوش کوڕی مێهری هەڵبژارد کە لەمنالْەکانی مازی کوڕی یافس کوڕی نوحە. ئەو خوشکەزای بەخترەشە بوو.

هەروەها کوروشی کەیکوانی هەڵبژارد کە لەمنالْەکانی غەیلەم کوڕی سامە و خەزێنەداری بەهمەن بوو لەگەڵ ئەخشویریش کوڕی کورش کوڕی جاماسب کە

نازناوی عالەمی پێرا هاوریێ لەگەڵ بەهرام کوڕی کورش کوڕی بەشتاسب.

بەهمەن ئەم چوارکەسەی کە لەبنەماڵە ولەکەس نزیکەکانی خۆی بوون، کردە هاورێی بەخترەشە. هەروەها سێسەد کەس لەدەست و پێوەندەکان و پەنجا هەزار سوپای پەیوەستی ئەو کرد و رێگەی پێدا هەرچی دەخوازێت، دیاری بکات. بەخترەشە لەگەڵ ئەوان بەرێکەوت تا گەیشتە بابل. یەك ساڵ مایەوە تا کەرەستەکانی شەڕ کۆبکاتەوە. دەستەیەکی فراوان لەدەوری کۆبونەوە و لەناو ئەوان پیاوێك لەمناڵەکانی سەنحاریب پاشا لەشەڕ دژی حەزقیا کوڕی ئەحاز پاشای شام و بیت المقدس و هاورێی شۆعیای پێغەمبەر بەشداری کردبوو و ناوی ئەم پیاوە بەخت نەسر و کوڕی نەبوزەرادان کوڕی سەنحاریب پاشای موسڵە. سەنحاریب کوڕی داریوش و رەچەڵەکی بۆ نەمرود کوڕی کوش کوڕی حام کوڕی نوح دەگەڕێتەوە.

ئەم نەوەی سەنحاریبە بەهۆی ئەو کارەی حەزقیا و ئیسرائیلیەکان لەکاتی شەڕ لەگەڵ سەنحاریب لەگەڵ باوەگەورێی ئەو کردبوویان، بۆ شەڕ لەگەڵ مناڵەکانی ئیسرائیل پەیوەستی بەخترەشە بوو و ئەوی کردە هۆکارێك بۆ تۆڵە سەندنەوەی خۆی. بەخترەشە ئەوی لەگەڵ دەستەیەکی فراوان لەپێشەوە رەوانە کرد و خۆی بەدوای ئەودا بەرێکەوت.,

کاتێك سوپاکان گەیشتە بیت المقدس، بەخترەشە سەرکەوتنی بەدەست هێنا چوونکە خواوەند ئیرادەی کردبوو سزای مناڵەکانی ئیسرائیل بدات. بەخترەشە ئەسیری گرت و ماڵەکانی خاپوور وبۆ بابل گەڕایەوە و یوحاحن کوڕی یویاقیم پاشای ئەوکاتی مناڵەکانی ئیسرائیل لەگەڵ خۆی برد کە لەمناڵەکانی سلێمان و لەجێگەی ئەو پاشایەتی بەمتنیاعەم یوحسا بەخشی و بەصدقیا ناوی برد.

کاتێك بەخت نەسر گەیشتە بابل، صدیقیا دژایەتی ئەوی کرد. بەخت نە صر جارێکی دیکە بۆ شەڕی ئەو بەرێکەوت و سەرکەوتنی بەدەست هێنا و شار و پەیکەرەکەی وێران کرد. صدیقیای زیندانی و مناڵەکەی سەربڕی. دواتر ئەوی لەگەڵ خۆی بۆ بابل برد. مناڵەکانی ئیسرائیل لەبابل مانەوە تای ئەو کاتەی دووبارە بۆ بیت المقدس گەڕانەوە.

زاڵبوونی بەخت نەسر ناسراو بەبەخترەشە بەسەر بیت المقدس بەپێی ئەم گێڕانەوەیە چل ساڵ بوو. دوای ئەو کوڕەکەی ئولمەردوخ دەرکەوت و بیست و سێ

ساڵ پاشایەتی ئەو ناوچەی کرد و کاتێك مرد، کوڕەکەی بەلتشسەر بۆ ماوەی یەك ساڵ پاشایەتی کرد.

کاتێك بەلتشسەر پاشایەتی گرتەدەست، کاروبارەکان پەرێشان بوون. بەهمەن کاتێك بۆ سەرزەمینی ڕۆژهەڵات ڕۆشت، ئەوی لەسەر کار لابرد و لەجیاتی ئەو داریوشی مازەوی کەرەچەڵەکی بۆ مازی کوڕی یافس کوڕی نوح دەگەڕێتەوە، وەك پاشای بابل و سنورەکانی دەوروبەری وەك شام دەستنیشان کرد. ئەو بەلتشسەری کوشت و بۆ ماوەی سێ ساڵ پاشایەتی کرد. دواتر بەهمەن ئەوی لەسەر کار لابرد و کیرەشی غەیلەمی وەك پاشا دیاری کرد کە لەمناڵەکانی غەیلەم کوڕی سام کوڕی نوحە. غەیلەم ئەو کەسەیە کاتێك جامر لەگەڵ مازی بەرەو ڕۆژهەڵات ڕۆشت، هاورێیەتی دەکرد و کاتێك کیرەش پاشایەتی بابلی گرتەدەست، نامەی بۆ بەهمەن نووسی تا لەگەڵ مناڵەکانی ئیسرائیل هەڵس وکەوتێکی نەرم بگرێتەبەر و ڕێگەیان بدات، لەهەر شوێنێك دەخوازن نیشتەجێ بن و بۆ سەرزەمینەکەی خۆیان بگەڕێنەوە و کەسێك وەك فەرمانڕەوای ئەوان دەستنیشان بکات. مناڵەکانی ئیسرائیل دانیالی پێغەمبەریان هەڵبژارد. دانیال هەڵسووڕانی کاروبارەکانی ئەوانی لەئەستۆ گرت. کیرەش بۆ ماوەی سێ ساڵ پاشایەتی بابل و دەوروبەری کرد. ئەم ساڵانە لەکاتی زاڵ بوونی بەخت نەسر تا کۆتایی پاشایەتی ئەو و مناڵەکانی و پاشایەتی کیرەشی غەیلەمی، بەقۆناغی وێرانی بیت المقدس هەژمار دەکرێت و ماوەکەی حەفتا ساڵە.

دوای ئەو، یەکێك لەخزمەکانی بەهمەن بەناوی ئەخشوارش کوڕی کیرەش کوڕی جاماسب کە بەزانا ناودەبرا، پاشایەتی بابلی گرتەدەست. یەکێك بوو لەو چوار سالارەی بەختەرەشە لەکاتی ڕۆشتن بۆ شام هەڵیبژاردبوو. بۆیە وەك پاشای بابل دەستنیشان کرا چوونکە بەشێوەیەکی شیاو بۆ لای بەهمەن گەڕایەوە. کەرئەردەشێر کوڕی دەشکال کە لەلایەن بەهمەنەوە وەك فەرمانڕەوای سند و هیند دەستنیشان کرابوو، دژایەتی بەهمەنی کرد. شەشسەد هەزار کەس شوێنکەوتەی ئەو بوون. بەهمەن فەرمانڕەوایی ئەو ناوچەی بەئەخشو یەرش سپارد و فەرمانی پێدا هێرش بکاتە سەر کەرئەردەشێر. ئەخشو یەرش هێرشی کردەسەر و خۆی و زۆربە شوێنکەوتەکانی کوشت. بەهمەن سنووری فەرمانڕەوایەتی ئەوی زیاد کرد و چەند ویلایەتی دیکەی پێبەخشی. ئەو لەشووش نیشتەجێ و گەورەکانی کۆکردەوە و

گۆشتی دەرخواردی خەڵکدا و لەیەك ڕۆژ بۆ سەد و بیست سالار ئالآی هەڵکرد. لەگەڵ هەر سالارێك هەزار پیاوی شەڕکەری ڕەوانە کرد. هەرکامیان بۆ شەڕ بەرابەر بوو لەگەڵ سەد پیاو.

شوێنی نیشتەجێ بوونی ئەخشو یەرش بابلە بەلآم بەزۆری لەشووش دەمایەوە. لەدیلەکانی منالەکانی ئیسرائیل ژنێکی بەناوی ئەشتەر کچی حاویل وەك هاوسەر هەڵبژارد. مەردخای کوڕە پوور و برای شیری ئەشتەر، ئەوی پەروەردە کردبوو. دایکی مەردخای شیری بەئەشتەر دابوو و هۆکاری هاوسەرگیری ئەخشو یەرش لەگەڵ ئەشتەر ئەوە بوو ژنەکەی خۆی کوشت کەناوی وەشتارا بوو. ژنێکی جوان ولەبەر ئەوەی پاشا پێی وت بێ پەردە خۆی نیشانی خەڵکان بدات تا هەمووان جوانی روخساری ئەو ببینن بەلآم ژن رازی نەبوو، ئەوی کوشت و دوای کوشتنی ئەو زۆر گریا. پێیان وت: سەیری ژنانی دنیا بکات. پاشا ئەو کارەی کرد و ئەشتەری هەڵبژارد کەژنێکی ئیسرائیلی بوو.

بەگومانی نەصاری، کاتێك ئەخشویەرش ڕۆشتە بابل، ئەشتەر کوڕێکی بۆ هێنایە دنیا و ناوینا کیرەش.

پاشایەتی ئەخشویەرش چواردەساڵی خایاند. مەردخای تەوراتی فێر کردبوو و باوەڕی بەئایینی ئیسرائلیەکان هێنابوو. لەدانیالی پێغەمبەر و ئەو کەسانەی هاوڕێیەتی ئەویان دەکرد وەك حەننیا و میشاییل و عازریا زانیاری زۆری دەستکەوت. داوایان لێکرد مۆڵەتیان پێبدات بۆ ئەوەی بڕۆنە بیت المقدس بەلآم رازی نەبوو و وتی ئەگەر هەزار پێغەمبەر لەئێوە لەگەڵ مندا بێت، تا ئەوکاتەی زیندووم کەسیان لەمن جیانابێتەوە.

ئەخشویەرش کاری داوەری بەدانیال سپارد. هەموو کارەکانی خۆی بەو سپارد و وتی هەموو ئەو شتانەی لەخەزێنەدا بوو و کاتی خۆی بەخت نەسر لەبیت المقدس هێنابووی، دەربێنێت و بیانگەڕێنێتەوە. دەستی بەدروست کردنەوەی بیت المقدس کرد کە لەدەورانی کیرەش کوڕی ئەخشویەرش ئاوەدان بوویەوە.

ماوەی پاشایەتی کیرەش لەرۆژگاری بەهمەن و خەمانی بیست و دوو ساڵ درێژەی کێشا. بەهمەن لەسیانزەیەم ساڵی پاشایەتی کیرەش مرد و مەرگی کیرەش لەساڵی چوارەمی پاشایەتی خەمانیدا بوو. هەموو ساڵەکانی پاشایەتی کیرەش کوڕی

نەخشویەرش بیست و دوو ساڵە.

ئەمە گێڕانەوەکانە لە زاناکان و شارەزایانی مێژوو سەبارەت بەکاروباری بەخت نەسر و چۆنییەتی هەڵس و کەوتی ئەو لەگەڵ منالەکانی ئیسرائیل. بەلام زاناکانی مێژووی کۆن لەمبارەوە بۆچوونیان جیاوازە.

بۆنمونە گێڕانەوەی سەعید کوڕی جوبەیر بەمشێوەیە: یەکێك لەخەڵکی منالەکانی ئیسرائیل تەوراتی دەخوێندەوە، دەگێڕنەو گەشتە ئەم دێرە کە ((بعثنا عليكم عبادا لنا اولى بأس شديد. واتاکەی: بەندە خۆڕاگر و بەهێزەکانمان کردە فەرمانڕەوایی ئەوان.)) گریا و چاوەکانی پڕبوو لەفرمێسك. ئەوسا کتێبەکەی بەست و وتی: ئەمە ئەو شتەیە خواوەند لەرۆژگاری ویستوە. وتی: پەروەردگارا، ئەم پیاوە کەلەناوچونی منالەکانی ئیسرائیل لەسەر دەستی ئەو دەبێت، نیشانی منی بدە. پیاوێك لەدانیشتووانی بابلی لەخەودا بینی بەناوی بەخت نەسر. ئەم ئیسرائیلیە کەسێکی دەوڵەمەند و بەتوانا بوو. لەگەڵ نۆکەر و سامانەکەی خۆی مەبەستی رۆشتن بۆ بابلی کرد. وتیان: بۆ کوێ دەڕۆیت؟ وتی: بۆ بازرگانی دەڕۆم. لەبابل لەماڵێك دابەزی و ئەو شوێنەی بەکرێ گرت. کەس جگە لەخۆی لەناو ماڵەکەدا نەبوو. نیازمەندانی کۆدەکردەوە و نیازەکانی بەراوەردە دەکردن. هەرکەس دەهات، هاوکاری دەکرد و وتی: ئایا کەسێکی دیکە هەیە نیازمەند بێت؟

وتیان: بەڵێ، کەسێك هەیە لەفلان بنەماڵە کەنەخۆشە و ناوی بەخت نەسرە.

ئیسرائیلی بەکۆیلە و نۆکەرەکانی خۆت با بڕۆین بۆ سەردانی. کاتێك گەیشتە لای ئەو، وتی: ناوی تۆ چییە؟

وتی: بەخت نەسر.

ئیسرائیلی بەکۆیلەکانی خۆی وت هەڵیبگرن و بیبەن بۆ لای خۆیان. پەرەستاری لێکرد تا چاك بوویەوە. جل و بەرگی لەبەر کرد و رۆژی پێدا. دواتر ئسرائیلی رایگەیاند دەیەوێت بگەڕێتەوە. بەخت نەسر گریا و ئیسرائیلی وتی: گریانی تۆ لەبەر چییە؟

وتی: بۆ ئەوە دەگریم ئەو هەموو چاکەت لەگەڵ کردم بەلام هیچم نییە بەتۆی بدەم.

ئیسرائیلی وتی: شتێکی سادەیە هەیە کەئەگەر بەپاشایەتی گەیشتیت، لەمنی دریغ نەکەیت.

بەخت نەسر بەدوایدا دەڕۆشت و دەیوت: گاڵتەم پێدەکەیت؟ هیچ ڕێگرێکی نەدەبینی بۆ ئەوەی بەداواکەی ڕازی ببێت بەڵام بڕوای وابوو گاڵتەی پێدەکات.

ئیسرائیلی گریا و وتی: دەزانم بۆ بەداواکەی من ڕازی نابیت چوونکە خواوەند دەیەوێت قەزای خۆی بەئەنجام بگەیەنێت. لەکتێبەکەی ئەودا تۆمار کراوە و ڕۆژگاری کاری خۆی ئەنجام دەدات.

صیحون پاشای پارسی بابل وتی: چی دەبوو ئەگەر پێشەنگێکمان بۆ شام ڕەوانە دەکرد.

وتیان: چ زیانێکی هەیە ئەگەری ڕەوانەی بکەیت؟

وتی: چ کەسێکتیان پێ باشە.

وتیان: فلانکەس.

صیحون ئەو پیاوەی ڕەوانە کرد. سەد هەزار سکەی پێدا. بەخت نەسر لەچێشتخانەکەی ئەودا بوو. تەنیا بۆ خواردن دەڕۆشتە ئەوێ. کاتێك پێشەنگ گەیشتە شام، بینی ئەوێ زیاتر لەهەر شوێنێکی دیکە ئەسپ و پیاوی شەڕکەری هەیە. پەرێشان بوو وپرسیاری هیچی نەکرد. بەخت نەسر دەڕۆشتە ناو کۆبوونەوەی خەڵکی شام و بەردەوام دەیوت: بۆ لەگەڵ بابلیەکان شەڕ ناکەن، ئەگەر هێرشیان بکەنەسەر، خەزێنەکانیان دەکەوێتە بەردەستی ئێوە.

لەوەڵامدا دەیانوت: ئێمە هونەری جەنگ نازانین و شەڕکەر نین. هیچ کۆڕێك نەبوو کەنەیبینێت.

گەڕانەوە و پێشەنگ پاشای لەهەموو ڕوداوەکان ئاگادار کردەوە. بەخت نەسر بەسوارەکانی پاشای دەوت: ئەگەر پاشا بانگی من بکات، شتێکی دیکە دەهێنمە سەرزمان. پاشا ئەوی بانگ کرد و بەخت نەسر بۆچوونی خۆی باس کرد. وتی فلانکەس لەبەر ئەوەی ژمارەیەکی زۆری ئەسپ و پیاوی شەڕکەری لەوێ بینی، پەرێشان بوو و پرسیاری هیچی نەکرد. بەڵام من لەناو کۆبوونەوەی خەڵکانی شام دانیشتم و بەم شێوە و بەو شێوە وەڵامیان دامەوە. پێشەنگ بەبەخت نەسری وت: منت ڕیسوا کرد، سەد هەزار سکە وەربگرە و واز لەم گفتوگۆیە بێنە.

وتی: ئەگەر هەموو خەزێنەی بابل بەمن بدەیت، واز ناهێنم.

ڕۆژگاری کاری خۆی کرد و پاشا وتی چی دەبوو ئەگەر سوپایەکمان بۆ شام

ڕەوانە دەکرد تا ئەگەر دەرفەتیان دەست کەوت، گوڕزی خۆیان بوەشێنن و بگەڕێنەوە.

وتیان: چ زیانێکی هەیە؟

وتی: کێ پەسەند دەکەن؟

وتیان: فلانکەس.

وتی: نە، ئەو کەسە ڕەوانە دەکەم کە لەبارودۆخی شام ئاگاداری کردمەوە. داوای بەخت نەسر و ئەوی ڕەوانە کرد. چوارهەزار کەس لەسوارە هەڵبژێردراوەکانی خۆی پەیوەستی ئەو کرد. بەرێکەوتن و هێرشیان کردە سەر ویلایەتەکان و تا ئەو شوێنەی خواوەند ویستی، ئەسیریان گرت و کوشتار و وێرانیان نایەوە. لەم ناوەدا صیحون مرد و وتیان: پیاوێك بکەنە جێگری ئەو.

وتیان: چاوەڕێ بکەن تا هاوەڵانتان لەشام بگەڕێنەوە، ئەگەری هەیە بۆچوونیان جیاواز بێت.

چاوەڕێیان کرد تا بەخت نەسر لەگەڵ ئەسیر و سامانەکان گەڕایەوە و لەناو خەڵکاندا دابەشی کرد. وتیان: کەس بۆ پاشایەتی لەو شیاوتر نییە.

کەسانی دیکە وتیان: بەخت نەسر بۆیە شەڕی لەگەڵ منداڵەکانی ئیسرائیل کرد، لەبەر ئەوەی یەحیا کوڕی زەکەریایان کوشت.

ئاماژەدان بەبێژەرانی ئەم وتەیە:

لەسەدی دەگێڕنەوە: کاتێك صیحائین ئاگادار بوویەوە پاشای منداڵەکانی ئیسرائیل یەحیا کوڕی زەکەریای کوشتووە، بەخت نەسری بۆ شەڕی ئەوان ڕەوانە کرد.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: خواوەند دوای شۆعیا پیاوێکی لە منداڵەکانی ئیسرائیل بەناوی یاشیە کردە پاشا و خزری وەك پێغەمبەری ئەوان ڕەوانە کرد. بەوتەی وەهب کوڕی مونبە ناوی خزر ئەرمیا کوڕی خەلقیا و لەنەوەی هاروونە.

لەوەهب کوڕی مونبەی یەمەنی دەگێڕنەوە: خواوەند کاتێك ئەرمیای وەك پێغەمبەری منداڵەکانی ئیسرائیل هەڵبژارد، پێی فەرموو: ئەی ئەرمیا، پێش ئەوەی تۆ بئافرێنم، هەڵمبژاردی و پێش ئەوەی لەناو سکی دایکتا، خۆ بگریت، پاکم کردیتەوە

و پێش ئەوە بالغ ببیت، تۆم کردە پێغەمبەر و پێش ئەوەی بگەیتە تەمەنی کەماڵ، تاقیمکردیتەوە و بۆ کارێکی گەورە هەڵمبژاردیت.

خواوەند ئەرمیای بۆ لای پاشای منداڵەکانی ئیسرائیل رەوانە کرد تا رێنوێنی بکات و لەپەیام و هەواڵەکانی خواوەند ئاگاداری بکاتەوە.

دەڵێت: لەناو منداڵەکانی ئیسرائیل دیاردەی تازە دەرکەوت و دەستیان بەگوناحەکان پیس بوو، حەرامەکانیان حەڵاڵ و نیعمەتەکانی خواوەندیان لەبیر کرد کە لەسەنحاریب و سوپاکەی ئەو رزگاری کردبوون. خواوەند وەحی بۆ ئەرمیا نارد تا بڕواتە لای خەڵکەکەی و لەوتاری خواوەند ئاگاداریان بکاتەوە و پێیان بڵێ: نیعمەتەکانی منیان لەبیر بێت و لەدیاردە تازەکان دووریان بخەرەوە.

ئەرمیا وتی: ئەگەر هێزم پێنەبەخشیت، لاوازم وئەگەر رێنوێنیم نەکەیت هەڵە دەکەم و ئەگەر هاوکاریم نەکەیت، ریسوا دەبم.

خواوەند فەرمووی: مەگەر نازانی هەموو کارەکان بەئیرادەی من ئەنجام دەدرێن. دڵەکان و دەستەکانم لەدەستدایە و ئەگەر بمەوێت، دەیانگۆڕم. گوێرایەڵی من دەبیت و من خواوەندی بێ هاوتام. ئاسمان و زەوی و ئەوەی لەناو ئەواندایە، بەوشەکانی من ئافرێنراون. من لەگەڵ دەریاکان قسەم کرد و تێگەیشت و فەرمانمدا و ئەنجامیدا. سنورەکانم بۆ دیاری کردن تا سنوری خۆریان نەبەزێنن. شەپۆلە کێوە ئاساکان دێن و کاتێك دەگەنە سنوری دیاریکراوی من، لەترسی فەرمانی من ریسوا و لاواز دەبن. من لەگەڵ تۆم و بەبوونی من خراپە بەتۆ ناگات. من تۆم بۆ لای دەستەیەکی گەورە لەئافرێنراوکانی خۆم رەوانە کردووە تا پەیامەکەی من بگەیێنیت و کاتێك هەموو کەسەکان ببنە شوێنکەوتەی تۆ، پاداشتت پێدەبرێت و لەپاداشتی ئەوان کەم نابێتەوە و ئەگەر کەمتەرخەمی بکەیت، گوناحەکەت هاوشێوەی گوناحی ئەوانە لەبەر ئەوەی ئەوانت لەگومڕایی خۆیاندا بەجێهێشت و هیچ لەگوناحی ئەوان کەم نابێتەوە. بڕۆ لای خەڵکەکەی خۆت و بڵێ: خواوەند خۆپارێزی باوکانی خۆتانتان بیردەخاتەوە و دەیەوێت بۆ تۆبە ناچارتان بکات. لێیان بپرسە باوکانی ئەوان لەپەرەستینی من چییان پێبڕاوە و لەنافەرمانی کردنی من گیرۆدەی چ بەڵایەك بوون. ئایا کەس پێش ئەوان فەرمانبەری منی کردووە و بەو هۆیەوە بەدبەخت و چارەڕەش بووبێت یا نافەرمانی منی کردووە کەبەهۆیەوە بەختەوەری پێبڕابێت؟ چوارپێکان کاتێك شوێنە باشەکانیان

لەبیر بێت بۆ ڕۆشتن بۆ ئەو شوێنانە هەوڵ دەدەن بەڵام ئەم خەڵکە لەلەوەرگەی مردندا پیاسە دەکەن. زانا و ڕاهیبەکانیان بەندەکانی منیان کردۆتە بەندەی خۆیان و بۆ پەرەستینی شتەکانی دیکە ناچاریان کردون. بەپێچەوانەی کتێبەکەی من لەنێوان ئەوان داوەری دەکات بەشێوەیەك پەرەستینی منیان لەبیر کردووە و بەرابەر بەمن بوێر بوون. ئەمیر وسەرکردەکانیان کوفرانی نیعمەت دەکەن و لەفریوی من پارێزراون. کتێبەکەی منیان پشتگوێ خستەوە و پەیمانەکەیان لەبیر کردووم. بەندەکانی من فەرمانبەری ئەوان دەکەن فەرمانبەری کردنێك کەشیاوی هیچ کەسێك نییە و ڕەوان نییە بۆ نافەرمانی کردنی من، فەرمانەکانی ئەوان جێبەجێ بکەن. دیاردە تازەکان کە بەهۆی لەخۆبایی بوونەوە لەئایینەکەی من دروستیان کردووە و تۆمەتی ناڕەوا بۆ نێردراوانی من هەڵدەبەستن. جەلالی من گەورەیە و جێگەی من سەرەوەیە و شان و شکۆی من لەپێشتر لەهەمووان ورەوا نییە فەرمان لەسەرپێچیکەران لەفەرمانەکانی من ببەن و بەندە ئافرێنراوەکانی من بەخوا بزانن. خوێنەرانی تەورات و زاناکانیان لەمزگەوتە کان بەپەرەستینەوە سەرقاڵن و ئاوەدانی دەکەنەوە بەڵام لەدینەکەیان تەنیا بەدوای دنیادا دەگەڕێن. فێقە تەنیا لەبەر زانست فێر دەبەن و زانست تەنیا لەبەر ئەنجامدان. مناڵەکانی پێغەمبەر فراوانن بەڵام بەزیو و مەغروو و شوێنکەوتەی کۆمەڵن و ئارەزوو دەکەن ڕێز و پێگەی باوکانیان پێببڕێت. گومان دەکەن بێ ڕاستی و بیرکردنەوە و خواپەرەستی دەتوانن ئەو ڕێز و پێگەیە بەدەست بێنن. بیریان نییە باوکانیان بەچ شێوەیەك هاوکاری منیان کردووە و لەبەرابەر ئەو کەسانەی دیاردەی تازەی و نەیاری ئایینەکەی منیان هێناوەتە کایەوە، چۆن بەرگری و هەوڵیان داوە و گیان و ماڵی خۆیان بەخشیوە و خۆڕاگر و ڕاستگۆ بوون تا ئەوکاتەی ئایینەکەی من سەرکەوتووە و دینەکەی من گەشتۆتە هەموو سوچ و پەناکان. من ڕێگەیەکی نەرم و نیانم لەگەڵ ئەم خەڵکە گرتۆتەبەر ئەگەری هەیە بگەڕێنەوە، تەمەنیانم درێژ کرد تا تێبفکرن. لەئاسمانەوە بارانیان پێدەبەخشم و زەوی دەڕوێنم و ڕۆژیان پێدەدەم، بەسەر دوژمندا سەرکەوتوویان دەکەم بەڵام بەردەوام گوناح و نافەرمانی ئەوان زیاد دەکات. تاکەی بەم شێوە دەبەن؟ مەگەر دەیانەوێت فریوم بدەن یا گاڵتەم پێبکەن؟ سوێند بەگەورەی خۆم ئاژاوەیەك دەنێمەوە کەبیرمەند سەریسوڕ بمێنێت وحیکمەتی حەکیم وڕێگەچارەی چارەسەرکەر، بەرەو گومرایی بڕوات. ستەمکارێکی بێ بەزەیی،

دڵڕەقی خوێنرێژ دەکەمە فەرمانڕەوای ئەوان لەگەڵ سوپایەک وەک شەوی دەیجوور و هاوشێوەی پەڵە هەورەکان و کەشتییەکان وەک شەپۆل کەشەکانەوەی ئاڵاکەی وەک هەڵفڕینی باز و هێرشی سوارەکانی وەک هەڵفڕینی هەڵۆکان بێت.

خواوەند وەحی بۆ ئەرمیا ناردەخوار: من خەڵکی منداڵەکانی ئیسرائیل لەسەر دەستی یافس لەناو دەبەم. یافس خەڵکانی بابل لەمنداڵەکانی یافس کوڕی نوحن.

کاتێک ئەرمیا وەحی خواوەندی بیست، گریا و جل و بەرگی دڕاند و خۆڵەمێشی بەسەری خۆیدا پرژاند و وتی: ئەو ڕۆژەی لەدایک بوون وئەو ڕۆژەی فێری تەورات بووم، بەنەحلەت بن. خراپترین ڕۆژی من ئەو ڕۆژە بوو چاوم بەدنیا هەڵهێنا. منیان کردووە بەکۆتایی پێغەمبەران تا گرفتاری شەڕ و بەڵاکان ببم. ئەگەر خێری منی دەویست منی نەدەکردە کۆتایی پێغەمبەرانی منداڵەکانی ئیسرائیل چوونکە لەبەر من بەدبەختی و چارەڕەشی بەسەر ئەواندا دەبارێت.

کاتێک خواوەند سکاڵا و گریانی ئەرمیای بیست، بانگی کرد: ئەی ئەرمیا وەحی من دژوار بوو؟

وتی: بەڵێ، پەروەردگارا، پێش ئەوەی منداڵەکانی ئیسرائیل لەبارودۆخێکی دژواردا ببینم، گیانی من بستێنە.

خواوەند فەرمووی: سوێند بەگەورەیی خۆم و سوێند بەبیت المقدس، منداڵەکانی ئیسرائیل لەناو نابەم تا ئەو کاتەی تۆ بڵێیت.

ئەرمیا لەوتاری خواوەند شادمان و دڵخۆش بوو، وتی: سوێند بەو کەسەی موسای بەراستی ڕەوانە کرد، هیچ کات بەپەروەردگار ناڵێم، منداڵەکانی ئیسرائیل لەناو ببات.

ئەرمیا ڕۆشتە لای پاشای منداڵەکانی ئیسرائیل و لەوەحی خواوەند ئاگاداری کردەوە. پاشا ڕازی بوو.

پاشا وتی: ئەگەر پەروەردگار سزامان بدات، بەهۆی زۆری گوناحەکانی ئێمەیە و ئەگەر لێمان خۆش بێت، لەهێزی خۆیەتی.

سێ ساڵ بەسەر هاتنەخوارەوەی وەحی تێپەڕی و خراپەکاری و نافەرمانی منداڵەکانی ئیسرائیل زیادی کرد و لەناوچوونیان نزیک بوویەوە. وەحی کەمتر دەهاتەخوار، ئەو دنیایان لەبیر کرد وچیتر خواوەند وەحی نەدەنارد. بەکاروباری

دنیاوە سەرقاڵ بوون. پاشاکەیان وتی: ئەی منداڵەکانی ئیسرائیل، پێش ئەوەی سزای خوایی بگات و نەتەوەیەکی دڵڕەق و خوێنڕێژ بکاتە فەرمانڕەوایی ئێوە، لەکردەوەکانی خۆتان پەشیمان ببنەوە چوونکە خواوەند بەتۆبەکان رازی دەبێت و لەگەڵ تۆبەکەران میهرەبانە.

بەڵام خەڵك نەیانویست دەست لەکارو کردەوەکانی خۆیان هەڵبگرن. خواوەند مەبەستی وێران کردنی لەدڵی بەخت نەسر کوڕی نەبوزەرازان کوڕی سەنحاریب کوڕی داریاس کوڕی نەمرود کوڕی فالغ کوڕی عابردا دروست کرد. باوەگەوریێ ئەو یانی سەنحاریب دەیویست بەشەشسەد هەزار ئالاّ هێرش بکاتە سەر بیت المقدس.

کاتێك بەرێکەوت، پاشای بیت المقدسیان ئاگادار کردەوە: بەخت نەسر هاوڕێ لەگەڵ سوپاکەی دەیەوێت هێرش بکاتە سەر بیت المقدس. شا ئەرمیای بانگ کرد و کاتێك هات، وتی: ئەو بەڵێنەی خواوەند کەخەڵکی بیت المقدس لەناو نابات، چی بەسەرهات.

ئەرمیا وتی: خواوەند بەڵێنەکەی خۆی دەباتەسەر و من باوەڕم پێیەتی.

کاتێك، کاتی دیاریکراو نزیك کەوتەوە و سەردەمی لەناوچوونی پاشایەتی منداڵەکانی ئیسرائیل گەیشت و خواوەند مەبەستی لەناو بردنی ئەوانی کرد، فریشتەیەکی رەوانە کرد و فەرمووی: برۆ لای ئەرمیا و داوای فتوای لێبکە.

فریشتە لەروخساری پیاوێك لە منداڵەکانی ئیسرائیل رۆشتە لای ئەرمیا. پرسی: تۆ کێیت؟

وتی: یەکێك لە منداڵەکانی ئیسرائیل، هاتووم سەبارەت بەخزمەکانم فتوا لەتۆ وەربگرم چوونکە بەپێی فەرمانی خواوەند چاکەم لەگەڵ کردوون بەڵام چاکە و رێزگرتنی من پەرەی بەدوژمنایەتی ئەواندا. ئەی پێغەمبەر، لەمبارەوە فتوای خۆت بدە.

ئەرمیا وتی: چاکەیان لەگەڵ بکە و فەرمانەکانی خواوەند ئەنجام و چاوەڕوانی خێر بە.

دەڵێت: فریشتە رۆشت و چەند رۆژێك دواتر بەهەمان روخسار گەڕایەوە. لای ئەو دانیشت و ئەرمیا وتی: تۆ کێیت؟

وتی: ئەو کەسەم بۆ وەرگرتنی فتوا سەبارەت بەخزمەکانم هاتمە لای تۆ.

پێغەمبەر پێی وت: کردەوەکانیان گۆڕا و لەگەڵ تۆدا چاك بوون؟

وتی: ئەی پێغەمبەر، سوێند بەو کەسەی تۆی بەراستی و دروستی ڕەوانە کرد، هەر چاکەیەك کەخزمان لەگەڵ یەکی دەکەن، لەگەڵ ئەوان کردم تەنانەت زیاتریش.

پێغەمبەر وتی: بۆلای کەسەکانی خۆت بگەڕێرەوە و داوا لەخواوەند بکە ئاشتی لەنێوان ئێوەدا سەقامگیر بکات و بەرەزامەندی بتانکاتە هاودەمی یەك و لەتوڕەیی خۆی بتانپارێزێت.

فریشتە لای ئەرمیا ڕۆشت و چەند ڕۆژێك تێپەڕی. بەخت نەسر وسوپاکەی کەهاوشێوەی کوولە بوون، بیت المقدسیان گەمارۆدا بوو. منداڵەکانی ئیسرائیل دەترسان و پاشای منداڵەکانی ئیسرائیل پەرێشان بوو. ئەرمیای بانگ کرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، بەڵێنی پەروەردگار چی بەسەر هات؟

ئەرمیا وتی: من لەپەروەردگار دڵنیام.

کاتێك ئەرمیا لەسەر دیواری بیت المقدس دانیشتبوو ودڵی بەهاوکاری خواوەند خۆش بوو، فریشتە هات و لای ئەو دانیشت. ئەرمیا وتی: تۆ کێیت؟

وتی: ئەو کەسەم سەبارەت بەکاری خزمەکانی خۆم هاتمە لای تۆ.

پێغەمبەر وتی: هێشتا لەکردەوەکانی خۆیان پەشیمان نەبوونەوە؟

فریشتە وتی: ئەی پێغەمبەر، بۆ کردەوەکانیان لەگەڵ خۆم تا ئێستاکە خۆڕاگر بووم و دەمزانی جگە لەتوڕەیی من گیردەی بەلا و زیان نابن و کاتێك ئەمڕۆ ڕۆشتمە لای ئەوان، بینیم سەرقاڵی ئەنجامدانی کارە نەشیاو و ناڕەواکانن.

پێغەمبەر وتی: کاریان چییە؟

وتی: کارێکی گەورەیە کەهۆکارێکە بۆ توڕە بوونی خواوەند. ئەگەر کردەوەکانیان هاوشێوەی پێشوو دەبوو، توڕە نەدەبووم و خۆڕاگریم دەکردە پیشە و هیوام دەخواست پەشیمان ببنەوە، بەڵام ئەمڕۆ لەبەر خواوەند و لەبەر تۆ توڕەم و هاتووم ئاگادارت بکەمەوە. سوێندت دەدەم بەخوا نفرینیان بکەیت تا خواوەند لەناویان ببات.

ئەرمیا وتی: ئەی پاشای ئاسمانەکان و زەوی، ئەگەر لەسەر ڕێگەی ڕاستن بیانهێڵەرەوە و ئەگەر گوناحکارن و لەکار و کردووەکانی ئەوان ڕازی نیت، لەناویان ببە.

کاتێك وشەکان لەدەمی ئەرمیا هاتنەدەر، خواوەند هەورەبروسکەیەکی ڕەوانە کرد

و شوێنی قوربانی کردنی سوتاند و حەوت دەرگاکەی بەزەویدا بردە خوار.

کاتێك ئەرمیا ئەمەی بینی، ناڵاندی و خۆڵی کرد بەسەری خۆیدا، وتی: ئەی پاشای زەمین و ئەی ارحم الراحمین! ئەو بەڵێنەی بەمنتدا چی بەسەر هات؟

وەحی هات: ئەی ئەرمیا، ئەمە بەهۆی فتواکەی تۆوەیە کە بەنێردراوەکەی ئێمەت راگەیاند، بەسەر ئەواندا دەبارێت.

ئەرمیا زانی مەبەست لەو فتوایە کە سێ جار هێنایە سەرزمان و ئەو پیاوە نێردراوی خواوەند بوو. لەناو خەڵکان رایکرد و بوو بەهاودەمی درندەکان. بەخت نەسر هاوڕێ لەگەڵ سوپاکەی رۆشتە ناو بیت المقدس و هێرشی دەست پێکرد. بەرادەیەك لە منداڵەکانی ئیسرائیلی کوشت کەلەناوچوون. بیت المقدسی خاپوور و بەسوپاکەی خۆی وت هەرکام قەڵغانەکەی خۆیان پڕ بکەن لەخاك و لەبیت المقدس بیرێژن. ئەوەندە خۆڵیان تێکرد کەپڕ بوویەوە.

بەخت نەسر بۆ سەرزەمینی بابل گەڕایەوە و ئەسیرەکانی لەگەڵ خۆیدا برد و فەرمانیدا هەموو خەڵکانی منداڵەکانی ئیسرائیل کۆبکەنەوە. گەورە و بچوکیان لای ئەو کۆکردەوە. سەد منداڵی لەناو ئەوان هەڵبژارد و کاتێك ویستی تاڵانییەکان لەناو سوپاکەی خۆیدا دابەش بکات، ئەو سوپایەی هاورێیەتیان دەکرد، پێیان وت: ئەی پاشا هەموو تاڵانییەکان بۆ تۆ بێت تەنیا ئەم منداڵانە لەناو ئێمەدا دابەش بکە.

بەخت نەسر ئەو کارەی کرد و هەرکەس چوار غولامی بەرکەوت. دانیال و حەنانیا و عەزاریا و میشابل لەناو ئەواندا بوون.

حەوت هەزار کەسیان لەبنەماڵەی داوود بوون، پانزە هەزار کەسیان لەنەوەکانی یوسف و براکەی بنیامین، هەشت هەزار کەس لەنەوەی ئەشتەر کوڕی یەعقوب، چواردەهەزار کەس لەنەوەی زەبالون و نەفسالی کوڕەکانی یەعقوب، چوار هەزار کەس لەنەوەی روبیل و لاوی کوڕەکانی یەعقوب و چوار هەزار کەس لەنەوەی یەهوودا کوڕی یەعقوب.

بەخت نەسر پاشماوەی ئیسرائیلیەکانی بۆ سێ دەستە دابەش کرد: یەك لەسەر سێی لەشام نیشتەجێ کرد. یەك لەسەر سێی وەك ئەسیر راگرت و یەك لەسەر سێی کوشت. دەفرەکانی بیت المقدسی لەگەڵ حەفتا هەزار منداڵ بۆ بابل برد. ئەمە یەکەم روداو و بەلا بوو خواوەند بەهۆی نافەرمانی و گوناح، منداڵەکانی ئیسرائیلی پێ

گرفتار کرد.

کاتێك بەخت نەسر لەگەڵ سەرکردەکانی منداڵەکانی ئیسرائیل بۆ بابل گەڕایەوە، ئەرمیا سوار لەسەر کەرەکەی خۆی هات. دەفرێك لەگوشراوی ترێ وسەوەتەیەك هەنجیری پێبوو. کاتێك گەیشتە ئیلیا و وێرانییەکەی بینی، گومان لەدڵیدا درست بوو، وتی: خواوەند کەی ئەم شارە مردووە زیندووو دەکاتەوە؟ خواوەند ئەو و کەرەکەی مراند و یەك سەد ساڵ بەو شێوەیە مانەوە. گوشراوی ترێ و سەوەتە هەنجیرەکە لەشوێنی خۆیاندا بوون. خوا چاوی خەڵکانی بەست و کەس ئەوانی نەبینی. دواتر ئەوانی زیندووو کردەوە.

((قال کم لبثت. قال لبثت یوما او بعض یوم. قال بل لبثت مأة عام فانظر الی طعامك و شرابك لم یتسنه و انظر الی حمارك و لنجعلك آیة للناس و انظر الی العظام کیف ننشزها ثم نکسوها لحما.

واتاکەی: وتی چ ماوەیەك لەو حاڵەدا بوویت؟ وتی رۆژێك یا بەشێك لەرۆژ. وتی: نە سەد ساڵە. سەیری خواردن و خواردنەوەی خۆت بکە کەگۆڕانی بەسەردا نەهاتووە! سەیری گوێ درێژەکەی خۆت بکە! تۆ دەکەینە وانەیەك بۆ خەڵکان. ئێسقانەکان ببینە چۆن بەرزیان دەکەینەوە دواتر بەگۆشت دایاندەپۆشین.))

سەیری کەرەکەی خۆی کرد کە لەگەڵ ئەودا مردبوو، دەمارەکان و ئێسقانەکانی پەیوەستی یەك بوونەوە و بەگۆشت داپۆشران و رۆح لەناو جەستەیدا رەوان بوو. هەستا و زەڕاندی. گوشراوی ترێ و هەنجیرەکەی بینی وەك خۆی مابوویەوە و نەگۆڕابوون. کاتێك هێز و دەسەڵاتی خوای بینی، وتی: دەزانم خواوەند بۆ هەموو شتێك بەتوانایە.

خواوەند تەمەنی ئەرمیای درێژ کردەوە. ئەو لەشار و بیابانەکان دەبینرێت.

بەخت نەسر تا ئەو کاتەی خواوەند ویستی پاشایەتی کرد. ئەوسا خەوێکی بینی و پەرێشان بوو. شتێکی بینی و ئەوی بینیبووی، لەبیری کرد. دانیال و حەنانیا و عەزاریا و مەیشاییلی بانگ کرد، وتی: شتێکم لەخەودا بینیوە و روداوێك روویدا کە بووە هۆی سەرسورمانم، بەڵام لەبیرم کرد. پێم بڵێن چی بوو؟

وتیان: خەوەکەت وەگێڕە تا لێکدانەوەی بۆ بکەین.

وتی: بیرم نییە و ئەگەر پێم نەڵێن شانی ئێوە هەڵدەکەنم.؟

ئەوان لای بەخت نەسر ڕۆشتن و لەخوا پاڕانەوە، نالآندیان و دوایان کرد خەوەکەی بەخت نەسریان پێ بڵێت. خواوەند ئەوانی لەخەوەکەی بەخت نەسر ئاگادار کردەوە. ڕۆشتنە لای بەخت نەسر و پێیان وت: پەیکەرێکت لەخەودا بینی.

وتی: ڕاست دەکەن.

وتی: قاچەکانی لەسواڵەت و ئەژنۆ و ڕانەکانی لەمس و سکی لەزیو و سنگی لەزێر و سەرو ملی لەئاسن بوو.

وتی: ڕاست دەکەن.

وتیان: لەو کاتەی سەیری پەیکەرەکەت دەکرد و سەرتسوڕما بوو، بەردێك لەئاسمانەوە هات و بەر پەیکەرەکە کەوت و ئەمە بووە هۆی ئەوەی خەوەکەت بیرنەما.

وتی: ڕاست دەکەن. بەڵام لێکدانەوەکەی دبێتەچی؟

وتیان: لێکدانەوەکەی بەمشێوەیە، تۆپاشایەتی شاکانت بینیوە هەندێکیان ماوەی پاشایەتیان کەمتر و دەستەیەکیان زیاتر و باشترە.: قۆناغی یەکەم پاشایەتی سواڵەتە و لەهەموویان نەرمتر و لاوازترە. سەرەوەی مسە وباشترە و بەهێزتر. لەسەرەوەی مس زێرە کەباشترە. سەرەوەی زێر زیوە وباشترە. دوای ئەو ئاسنە کەپاشایەتی تۆیە و لەهەموو پاشاکان بەهێزتر و لەرابردووان بەتواناترە. ئەو بەردەی بینیت کەخواوەند لەئاسمانەوە ڕەوانەی کرد و پەیکەرەکەی شکاند، پێغەمبەرێکە خواوەند لەئاسمانەوە ڕەوانەی دەکات و هەموو ئەم شتانە لەناو دەبات و کاروبارەکان دەکەوێتە دەست ئەو.

دوای ئەوە خەڵکی بابل بەبەخت نەسریان وت: ئەم غولامانەی منداڵەکانی ئیسرائیل کەداوامان کرد و بەئێمەی ببەخشی، لەو کاتەوەی ئەوانمان هێناوە، ژنەکانمان لەئێمە خۆیان دوور دەخەنەوە و ئارەزووی نزیکی لەگەڵ ئەوان دەکەن، یا دەریانبکە یا بیانکوژە.

بەخت نەسر وتی: کاری ئەوان لەئەستۆی خۆتاندایە، هەرکەس دەخوازێت غولامەکانی خۆی بکوژێت.

کاتێك ئەوانیان بۆ کوشتن هێنایەدەر، نالآندیان و وتیان: پەروەردگارا، ئێمە لەگوناحی کەسانی دیکەوە زیانمان بەردەکەوێت. خواوەند بەزەیی بەواندا هاتەوە و بەڵێنیدا دوای کوژران زیندوویان بکاتەوە. هەموویان کوژران جگە لەوانەی لای بەخت نەسر مانەوە.

دانیال و حەنانیا و عەزاریا و میشاییل لەناو پاشماوەکاندا بوون.

کاتێك خواوەند مەبەستی لەناو بردنی بەخت نەسری کرد، بەئەسیرەکانی منداڵەکانی ئیسرائیلی وت: دەزانن ئەو ماڵەی وێرانم کرد چی بوو و ئەو خەڵکانەی ئەوانم بەکوشتدا کێ بوون؟

وتیان: ئەمە ماڵی خوا ویەکێك لەمزگەوتەکانی خوا وئەوان لەنەوەی پێغەمبەران بوون. ستەمیان کرد و سنورەکانیان بەزاند و نافەرمانیان کردەپیشە و لەبەر گوناحەکانیان، خواوەند تۆی بەسەر ئەواندا زاڵکرد و پەروەردگار، خواوەندی هەموو ئاسمانەکان و وزەوی و بوونەوەرەکانە و ڕێزیان دەگرێت و دەیانپارێزێت و کاتێك گوناحیان ئەنجامدا، ئەوانی بەکوشتندا و بێگانەکانی بەسەر ئەواندا زاڵ کرد.

وتی: پێم بڵێن چۆن دەتوانم بۆ ئاسمان بڕۆم تا بڕۆم و ئەوەی لەئاسمان نیشتەجێیە بیکوژم و پاشایەتی ئاسمانیش بگرمە دەست چوونکە لەسەرزەمین هیچ کارێك بۆ من نەماوەتەوە.

وتیان: توانای ئەو کارەت نییە و هیچ کام لە بوونەوەرەکان بۆ ئەو کارە بەتوانا نییە.

وتی: دەبێت پێم بڵێن وەگەرنە هەمووتان دەکوژم.

ئەوان گریان و لەدەرگای خواوەند پاڕانەوە. خواوەند هێز و دەسەڵاتی خۆی نیشاندا تا لاوازی و هێزی خۆی بزانێت. ئەویش مێشێك بوو کە ڕۆشتە ناو لووتی و لەوێوە گەیشتە مێشکی و گازی لەمۆخی دەگرت. ئارام و قەراری لێبڕابوو. بەچەکوش لەسەریان دەدا. کاتێك ڕۆژی مەرگی گەیشت، بەپەردەدارانی خۆی وت: کاتێك مردم، سەرم بقڵیشێنن و بزانن ئەوچی بوو بووە هۆی کوشتنی من؟ کاتێك مرد، سەری ئەویان کردەوە و مێشەکەیان بینی گازی لەمۆخی دەگرت. بەمشێوەیە خواوەند دەسەڵات و هێزی خۆی نیشانی بەندەکانی دەدا.

خواوەند پاشماوە ئەسیرەکانی منداڵەکانی ئیسرائیلی ڕزگار کرد. بەزەیی بەواندا هاتەوە وئەوانی بەرەو ئیلیا و شام و بیت المقدس گەڕاندەوە. لەوی بیناکانیان دروست کرد و ژمارەیان فراوان بوو. لەوەی بوون، باشتر بوون. گومان دەکەن خواوەند ئەسیرە کوژراوەکانیشی زیندوو کردەوە و پەیوەستی ئەوان بوون. و خوا زاناترە.

کاتێك ئیسرائیلیەکان گەڕانەوە بۆشام، پەیمانی خوایان لەگەڵدا نەبوو چوونکە

تەوراتیان لەدەستدا بوو. تەورات سوتا بوو. عەزیز کەیەکێك بوو لەئەسیرەکان و دواتر بۆ شام گەڕایەوە، شەو و ڕۆژ بۆ تەورات دەگریا. خۆی لەخەڵکان بەدوور گرت و لەناو دۆڵ و بیابانەکان بەتەنیا ڕێگەی دەبڕی و تەنیاکاری گریان بوو. ڕۆژێك کەدانیشتبوو، پیاوێك ڕۆشتە لای و وتی: ئەی عەزیز، لەبەرچی دەگریت؟

وتی: بۆ کتێب و پەیمانی خوا دەگریم کە لەناو ئێمەدا بوو. گوناحی ئێمە و تووڕەیی پەروەدگار ئەوەی لێکەوتەوە کەدوژمنی بەسەر ئێمەدا زاڵ کرد، پیاوەکانی کوشتین و دیاری ئێمەی خاپوور و کتێبی خوای سوتاند کەدنیا و ڕۆژی هەستانەوەی ئێمە تەنیا بەوە سامان دەدرێت. ئەگەر بۆتەورات نەگریم، بۆ چی بگریم؟

ئەو پیاوە وتی: ئایا حەز دەکەیت تەورات بۆ تۆ بگەرێتەوە؟

وتی: ئایا شتی وا دەکرێت؟

وتی: بەڵێ، بگەرێرەوە و بەرۆژو بە و خۆت پاك بکەرەوە و جل وبەرگی پاك بپۆشە و بەیانی بگەرێرەوە.

عەزیز گەڕایەوە، ڕۆژوی گرت و خۆی پاك و خاوێن و جلی پاکی پۆشی و بەیانی گەڕایەوە بۆ هەمان شوێن. ئەو پیاوە فریشتەی خوا بوو، بەدەفرێك ئاو هاتە پێش و ئاوەکەی دەرخوارددا و بەم شێوەیە تەورات لەسینەی عەزیزدا تۆمار کرا. بۆ لای مناڵەکانی ئیسرائیل گەڕایەوە وتەوراتی بەحەڵاڵ و حەرام و سونەتەکان و فەرزەکان و سنورەکانی بۆ مناڵەکانی ئیسرائیل نوسییەوە کەزیاتر لەهەر شتێك ئارەزوومەند بوون پێی. کاروباریان بەمشێوەیە سامانی گرت. عەزیز لەناو ئەواندا بوو و ڕێزی لەفەرمانە خواییەکان دەگرت. ئەوسا خواوەند گیانی ستاند و دیاردەکان لەناو مناڵەکانی ئیسرائیل دەرکەوتنەوە و وتیان: عەزیز کوڕی خوا بوو. خواوەند پێغەمبەرێکی ڕەوانە کرد تا ڕێگەی ڕاستیان نیشان بدات و بۆ ئەنجامدانی فەرمانەکانی تەورات ناچاریان بکات.

دەستەیەکی دیکە لەوەهب کوڕی مونبە سەبارەت بەبەخت نەسر و شەڕی ئەو لەگەڵ مناڵەکانی ئیسرائیل ئاماژەیان بەگێڕانەوەیەکی دیکە داوە کە لەباسی کردنی چاومان پۆشی تا کتێبەکەمان دوور و درێژ نەبێت.

## گێڕانەوەکان سەبارەت بەشەڕی بەخت نەسر لەگەڵ عەرەب

لەهوشام کوڕی محەممەد دەگێڕنەوە: سەرەتای نیشتەجێ بوونی عەرەبەکان لەسەرزەمینی عێراق و نیشتەجێ بوونیان لەحیرە و ئەنبار بەو شێوەیە کەخواوەند بەبەرخیا کوڕی ئەحسار کوڕی زەربابل کوڕی شەلتیل لەنەوەکانی یەهودا وەحی کرد تا بڕواتە لای بەخت نەسر وپێی بڵێت هێرش بکاتە سەر عەرەبەکان چوونکە ماڵەکانیان دەرگا و کڵۆنی نییە. بەسوپاکەی خۆی هێرش بکاتە سەر دیاری ئەوان و پیاوەکانیان بکوژێت و سامانیان تالآن بکات. پێی بڵێ ئەوان کافر بوون و جگە لەمن خواکانی دیکە دەپەرەستن و نێردراو و پێغەمبەرانی منیان بەدرۆزن لەقەڵەمداوە.

دەڵێت: بەرخیا لەنەجرانەوە هات تا گەشتە بابل لای بەخت نەسر. ناوی ئەو نەبوخەز نەصرە و عەرەبەکان ناوەکەیان بۆ عەرەبی گۆڕیوە. هات و لەفەرمانی خواوەند ئاگاداری کردەوە. ئەمە لەرۆژگاری مەعد کوڕی عەدنان بوو. بەخت نەسر هێرشی کردە سەر ئەو بازرگانە عەرەبانەی لەسەرزەمینەکەی خۆیدا بوون. ئەوان ماڵ و کالآیان بۆ بابل دەهێنا و دانەوێڵە و خورما و قوماشیان دەبردەوە. هەرکەسی گرت، کۆیکردەوە و لەنەجەف قەلآیەکی بەهێزی دروست کرد و هەموویانی لەوێ جێ کردەوە و پاسەوانی بۆ دانان. دواتر لەناو خەڵکان جاڕیدا و بۆ شەڕ خۆیان ئامادە کرد. ئەم هەواڵە لەناو عەرەبەکانی دەوروبەر بڵاوبوویەوە. دەستەیەك لەهۆزە عەرەبەکان داوای ئەمان و ئاشتیان کرد. بەخت نەسر سەبارەت بەوان راوێژی لەگەڵ بەرخیا کرد و وتی: ئێستا کەپێش هێرشەکەی تۆ سەرزەمینی خۆیان بەجێهێشتووە، نیشانەی گەڕانەوە و پەشیمان بوونەوەی ئەوانە، لەوان رازی ببە وکاروبارەکانیان بۆ سامان بدە. بەخت نەسر ئەوانی لەسەرزەمینی سواد لەکەنارەکانی فورات نیشتەجێ کرد و لەوێ ئوردوگایەکیان دروست کرد و ناویاننا ئەنبار.

دەڵێت: خەڵکی قەلآکەی پشتگوێ خست بەلآم تا ئەو کاتەی بەخت نەسر زیندووو بوو، لەوێ مانەوە و کاتێك مرد، پەیوەستی خەڵکانی ئەنبار بوون. قەلآکە کەبەحیرە ناو دەبرا، وێران بوو.

بەلآم دەستەیەکی دیکە لەشارەزایانی مێژوو بەمشێوە باسی دەکەن: کاتێك مەعد کوڕی عەدنان چاوی بەدنیا هەڵهێنا، منالەکانی ئیسرائیل دەستیان بەکوشتنی

پێغەمبەرەکانی خۆیان کرد و دوایین کەس کەکوژرا، یەحیا کوڕی زەکەریا بوو. خەڵکی ڕەس هێرشیان کردە سەر پێغەمبەرەکەی خۆیان و کوشتیان. خەڵکی حزور هێرشیان کردە سەر پێغەمبەرەکەی خۆیان و خوێنیان ڕشت. کاتێك بۆ کوشتنی پێغەمبەرەکان بوێر بوون، خواوەند ڕێگەیدا ئەو نەوەی لەرۆژگاری مەعد کوڕی عەدنان بوو، لەناو بچێت و بەخت نەسری دژی منداڵەکانی ئیسرائیل بزواند و کاتێك لەوێران کردنی مسجد الاقصی و شارەکان تەواو بوو و منداڵەکانی ئیسرائیلی تێکشکاند و ئەسیرەکانی بۆ سەرزەمینی بابل برد، لەخەودا بینی یا یەکێك لەپێغەمبەرەکان پێی وت کەهێرش بکاتە سەر وڵاتی عەرەبەکان و هەموو بوونەوەرەکانی بکوژێت. خواوەند وەحی بۆ ئەرمیا و یوحەنا ناردەخوار: خواوەند خەڵکەکەی ئێوەی ئاگادار کردەوە و دەستیان لەکارەکانی خۆیان هەڵنەگرت و دوای پاشایەتی بوونە بەندەکان و دوای خۆشگوزەرانی دەستیان بەسواڵ کردن کرد. خەڵکانی عەرەبیشم ئاگادار کردەوە بەڵام لەسەر گوناحەکانیان پێداگری دەکەن و بەخت نەسرم بەسەر ئەواندا زاڵکرد تا تۆڵەی خۆم بستێنمەوە. ئێستا بەدوای مەعد کوڕی عەدناندا بگەڕێن کەمحەممەدی پێغەمبەر(د.خ) لەمنداڵەکانی ئەوە ولەئاخرزەماندا وەك پێغەمبەر(د.خ) ڕەوانەی دەکەم ودەیکەم بەخاتەمی پێغەمبەران.

دوو پێغەمبەرەکە بەرێکەوتن و زەوی بۆ ئەوان کورت بوویەوە وپێش بەخت نەسر کەوتنەوە و عەدنانیان بینی و بەرەو لای مەعد بەرێکەوتن. ئەو دوانزە ساڵە بوو. بەرخیا ئەوی سوار ئەسپ کرد و خۆی لەپشت سەریەوە سوار بوو و لەکاژێرێکدا گەشتنە حەران. زەوی بۆ ئەو و ئەرمیا کورت بوویەوە. ئەویش گەشتە حەران و عەدنان و بەخت نەسر لەزات عەرەق ڕووبەڕووی یەك بوونەوە. بەخت نەسر عەدنانی شکستدا و هێرشی کردە سەر دیاری عەرەب و شوێن عەدنان کەوت تا گەشتە حزور. کاتێك گەشتە حزور، زۆربەی عەرەبەکان لەدەوروبەری عەرەبە لەحزور کۆببونەوە. هەردوولا خەندەکیان لێدا و بەخت نەسر بۆسەی نایەوە. دەڵێن یەکەم کەس بوو بۆسەی نایەوە. ئەوسا دەنگ لەئاسمانەوە هات: تۆڵەی پێغەمبەرەکان بستێنن. لەپێش و دواوە شمشێریان خستە ناو ئەوان. لەگوناحەکانی خۆیان پەشیمان بوونەوە و ناڵاندیان. عەدنان و بەخت نەسر دەستیان لەیەك هەڵگرت. ئەوانەی لەحزور نەبوون و ئەوانەی پێش بەلاَ و شەڕەکە گیانیان دەرباز کردبوو، بوون بەدوو دەستە،

دەستەیەکیان ڕۆشتنە ریسوب کەعەك لەویٚ بوو و دەستەیەکی دیکە بەرەو وەبار بەرێکەوتن.

دەڵێت: خواوەند لەم ئایانە مەبەستی ئەوانە کەدەفەرمێت:

((وکم قصمنا من قرية كانت ظالمة وانشأنا بعدها قوما آخرين. فلما احسوا بأسنا اذاهم منه يركضون. لا تركضوا و ارجعوا الى ما اترفتم فيه و مساكنكم لعلكم تسئلون. قالوا يا ويلنا انا كنا ظالمين. فما زالت تلك دعواهم حتى جعلناهم حصيدا خامدين.

واتاکەی: چەندە ئەو گوندانەمان لەناو برد کەستەمکار بوون و دوای ئەوان دەستەیەکی دیکەمان هێنایە بوون. کاتێك هەستیان بەبەهێزی و خۆڕاگری ئێمە کرد، لێی هەڵاتن، رامەکەن، بەرەو چێژ و ماڵەکانی خۆتان بگەرێنەوە ئەگەری هەیە بەشوێن ئێوەدا بگەرێن. دەڵێن هاوار لەئێمە کەستەمکار بووین. بانگەشەیان بەردەوام ئەوە بوو تا ئەوەی دروێنە کران و گیانمان لیٚ سەندن.))

بەخت نەسر هاوریٚ لەگەڵ ئەو ئەسیرانەی لەعەرەبە کۆیکردبوونەوە، بۆ بابل گەڕایەوە و ئەوانی لەئەنبار نیشتەجیٚ کرد.ئەو ناوچەیان بەئەنباری عەرەب ناوبرد و دواتر بەئەنبار ناوی دەرکرد. دوای ئەوە نبتیەکان تیکەڵاویان بوون و کاتێك بەخت نەسر لەعەرەبە گەڕایەوە، عەدنان مرد و دیاری عەرەب لەرۆژگاری ژیانی بەخت نەسر وەك وێرانە مایەوە.

کاتێك بەخت نەسر مرد، مەعد کوڕی عەدنان لەگەڵ پێغەمبەرانی مناڵەکانی ئیسرائیل بۆ مەککە ڕۆشت و شوێنەوارەکانی زیندووو کردەوە، حەجی کرد وپێغەمبەرانیش لەگەڵ ئەو حەجیان کرد. دواتر مەعد لەمەککەوە بەرەو ریسوب بەرێکەوت وخەڵکی ئەویٚی کۆکردەوە و پرسی ئایا لەمناڵەکانی حارس کوڕی مەزازی جورهەمی کەس ماوەتەوە یا نە؟ حارس ئەو کەسە بوو شەری لەگەڵ دوسی عەبەق کرد و بەشی زۆری خەڵکانی جورهەمی لەناو بردبوو. وتیان: جورهەم کوڕی جولهەمە ماوەتەوە. مەعد مەعانە کچی ئەوی وەك هاوسەر هەڵبژارد و نەزار کوڕی مەعد چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

## گێڕانەوەکان سەبارەت بە پاشایەتی بەشتاسب و ڕوداوەکانی ڕۆژگاری ئەو

شارەزایانی مێژوو لەعەرەب و عەجەم وتوویانە کاتێك بەشتاسب کوڕی کەی لەهراسب تاجی لەسەرنا، لەسەرەتای پاشایەتییەکەی وتی: ئێمە ئەندێشە و زانستی خۆمان بۆ گەشتن بەچاکەکاری تەرخان دەکەین.

دەڵێن: بناغەی شاری فەسای لەفارس داڕشت و لەهیند و سەرزەمینەکانی دیکە ئاتەشکەدەکانی دروست کرد. هیربودانی لەوێ دانا و حەوت کەس لەگەورەکانی وڵاتی هەڵبژارد وهەریەك لەناوچەکانی وڵاتی بەیەکێك لەوان سپارد.

لەسیەم ساڵی پاشایەتی بەشتاسب زەردەشت کوڕی ئەسفیمان دەرکەوت و بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کرد. پێشنیاری دینەکەی خۆی بەبەشتاسب کرد. سەرەتا ڕازی نەبوو و دواتر باوەڕی بەدینەکەی هێنا.

کتێبی زەردەشت لەسەر پێستی دوانزە هەزار گا نووسرا و بەزێر ئاودرابوو. بەشتاسب لەئیستەخر لەشوێنێك بەناوی بیشت داینا و هیربودانی بۆ فێربونی ڕاسپارد و کۆمەڵانی خەڵکی لەفێربوونی کتێبەکەی زەردەشت دوور خستەوە.

بەشتاسب لەم ڕۆژگارەدا لەگەڵ خەزەر ئەسەف کوڕی کەی سواسف برای فراسیات پاشای تورکەکان ڕێگەی ئاشتی گرتبووە بەر. لەمەرجەکان ئاشتی یەکیان ئەوە بوو بەشتاسب لەبەر دەرگای خەزەر ئەسەف ئەسپێکی هەبێت هاوشێوەی ئەو ئەسپانەی لەدەرگای پاشاکان ڕایاندەگرن. زەردەشت فەرمانی پێدا دوژمنایەتی پاشای تورکەکان بکات. بەشتاسب ڕازی بوو. داوای ئەسپ و سوارکارەکەی کردەوە. خەزەر ئەسەف ئاگادار بوویەوە و توڕە بوو. ئەو جادووگەرێکی چاونەترس بوو. خۆی بۆ شەڕی بەشتاسب ئامادە کرد. نامەیەکی بۆ نوسی و ئاگاداری کردەوە کارێکی گران و دژواری ئەنجام داوە کە بەوتەکانی زەردەشت ڕازی بووە. داوای کرد زەردەشت بۆ لای ئەو ڕەوانە بکات. سوێندی خوارد ئەگەر زەردەشت ڕەوانە نەکات، هێرشی دەکاتەسەر و خوێنی خۆی و بنەماڵەکەی دەرێژێت.

کاتێك نێردراو و نامەکە گەیشتە لای بەشتاسب، سەرانی بنەماڵە و گەورەکانی وڵاتی کۆکردەوە کەجاماسف زانای ئەستێرەناس و زەرین کوڕی لەهراسب لەناویاندا بوون. لەوەڵامی پاشای تورکەکان نامەیەکی نوسی و شەڕی راگەیاند و هەواڵی پێدا ئەگەر خەزەر ئەسەف لەبەڵێنی شەڕ پەشیمان ببێتەوە، ئەو پەشیمان نابێتەوە. بەرەو لای یەك ئەسپ و سوپایان غاردا. هەرکام سوپایەکی بێ ئەژماری لەگەڵدابوو. زەرین برای بەشتاسب و نەستوری کوڕی زەرین و ئیسفەندیار و پەشوتن کوڕەکانی بەشتاسب و بنەماڵەی لەهراسب هاورێیەتیان دەکرد. خەزەرئەسەفیش براکانی خۆی یانی گەوهرمز وئەندرمان هاورێیەتیان دەکرد لەگەڵ بنەماڵەی پاشایەتی و بیدرەفشی جادووگەر. زەریم لەم شەڕانەدا کوژرا و بەشتاسبی خەمبار کرد. کوڕەکەی ئیسفەندیار جێگەی ئەوی پڕ کردەوە و بیدرەفش لەشەڕی دەستەویەخە کوژرا و شکست کەوتە ناو سوپای تورکەکان و ژمارەیەکی زۆر لەوان کوشتار کران. خەزەر ئەسەف هەڵات و بەشتاسب بۆ بەلَخ گەڕایەوە.

کاتێك چەند ساڵێك بەسەر ئەم شەڕانەدا تێپەڕی، پیاوێك بەناوی قەرزەم دژی ئیسفەندیار دەستی بەفیتنەگێڕی و دڵی بەشتاسبی لێ ڕەش کرد. بەردەوام ئەوی بۆ شەڕەکان دەنارد و دواتر فەرمانی زیندانی کردنی ئەوی دەرکرد. ئەویان بۆ قەڵایەك نارد کەزیندانی ژنان بوو. بەشتاسب بەرەو سیستان و کرمان بەرێکەوت و لەوێوە رێگەی کوێستانی تەمەندەری گرتەبەر تا زانستی دین فێر ببێت و ببێتە کەسێکی خۆپارێز. لەهراسب باوکی بەشتاسب کەپیرەپیاوێکی بەتەمەن و پەککەوتە بوو، هاورێ لەگەڵ خەزێنەکان و ماڵ و منداڵ و ژنەکانی شا لەبەلَخ مایەوە. خەتوس شاژنی حەرەم لەبەلَخ بوو. سیخوڕەکان خەزەرئەسەفیان ئاگادار کردەوە و کاتێك بەمەی زانی، سوپایەکی بێ ژماری کۆکردەوە و لەدیاری خۆیەوە بەرەو سەرزەمینی بەلَخ پێشڕەوی کرد. هیوادار بوو دژی بەشتاسب و وڵاتەکەی دەرفەتێکی زێرینی دەست کەوێت. کاتێك گەیشتە سنوری فارسەکان، گەوهەرمزی برای لەگەڵ دەستەیەکی فراوان لەشەرکەران وەك پێشەنگ رەوانە کرد و فەرمانی پێدا بەخێرایی بڕوات و لەناو دڵی وڵاتی پاشای فارس هێرش بکاتە سەر گوند و

شارەکان. گەوهەرمز ئەو کارەی کرد و خوێنی زۆری ڕشت. بێ ڕێزی زۆری بەرابەر بەئێرانییەکان لەخۆی نیشاندا. خەزەر ئەسەف بەدوای ئەودا بەرێکەوت و دەفتەرەکانی سوتاند و لەهراسب و هیربودانی کوشت و ئاتەشکەدەکانی وێران و خاپوور کرد. دەستی بەسەر خەزێنە و گەنجەکاندا گرت. دوکچەکەی بەشتاسبی ئەسیر کرد کەناویان خەمانی و بازافره بوو. ئاڵای گەورە وپیرۆزی ئێرانییەکانی کەوتە دەست کەپێیان دەوت ئاڵای کابیان. شوێن بەشتاسب کەوت و بەشتاسب هەلات و لەناوچەکانی دەوروبەری فارس لەکوێستانی تەمەندەر خۆی حەشاردا.

دەڵێن: کاتێك کاروبارەکان بۆ ئەو دژوار بوو، جاماسبی بۆ لای ئیسفەندیار ڕەوانە کرد وئەوی لەزیندان هێنایەدەر. بردی بۆ لای پاشا. بەشتاسب دڵنەوایی کرد و بەڵێنی پێدا تاجی پێببەخشێت و ئەو کارە ئەنجام بدات کەلەهراسبی باوکی لەگەڵ خۆی کردی. کاری سوپا و شەڕکردن لەگەڵ خەزەر ئەسەق بەئیسفەندیار سپارد. کاتێك ئیسفەندیار وتەکانی باوکی بیست، کوڕنوشی برد و ڕۆشت. بەناو سوپاکەدا گەڕا و شەوی بەئامادەکردنی سوپا بەسەر برد. بەرەبەیان فەرمانیدا و شەیپووریان لێدا. سوپای کۆکردەوە و ڕووی کردە ئوردوگای تورکەکان. کاتێك سوپای تورك ئەوانیان بینی، ڕووبەڕوویان بوونەوە. گەوهەرمز و ئەندرمان لەناو سوپای تورکدا بوون. شەڕ دەستیپێکرد و ئیسفەندیار ڕم بەدەست وەك بروسکە هەلمەتی دەبرد. لەچەندین شوێنەوە برینداربوو. کەلێن کەوتە ناو سوپای تورکەکان. تورکەکان زانیان ئیسفەندیار لەزیندان هاتۆتەدەر. شکستیان خوارد و هیچ کارێکتان پێنەکرا. ئیسفەندیار گەڕایەوە و ئاڵای کابیانی وەرگرتەوە. ئاڵا بەدەست ڕۆشتە لای بەشتاسب کە لەسەرکەوتنی ئەو ڕەزامەندی خۆی نیشاندا و فەرمانی پێدا شوێن تورکەکان بکەوێت و پێشنیاری پێکرد ئەگەر خەزەر ئەسەق بەردەست کەوت، لەتۆڵەی لەهراسب بیکوژێت و گەوهەرمز و ئەندرمان لەتۆڵەی منداڵەکانی بەزیندوویی نەهێڵێتەوە و قەلای تورکەکان وێران و شارەکانیان بسوتێنێت و خەڵکان لەتۆڵەی پیاوانی دین کوشتار بکات. ئەسیریان لێبگرێت. سەران و گەورەکانی ولاتی کردە هاورێی ئەو.

دەڵێن: ئیسفەندیار لەرێگەیەك کەپێشتر کەس پێیایدا نەڕۆشتبوو، ڕۆشتە ناو

سەرزەمینی تورکەکان و لەچاودێری کردنی سوپا و کوشتنی دڕندەکان و تیرهاویشتن بۆ سیمۆرغ کارێکی کرد پێشتر کەس ئەنجامی نەدابوو. گەمارۆی خستە سەر شاری ناوداری تورکەکان بەناوی دزروئین. پاشا و براکانی پاشا و سوپاکەی کوشت و سامانی ئەوانی تالآن کرد و ژنانی ئەوانی کردە ئەسیر و خوشکەکانی خۆی رزگار و نامەی سەرکەوتنی بۆ باوکی نوسی. لەم شەڕانە جگە لەئیسفەندیار، فشوتنی برای وئازەرنوش و مەهرین کوڕەکانی ئەبسە چالآکی بەرچاویان لەخۆیان نیشاندا.

ئەڵێن: بۆ گەیشتن بەشار لەرووبارە گەورەکانی وەك کاسروز و مێهرود و رووبارێکی گەورەی دیکە پەڕینەوە. ئیسفەندیار ڕۆشتە ناو شارێکی دیکەی فراسیات بەناوی هەسکسگ. سەرزەمینی تورکەکانی وێران و گەشتە دوورترین شوێنی سەرزەمینەکەیان و دیاری تبت و دەربەندی صولّ. ئەوسا ولآتی تورکەکانی کردە چەندین بەش و هەر ناوچەیەکی بەیەکێك لەفەرمانڕەوا تورکەکان سپارد و ئەمانی پێبەخشین و باج و خەراجی لەسەر دیاری کردن تا سالآنە رەوانەی بەشتاسبی بکەن. خۆی بۆ بەلّخ گەڕایەوە.

بەشتاسب رژدی بەکارەکانی ئیسفەندیار برد و ئەوی بۆ شەڕی رۆستەم لەسیستان رەوانە کرد.

لەهوشام کوڕی محەممەدی کەلبی دەگێڕنەوە: بەشتاسب ئیسفەندیاری وەك جێگری خۆی ناساند. بۆ شەڕی تورکەکان رەوانەی کرد کەسەرکەوتنی بەدەست هێنا و بۆ لای باوکی گەڕایەوە. باوك پێی وت: ئەم رۆستەمە فەرمانڕەوایەتی ویلایەتێك لەولآتەکەی ئێمە و گومان دەکات کابووس ئەوی لەبەندایەتی پاشا رزگار کردووە و ملکەچی فەرمانەکانی من نابێت، ئەو بۆ لای من بێنە. ئیسفەندیار بۆ شەڕی رۆستەم بەرێکەوت. رۆستەم ئەوی کوشت.

ماوەی پاشایەتی بەشتاسب سەد و دوانزە سالّ درێژەی کێشا و ئەوسا مرد. دەستەیەك وتوویانە یەکێك لەمنالّەکانی ئیسرائیل بەناوی سەمی وەك پێغەمبەر بۆ لای بەشتاسب رەوانە کرابوو کەڕۆشتە بەلّخ و لەگەلّ زەردەشتی پێغەمبەر و جاماسبی دانا کوڕی فەحد کۆبوویەوە. سەمی بەعیبرانی قسەی دەکرد. زەردەشت

ئەم زمانە فێر بوو و وتەکانی ئەوی بەفارسی نووسیەوە و جاماسب چاودێری ئەوان بوو. لەبەر ئەمە پێیان دەوت جاماسبی دانا.

دەستەیەك لەعەجەمەکان گومان دەکەن جاماسب کوڕی فەحد کوڕی هوو کوڕی حەکاو کوڕی ئەزکاو کوڕی فەرس کوڕی رەج کوڕی خوراسرو کوڕی مەنوچێهر پاشایە. زەردەشت کوڕی یوسف کوڕی فرودئەسەف کوڕی ئەریحەد کوڕی مەجدەسف کوڕی جەخشنس کوڕی حەدی کوڕی هەردان کوڕی سەفمان کوڕی ویدس کوڕی ئەدرا کوڕی رەج کوڕی خوراسرو کوڕی مەنوچێهر پاشایە.

دەڵێن بەشتاسب و لەهراسب باوکی باوەڕیان بەدینی صائیبیەکان هەبوو تا ئەو کاتەی سەمی و زەردەشت بانگەشەیان بۆ ئایینەکەی خۆیان کرد. ئەم روداوە لەسییەم ساڵی پاشایەتی بەشتاسب روویدا. هەروەها دەڵێن پاشایەتی بەشتاسب سەد و پەنجا ساڵ درێژەی کێشا.

لەو حەوت کەسەی بەشتاسب هەڵیبژاردن یەکیان بێهکامەند بوو کە لەدێی گورگان نیشتەجێ بوو، قارنی فەهلەوی کە لەویلایەتی نەهاوەند نیشتەجێ بوو، سورینی فەهلەوی شوێنی نیشتەجێ بوونی سیستان و ئیسفەندیاری فەهلەوی کەشوێنی نیشتەجێ بوونی شاری رەی بوو. دەستەیەك وتوویانە پاشایەتی بەشتاسب سەد و بیست ساڵ درێژەی کێشا.

## گێڕانەوەکان سەبارەت بەپاشاکانی یەمەن لەدەورانی بەشتاسب و بەهمەن کوڕی ئیسفەندیار

ئەبوجەعفەر دەڵێت: پێشتر باسمان کرد: دەستەیەك گومانیان کردووە کابووس لەڕۆژگاری سلێمان کوڕی داوود بوو. هەروەها باسی ئەوەمان کرد پاشاکانی یەمەن لەڕۆژگاری سلێمان بوون و باسی بەلقیس کچی ئیلیەشرح مان کرد.

لەهوشامی کەلبی دەگێڕنەوە: دوای بەلقیس پاشایەتی یەمەن بەیاسر کوڕی عەمرۆ کوڕی یەعفەر گەیشت و ئەویان بەیاسری ئەنعەم ناودەبرد لەبەر ئەوەی لەئەنعامی((بەخششەکانی)) ئەو پاشایەتی خەڵکان بەهێز و کاروبارەکانیان سامان درابوو.

بەگومانی دانیشتووانی یەمەن، یاسر ئەنعەم بەمەبەستی شەڕ بەرەو مەغریب بەڕێکەوت تا گەشتە دۆڵێك بەناوی دۆڵی لم. پێش ئەو کەس نەگەشتبوویە ئەو ناوچەیە. کاتێك گەشتە ئەو ناوچە، لەبەر زۆری لم نەیتوانی تێپەڕێت. لەکاتی مانەوەی ئەو لم بڵاو بوویەوە و فەرمانی بەیەکێك لەبنەماڵەکەی بەناوی عەمرۆدا تا لەگەڵ کەسەکانی خۆی تێپەڕێت. ئەوان ڕۆشتن و نەگەڕانەوە. کاتێك ئەمەی بینی، فەرمانی دروست کردنی بتێکی مسینی دەرکرد و لەسەر بەردێك لەلێواری دۆڵەکە هەڵیانواسی و بەخەتی نوسراو لەسەر سینەی بتەکە نوسیان: ئەم بتە لەیاسر ئەنعەمی حەمیریە.

دەڵێت: دوای ئەو توبەع، تەبان ئەسعەد پاشایەتی گرتەدەست و ناوی ئەو باوکی کەربە. لەڕۆژگاری بەشتاسب و ئەردەشێر بەهمەن کوڕی ئیسفەندیار بوو. لەیەمەن لەو ڕێگەوەی رائێش ڕۆشتبوو، بەرەو کوێستانی تەی بەڕێکەوت و لەوێوە مەبەستی ڕۆشتن بۆ ئەنباری کرد. کاتێك گەیشتە شوێنی حیرە، شەو بوو، سەریسوڕما و مایەوە و ئەو ناوچەیە بەحیرە ناوی دەرکرد. (حیرت: سەرسوڕمان)

دوای ئەوە ڕۆشت ودەستەیەك لەخەڵکانی ئەزد و لەخم و جەزام و عاملە و قوزاعەی بەجێهێشت کەبینایان دروست کرد و مانەوە و دواتر دەستەیەك لەتەی و

کەلب و سەکوون و بەلحارس کوڕی کەعب و ئەیاد پەیوەستیان بوون. باوکی کەرب بەرەو ئەنبار ملی ڕێگەی گرتەبەر و لەوێوە بەرەو موسڵ و ئازەربایەجان ڕۆشت. ڕووبەرووی تورکەکان بوویەوە و شکستی پێهێنان. پیاوانی کوشت و ژن و منداڵەکانی ئەسیر کرد. بۆ یەمەن گەڕایەوە و ڕۆژگارێکی تر ژیا. شاکان لەو دەترسان و سەری کوڕنوشیان بۆ دادەنەواند و خەڵاتیان بۆ دەنارد. نێردراوی پاشای هیند بەچەندین دیاری گرانبایی لەحەریر و بۆنی خۆش و عود وکاڵاکانی دیکە هیند ڕۆشتە لای. باوکی کەرب شتێکی بینی پێشتر نەیبینیبوو، وتی: ئەمانە لەدیاری ئێوەوە دێت؟

نێردراو وتی: زیان لەتۆ بەدوور بێت، لەدیاری ئێمەوە کەمتر دێت و زیاتر لەچینەوە دێت. وەسفی دیاری چین و فراوانی وئاوەدانی و زۆری بەرهەمەکانی بۆ کرد. باوکی کەرب سوێندی خوارد بۆ شەڕ لەسەرزەمینی چین بڕوات. لەگەڵ خەڵکانی حەمیر لەڕێگەی کەنارەکانەوە تا سەرزەمینی کائێك و کلاّو ڕەشەکان ڕۆشت و یەکێك لەهاوڕێکانی خۆی بەناوی نابتی لەگەڵ سوپایەك بۆ چین ڕەوانە کرد. نابت کوژرا و توبەع بەرێکەوت تا گەیشتە چین. پیاوانی کوشت و وێرانی زۆری دروست کرد.

دەڵێت: بەگومانی خەڵکانی یەمەن، ڕۆشتن و مانەوە وگەڕانەوەی ئەو لەچین حەوت ساڵی خایاند. دوانزە هەزار سواری لەحەمیر لەتبت بەجێ هێشت کەدانیشتووانی تبت لەوانن و ئێستا خۆیان بەعەرەب دەزانن و نەریت و عادەتی عەرەبەکان لەناو ئەواندا بلاّوە.

لەموسا کوڕی تەڵحە دەگێڕنەوە: توبەع لەگەڵ عەرەبەکان هات تا لەدەرەوەی کوفە کەیەکێك لەمەنزەڵەکانی ڕێگە بوو، سەریان سوڕما و لاوازەکانی خەڵك لەوێ مانەوە و بەحیرە ناوی دەرکرد. توبەع ڕۆشت و کاتێك گەڕایەوە، بینایان دروست کردبوو. لەهەموو هۆزەکانی عەرەب لەمناڵەکانی لەحیان و هوزەیل و تەمیم و جوعفی و تەی و کەلب، کەسانێك لەوێ نیشتەجێ بوون.

## گێڕانەوەکان سەبارەت بەئەردەشێر بەهمەن و کچەکەی، خەمانی

دوای بەشتاسب، نەوەکەی ئەردەشێر بەهمەن پاشایەتی گرتە دەست. ئەو ڕۆژەی تاجی لەسەرنا وپاشایەتی گرتەدەست، وتی: بەبەڵێنەکانی خۆمان ئەمەکدار دەبین و قەرزاین کە لەگەڵ ژێردەستەکان و مسکێنەکان بەچاکە هەڵس و کەوت بکەین. ئەویان بەئەردەشێری درێژدەست ناو بردووە لەبەر ئەوەی دەست درێژی بۆ هەموو سەرزەمینەکانی دەوروبەر کرد و بوو بەپاشای هەرێمەکان.

دەڵێن: ئەو لەسوادی عێراق بناغەی شارێکی داڕشت و بەئاباد ئەردەشێر ناوی برد. هەمان گوندی بەهمینیایە کەئێستاکە لەزابی سەرەودایە. لەناوچەی دیجلەیش بناغەی شارێکی داڕشت و ناوی بەهمەن ئەردەشێری لێنا کەهەمان ئوبلەیە. هەروەها بۆ تۆڵەسەندنەوەی باوکی ڕۆشتە سیستان و ڕۆستەمی دەستان و برازاکەی ئەوی بەناوی ئەزوارە و کوڕەکەی ئەو یانی فەرمۆرزی کوشت. بۆ خەرجی سوپا و ڕۆژی هیربودان پارەیەکی زۆری تەرخان کرد.

ئەردەشێر بەهمەن باوکی دارای گەورە و باوکی ساسانە. دوایین پاشای فارسەکان ئەردەشێر بابەك و منداڵەکانی لەنەوەی ساسان بوون.

لەهوشامی کەلبی دەگێڕنەوە: دوای بەشتاسب، ئەردەشێر بەهمەن کوڕی ئیسەفەندیار کوڕی بەشتاسب پاشایەتی گرتەدەست و وەك دەڵێن کەسێکی لەخۆ بوردوو بوو. نامەکانی بەناوی ئەردەشێر بەندەی خوا و خزمەتکاری خوا و چارەسەرکەری کاروباری خەڵکان بلاّو دەبوویەوە. دەڵێن: لەگەڵ سوپایەکی هەزار هەزار کەسی بۆ شەڕی ڕۆمی نزیك بەرێکەوت.

کەسانێتر وتوویانە بەهمەن مرد و دارا لەسکی دایکیدا بوو. خەمانیان بۆ ڕێزگرتن لەباوکی وەك پاشا دەستنیشان کرد. پاشاکانی زەوی خەراجیان بەبەهمەن دەدا. بۆ شکۆ و مەزنی گەورەتر لەپاشاکانی دیکەی پارس بوو. نامە و نووسراوەکانی لەنامە و نووسراوەکانی ئەردەشێر باشتر بوو.

دایکی بەهمەن ئەستوریا یا ئەستارە. ئەو کچی یائیر کوڕی شەمعی کوڕی

قەیس کوڕی مەنشا کوڕی تالوت کوڕی قەبس کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیمە و دایکی منالەکانی بەهمەن، راحب کچی فەنحس لەنەوەکانی رەحبعەم کوڕی سلێمان کوڕی داوودە. بەهمەن زەربابل کوڕی شەلتاییل و برای راحبی کردە فەرمانڕەوای منالەکانی ئیسرائیل و سەرۆکایەتی جالوتی بەو سپارد. دواتر لەسەر داوای خوشکەکەی ئەوی بۆ شام گەڕاندەوە.

بەهمەن دوو کوڕی بوو بەناوەکانی دارای گەورە و ساسان. کچەکانی فەرەنگ و بەهمەن دۆخت بوون. مانای بەهمەن خۆش نییەتە و خەمانی دوای ئەو پاشایەتی گرتەدەست. ماوەی پاشایەتی بەهمەن هەشتا ساڵ درێژەی کێشا.

دوای خۆی خەمانی کچی پاشایەتی گرتەدەست. ئەویان بۆ رێز گرتن لەکارە چاکەکانی باوکی و هەروەها لەبەر بیرمەندی و دلێری و توانای ئەو بۆ سوارکاری، وەك پاشا هەڵبژارد. نازناوەکەی شەهر ئازادە.

دەستەیەك لەشوێنکەوتەکانی هەواڵ وتوویانە: پاشایەتی خەمانی لێرەوە سەرچاوەی دەگرێت کاتێك دارای گەورە لەناو پزدانی دایکیدا شێوەی گرت، داوای لێکرد تاج بخاتە سەرسکی و پاشایەتی بەدارا ببەخشێت. بەهمەن ئەو کارەی کرد و تاجی بەدارا بەخشی کە لەناو سکی خەمانیدا بوو. ساسان کوڕی بەهمەن هەڵس و کەوتی شایانەی لەخۆی نیشاندەدا و لەپاشایەتی خۆی دڵنیا بوو. کاتێك کاری باوکی بینی، رووی کردە ئیستەخر و خۆی بەدوور گرت. لەدینی پێشووی هەڵگەڕایەوە و بوو بەکەسێکی خواپەرەست. دەڕۆشتە بەرزایی کێوەکان و خواپەرەستی دەکرد. سەرقاڵی بەخێو کردنی مەڕومالاَتەکەی بوو. خەڵك ئەم کارەیان ریسوا و سەرکۆنەیان کرد و وتیان: ساسان بۆتە شوان. لەبەر ئەمەیە نازناوی شوانیان خستە پاڵ ساسان.

دایکی ساسان کچی شالتیال کوڕی یوحەنا کوڕی ئوشیا کوڕی ئەقون کوڕی مەنشی کوڕی هازقیا کوڕی ئەحاز کوڕی یوسام کوڕی عوزیا کوڕی یورام کوڕی یوشافت کوڕی ئەبیا کوڕی رەحبعەم کوڕی سلێمان کوڕی داوودە.

دەڵێن: کاتێك بەهمەن مرد، کوڕەکەی دارا لەناو سکی خەمانیدا بوو. دوای چەند مانگێك لەپاشایەتی کوڕەکەی هێنایە دنیا، بەلاَم نەیویست ئاشکرای بکات.

ئەوی کردە ناو سنوقێك و بڕێکی زۆر گەوهەر و زێری کردە ناو سنوقەکە و خستیە ناو رووباری ئیستەخر و بەوتەیەك خستیە ناو رووباری بەلخ.

سنوقەکە کەوتە دەست ئاشەوانێك لەخەڵکانی ئیستەخر کە منداڵەکەی خۆی مردبوو. کاتێك دارای دۆزییەوە، ئەوی بردە لای ژنەکەی خۆی و لەجوانی ئەو و ئەو گەوهەرانەی لەگەڵ دارادا بوو، رەزامەندی خۆی نیشاندا. پەرەستاری ئەویان کرد و کاتێك گەورە بوو، خەمانی بۆی دەرکەوت کارێکی خراپی ئەنجامداوە کوڕەکەی خستۆتە بەردەم مەترسییەوە. کارەکەی ئاشکرا بوو. کاتێك کوڕەکە گەورە بوو، تاقیان کردەوە. هەموو تایبەتمەندی شازادەکانی تیا دەبینرا. خەمانی تاجی تەسلیم کرد و دارا کاروباری پاشایەتی گرتەدەست. خەمانی پۆشتە فارس و بناغەی شاری ئیستەخری داڕشت. بەردەوام سوپای بۆ شەڕی رۆمیەکان رەوانە دەکرد و سەرکەوتنی بەدەست هێنا و دوژمنانی شکستدا و لەدەستدرێژی کردن بۆ ولاتەکەی خۆی دووری کردنەوە. مسکێن و ژێردەستەکان لەرۆژگاری پاشایەتی ئەو ژیانێکی خۆشیان پێبڕا.

کاتێك خەمانی سوپای بۆ شەڕی رۆمیەکان رەوانە دەکرد و ئەسیری زۆریان لەدەوری ئەو کۆکردەوە، فەرمانیدا تا وەستا رۆمیەکان کە لەئەنمیان بوون، لەهەر سوچێك لەدەوروبەری ئیستەخر بینایەکی گەورە و سەرسوڕهێنەر لەشێوەی بیناکانی رۆم دروست بکەن. یەکێك لەبیناکان لەشاری ئیستەخر بوو، یەکیتریان لەسەر رێگەی دارابگەرد لەیەك فەرسەخی شار، سێیەمی لەچوار فەرسەخی شار و لەسەر رێگەی خوراسان بوو. خەمانی بۆ بەدەست هێنانی رەزامەندی خواوەند هەوڵیدەدا و سەرکەوتنی پێبڕا. خەراجی لەسەر مسکێنەکان هەڵگرت. ماوەی پاشایەتی ئەو سی ساڵ بوو.

## هەنووکە رووداوەکان و داستانی منداڵەکانی ئیسرائیل باس دەکەین

مێژووی رۆژگاری ئەوان تا کۆتایی مێژووی شاکانی ئێرانی هاوچەرخی خۆیان باس دەکەین:

پێشتر وتمان بۆچی ئەو دەستە لەمنداڵەکانی ئیسرائیل کەبەخت نەسر ئەوانی بۆ بابل برد، بۆ بیت المقدس گەڕانەوە. ئەمە لەرۆژگاری کیرەش کوڕی ئەخشو یەرش بوو کە لەلایەن بەهمەن کوڕی ئیسفەندیار پاشایەتی بابلی دەکرد و چوار ساڵ دوای ئەو لەلایەن خەمانییەوە پاشای بابل بوو. خەمانی دوای مەرگی کیرەش کوڕی ئەخشویەرش بیست و شەش ساڵ پاشایەتی کرد. هەموو پاشایەتی ئەو سی ساڵ و ماوەی وێرانی بیت المقدس لەو کاتەوەی بەخت نەسر وێرانی کرد تا ئەو کاتەی ئاوەدان بوویەوە، وەك شوێنکەوتەکانی کتێبی کۆن و شارەزایانی مێژوو وتوویانە، حەفتا ساڵە کەبەشێکی لەرۆژگاری بەهمەن کوڕی ئیسفەندیار کوڕی بەشتاسب کوڕی لەهراسب و بەشێکی لەرۆژگاری خەمانیدا بوو بەهەمان شێوە کە لەم کتێبەدا ئاماژەمان پێدا.

بەگومانی دەستەیەك کیرەش هەمان بەشتاسبە و دەستەیەك ئەم قسەیە بەناڕاست دەزانن و دەڵێن: کەی ئەرش مامی باوەگەورەیی بەشتاسبە، یانی کەی ئەرش برای کەیکاووس کوڕی کیسە کوڕی کەیقوبادی گەورەیە و بەشتاسب کوڕی کەی لەهراسب کوڕی کەبوجی کوڕی کیمنوش کوڕی کەیکاووس کوڕی کیسە کوڕی کەیقوبادی گەورەیە.

دەڵێن: کەی ئەرش هەرگیز لەلایەن کەیکاووس و کەی خوسرەو کوڕی سیاوەخش و لەلایەن لەهراسبەوە پاشایەتی نەکردووە، بەڵکوو لەخوزستان و ناوچەکانی دەوروبەری لەسەرزەمینی بابل فەرمانڕەوایەتی دەکرد. تەمەنی درێژ و کەسێکی رێزدار بوو.

کاتێك بیت المقدسی ئاوەدان کردەوە، منداڵەکانی ئیسرائیل بۆ ئەو سەرزەمینە گەڕانەوە. عەزیزیش لەگەڵ ئەواندا بوو. پێشتر داستانی ئەو و داستانی منداڵەکانی ئیسرائیلمان باس کرد. پێشتر و دوای ئەوە پاشاکانی منداڵەکانی ئیسرائیل لەلایەن پاشاکانی ئێرانەوە دیاری دەکران کەیا پیاوێکی فارسی بوو یایەکێك لەئیسرائیلیەکان تا ئەو کاتەی ناوچەکانی ئەوان کەوتە ژێر دەسەڵاتی یۆنانی و رۆمیەکان. ئەسکەندەر کاتێك دارای کوشت، دەستی بەسەر ئەم ناوچەدا گرت و هەمووی ئەم ماوە، وەك وتوویانە هەشتا و حەوت ساڵ بوو.

**هەنووکە گێڕانەوەکان سەبارەت بەدارای گەورە و کوڕەکەی دارای بچوک و چۆنییەتی کوژرانی ئەو و گێڕانەوەکان تایبەت بە زولقەرنەیین و پاشایەتی دارا کوڕی بەهمەن کوڕی ئیسفەندیار کوڕی بەشتاسب کەنازناوەکەی چیهر ئازادە، باس دەکەین**

دەڵێن: نیشتەجێی بابل و پاشایەتی دەکرد و پاشاکانی دەوروبەر خەراجیان بۆ دەنارد. لەفارس شاری دارابگەردی دروست کرد و شەیدای دارای کوڕی بوو. لەبەر ئەمە بەناوی خۆیەوە ناوینا و ئەوی کردە جێگری خۆی. وەزیری دارا کەپیاوێکی بیرمەند بوو بەناوی رەسەن، لەگەڵ ئەو منداڵەی لەگەڵ دارای بچوک گەورە بوو، دوژمنایەتی دەکرد و لای شا ئاژاوەی دەنایەوە. ناوی ئەو منداڵە سەری بوو. وەك دەڵێن پاشا شەربەتێکی بەسەریدا و ئەوی کوشت. دارا کینەی رەسەن و دەستەیەك لەگەورەکانی لەدڵ گرت کەدژی سەری پیلانگێڕیان کردبوو. ماوەی پاشایەتی دارا دوانزە ساڵی خایاند.

دوای ئەو کوڕەکەی دارا کوڕی دارا کوڕی بەهمەن پاشایەتی گرتەدەست و دایکی ئەو ماهیا هیند کچی هەزار مەرد کچی بەهراد مە بوو. کاتێك تاجی لەسەرنا، وتی: کەس ناخەمە گێژاوی مردنەوە، هەرکەسێك بکەوێتە ناو ئەو گێژاوە، رزگاری ناکەم.

دەڵێن: شاری دارای لەسەرزەمینی جەزیرە دروست کرد و براکەی سەری کردە دەبیر و وەزیری خۆی. چوونکە ئەو و براکەی هاودەم و هاوڕێی ئەو بوون. ئەو دڵی پاشای لەهاوەڵانی ڕەش کرد و ژمارەیەك لەوانی بەکوشتندا. کەسە نزیکەکان و تایبەتەکانی شا ترسی ئەویان کەوتە دڵەوە و بێزاری خۆیان دەبڕی چوونکە ئەو گەنجێکی لەخۆرازی و ستەمکار بوو.

لەهوشامی کەلبی دەگێڕنەوە: دوای دارا کوڕی ئەردەشێر، دارا کوڕی دارا بۆ ماوەی چواردە ساڵ پاشایەتی کرد. هەڵس و کەوتی ئەو لەگەڵ ژێردەستەکان پەسەند کراو نەبوو، سەرکردەکانی ئەوانی کوشت. ئەسکەندەر هێرشی کردەسەر و لەبەر ئەوەی خەڵکی وڵات لەو نارازی بوون و دەیانویست لەدەست ئەو ئاسوودە

بن، زۆر لەسەران و گەورەکانی خەڵك پەیوەستی ئەسکەندەر بوون و لەنهێنییەکانی دارا ئاگاداریان کردەوە. لەسەرزەمینی جەزیرە رووبەرووی یەك بوونەوە و شەڕ بۆ ماوەی یەك ساڵ درێژەی کێشا. ئەوسا چەند کەسێك لەنزیکەکانی دارا، دارایان کوشت و سەری ئەویان بۆ ئەسکەندەر برد. ئەسکەندەر فەرمانی کوشتنی بکوژەکانی دارای دەکرد و وتی: سزای کەسێك دەستدرێژی بکاتە سەر پاشاکەی خۆی، ئەمەیە.

ئەسکەندەر، رەوشەنەك کچی دارای وەك هاوسەری خۆی هەڵبژارد و هێرشی کردەسەر هیندستان وناوچەکانی رۆژهەڵات. دواتر گەڕایەوە و مەبەستی ئەسکەندەریەی کرد و لەسەرزەمینی سواد چاوی لەجیهان بەست. ئەویان لەناو تابووتێکی زێر بۆ ئەسکەندەریە برد.

ماوەی پاشایەتی ئەسکەندەر چواردە ساڵ درێژەی کێشا. لەرۆژگاری ئەو پاشایەتی تورکەکان تۆکمە بوو. پێش ئەسکەندەر پاشایەتی تورکەکان بەربلاو و پچرپچڕ بوو. پاشایەتی فارسەکان لەیەك هەڵوەشا کە پێش ئەسکەندەر تۆکمە و بەهێز بوو.

یەکیتر دەڵێت: کاتێك دارا کوڕی دارا پاشایەتی گرتە دەست، لەسەرزەمینی جەزیرە بناغەی شارێکی بەرفراوانی داڕشت و بەدارانەوا ناوی برد. ئەو شارەیە ئێستاکە بەدارا دەیناسن. شارەکەی ئاوەدان کردەوە و هەرچی پێویست بوو، لەو شارەدا ئامادەی کرد. فیلقوس باوکی ئەسکەندەری یۆنانی لەخەڵکی مەقدۆنییەی یۆنان و پاشای ئەویّ و ویلایەتەکانی دیکەی یۆنان بوو. لەگەڵ دارا ئاشتی کرد لەسەر ئەو بنەمای ساڵانە باج و خەراجی بۆ رەوانە بکات. کاتێك فیلقوس مرد، ئەسکەندەری کوڕە پاشایەتی گرتەدەست و خەراجی باوکی رەوانە نەکرد. دارا توڕە و نامەی بۆ نوسی و ئاگاداری پێدا و رایگەیاند لەبەر گەنجی و نەزانی خەراجی باوکی رەوانە نەکردووە. چۆگان و گۆی و پێوانەیەك کونجی بۆ ئەسکەندەر نارد و بۆی نوسی کەمناڵە و دەبێت بەچۆگان و گۆی گەمە بکات و سەرقاڵی پاشایەتی نەبێت. ئەگەر ئەم کارەبکات و جڵەوی پاشایەتی لەدەست بگرێت، کەس رەوانە دەکات بۆ ئەوەی لەناوی ببات. ژمارەی سوپاکەی ئەو

بەئەندازەی دەنکەکانی کونجیە کەرەوانەی کردووە.

ئەسکەندەر لەوەڵامدا نووسی: لەناوەرۆکی نامەکەی حاڵی بووە و چۆگان و گۆی بەپیرۆز دەزانێت چوونکە چۆگان لەگۆی دەدات و دەیشکێنێت و زەوی بەگۆی شوبهاند و وتی پاشایەتی دارا پەیوەستی پاشایەتی خۆی دەکات ویلایەتەکەی ئەو دەخاتە سەر سنوری فەرمانڕەوایەتی خۆی و کونجی بەهاوشێوی چۆگان دەزانێت چوونکە رۆنی هەیە و لەتاڵی و توندی بەدوورە و کیسەیەکی پڕ خەردەلی بەنامەکەدا بۆ دارا نارد و نوسی خەردەل کەمە بەڵام توندی و تاڵی و هێزی زۆری هەیە و سوپاکەی ئەو بەم شێوەیە.

کاتێك وەڵامی ئەسکەندەر بەدارا گەیشت، سوپاکەی خۆی کۆکردەوە وبۆ شەڕی ئەسکەندەر خۆی ئامادە کرد. ئەسکەندەریش خۆی ئامادە و بەرەو سنوری دارا بەرێکەوت. دارا ئاگادار بوویەوە وبەرەو سوپاکەی ئەسکەندەر پێشڕەوی کرد. کاتێك رووبەرووی یەك بوونەوە، شەڕێکی قورسیان دەستپێکرد. سوپاکەی دارا شکستی خوارد و دوو لەپاسەوانەکانی دارا کەدەڵێن لەخەڵکانی هەمەدان بوون، لەپشتەوە لەدارایاندا و لەئەسپەکەی خستیانە خوار. مەبەستیان لەم کارە خۆنزیك کردنەوە بوو لەئەسکەندەر.

ئەسکەندەر فەرمانیدابوو دارا بەئەسیری بگرن و نەیکوژن. کاتێك لەکوژرانی دارا ئاگادار بوویەوە، بەرەو لای رۆشت و لەکاتی گیان سپاردنی ئەو گەیشت. لەئەسپەکەی هاتەخوار و لەسەر سەری دانیشت و پێی وت هیچ کات مەبەستی کوشتنی ئەوی نەبووە و ئەوەی روویداوە بەپێچەوانەی فەرمانی ئەوە، وتی: هەرچی داوا دەکەیت بیکە تا ئەنجامی بدەم.

دارا وتی: دوو نیازم هەیە، یەکەم ئەوەی تۆڵەی من لەبکوژەکانم بستێنیت و دوەم ئەوەی کچەکەم رەوشەنەك بکەیتە هاوسەری خۆت.

ئەسکەندەر بەداواکەی رازی بوو و فەرمانیدا بکوژەکانی دارا هەڵواسن و رەوشەنەکی کردە هاوسەری خۆی. دەستی بەسەر سنوری پاشایەتی دارادا گرت و پاشایەتی گرتەدەست.

دەستەیەك لەشارەزایانی مێژوو وتوویانە ئەسکەندەر کە لەگەڵ دارای بچوك

شەڕی کرد، برای بوو و دارای گەورە دایکی ئەسکەندەری کردبووە هاوسەری خۆی کەکچی پاشای رۆم و ناوی هێلای بوو. ئەویان بردە لای دارا بەلام بۆگەنێکی ناخۆشی لێدەهات و شا فەرمانیدا تارێگەچارەیەکی بۆ بدۆزنەوە. زاناکان وتیان ئەو پێویستە بەداری سندەر چارەسەر بکرێت و جەستەی بەکولاوی سەندەر بشوات. بەشێکی زۆری بۆگەنەکەی جەستەی لەناو چوو بەلاّم نەك هەمووی. شا بەهۆی ئەو بۆگەنەوە لەژنەکەی بێزار و ئازادی کرد و بۆ لای کەسەکانی خۆی رەوانەی کردەوە. ژن لەشا دووگیان و کوڕێکی هێنایە دنیا. ئەویان بەناوی ئەو دارەی بۆگەنەکەی ئەوی بردبوو و بەناوی پاشا، ناویان نا سەندروس و ناوی ئەسکەندەروس لێرەوە کەوتە سەرزمانان.

دەڵێت: کاتێك دارای گەورە مرد، پاشایەتی بەدارای بچوکی کوڕی گەیشت. پاشاکانی رۆم سالاّنە خەراجیان بۆ دارای گەورە دەنارد و کاتێك باوکی هیلای پاشای رۆم و باوەگەورێی ئەسکەندەر مرد، پاشایەتی بەکچەزاکەی گەیشت، دارای بچوك کەسی نارد: ئەو خەراجەی پاشاکانی پێش تۆ دەیاندا، نەهاتووە، خەراجی ویلایەتەکەی خۆت رەوانە بکە و گەرنە هێرش دەکەمە سەرتۆ. وەلاّم هاتەوە: من مەلم کوشت و گۆشتەکەیم خوارد و هیچی لیّ نەماوەتەوە، ئەگەر دەخوازیت بەئاشتی لەگەلّ تۆ دەسازێم وئەگەر دەتەوێت شەڕ لەگەلّ تۆ دەکەم.

دارا سوپای رازاندەوە و مەبەستی شەڕی کرد، ئەسکەندەر بەدوو پەردەداری دارای وت: بیکوژن و داوای هەرچی دەکەن، بیکەن. پەردەدارەکان داوای بەخششیان کرد بەلاّم داوای مانەوەی خۆیان نەکرد. کاتێك دوو سوپا خۆیان بۆ شەڕ ئامادە کرد، پەردەدارانی دارا لەگۆڕەپانی شەڕ دارایان کوشت. ئەسکەندەر هات و دارا لەناو خوێنی خۆیدا دەتلایەوە. دوایین ساتەکانی ژیانی بوو. دابەزی و خاکی لەروخساری تەکاند و سەری خستە سەرداوێنی و وتی: ئەی شەریفی شەریفەکان و ئەی ئازادەی ئازادەکان و شای شاکان، پەردەدارەکانت تۆیان کوشت، من بەم کارە رازی نەبووم، هەرچی دەخوازیت، داوا بکە.

دارا وەسیەتی کرد کچەی بکاتە هاوسەری خۆی و ئازادەکانی فارس نەکوژێت و بێگانەکان نەکاتە فەرمانڕەوای ئەوان.

ئەسکەندەر بەداواکارییەکەی رازی بوو. کاتێك بکوژەکانی دارا ڕۆشتنە لای ئەسکەندەر، ئەوەی داوایان کردبوو، بەوانی بەخشی و وتی: بەڵێنەکەی خۆم لەگەڵ ئێوە بردەسەر بەڵام داوای مانەوەی خۆتانتان نەکرد، ئێوە دەکوژم چوونکە زیندووو هێشتنەوەی بکوژی پاشاکان ڕەوا نییە مەگەر بەئەمانێکی ڕاشکاو. ئەوانی کوشت.

دەستەیەك وتوویانە لەڕۆژگاری دارای گەورە، پاشای ڕۆم خەراجی بۆ دەنارد. کاتێك ئەو مرد و ئەسکەندەر پاشایەتی گرتەدەست کەپیاوێکی دوورئەندێش و بەتوانا بوو، بۆ شەڕی یەکێك لەپاشاکانی ڕۆژئاوا بەڕێکەوت و سەرکەوتنی بەدەست هێنا. خۆی بەکەسێکی بەهێز بینی و دژی دارای بچوك شۆڕشی کرد و لەناردنی خەراجی ساڵانە خۆی بەدوور گرت. دارا تورە بوو و نامەیەکی ئیهانە ئامێزی بۆ نووسی. شەڕ لەنێوانیان دروست بوو. دوو سوپا بەمەبەستی هێرش کردنە سەریەك خۆیان ئامادە کرد و لەسەر سنوور ڕووبەڕووی یەك بوونەوە. نامەکان ئاڵ و گۆڕ کران و ئەسکەندەر لەڕووبەڕوو بوونەوەی دارا ترسا. داوای ئاشتی کرد و دارا بۆ ئاشتی ڕاوێژی لەگەڵ کەسە نزیك و گەورەکانی وڵات کرد. ئەویان بۆ شەڕ هاندا چوونکە لەو بێزار بوون.

سەبارەت بەشوێنی ڕووبەڕوو بوونەوەی دارا و ئەسکەندەر بۆچوونەکان جیاوازە. دەستەیەك وتوویانە شوێنی ڕووبەڕوو بوونەوە لەناوچەی خوراسان و نزیك خەزەر بوو وشەڕێکی قورسیان کرد. ئەسکەندەر سوار ئەسپێکی سەرسوڕهێنەر بوو بەناوی کوفرئەسب.

دەڵێن: لەو ڕۆژەدا یەکێك لەفارسەکان هێرشی برد و ڕیزەکانی سوپای ئەسکەندەر تێکشکاند و بەشمشێر زەرەبەیەکی لەئەسکەندەردا. ئەسکەندەر سەری سوورما و وتی: ئەمە یەکێکە لەسوارە فارسیەکان کە بوێری ئەوان لەسەر زمانانە. ڕقی هاوەڵانی دارا بزوا و دوان لەپاسەوانەکانی ئەو لەخەڵکی هەمەدان نامەیان بۆ ئەسکەندەر نووسی و بەدوای دەرفەتێکدا گەڕان. بەشمشێر لێیاندا کە بەمەرگی دارا کۆتایی هات و هەڵاتن.

دەڵێن: دەنگ بەرز بوویەوە و ئەم هەواڵە بەئەسکەندەر گەیشت. لەگەڵ

هاوەڵانی خۆی سوار بوو و لەسەرە مەرگ گەیشتە لای دارا. قسەی لەگەڵ کرد و سەری خستە سەرداوێنی، گریا و وتی: لەشوێنەکەی خۆتەوە زیانت بەرکەوت و باوەڕپێکراوانت خیانەتیان لەتۆ کرد و لەناو دوژمنەکان بەتەنیا ماویتەوە. داوای هەرچی دەکەیت بیکە، چوونکە رێز لەپەیوەندی خزمایەتی تۆ دەگرم.

دەڵێت: مەبەستی لەخزمایەتی نێوان سەلەم و هیرەج دوو کوڕەکەی فەرەیدونە. لەروداوەکە خەمبار و سپاسی خوای کرد کەدەستی بەخوێنی ئەو پیس نەبووە. دارا داوای لێکرد رەوشەنەکەی کچی بکاتە هاوسەری خۆی و تۆڵە لەبکوژەکانی بستێنێت. ئەسکەندەر رازی بوو. ئەو دوو کەسەی دارایان کوشت، هاتن و داوای پاداشتیان کرد. ئەسکەندەر فەرمانی کوشتنی هەردووکیانی دەرکرد و هەڵیانواسین. جاریدا هەرکەس دەستدرێژی بکاتە سەر پاشاکەی خۆی و خیانەت لەخەڵکەکەی خۆی بکات، سزاکەی کوشتنە .

دەستەیەك دەڵێن: ئەسکەندە کتێب وزانست و ئەستێرەناسی و حیکمەت لەفارسەکانەوە فێر بوو کەسەرەتا بۆ سریانی و دواتر بۆ زمانی رۆمی وەرگێڕدران.

دەڵێن: کورەکانی دارا ئەشك و سودا و ئەردەشێر بوون. کچێکی هەبوو بەناوی رەوشەنەك و ماوەی پاشایەتی ئەو چواردەساڵ بوو.

دەستەیەك وتوویانە: ئەو باجەی باوکی ئەسکەندەر بەپاشاکانی ئێرانی دەدا، تۆوی زێر بوو. کاتێك ئەسکەندەر پاشایەتی گرتەدەست، دارا کەسی نارد و داوای باجی کرد. ئەسکەندەر وەڵامی دایەوە، ئەو مریشکەی تۆوی زێری دەکرد، کوشتم و گۆشتەکەیم خوارد. و خۆی بۆ شەڕ ئامادە کرد.

ئەسکەندەر دوای دارا کوڕی دارا پاشایەتی گرتەدەست. پێشتر ئاماژەمان بەبۆچوونی ئەو کەسەدا کەدەڵێت دارا وئەسکەندەر برا بوون.

رۆمیەکان و زۆر لەڕەچەڵەك ناسان دەڵێن ئەسکەندەر کوڕی فیلقوس بوو.

دەستەیەك وتوویانە: کوڕی بیلبوس کوڕی مەتریوس و بەوتەیەك مەصریم کوڕی هێرمس کوڕی هەردس کوڕی مەبتون کوڕی رۆمی کوڕی لەمتی کوڕی یۆنان کوڕی یافس کوڕی سوبە کوڕی سەرحون کوڕی رۆمیە کوڕی مەربت کوڕی نەوفیل کرۆمی کوڕی ئەصفەر کوڕی یەفز کوڕی عەیص کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیمە.

ئەسکەندەر دوای مەرگی دارا، سنوری پاشایەتی ئەوی پەیوەستی سنوری پاشایەتی خۆی کردو بوو بەپاشای رۆم و میسر وشام و عێراق. بەناو سوپاکەی خۆیدا گەڕا. وەك وتوویانە یەك هەزار و چوارسەد هەزار بوو کەهەشسەد هەزاری سوپای خۆی و شەشسەد هەزاری سوپای دارا بوو.

دەڵێن: کاتێك ئەسکەندەر لەسەر تەخت دانیشت، وتی: خوا ئێمەی کردە جێگری دارا و بەپێچەوانەی هەڕەشەکانی ئەو سەرکەوتنی پێبەخشین.

ئەسکەندەر هەموو شار و قەلاَ و ئاتەشکەدە سنوری فارسەکان وێران و هیربودانی کوشت. کتێبەکان و دیوانەکانی دارای سوتاند و یەکێك لەپیاوەکانی خۆی کردە فەرمانڕەوای ولاَتەکەی دارا. بەرەو هیندستان لەشکری کێشا و پاشاکەی کوشت و دەستی بەسەر شارەکەیدا گرت. لەوێوە بەرەو چین ڕۆشت و ئەو کارەی کرد کە لەهیندستان ئەنجامیدا. هەموو جیهان ملکەچی بوو. تبت و چینی خستە سەر سنوری فەرمانڕەوایەتی خۆی و لەگەڵ چوارسەد پیاو بەدوای سەرچاوەی ژیانی نەمری ڕۆشتە ناو تاریکیەکان کە لەنزیك جەمسەری باکوور وهەتاوی باشوورە. هەژدە رۆژ لەتاریکیدا ڕێگەی بڕی و هاتەدەر و بۆ عێراق گەڕایەوە و ملوك الطوایفی کردە پاشا و لەناو ڕێگە لەشارەزوور مرد.

بەوتەی دەستەیەك لەکاتی مردنی تەمەنی سی و شەش ساڵ بوو. جەستەی ئەویان گەڕاندەوە بۆ لای دایکی بۆ ئەسکەندەریە.

بەگومانی فارسەکان ماوەی پاشایەتی ئەسکەندەر چواردە ساڵ بوو.

بەگومانی نەصاریەکان ماوەی پاشایەتی ئەو سیانزە ساڵ و چەند مانگ بوو و کوژرانی دارا لە سێیەم ساڵی پاشایەتی ئەو روویدا.

دەڵێن: فەرمانیدا تا شارەکان دروست بکەن. بناغەی سیانزە شاری داڕشت و هەموویانی بەئەسکەندەریە ناوبرد. یەکیان لەئیسفەهان بوو کەبەجی ناوی برد. هاوشێوەی بەهەشت دروست کرا بوو. سێ شار لەخوراسان کەهەرات و مەرو و سەمەرقەند بوون. لەسەرزەمینی یۆنان و دیاری هیلاقوس شارێکی بۆ فارسەکان دروست کرد لەگەڵ چەندین شاریتر.

کاتێك ئەسکەندەر مرد، پاشایەتیان بەئەسکەندروسی کوڕی بەخشی بەلاَم رازی نەبوو و خواپەرەستی و گۆشەگیری هەڵبژارد. یۆنانییەکان وەك دەڵێن بەتلیموس

کوڕی لۆگۆسیان وەك پاشا هەڵبژارد کەبۆماوەی هەشتا و هەشت ساڵ پاشایەتی کرد.

لەرۆژگاری یۆنانییەکان، لەژیانی ئەسکەندەر و دوای ئەو پێش ئەوەی پاشایەتی بەرۆمیەکان بگات، پاشایەتی تایبەت بوو بەیۆنانییەکان و منالەکانی ئیسرائیل لەبیت المقدس و دەوروبەری سەرۆکایەتیان دەکرد نەك پاشایەتی. تا ئەو کاتەی دوای کوشتنی یەحیا کوڕی زەکەریا، فارسەکان و رۆمیەکان شوێنەوارەکانی ئەوانیان وێران کرد و خۆیانیان لەوێ دەرپەڕاند.

دوای بەتلیموس کوڕی لۆگۆس دلتانوس بۆماوەی چل ساڵ پاشایەتی شام و میسر و ناوچەکانی رۆژئاوای کرد.

دوای ئەو بەتلیموس ئورگاتس بیست و چوار ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو بەتلیموس فیلافەتر پانزە ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو بەتلیموس ئەفیفانس بیست و دوو ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو بەتلیموس ئورگاتس بیست و نۆ ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو بەتلیموس ساتر حەفدە ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو بەتەلیموس ئەحسەندەر پانزە ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو بەتلیموسێك کە لەپاشایەتی ونبوو، هەشت ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو بەتلیموس دونسیۆس شانزە ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو بەتلیموس قالو بەتری حەفدە ساڵ پاشایەتی کرد.

هەمووی ئەم کەسانەی یۆنانی بوون و هەموو شاکانی یۆنان دوای ئەسکەندەر بەبەتلیموس ناودەبران بەهەمان شێوە کە شاکانی ئێران بەخوسرەو. یۆنانییەکانیان بەمەقدونیشی ناو دەبرد.

دوای قالو بەتری وەك دەڵێن پاشایەتی شام تایبەت بوو بەرۆمیەکان. یەکەم کەس لەوان پاشایەتی گرتەدەست، کایوس یولیۆس بوو کەبۆ ماوەی پەنجا ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو ئۆگۆستۆس سی و شەش ساڵ پاشایەتی شامی کرد و لەساڵی چل و دوەم لەپاشایەتی ئەو عیسا کوڕی مریەم چاوی بەدنیا هەڵهێنا. لەدایك بوونی ئەو سێسەد و سێ ساڵ دوای شۆڕشەکەی ئەسکەندەر بوو.

## گێڕانەوەکان سەبارەت بەفارسەکان دوای مەرگی ئەسکەندەر کە ئەریتی مێژوو بۆ پاشایەتی ئەوانە

شارەزایانی مێژوو سەبارەت بەو کەسەی دوای ئەسکەندەر پاشایەتی عێراقی کرد و لەکاری پاشای تیرەکان تا ئەو کاتەی پاشایەتی ئەردەشێری بابەکان، پاشایەتی هەرێمی بابلیان لەدەستا بوو، بۆچوونەکانیان جیاوازە.

هوشامی کەلبی دەڵێت: دوای ئەسکەندەر بلاکوس سلیکس پاشایەتی گرتەدەست و دوای ئەو ئەنتیحس. دەڵێت ئەنتیحس بناغەی شاری ئەنتاکیەی دارِشت. سوادی کوفە لەژێر داگیرکاری ئەم پاشایانەدا بوو و لەناوچەی کوێستانییەکان و ئەهواز و فارس هاتوچۆیان دەکرد تا ئەوەی پیاوێك بەناوی ئەشك دەرکەوت. ئەو کوڕی دارای گەورە بوو. لەدایك بوون و گەورەبوونی لەشاری رەی بوو. دەستەیەکی زۆری لەدەوری خۆی کۆکردەوە و مەبەستی هێرش کردنە سەر ئەنتیحسی کرد. دەستی بەسەر سوادا گرت و لەموسڵەوە تارەی و ئیسفەهان کەوتە ژێر دەستی. بەهۆی شەرەف و رەچەڵەکی خۆی زۆربەی پاشای تیرەکان سەری کوڕنوشیان بۆ دانەواند. لەنامەکاندا رێزی ئەویان گرت وئەویش کاتێك نامەی دەنووسی، لەناوی خۆیەوە دەستی پێدەکرد. ئەویان بەشا ناوبرد و دیاریان بۆ رەوانە کرد. بەڵام لابردن و دانانەکان لەدەسەلاّتی ئەودا نەبوو.

دەڵێت: دوای ئەو گودەرز کوڕی ئەشکان پاشایەتی گرتەدەست. ئەو بوو کەبۆ جاری دووەم هێرشی کردە سەر منداڵەکانی ئیسرائیل و بەوتەی حەتلعان، خواوەند ئەوی بەهۆی کوژرانی یەحیا کوڕی زەکەریا بەدەستی ئیسرائیلیەکان، بەسەر منداڵەکانی ئیسرائیلدا زاڵ کرد. ژمارەیەکی زۆری لەوان کوشت کەچیتر هیچ کات بەو ئەندازەیە فراوان نەبوونەوە. خواوەند پێغەمبەری لەوان سەندەوە و ریسوایی کردن.

دەڵێت: رۆمیەکان بەسەرکردایەتی پاشا گەورەکەیان بۆ تۆڵە سەندنەوەی ئەنتیحس کە بەدەستی ئەشك لەبابل کوژرا بوو، هێرشیان کردە سەر سەرزەمینی

فارسەکان. پاشای بابل بلاش کوڕی ئەردوان بوو. ئەردەشێر کوڕی بابەکان ئەوی کوشت و بلاش نامەی بۆ پاشای تیرەکان رەوانە کرد کەرۆمیەکان بۆ هێرش کردنە سەر سەرزەمینەکەیان کۆبوونەتەوە و ژمارەی سوپاکەیان بەئەندازەیەکە توانای بەرگری کردن لەبەرابەر ئەوانی نییە. ئەگەر نەتوانێت رێگەی پێشڕەوی ئەوان بگرێت، بەسەر پاشاکانی دیکەیش سەرکەوتنی بەدەست دێنن. هەرکام لەپاشای تیرەکان بەگوێرەی توانای خۆی، پیاوی شەڕکەر و کەرەستەی شەڕی بۆ رەوانە کرد. چوارسەد هەزار کەس لەدەروی ئەو کۆبوونەوە. فەرمانڕەوای حزری کردە سالار کەیەکێك بوو لەپاشای تیرەکان و سنوری فەرمانڕەوایەتی ئەو لەسنورەکان سواد تا جەزیرە بوو. بەرێکەوت و رووبەرووی پاشای رۆم بوویەوە. ئەوی کوشت و سوپاکەی تالآن کرد. ئەم شکستە رۆمیەکانی بۆ داڕشتنی بناغەی شاری قوستەنتینە ناچار کرد و شوێنی پاشایەتیان لەرۆمیەوە وبۆ ئەو شارە گواستەوە. دامەزرێنەری شارەکە قوستەنتین بوو. ئەو یەکەم پاشای رۆم بوو باوەڕی بەئاییینی نەصرانی هێنا. ئەو پاشماوەکانی منالّەکانی ئیسرائیل لەفەلەستین وئەردەن دەرپەڕاند چوونکە گومانی کردبوو عیسا کوڕی مریەمیان کوشتووە. خاچەکەی وەرگرتەوە کەگومانیان دەکرد عیسایان پێ لەخاچداوە. رۆمیەکان ئەو دارە بەپیرۆز دەزانن. خاچەکەیان بردە ناو خەزێنەکانی خۆیان و تا ئێستایش لای ئەوانە.

دەڵێت: پاشایەتی فارسەکان بەربلاّو بوو تا ئەو کاتەی ئەردەشێر پاشایەتی گرتەدەست. هوشام ئاماژەی بەم بابەتە داوە بەلاّم ماوەی پاشایەتی ئەو خەڵکانەی دیاری نەکردووە.

یەکێکی دیکە لەشارەزایانی مێژووی فارسەکان دەڵێت: دوای ئەسکەندەر سەرزەمینی دارا کەوتە دەست کەسانێك جگە لەپاشا فارسەکان بەلاّم هەموویان ملکەچی پاشای دیاری کوێستان بوون و فەرمانەکانی ئەویان جێبەجێ دەکرد.

## ئەوان پاشا ئەشکانییەکان بوون کەومک پاشای تیرەکان ناو دەبران

دەڵێت: ماوەی پاشایەتی پاشای تیرەکان، دوسەد و شەشت و شەش ساڵ بوو.

لەم ماوەدا ئەشك کوڕی ئەشکان دە ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو شاپوور کوڕی ئەشکان شەست ساڵ پاشایەتی کرد، لەساڵی چل ویەکەمی پاشایەتی ئەو عیسا کوڕی مەریەم لەسەرزەمینی فەلەستین دەرکەوت و چل ساڵ دوای بەرزبوونەوەی عیسا، بەتوس کوڕی ئەسفیساتوس پاشای رۆمیە هێرشی کردە سەر بیت المقدس و هەموو پیاوەکانی ئەو شارەی کوشت و ژن و منداڵەکانی ئەسیر کردن. فەرمانی وێران کردنی شارەکەی دەرکرد بەشێوەیەك بەرد لەسەر بەرد نەمایەوە.

دوای ئەو گودەرز کوڕی ئەشکانی گەورە، دە ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو بیژەنی ئەشکانی بیست و یەك ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو گودەرزی ئەشکانی نۆزدە ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو نێرسی ئەشکانی چل ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو هورموزی ئەشکانی حەفدە ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو ئەردوانی ئەشکانی دوانزە ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو خوسرەوی ئەشکانی چل ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو بلاشی ئەشکانی بیست و چوار ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو ئەردوانی بچوکی ئەشکانی سیانزە ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو ئەردەشێر کوڕی بابەك پاشایەتی گرتە دەست.

دەستەیەك وتوویانە پاشای تیرەکان کەئەسکەندەر وڵاتی لەناویاندا دابەش کردبوو، دوای ئەو پاشایەتیان کرد. هەر ناوچەیەك پاشایەکی هەبوو جگە لەسواد کەتا پەنجا و چوار ساڵ دوای مەرگی ئەسکەندەر لەدەست رۆمیەکاندا بوو. یەکێك لەپاشای تیرەکان کە لەنەوەی پاشاکان بوو، پاشایەتی هەرێمی کێوەکان و ئیسفەهانی دەکرد. دوای خۆی منداڵەکانی دەستیان بەسەر سوادا گرت و بوونە پاشای ئەویٚ و ماهات و کێوەکان و ئیسفەهان و سالاری پاشای تیرەکانیان پێبڕا. نەریت بەو شێوە بوو کەئەو و منداڵەکانیان پێش بخەن لەبەر ئەمە لەکتێبی بەسەرهاتی پاشاکان تەنیا

ئاماژەیان بەناوی ئەواندا و ناوی شاکانی دیکەیان پشت گوێ خست.

دەڵێت: عیسا کوڕی مریەم پەنجا و یەك ساڵ دوای پاشایەتی پاشای تیرەکان لەئورشەلیم چاوی بەدنیا هەڵهێنا. هەموو رۆژگاری ئەسکەندەر تا شۆرشی ئەردەشێر کوڕی بابەك و کوشتنی ئەردوان و سەقامگیر بوونی پاشایەتی ئەو، دوسەد و شەست و شەش ساڵی خایاند.

دەڵێت: ئەو پاشایانەی فەرمانڕەوایی هەرێمی کێوەکانیان دەکرد و دوای ئەوان منداڵەکانیان دەستیان بەسەر سوادا گرت، ئەشك کوڕی حورە کوڕی ریسان کوڕی ئەرتشاك کوڕی هورموز کوڕی شاهم کوڕی ران کوڕی ئیسفەندیار کوڕی بەشتاسب بوو.

دەڵێت: فارسەکان گومان دەکەن ئەشك کوڕی دارایە.

دەڵێت: دەستەیەکیان وتوویانە ئەشك کوڕی ئەشکانی گەورەیە. ئەو لەمنداڵەکانی کیسە کوڕی کەیقوبادە و بۆ ماوەی دەساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو ئەشك کوڕی ئەشك کوڕی ئەشکان بیست و یەك ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو شاپور کوڕی ئەشك کوڕی ئەشکان سی ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو گودەرزی گەورە کوڕی شاپوور کوڕی ئەشکان دە ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو بیژەن کوڕی گودەرز بیست و یەك ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو گودەرزی بچوك کوڕی بیژەن نۆ ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو نێرشە کوڕی گودەرزی بچوك چل ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو هورموز کوڕی بەلاش کوڕی ئەشکان حەفدە ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو ئەردوانی گەورە کوڕی ئەشکان دوانزە ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو خوسرەو کوڕی ئەشکان چل ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو بەئافەریدی ئەشکانی نۆ ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو بلاشی ئەشکانی بیست و چوار ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو ئەردوانی بچوکی ئەشکانی پاشایەتی گرتە دەست. ئەو کوڕی بلاش کوڕی فیروز کوڕی هورموز کوڕی بلاشەر کوڕی شاپور کوڕی ئەشك کوڕی ئەشکانی گەورە بوو. باوەگەوڕێی کیسە کوڕی کەیقوبادە کەدەڵێن سنوری فەرمانڕەوایەتی ئەو لەهەموو ئەشکانیان زیاتر بوو. لەهەموویان بەتواناتر و ناودارتر و زیاتر لەهەموویان بەسەر پاشای تیرەکاندا زاڵبوو.

ئەردوان دەستی بەسەر ویلایەتی ئیستەخردا گرت کەپەیوەستی ئیسفەهان ببوو. لەوێوە دەستی بەسەر ناوچەکانی گور و ناوچەکانی دیکەی فارسدا گرت. پاشاکان ملکەچی فەرمانەکانی بوون. ماوەی پاشایەتیەکەی سیانزە ساڵ درێژەی کێشا. دوای ئەو پاشایەتی ئەردەشێر دەستی پێکرد.

دەستەیەك وتوویانە دوای ئەسکەندەر نەوەد پاشا لەعێراق و شام و میسر پاشایەتی نەوەد نەتەوەیان دەکرد. هەموویان پاشاکانی مەداینیان بەگەورە دەزانی کەئەشکانی بوون.

دەڵێت: لەئەشکانییەکان ئەفقور شا کوڕی بلاش کوڕی شاپوور کوڕی ئەشکان کوڕی ئەش جەبار کوڕی سیاوەش کوڕی کەیکاووس شەست و دوو ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو شاپوور کوڕی ئەفقور پەنجا و سێ ساڵ پاشایەتی کرد و مەسیح و یەحیا لەرۆژگاری ئەودا بوون.

دوای ئەو گودەرز کوڕی شاپوور کوڕی ئەفقور پەنجا و نۆ ساڵ پاشایەتی کرد. ئەو بوو بەمەبەستی تۆڵەکردنەوە لە منداڵەکانی ئیسرائیل بۆ کوشتنی یەحیا کوڕی زەکەریا، هێرشی کردە سەریان.

دوای ئەو برازاکەی ئەبزان کوڕی بلاش کوڕی شاپوور چل و حەوت ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو گودەرز کوڕی ئەبزان کوڕی بلاش سی و یەك ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو براکەی نێرسی کوڕی ئەبزان سی و چوار ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو هورموزان کوڕی بلاش چل و هەشت ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو فیروزان کوڕی هورموزان کوڕی بلاش سی و حەوت ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو خوسرەو کوڕی فیروزان چل و حەوت ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو ئەردوان کوڕی بلاش پەنجا وپێنج ساڵ پاشایەتی کرد. ئەو دوایین پاشای ئەشکانی بوو و لەسەر دەستی ئەردەشێری بابەکان کوژرا.

دەڵێت: ماوەی پاشایەتی ئەسکەندەر و پاشایەتی پاشای تیرەکان لەناوچە جیاوازەکان پێنسەد و بیست و سێ ساڵ درێژەی کێشا.

## گێڕانەوەی ڕووداوەکانی سەردەمی پاشای تیرەکان

بەگومانی فارسەکان شەست وپێنج ساڵ دوای زاڵبونی ئەسکەندەر بەسەر سەرزەمینی بابل، پەنجا ویەك ساڵ دوای دەسپێکردنی پاشایەتی ئەشکانییەکان، مریەم کچی عیمران، عیسا کوڕی مریەمی هێنایە دنیا. بەگومانی مەسیحیەکان لەدایك بوونی عیسا سێسەد و سێ ساڵ دوای زاڵبوونی ئەسکەندەر بوو. هەروەها گومان دەکەن لەدایك بوونی یەحیا کوڕی زەکەریا شەش مانگ پێش لە لەدایك بوونی عیسا کوڕی مریەم بوو.

دەڵێن: مریەم سیانزە ساڵە بوو بەعیسا دووگیان و عیسا تا کاتی بەرزبوونەوەی بۆ ئاسمان، سی و دوو ساڵ و چەند رۆژێك ژیا. مریەم تا شەش ساڵ دوای بەرز بوونەوەی ئەو بۆ ئاسمان زیندووو بوو. ساڵەکانی تەمەنی پەنجا و چەند ساڵ درێژەی کێشا.

دەستەیەك گومانیان کردووە عیسا سێ ساڵە بوو کە لەکەنارەکانی رووباری ئەردەم یەحیای بینی. یەحیا پێش لەبەرز بوونەوەی عیسا بۆ ئاسمان کوژرا. زەکەریا کوڕی بەرخیا و باوکی یەحیا لەگەڵ عیمران کوڕی ماسان باوکی مریەم دوو خوشکیان کردبووە هاوسەر. ئەو ژنەی بووبە هاوسەری زەکەریا، یەحیای هێنایە دنیا وئەوی دیکەیان کەهاوسەری عیمران بوو، مریەمی هێنایە دنیا. کاتێك عیمران کوڕی ماسان مرد، دایکی مریەم دووگیان بوو وکاتێك مریەم چاوی بەدنیا هەڵهێنا، زەکەریا دوای مەرگی دایکی سەرپەرەستی کردنی ئەوی گرتە ئەستۆ لەبەر ئەوەی پووری مریەم، خوشکی دایکی، هاوسەری زەکەریا بوو. ناوی دایکی مریەم حەنە کچی فاقود کوڕی قەبیلە و ناوی خوشکەکەی، دایکی یەحیا، ئەشباع کچی فاقودە. کاتێك زەکەریا سەرپەرەستی کردنی مریەمی گرتە ئەستۆ، ئەو دەزگیرانی یوسف کوڕی یەعقوب کوڕی ماسان کوڕی ئەلیعازار کوڕی ئەلیوز کوڕی ئەحین کوڕی صادوق کوڕی عازور کوڕی ئەلیاقیم کوڕی ئەبیوز کوڕی زەربابل کوڕی شەلتیل کوڕی یوحنیا کوڕی یوشیا کوڕی ئەمون کوڕی مەنشا کوڕی حەزقیا

کوڕی ئەحاز کوڕی یوسام کوڕی عوزیا کوڕی یورام کوڕی یەهوشافات کوڕی ئەسا کوڕی ئەبیا کوڕی رەحبعەم کوڕی سلێمان کوڕی داوود بوو. یوسف کوڕە مامی مریەمە.

بەڵام بەپێی گێڕانەوەی کوڕی ئیسحاق ڕەچەڵەکی مریەم بەمشێوەیە:

مریەم کچی عیمران کوڕی یاشهەم کوڕی ئەمون کوڕی مەنشا کوڕی حەزقیا کوڕی ئەحزیق کوڕی یوسام کوڕی عەزریا کوڕی ئەمصیا کوڕی یاوش کوڕی ئەحزیهو کوڕی یارم کوڕی یەهشافات کوڕی ئەسا کوڕی ئەبیا کوڕی رەحبعەم کوڕی سلێمان.

یەحیا کوڕی زەکەریا و کوڕە پوری عیسا، لەتەمەنی منداڵیدا بۆ پێغەمبەرایەتی هەڵبژێردرا. بەرەو شام بەرێکەوت. دواتر یەحیا و عیسا کۆبونەوە و دوای ئەوەی یەحیا عیسای پاك کردەوە، لەیەك جیا بوونەوە.

دەڵێن: یەحیا، عیسای لەگەڵ دوانزە کەس لەحەواریەکان رەوانە کرد تا خەڵکان فێری خواپەرەستی بکەن. لەو شتانەی حەرامیان کرد، مارە کردنی کچی برا بوو. کوڕی عەباسیش ئاماژەی بەگێڕانەوەیەکی لەم چەشنە داوە.

پاشای مناڵەکانی ئیسرائیل برازایەکی هەبوو کەحەزی لێدەکرد. دەیوست ئەو بکاتە هاوسەری خۆی. هەر ڕۆژە و بەمەبەستێك ئەوی دەبردە لای خۆی. کاتێك دایکی کچەکە لەمەبەستی پاشا ئاگادار بوویەوە، پێی وت: کاتێك ڕۆشتیتە لای پاشا و پرسی چیت دەوێت، بڵێ دەمەوێت یەحیا کوڕی زەکەریا سەر ببڕیت.

کاتێك کچەکە ڕۆشتە لای پاشا، پاشا پرسی: چیت دەوێت؟

وتی: دەمەوێت یەحیا کوڕی زەکەریا سەر ببڕیت.

شا وتی: داوای شتێکی دیکە بکە.

کچ وتی: تەنیا ئەوەم دەوێت.

کاتێك کچەکە پێداگری کرد. پاشا داوای یەحیای کرد و کاتێك هات تەشتێکیان دانا. یەحیای سەربڕی و دڵۆپێك خوێنی ئەو ڕژایە سەرزەوی. دڵۆپە خوێنەکە بەردەوام هەڵدەقولا تا ئەو کاتەی خواوەند بەخت نەسری رەوانە کرد. پیرێژنێك لەمناڵەکانی ئیسرائیل ڕۆشتە لای و خوێنەکەی نیشاندا. خواوەند فەرمانی پێدا

بەرادەیەك لە ئیسرائیلیەکان بکوژێت تا خوێنەکە ئارام ببێتەوە. حەفتا هەزار کەسی لەیەك نەوە کوشت ئەوسا خوێنەکە ئارام بوویەوە.

لەکوڕی مەسعود و دەستەیەك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕنەوە: یەکێك لە منداڵەکانی ئیسرائیل لەخەودا بینی کەوێرانی بیت المقدس لەسەر دەستی کوڕێکی هەتیوە بەناوی بەخت نەسر کەهاوڕێ لەگەڵ دایکە بێوەژنەکەی لەبابل نیشتەجێیە. نەریتی منداڵەکانی ئیسرائیل بەشێوەیەك بوو خێریان دەکرد و خەوەکەیان دەهاتەدی.

ئیسرائیلی دەستی بەگەڕان کرد تا ئەوەی لای دایکی بەخت نەسر دابەزی. بەخت نەسر بۆ چیلکە کۆکردنەوە ڕۆشتبوەدەر. کاتێك گەڕایەوە، بارە چیلکەکەی دانا و لەسوچێکدا دانیشت. ئیسرائیلی گفتوگۆی لەگەڵ کرد، سێ درەمی پێدا و وتی: بەدەرمێکیان گۆشت و بەدەرمێکیان نان و بەدرەمێکیان شەراب بکرە. خواردیان و خواردیانەوە تا ئەوەی ڕۆژی دووەم هات. ئەوسا بەبەخت نەسری وت: دەمەوێت ئەمان نامەیەك بۆ من بنوسیت ئەگەری هەیە ڕۆژێك ببیتە پاشا.

بەخت نەسر وتی: گاڵتەم پێدەکەیت؟

ئیسرائیلی وتی: گاڵتەت پێناکەم، چ زیانێکت پێدەگات ئەگەر ئەو چاکە لەگەڵ مندا بکەیت.

دایکی بەخت نەسر پێی وت: هیچ زیانێکت پێ ناگات ئەگەر بوویتە پاشا، هیچ شتێك لەدەست نادەیت.

بەخت نەسر ئەمان نامەکەی بۆ نووسی، ئیسرائیلی وتی: ئەگەری هەیە بێم و خەڵکان لەدەوری تۆبن و ڕێگە نەدەن بتبینم، نیشانەیەك دیاری بکە تا بەهۆیەوە من بناسیتەوە.

بەخت نەسر وتی: ئەمان نامەکەی خۆت لەسەر قامیش بەرز بکەرەوە تا بتناسمەوە.

ئیسرائیلی جل و بەرگی بۆ کڕی و پارەی پێدا.

پاشای منداڵەکانی ئیسرائیل ڕێزی لەیەحیا کوڕی زەکەریا دەگرت و یەکێك بوو لەکەسە نزیکەکانی ئەو. لەکارەکانی خۆی راوێژی لەگەڵ دەکرد و هیچ کارێکی بێ

پرس کردن بەو ئەنجام نەدەدا. شا بڕیاریدا بوو کچی ژنەکەی خۆی بکاتە هاوسەر. پرسیاری لەیەحیا کرد و یەحیا ڕێگەی مارە کردنی کچەکەی خۆی لێگرت. دایکی ئاگادار بوویەوە و ڕقی یەحیای لەدڵ گرت. کاتێک کچەکە دەرۆشتە ناو دانیشتنەکانی شەراب خواردنەوەی پاشا، جلێکی ناسک و سوورەنگی لەبەر کرد. بۆنی خۆشی لێدا و بەخشڵ و زێڕ ڕازاندییەوە. لەسەر ئەو جلانەوە پۆششێکی تەنکی ڕەشی لەبەر کرد. کچەکەی بۆ لای پاشا نارد و پێی وت شەراب بۆ پاشا تێبکات. نازی بۆ بکات وئەگەر داوای نزیك بوونەوەی لێکرد ڕێگەی پێنەدات تائەوەی دەخوزایت پێی ببەخشێت و ئەگەر پرسیاری دڵخوازی کرد، بڵێت، دەخوازم سەری یەحیا کوڕی زەکەریا لەناو تەشتێکدا بێنن.

کچ ئەو کارەی کرد وشەرابی بۆ پاشا تێکرد. نازی بۆ کرد و کاتێك شەرابەکەی وەرگرت، داوای نزیك بوونەوەی لەکچەکەی کرد، کچ وتی: ڕێگە نادەم تا ئەوەی دەخوازم پێمی ببەخشیت.

پاشا وتی: چیت دەوێت؟

کچ وتی: دەمەوێت کەسێك بۆ لای یەحیا کوڕی زەکەریا ڕەوانە بکەیت و سەری ئەو لەناو ئەم تەشتەدا بێنن.

پاشا وتی: هاوار لەتۆ، داوای شتێکی دیکە بکە.

کچ وتی: تەنیا ئەوەم دەوێت.

کاتێك کچەکە ڕازی نەبوو، کەسی ڕەوانە کرد و سەری یەحیای لەناو تەشتەکەدا هێنا. سەرەکە تا ئەو کاتەی خستیانە بەردەم پاشا قسەی دەکرد و دەیوت: بۆ تۆ حەڵاڵ و ڕەوا نییە.

کاتێك بەیانی بوویەوە، خوێنی یەحیا دەستی بەکوڵان و جۆشان کرد. پاشا فەرمانیدا تا خۆڵی بکەن بەسەردا. خوێن لەخۆڵەکە دەهاتەسەر، دووبارە خۆڵیان ڕشت و دوبارە لەخۆڵەکە خوێن دەهاتەدەر. ئەوەندەیان خۆڵ کرد بەسەردا تا ئەوەی بەئەندازەی دیواری شارەکە بەرز بوویەوە بەڵام خوێنەکە لەجۆشان و بەرز بوونەوە نەکەوت.

سیحائین ئاگادار بوویەوە و لەناو خەڵکدا جاڕیدا. دەیویست بەسوپایەك

هێرش بکاتە سەر منداڵەکانی ئیسرائیل و سالاری سوپاکە بەکەسێك بدات. بەخت نەسر ڕۆشتە لای و وتی: ئەم پیاوەی دەتەوێت ڕەوانەی بکەیت، کەسێکی لاوازە، من ڕۆشتوومە ئەو شارە و قسەی خەڵکەکەیم بیستووە، من ڕەوانە بکە.

سیحائین بەخت نەسری ڕەوانە کرد. بەڕێکەوت تا گەشتە شوێنی مەبەست. منداڵەکانی ئیسرائیل لەناو شارەکان خۆیان حەشاردا. بەخت نەسر نەیتوانی بەسەر ئەواندا زاڵبێت و کاتێك مانەوەی ئەو درێژەی کێشا و برسیەتی تەنگی بەهاوەڵانی هەڵچنی و مەبەستی گەڕانەوەیان کرد، پیرێژنێك لە منداڵەکانی ئیسرائیل هات و وتی: سالاری ئەم سوپایە کێیە؟

کاتێك پیرێژنەکەیان بردە لای بەخت نەسر، وتی: بیستوومە دەتەوێت پێش ئەوەی دەست بەسەر شارەکەدا بگریت، سوپاکەت لێرە ببەیت؟

بەخت نەسر وتی: بەڵێ، ماوەیەکی زۆر لێرەدام، هاوەڵانم برسین و زیاتر لەمە ناتوانین بەرگە بگرین.

ژن وتی: ئەگەر دەروازەکانی ئەم شارە بۆ تۆ بکەمەوە، هەرچیم بوێت، پێمی دەبەخشیت و هەر کەس بڵێیم، دەیکوژیت و کاتێك بڵێم، دەست لەکوشتار هەڵبگرە، دەست هەڵدەگریت؟

بەخت نەسر وتی: بەڵێ.

ژن وتی: بۆ بەیانی سوپاکەت بۆ چوار دەستە دابەش بکە و هەر دەستەیەك لەسووچێکی شارەکە جێگیر و دەست بۆ ئاسمان بەرز بکەنەوە و هاوار بکەن، خواوەندا، بۆ ڕێز گرتن لەخوێنی یەحیا کوڕی زەکەریا سەرکەوتنمان پێببەخشە. بەمشێوەیە دیوارەکان دادەڕمێت.

ئەوکارەیان کرد و شارەکە داڕما و لەهەر چوارلاوە ڕۆشتنە ناو شارەکە.

ژن بەبەخت نەسری وت: بۆ تۆڵەی ئەم خوێنە کوشتار بکە تا خوێنەکە ئارام دەگرێت. ئەویان بردە لای یەحیا کەخۆڵی زۆری بەسەردا کرابوو.

بەخت نەسر ئەوەندەی لەخەڵکان کوشت تا خوێنەکە ئارامی گرت. دەڵێن: حەفتا هەزار ژن و پیاو کوژران.

کاتێك خوێنەکە ئارامی گرت، ژنەکە وتی: دەست هەڵبگرە چوونکە کاتێك

پێغەمبەرێك بكوژرێت، خواوەند رازی نابێت مەگەر ئەوەی بكوژەكەی و هەموو ئەو كەسانەی بەكوشتنی ئەو رازی بوون، بكوژرێن. خاوەنی ئەماننامەكی بینی و بەخت نەسر خوێنی ئەو و بنەماڵەكەی پاراست. بیت المقدسی وێران كرد و فەرمانیدا لاشەكان لەوێ فڕێبدەن. هەركەس لاشەیەك فڕێبداتە ناو شارەكە، سەرانەی ئەم ساڵ نەدات. رۆمیەكان بۆ وێران كردنی بیت المقدس هاوكاری بەخت نەسریان كرد لەبەر ئەوەی منداڵەكانی ئیسرائیل یەحیا كوڕی زەكەریایان كوشتبوو.

كاتێك بەخت نەسر بیت المقدسی وێران كرد، سەران و گەورەكانی ئیسرائیلی لەگەڵ خۆی برد هاورێ لەگەڵ دانیال و عەلیا و عەزریا و میشائیل و رەئس جالوت. كاتێك گەیشتنەوە سەرزەمینی بابل، سیحائین مردبوو. لەجیاتی ئەو پاشایەتی گرتەدەست و رێزی لەدانیال و هاورێكانی گرت. ئاگرپەرستەكان رژدیان برد و دەستیان بەئاژاوە نانەوە و فیتنەگێری كرد و وتیان: دانیال و هاورێكانی خوای تۆ ناپەرەستن و لەقوربانییەكانی تۆ ناخۆن.

بەخت نەسر ئەوانی بانگ كرد وپرسیاری لێكردن. وەڵامیان دایەوە: ئێمە خوایەكمان هەیە وپەرەستشی دەكەین و لەقوربانییەكانی ئێوە ناخۆین.

بەخت نەسر فەرمانیدا تا چاڵێكیان هەڵكەند. ئەوان ((شەش كەس بوون) وشێرێكی دڕندەی خستە ناو چاڵەكە تا بیانخوات. بەیەكیان وت: بڕۆین و بخۆین و بخۆینەوە. كاتێك گەڕانەوە بینیان ئەوان دانیشتون و شێرەكە لەبەردەم ئەوان دەستی خستۆتە سەرزەوی و تەنانەت هیچ كام لەوانی بریندار نەكردووە. یەك كەسی دیكەیان لەگەڵدا بوو چونكە كاتێك ئەوانیان بژارد، حەوت كەس بوون.

بەخت نەسر وتی: حەوتەم كەس كێیە، ئەوان شەش كەس بوون. حەوتەم كەس یەكێك لەفریشتەكان بوو، هاتە بەردەم بەخت نەسر و شەقەزللەیەكی لێدا كەبوو بەیەكێك لەوەحشەكان و حەوت ساڵ بەو شێوەیە مایەوە.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: ئەو گێڕانەوانەی ئاماژەم پێدا و ئەوانەی باسم نەكردن، كەدەڵێت: كاتێك منداڵەكانی ئیسرائیل یەحیا كوڕی زەكەریایان كوشت، بەخت نەسر بۆ شەڕی ئەوان بەرێكەوت، لای شارەزایانی مێژوو و هەواڵ و لای زۆر لەنەتەوەكان هەڵەیە چوونكە هەموویان كۆكن لەسەر ئەوەی بەخت نەسر كاتێك بۆ

شەڕی منداڵەکانی ئیسرائیل بەرێکەوت کەشۆعیای پێغەمبەری خۆیان لەرۆژگاری ئەرمیا کوڕی خەلیا کوشتبوو و لەرۆژگاری ئەرمیا و وێرانی بیت المقدس تا لەدایک بوونی یەحیا کوڕی زەکەریا و بەوتەی جوولەکە و مەسیحیەکان چوارسەد و شەست و یەك ساڵە. ئەمە لەکتێبەکانیاندا باسی لێوە کراوە و لەکاتی وێرانی بیت المقدس تا ئاوەدان کردنەوەی لەرۆژگاری کیرەش کوڕی ئەخشو یەرش سوپاسالاری بابل لەلایەن ئەردەشێر بەهمەن کوڕی ئیسفەندیار، حەفتا ساڵە و لەئاوەدانی بیت المقدس تا دەرکەوتنی ئەسکەندەر کەولآتی منداڵەکانی ئیسرائیل پەیوەستی سنوری فەرمانڕەوایەتی خۆی کرد هەشتا و هەشت ساڵ و لەدوای ئەسکەندەر تا لەدایك بوونی یەحیا کوڕی زەکەریا سێسەد و سێ ساڵ.

ئاگرپەرستەکان سەبارەت بەماوەی وێرانی بیت المقدس و کاری بەخت نەسر لەگەڵ منداڵەکانی ئیسرائیل تا زاڵبوونی ئەسکەندەر بەسەر بیت المقدس و شام و کوژرانی دارا، لەگەڵ جوولەکە و مەسیحیەکان هاوڕان و لەماوەی پاشایەتی ئەسکەندەر و لەدایك بوونی یەحیا کوڕی زەکەریا بۆچوونیان جیاوازە و گومان دەکەن پەنجا و یەك ساڵی خایاندووە. جیاوازی ئاگرپەرستەکان و مەسیحیەکان سەبارەت بەماوەی پاشایەتی ئەسکەندەر تا لەدایك بوونی یەحیا کوڕی زەکەریا، ئەوەیە کەئاماژەمان پێدا..

بەگومانی مەسیحیەکان یەحیا شەش مانگ دوای عیسا چاوی بەدنیا هەڵهێنا. بکوژی ئەو یەکێك لەپاشاکانی منداڵەکانی ئیسرائیل بەناوی هیرۆدۆس بوو بەهۆی ژنێك بەناوی هیرۆزیا کەهاوسەری برای فیلقوس برای پاشا بوو. شا حەزی لێدەکرد و بەزینا رازی بوو. کچێکی بوو بەناوی دەمیی و هیرۆدۆس دەیویست لەگەڵ هیرۆزیا ژنی براکەی خۆی زینا بکات. یەحیا رێگەی ئەو کارەی لێگرت و وتی حەڵاڵ نییە. هیرۆدۆس عاشقی کچەکە بوو. رۆژێك کچەکە داواکارییەکەی پێشکەش بەپاشا کرد و رازی بوو. فەرمانی بەیەکێك لەماوەڵانی خۆیدا تا داواکارییەکەی بێنێتەدی. کچ داوای سەری یەحیای کرد و هێنایان. کاتێك هیرۆدۆس ئاگادار بوویەوە، خەمابر و لەتاو ئازار دەستی بەناڵاندن کرد.

گێڕانەوەی شارەزایانی مێژوو و هەواڵەکانی جاهلییەتمان لەمبارەوە پێشتر

لەناو گێڕانەوەی هوشامی کەلبی باس کردووە.

وتاری کوڕی ئیسحاق لەمبارەوە بەمشێوەیە: مناڵەکانی ئیسرائیل دوای گەڕانەوە لەسەرزەمینی بابل دیاردەی تازەیان هێنایە کایەوە. خواوەند نێردراوەکانی خۆی ڕەوانە کرد کەدەستەیەکیان بەدرۆزن لەقەڵەمدا و دەستەیەکیان کوشت. دواپین پێغەمبەران کەخواوەند ڕەوانەی کردن، زەکەریا و یەحیا کوڕی زەکەریا و عیسا کوڕی مریەم بوون کەهەموویان لەبنەماڵەی داوودی پێغەمبەرن. ڕچەڵەکی یەحیا بەمشێوەیە: یەحیا کوڕی زەکەریا کوڕی موسلیم کوڕی سدوق کوڕی نەحشیان کوڕی داوود کوڕی سلێمان کوڕی موسلیم کوڕی سدیقە کوڕی بەرخیە کوڕی شەفاتیە کوڕی فاحور کوڕی شەلوم کوڕی یەهفاشات کوڕی ئاسا کوڕی ئەبیا کوڕی ڕەحبعەم کوڕی سلێمان کوڕی داوود.

دەڵێت: کاتێك خواوەند عیسا کوڕی مریەمی لەناو منداڵەکانی ئیسرائیل بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و یەحیا کوڕی زەکەریایان کوشت و بەوتەیەك زەکەریایشیان کوشت، خواوەند یەکێك لەپاشاکانی بابلی بەناوی خردوس هاندا تا لەگەڵ خەڵکانی بابل هێرش بکاتە سەریان. خردوس ڕۆشتە ناو شام و کاتێك بەسەرئەواندا سەرکەوت، بەیەکێك لەسوپاسالارەکانی خۆی بەناوی نەبوزەرازانی فیلداری وت: سوێندم خواردووە ئەگەر بەسەر خەڵکانی بیت المقدسدا سەرکەوم بەرادەیەك لەوان بکوژم کەخوێنیان لەناو ئوردوگاکەی من ڕەوان ببێت مەگەر ئەوەی کەس بۆ کوشتن نەمێنێتەوە. فەرمانیدا لێیان بکوژێت تا ئەو کاتەی خوێنیان ڕەوان دەبێت. نەبوزەرازان ڕۆشتە ناو بیت المقدس و لەشوێنی قوربانی کردن وەستا. خوێنێکی بینی کەقوڵتی دەدا، وتی: ئەی منالەکانی ئیسرائیل، داستانی ئەم خوێنەی قوڵت دەدات، چییە، هەموو شتێك بەراستی باس بکەن و هیچم لێمەشارنەوە.

وتیان: ئەمە خوێنی قوربانییەکی خۆمانە، خواوەند پێی ڕازی نەبووە و وەك دەبینی بەردەوام قوڵت دەدات. لەسەد ساڵ پێش ئێستاوە قوربانی دەکەین، خواوەند بەهەموویان ڕازی بووە، جگە لەمەیان.

وتی: ڕاستیەکانم پێ بڵێن.

وتیان: ئەگەر هاوشێوەی ڕۆژگاری کۆن دەبوو، خواوەند بەقوربانییەکەمان ڕازی دەبوو بەڵام پاشایەتی وپێغەمبەری لەناو ئێمەدا کۆچیان کردو و لەبەر ئەمە خواوەند بەقوربانییەکەمان ڕازی نەبوە.

نەبوزەرازان لەبەرابەر ئەو خوێنی خیوێنی حەوتسەد و حەفتا کەس لەگەورەکانی ئەوانی ڕشت بەڵام خوێنەکە ئارام نەبوویەوە. فەرمانیدا تا حەوتسەد کەس لەگەنجەکانی ئەوان سەر بڕن بەڵام خوێنەکە ئارام نەبوویەوە. کاتێك ئەمەی بینی، وتی: ئەی منداڵەکانی ئیسرائیل، هاوار لەئێوە، پێش ئەوەی هەمووتان بکوژم، لەراستیەکان ئاگادارم بکەنەوە و ملکەچی فەرمانەکانی خواوەند بن چوونکە لەکۆنەوە پاشایەتی سەرزەویتان کردووە وئەوەی پێتان خۆش بووبێت ئەنجامتان داوە.

کاتێك ئیسرائیلیەکان پێداگری و کوشتاری ئەویان بینی، وتیان: ئەمە خوێنی یەکێك لەپێغەمبەرەکانی ئێمەیە و ئێمەی لەو شتانە دووردەخستەوە کەدبووە هۆی تووڕەیی خواوەند. ئەگەر بەفەرمانەکانی ڕازی دەبووین، ڕێنوێنی دەکراین. ئێمەی لەهاتنی ئێوە ئاگادار کردەوە، بەڵام بەقسەکانی ڕازی نەبووین و خوێنیمان ڕشت.

نەبوزەرازان وتی: ناوی چی بوو.

وتیان: یەحیا کوڕی زەکەریا.

وتی: ئێستا ڕاستیتان هێنایە سەرزمان. خواوەند تۆڵەی خوێنی ئەو لەئێوە دەستێنێتەوە.

کاتێك نەبوزەرازان بینی لەراستییەکان ئاگاداریان کردۆتەوە، سپاسی خواوەندی کرد. دواتر بەکەسەکانی خۆی وت: دەرگاکانی شار ببەستن و هەر کەس لەسوپاکەی خردوس لێرەیە، ببەنەدەرەوەی شار. لەگەڵ منداڵەکانی ئیسرائیل مایەوە و وتی: ئەی یەحیا کوڕی زەکەریا، خواوەند ئاگادارە خەڵکەکەت لەتۆڵەی تۆدا گرفتاری چ بەلاً و نەهامەتییەك بوون و چەندەیان لێ کوژراوە، بەفەرمانی خواوەند پێش ئەوەی هەموو خەڵکەکەت کوشتار بکەم، ئارام بگرە. بەفەرمانی خواوەند خوێنی یەحیا ئارامی گرت. نەبوزەرازان دەستی لەکوشتنی ئەوان هەڵگرت و وتی: باوەڕم بەخواوەندی منداڵەکانی ئیسرائیل هەیە و پشت ڕاستی دەکەمەوە.

دڵنیام هیچ خوایەك جگە لەو خوا نییە و ئەگەر خواوەندی ئەو نەدەبوو، کاروبارەکان سامان نەدەدران، ئەگەر شەریکی دەبوو، ئاسمان و زەوییەکان لەشوێنی خۆیان نەدەمانەوە. پاڕانەوە و پەرەستینی خواوەندی پەروەردگار ڕەوایە چوونکە حەوت ئاسمانی بەزانست و حیکمەتی خۆی جێگیر کرد و زەوی بڵاو کردەوە و کێوەکانی بۆ دانا تا نەلەرزێت. پەروەردگار دەبێت بەمشێوە بێت و پاشایەتییەکەی بەمشێوە.

بۆ یەکێك لەدوایین پێغەمبەران وەحی هاتەخوار: نەبوزەرازان تازە باوەڕدارێکی ڕاستگۆیە.

نەبوزەرازان بە منالەکانی ئیسرائیل وت: دوژمنی خوا خردوس فەرمانی پێداوم بەرادەیەك لەئێوە بکوژم تا خوێنەکەتان لەناو ئوردوگاکەی ڕەوان ببێت. من ناتوانم نافەرمانی ئەو بکەم و دەبێت فەرمانەکەی ئەنجام بدەم. وتیان: ئەوەی فەرمانیان پێداویت، ئەنجامی بدە.

فەرمانی هەڵکەندنی خەندەکێکیدا و لەچوارپێکانی خۆی لەئەسپ و ئێستر و مانگا و وشتریان هێنا و سەریان بڕی. بەمشێوەیە خوێن لەناو ئوردوگاکە ڕەوان بوو. فەرمانیدا تا ئەوجەستەی ئەو کەسانەی پێشتر کوژرا بوون، بخەنە سەر لاشی چوارپێکان. خردوس گومانی کرد ئەوەی لەناو خەندەکەکەدایە، لە منالەکانی ئیسرائیلە. کاتێك خوێن بەئوردوگاکەی گەیشت، کەسی بۆ لای نەبوزەرازان ڕەوانە کرد و فەرمانیدا تا دەست لەکوشتنی ئەوان هەڵبگرێت لەبەر ئەوەی خوێنی ئەوان بەئوردوگاکەی من گەیشت و تۆڵەی خۆم سەندەوە.

خردوس بۆ بابل گەڕایەوە و منالەکانی ئیسرائیل لەناوچبوون. ئەمە دوایین بەلاَ و ڕووداو بوو خواوەند بەسەر منالەکانی ئیسرائیلدا باراندی و محەممەدی پێغەمبەری لێ ئاگادار کردەوە. ڕووداوی یەکەم بەخت نەسر و سوپاکەی ئەو بوو. دواتر خواوەند ئەوانی گرفتاری بەلاَیەکی دیکە کرد کە لەلایەن خردوس و سوپاکەی بەسەریاندا هات. ئەم بەلاَیە گەورەتر و ماڵوێرانتر بوو چوونکە سەرزەمینەکەیان وێران و پیاوەکانیان کوژران و ژن و منالەکانیان ئەسیر کران. خواوەند دەفەرمێت: بەسەر هەر شتێکدا زاڵبوون، لەناویان برد، لەناو بردنێکی

گشتی.

ئێستا دەگەڕێینەوە سەرباسی عیسا کوڕی مریەم و دایکی ئەو:

مریەم و یوسف کوڕی یەعقوب، کوڕە پوری ئەو، لەخزمەتی کەنیسەدا بوون. وەك وتوویانە، کاتێك مریەم و یوسف ئاویان نەبوو، گۆزەیان هەڵدەگرت و دەڕۆشتنە ئەشکەوتێك کەئاوێکی فێنکی لێبوو. گۆزەکەی خۆیان پڕدەکرد و بۆ کەنیسە دەگەڕانەوە. ئەو ڕۆژەی جبرەئیل مریەمی بینی، درێژترین و گەرمترین ڕۆژی ساڵ بوو. مریەم ئاوی نەمابوو، بەیوسفی وت: دێیت بۆ ئاوهێنان بڕۆین؟

یوسف وتی: ئەوەندەم ئاو هەیە تا بەیانی بەشم بکات.

مریەم وتی: بەڵام سوێند بەخوا من ئاوم نییە. گۆزەکەی هەڵگرت و بەتەنیا ڕۆشتە ناو ئەشکەوتەکە. جبرەئیلی لەوێ بینی کە لەروخسارێکی پیاوێکدا بوو، پێی وت: ((انما انا رسول ربك لاهب لك غلاماز كيا. قالت انى يكون لى غلام و لم يمسسنى بشرولم اك بغيا. قال كذلك قال ربك هو على هين و لنجعلة آية للناس و رحمة منا و كان امرا مقضيا.

واتاکەی: وتی من نێردراوی خوای تۆم تا کوڕێکی پاکت پێببەخشم. وتی: چۆن دەتوانم کوڕم هەبێت لەکاتێکدا کەس منی نەبینیوە و زیناکار نەبووم. وتی: پەروەردگارت دەفەرمێت ئەو کارە بۆ من ئاسانە تا بیکەمە نیشانەیەك بۆ خەڵکان و ڕەحمەتی خۆم و کارێکی ئەنجامدراو بوو.))

کاتێك ئەمەی بیست، تەسلیمی فەرمانی پەروەردگار بوو. جبرەئیل فووی کرد بەگیرفانی ئەودا و ڕۆشت. مریەم گۆزە ئاوەکەی خۆی پڕ کرد.

لەوەهب کوڕی مونبە دەگێڕنەوە: کاتێك خواوەند جبرەئیلی بۆ لای مریەم ڕەوانە کرد، فریشتە لەروخساری پیاوێك ڕۆشتە لای. مریەم وتی: ئەگەر خۆپارێز بیت، لەتۆ پەنا بۆ خواوەند دەبەم. جبرەئیل فووی کرد بەگیرفانی کراسەکەیدا و هەناسەی جبرەئیل بەمناڵانی مریەم گەیشت و بەعیسا دووگیان بوو.

دەڵێت: یوسفی دارتاشی خزمی مریەم هاوڕێیەتی دەکرد. دەڕۆشتنە مزگەوتێك کە لەکێوی سەهیونەوە نزیك بوو. ئەم مزگەوتە یەکێك لەگەورەترین مزگەوتەکانی مناڵەکانی ئیسرائیل بوو. مریەم و یوسف خزمەتی مزگەوتەکەیان دەکرد چوونکە

خزمەت کردنی مزگەوت چاکەکارییەکی گەورە و کەم وێنە بوو. ئارەزووی ئەو کارەیان دەکرد. هەموو کارەکانی وەك پاك کردنەوە و رووناك کردنەوەیان لەئەستۆ گرتبوو. کەس لەخەڵکانی رۆژگار تێکۆشەرتر و خۆپارێزتر لەوان نەبوو.

یەکەم کەس هەستی بەدڕوگیانی مریەم کرد، یوسف بوو. کارەکەی مریەمی بەناشیرین و قێزەون لەقەڵەمدا و نەیزانی چی بڵێت. ئەگەر دەیویست ئەو تۆمەتبار بکات، خۆپارێزی و داوێن پاکی ئەوی بیردەکەوتەوە و ئەوەی کەهیچ کات لەو دوور نەبووە. ئەگەر دەیویست ئەو بەبێ گوناح بزانێت، سك پڕی ئەوی دەبینی و کاتێك ئەم بابەتە بووە هۆی سەرسوڕمانی، لەگەڵ مریەم قسەی کرد. یەکەم قسەی ئەوە بوو، وتی: سەبارەت بەتۆ شتێك لەدڵمایە هەرچەند حەزم دەکرد لەبیری خۆمی ببەمەوە بەڵام نەمتوانی. گومان دەکەم قسە کردن باشتر بێت.

مریەم وتی: قسەیەکی باشت کرد.

یوسف وتی: تەنیا چاکە دەهێنمە سەرزمان، پێم بڵێ ئایا بەرهەمە کشتوکاڵییەکان بێ تۆو دەڕوێن؟

مریەم وتی: بەڵێ.

یوسف وتی: ئایا هیچ دارێك بێ باران گەورە دەبێت و بەر دەخات؟

مریەم وتی: بەڵێ.

یوسف وتی: ئایا منداڵ بێ پیاو چاوی بەدنیا هەڵدێنێت؟

مریەم وتی: بەڵێ.

دواتر مریەم وتی: مەگەر نازانی کاتێك خواوەند کشتوکاڵی ئافڕاند، بەبێ تۆو ئافڕاندی و تۆو لەکەشتییەوە هات کەخواوەند بێ تۆو رواندبووی. مەگەر نازانی خواوەند داری بێ باران ئافڕاند بەهێزی خۆی کاتێك داری ئافڕاند، بارانی کردە هۆکاری ژیانی. مەگەر گومان دەکەیت خواوەند نەیدەتوانی دارپڕوێنێت و داوای هاوکاری لەئاوی کرد و ئەگەر ئاو نەدەبوو، توانای ڕواندنی داری نەدەبوو.

یوسف وتی: گومانی لەو چەشنە ناکەم و دەزانم خواوەند بەهێزی خۆی بۆ هەر کارێك بەتوانایە.

مریەم پێی وت: مەگەر نازانی خواوەند ئادەم و حەوای بێ ژن و پیاو ئافڕاند؟

وتی: بۆنا.

کاتێك مریەم ئەم قسەی هێنایە سەرزمان، ئەم ئەندێشەیە لەزەینی یوسفدا دروست بوو کەدووگیانی ئەو لەلایەن خواوەندەوەیە. کاتێك بینی مریەم نایەوێت نهێنییەکەی بدرکێنێت، نەیتوانی پرسیاری لێبکات. یوسف خزمەت کردنی مزگەوتەکەی لەئەستۆ گرت و هەموو کارەکانی مریەمی ئەنجام ئەدا لەبەر ئەوەی جەستەی لاواز و رەنگی زەرد و رەشی روخسار و ئاوساوی سك و پەرێشانی روانینەکانی مریەمی دەبینی. مریەم پێشتر وانەبوو.

کاتێك، مریەم گەیشتە مانگی خۆی، خواوەند وەحی پێکرد تا لەسەرزەمینی خەڵکەکەی بڕواتەدەر چوونکە ئەگەر دەستیان بەتۆ بگات و ئەمە ببینن، منداڵەکەت دەکوژن. مریەم ڕۆشتە لای خوشکەکەی کە لەو کاتەدا بەیەحیا دووگیان بوو. کاتێك یەکیان بینی و دایکی یەحیا دووگیانی ئەوی بینی، کوڕنوشی برد و باوەڕی بەعیسا هێنا.

یوسف، مریەمی سوار کەرەکەی خۆی کرد و بەرەو میسر بەرێکەوتن. کەرەکە جگە لەکۆیان هیچی لەسەر نەبوو. ڕۆشتن تا گەیشتنە سنورەکانی میسر و کۆتاییەکانی سنوری منداڵەکانی ئیسرائیل. مریەم گرفتاری ئازاری منداڵبوون هات و پەنای بۆ ئاخورێك لای دار خورمایەك برد. زستان بوو. ئازار سات بەسات زیاتر دەبوو. پەنای بۆ دارخورماکە برد و باوەشی پیا کرد. فریشتەکان دەوری ئەویان گرت. کاتێك منداڵەکە چاوی بەدنیا هەڵهێنا، مریەم خەمبار بوو. پێی وترا:

((الاتحزني قد جعل ربك تحتك سريا. و هزي اليك بجذع النخلة تساقط عليك رطبا جنيا. فكلي و اشربي و قري عينا فاماترين من البشر احدا فقولي اني نذرت الرحمن صومافلن اكلم اليوم انسيا.

واتاکەی: خەم مەخۆ، پەروەردگار بەرێزی خستە لای تۆ. قەدی دارخورماکە بۆ لای خۆت راوەشێنە تا خورمای تازە بخاتە بەردەستی تۆ. بیخۆ و بیخۆرەوە تا دڵت بحەسێتەوە. ئەگەر لەمرۆڤەکان کەست بینی، بڵێ بۆ خواوەند ڕۆژوێکم نەزر کردووە وئەمرۆ لەگەڵ کەس قسە ناکەم.))

خورما بۆ ئەو دەکەوتە خوار. ئەمە لەکاتی زستاندا بوو. بتەکان کەلەجێگەی

خواوەند دەپەرەستران، لەهەر شوێنێکدا بوون، سەرەوخوار دەبوون. شەیتانەکان ترسان و تۆقان و هۆکاری ترسی خۆیان نەدەزانی. بەخێرایی ڕۆشتنە لای ئیبلیس کەوەك لاسایی کردنەوەی عەرەشی خواوەند لەسەر عەرشێکی سەوز ڕەنگ دانیشتبوو و بە لاسایی کردنەوەی پەردە تۆڕییەکان کەلای خواوەند هەڵواسرابوون، پەردەی هەڵواسیبوو. شەش کاژێر لەڕۆژ تێپەڕی کردبوو کەگەیشتنە لای ئەو. کاتێك ئیبلیس ئەوانی بینی، ترسا چوونکە دوای ئەوەی بڵاوەیان لێکردبوو، هیچ کات بەوشێوەیە کۆنەبیوونەوە. ئەوانی دەستە دەستە دەبینی، کاتێك پرسیاری لێکردن، وتیان: لەسەر زەوی ڕوودواوێك ڕوویداوە و بتەکانی سەرەو خوار کردووە. بۆ لەناو بردنی منداڵەکانی ئادەم هیچ شتێك باشتر لەوە نەبوو کەدەڕۆشتینە ناو سکی بتەکان و قسەمان لەگەڵ مرۆڤەکان دەکرد و کاروباری ئەوانمان ڕێکدەخست و گومانیان دەکرد ئەوە بتەکانن قسە دەکەن. دوای ئەم ڕووداوە بتەکان لەبەر چاوی مرۆڤەکان ریسوا بوون و ترسی ئەوە هەیە چیتر هیچ کات بتەکان نەپەرەستن. ئەوەیش بزانە پێش ئەوەی بێینە لای تۆ، هەموو سەرزەوی گەڕاین و دەریاکانمان ژێروروو کرد بەڵام هەستمان بەهیچ نەکرد.

ئیبلیس وتی: ئەمە ڕووداوێکی گەورەیە و دەزانم لەمنیان شاردۆتەوە. لەشوێنی خۆتانا بن.

هەڵفڕی و سێ کاژێر دواتر گەڕایەوە. لای شوێنی لەدایك بوونی عیسا کوڕی مریەم تێپەڕی کرد. کاتێك فریشتەکانی بینی، زانی کەڕووداوە گەورەکە لەوێ ڕوویداوە. مەبەستی ئەوەی کرد لەوێ دابەزێت بەڵام سەر و بازووی فریشتەکان تا ئاسمان کێشرابوو و ڕێگەی نەبوو. ویستی لەژێر زەوییەوە بڕواتە ئەو شوێنە، بەڵام هەنگاوی فریشتەکان لەزەوی و ئەو شوێنەی کەئیبلیس دەیویست لەوێ بڕواتەلایان، چەقیبوو. ویستی لەناو ئەوانەوە تێپەڕێت، بەڵام ڕێگەیان لێگرت و دووریان خستەوە. بەناچاری بۆ لای هاوەڵانی گەڕایەوە و وتی: هەموو زەویم لەڕۆژهەڵاتەوە تا ڕۆژئاوا و وشکی و دەریا و ئاسمانەکان گەڕام و لەماوەی سێ کاژێر بۆ هەموو شوێنێك ڕۆشتم. ئەوانی لەلەدایك بوونی مەسیح ئاگادار کردەوە، وتی: پێشتر هیچ منداڵێك لەناو پزدانی هیچ ژنێك خۆی نەدەگرت مەگەر ئەوەی

دەمزانی و هیچ ژنێك منالّی نەدەهێنایە دنیا مەگەر ئەوەی لەویّ ئامادە دەبووم. هیوادارم کەسان زۆر زیاتر لەوەی بەهۆی مەسیحەوە بۆ سەر ڕێگەی ڕاست ڕێنوێنی دەکرێن، گومڕا بکەین چوونکە هیچ پێغەمبەرێك بۆ من و ئێوە لەو دژوارتر نەبووە.

هەمان شەو خەڵك بەمەبەستی دۆزینەوەی عیسا ڕۆشتنەدەر. ئەستێرەیەك دەدرەوشایەوەو پێشتر نەیانبینیبوو. پێشتر وترا بوو ئەو ئەستێرەیە نیشانەی لەدایك بوونی منالّێکە کە لەکتێبەکەی دانیالدا باسی کراوە. بەهیوای دۆزینەوەی ئەو ڕۆشتنەدەر و زێر و مڕ و کەندەریان لەگەڵ خۆیان برد. لای یەکێك لەپاشاکانی شام تێپەڕین، پرسی: بۆ کویّ دەڕۆن. کاتێك لەداستانەکە ئاگاداری کردنەوە، وتی: بۆ لەناو هەموو شتەکان زێر و مڕ کەندری بۆ دەبەن؟

وتیان: ئەم شتانە نمونەکانی ئەوە کەزێر سالاری هەموو کارەکانە. ئەم پێغەمبەرەیش سالاری خەڵکی ڕۆژگاری خۆیەتی. مڕ هەموو نەخۆشی و شکاوییەکان چاك دەکاتەوە، ئەم پێغەمبەرەیش هەموو نەخۆشی و دەردێك شیفا دەدات. دووکەڵی کەندەر بەئاسمان دەگات و خوا ئەم پێغەمبەرەیش بۆ ئاسمان دەبات و لە ڕۆژگاری ئەو کەس بۆ ئاسمان ناڕوات.

کاتێك ئەم قسانەیان وت، شا بیری لەکوشتنی منالّەکە کردەوە، وتی: بڕۆن و کاتێك شوێنەکەی ئەوتان دۆزییەوە، من ئاگادار بکەنەوە چوونکە منیش شەیدای ئەوم.

ئەو دەستەیە ڕۆشتن و دیاریەکانی خۆیان بەمریەمدا. کاتێك ویستیان بۆ لای پاشا بگەڕێنەوە و لەشوێنی عیسا ئاگاداری بکەنەوە، فریشتەیەك ئەوانی بینی و وتی: مەگەڕێنە بۆ لای پاشا و لەشوێنی عیسا ئاگاداری مەکەنەوە چوونکە مەبەستی کوشتنی ئەوی هەیە. ئەوان لەڕێگەیەکی دیکەوە گەڕانەوە.

مریەم منالّەکەی خۆی خستە سەر کەرەکە و یوسف هاوڕێیەتی دەکرد. ڕۆشتنە ناو سەرزەمینی میسر. ئەمە هەمان شوێنە کەخواوەند دەفەرمێت:

((و آوینا هما الی ربوة قرار و معین.

واتاکەی: و لەبیابانێك کەشوێنێکی هەبوو ئاو تیایدا ڕەوان بوو، ئەوانمان

جێگە کردەوە.))

مریەم بۆ دوانزە ساڵ منداڵەکەی لەخەڵکان شاردەوە و کەسی لەو ئاگادار نەکردەوە چوونکە کەسی بەئەمین نەدەزانی. لەکاتی دروێنە دڕۆشت بۆ دەسکەنە و لانکەکەی بەشانەوە بوو و ئەو دەفرەی گژوگیای تێدەکرد، بەشانەکەیتریەوە بوو. تا ئەو کاتەی تەمەنی عیسا بوو بەدوانزە ساڵ. یەکەم نیشانە خەڵکان لەویان بینی ئەوە بوو دایکی لەماڵی وەرزێرێك لەخەڵکانی میسر دەژیا کەگەنجەکەیان دزیبوو. تەنیا نیازمەندان لەماڵەکەی ئەو دەمانەوە. نەیدەویست ئەوان تۆمەتبار بکات. مریەم لەزیانی پیاوەکە خەمبار بوو. عیسا هەستی بەخەمی دایکی کرد لەزیانی خانەخوێکەی، وتی: دایکە، حەز دەکەیت، گەنجەکەی ئەو بدۆزمەوە؟

مریەم وتی: بەڵێ کوڕم.

عیسا وتی: پێی بڵێ نیازمەندانی ماڵەکەی خۆی لای من کۆبکاتەوە. مریەم بەپیاوەکەی وت وئەو هەموو نیازمەندانی کۆکردەوە. کاتێك کۆبونەوە، عیسا ڕۆشتە لای دوو پیاو کەیەکیان کوێر و ئەوی دیکەیان شەل بوو. شەلەکەی سوار ملی کوێرەکە کرد و وتی: هەڵیگرە.

کوێر وتی: تواناى ئەو کارەم نییە.

عیسا وتی: ئەی چۆن دوێ شەو ئەوت هەڵگرت.

کاتێك ئەم قسەیان بیست، هانی کوێرەکەیاندا تا شەلەکەی هەڵگرت، کاتێك وەستا، شەلەکە گەشتە پەنجێرەی خەزێنەکە، عیسا وتی: دوێ شەویش بەمشێوەیە بۆ دزینی گەنجەکە فێڵیان کرد. کوێرەکە لەهێزی خۆی و شەلەکە لەچاوەکانی خۆی کەڵکی وەرگرت.

کوێر و شەل وتیان: ڕاست دەکات. گەنجی پیاوەکەیان گەڕاندەوە. پیاوەکە گەنجەکەی خستە ناو خەزێنە و وتی: ئەی مریەم، نیوەی هەڵبگرە.

مریەم وتی: ئەو کارە ناکەم.

پیاو وتی: بیدە بەکوڕەکەت.

مریەم وتی: ڕێز و گەورەیی ئەو زیاتر لەمنە.

پیاوی وەرزێر ژنی بۆ کوڕەکەی هێنا و ئاهەنگی گێڕا. هەموو خەڵکانی میسری

کۆکردەوە. کاتێك ئاهەنگەکە کۆتایی هات، دەستەیەك لەخەڵکانی شام کەپیاوەکە بانگێشتی نەکردبوون، هاتن و لەماڵەکەی ئەو دابەزین. پیاوی وەرزێر شەرابی نەبوو، کاتێك عیسا بینی پیاوەکە بیر لەم بابەتە دەکاتەوە، ڕۆشتە یەکێك لەماڵەکانی پیاوەکە کەدوو ریز خومرەی تیا بوو. دەستی بەلێواری خومرەکاندا کێشا وپڕ بوون لەشەراب. لەم کاتەدا تەمەنی دوانزە ساڵ بوو.

کاتێك عیسا ئەم کارەی کرد، خەڵك لەشکۆ و ئەو هێزەی خواوەند پێی بەخشیبوو، سەریان سوڕما. خواوەند وەحی بۆ مریەم ڕەوانە کرد تا بیبات بۆ شام. مریەم ئەو کارەی کرد و لەشام مایەوە تا ئەو کاتەی تەمەنی عیسا گەشتە سی ساڵان. وەحی بۆ هاتەخوار. ماوەی پێغەمبەرایەتی ئەو سێ ساڵ درێژەی کێشا. ئەوسا خواوەند عیسای بۆ ئاسمان بەرز کردەوە.

کاتێك ئیبلیس عیسای بینی، توانای خۆڕاگری لەبەرابەر ئەوی نەبینی، بۆ ڕوخساری پیرەپیاوێکی بەتەمەن و جوان ڕوخسار خۆی گۆڕی. دوو شەیتان هاورێیەتیان دەکرد بەهەمان ڕوخسار. ڕۆشتنە ناو خەڵکان.

بەگومانی وەهب کوڕی مونبە، هەندێ جار پەنجا هەزار نەخۆش لای عیسا کۆدەبوونەوە. هەرکەس دەیتوانی خۆی دەگەیاندە عیسا و هەر کەس نەیدەتوانی، عیسا خۆی دەڕۆشت بۆ لای و بەدۆعا چارەسەری نەخۆشییەکەی دەکرد. ئیبلیس بەڕوخسارێك کەخەڵکان لەدیمەنەکەی سەریان سووڕمابوو، هاتە پێش. کاتێك ئەویان بینی، لەدەوری کۆبوونەوە. باسی سەیر و سەرمەکانی بۆ ئەوان کرد، وتی: کاری ئەم پیاوە سەیرە کە لەناو لانکەدا قسە دەکات و مردووەکان زیندوو دەکاتەوە و لەغەیب ئاگادارە و نەخۆشییەکان چارەسەر دەکات. ئەو خوایە.

یەکێك لەدوو هاورێکەی شەیتان وتی: ئەی پیر! ناڕاستت وت و خراپەت هێنایە سەرزمان چوونکە ڕەوا نییە خواوەند خۆی نیشانی بەندەکانی بدات و بڕواتە ناو پزدانی ژنان. سکی ژنان جێگەی ئەو نییە، بەڵام ئەم پیاوە کوڕی خوایە.

ئەویتر وتی: ناڕاستتان وت، هەر دووکتان هەڵەتان کرد و نەتانزانی. ڕەوا نییە خواوەند منداڵی هەبێت، ئەویش خوایەکە هاوشێوەی خواوەند.

کاتێك ئیبلیس و دوو هاورێکەی ئەم قسانەیان هێنایە سەرزمان، لەبەر چاوان

ونبوون و چیتر کەس ئەوانی نەبینیوە.

لەکوڕی مەسعود و دەستەیەك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕنەوە: مریەم گرفتاری خوێنبەربوون بوو، لەمیحراب دوور کەوتەوە و لەپشت دیوارێکەوە خۆی داشارد. خواوەند سەبارەت بەو دەفەرمێت:

(( فانتبذت من اهلها مكانا شرقيا فاتخذت من دونهم حجابا فارسلنا اليها روحنا فتمثل لها بشرا سويا. قالت انى اعوذ بالرحمن منك ان كنت تقيا قال انما انا رسول ربك لاهب لك غلاما زكيا.

واتاکەی: ئەو کاتەی لەشوێنێکی روو لەهەتاو لەکەسەکانی خۆی دوور دەخستەوە، لەبەرابەر ئەوان پەردەیەکی هەڵواسی و رۆحی خۆمان بۆ ئەو رەوانە کرد کەمرۆڤێك لای ئەو دەرکەوت و وتی ئەگەر خۆپارێزیت، لەتۆ پەنا بۆ خواوەندی رەحمان دەبەم. وتی: من نێردراوی پەروەردگاری تۆم کەکوڕێکی پاکت پێ دەبەخشم.))

ئەوسا رووپۆشەکەی ئەوی لابرد و دوو قۆڵی ئەو گرت، فووی کرد بەگیرفانی کراسەکەیدا کەلەپێشەوە رووەکەی کراوە بوو. هەناسە ڕۆشتە ناو سکی و دووگیان بوو. خوشکەکەی زەکەریا شەوێك ڕۆشتە سەردانی و کاتێك دەرگای کردەوە، لای ئەو دانیشت و وتی: ئەی مریەم، دەزانی من دووگیانم.

مریەم وتی: دەزانی منیش دوو گیانم.

هاوسەری زەکەریا وتی: ئەوەی لەسکی مندایە، سوجدە بۆ ئەوەی سکی تۆ دەبات. مانای وتاری خواوەند ئەمەیە کەدەفەرمێت: (( و وشەی خواوەندی پشت راست کردەوە)) هاوسەری زەکەریا یەحیای هێنایە دنیا و کاتێك مریەم گەیشتە مانگی خۆی، ڕۆشتە لای رۆژهەڵاتی میحرابەکە و ئازاری منداڵبوون ئەوی بۆ لای دارخورمایەك برد. لەکاتی ئازاردا دەیوت: خۆزگە پێشتر مردبووم و لەبیر دەکرام. جبرەئیل وەحی پێکرد:

((الا تحزنى قد جعل ربك تحتك سريا.

واتاکەی: خەم مەخۆ چوونکە پەروەردگار بەرێزی پێشکەش بەتۆ کرد.))

کاتێك عیسا چاوی بەدنیا هەڵهێنا، شەیتان ڕۆشت و منداڵەکانی ئیسرائیلی

ئاگادار کردەوە کەمریەم منداڵێکی هێناوە دنیا. بەخێرایی هاتن و ئەویان بانگ کرد. ڕۆشتە لای خەڵکەکەی و منداڵەکەی لەباوەشدا بوو، وتیان:

((یامریم لقد جئت شیئا فریا یا اخت هرون ما کان ابوك امرأ سوء و ما کانت امك بغیا.

واتاکەی: ئەی مریەم، بەراستی کارێکی سەرسوڕهێنەرت کرد. ئەی خوشکی هەرون، نە باوکت پیاوێکی خراپ بوو و نەدایکت کەسێکی زیناکار.))

مریەم لەنەوەکانی هارون برای موسا بوو. بەهۆی نزیکی لەو ئەویان بەخوشکی هارون ناودەبرد. کاتێك ویستیان زیاتر گفتوگۆی لەگەڵ بکەن، ئاماژەی بەعیسا کرد کەتوڕە بوون و وتیان: ئێستا گاڵتەمان پێدەکات و دەڵێت لەگەڵ منداڵەکەدا قسە بکەین. ئەم کارەی لەزینا کردنەکەی خراپترە. بەمریەمیان وت: (( کیف نكلم من کان فی المهد صبیا

یانی: چۆن لەگەڵ ئەم منداڵەدا قسە بکەین لەکاتێکدا لەناو بێشکەدایە؟

عیسا قسەی کرد و وتی: (( انی عبدالله آتانی الکتاب و جعلنی نبیا و جعلنی مبارکا اینما کنت.

واتاکەی: من بەندەی خوام کەکتێبی بۆ ڕەوانە کردووم و منی کردۆتە پێغەمبەر، لەهەر شوێنێك بم، ڕۆژی منی فراوان کردووە.))

منداڵەکانی ئیسرائیل وتیان: کەس جگە لەزەکەریا ئەوی دووگیان نەکردووە چوونکە بەردەوام دەڕۆشتە لای ئەو. بەدوای ئەودا گەڕان و زەکەریا لەدەست ئەوان هەڵات. شەیتان لەڕوخساری شوانێك خۆی نیشاندا و وتی: ئەی زەکەریا، ئێستاکە بەتۆ دەگەن، داوا لەخوا بکە ئەم دارە بقڵیشێنێت و بڕۆیتە ناوی. ئەو لەخوا پاڕایەوە و دارەکە قەڵشتی برد. ڕۆشتە ناو دارەکە و سوچی عاباکەی لەدەرەوە بەجێما. منداڵەکانی ئیسرائیل لای شەیتان تێپەڕیان کرد و وتیان: ئەی شوان، ئایا پیاوێکت لێرەدا نەبینیوە؟

شەیتان وتی: بۆنا، جادووی لەم دارە کرد کەقەڵشتی برد و ڕۆشتە ناو دارەکە. ئەمە ڕشتەی عاباکەی ئەوە.

خەڵکەکە هاتن و دارەکەیان بەمشار بڕیەوە. زەکەریا لەناو دارەکەدا بوو.

هیچ جوولەکەیەك نابینی کەئەم ڕشتەیە لەناو عاباکەیدا نەبێت.

کاتێك عیسا چاوی بەدنیا هەڵهێنا، هەموو ئەو بتانەی لەجیاتی خوادەیانپەرەست،

سەرەوخوار بوون.

لەوەهب کوڕی مونبە دەگێڕنەوە: کاتێك خواوەند بەعیسای فەرموو، لەدنیا دەڕواتەدەر، لەمەرگ ترسا. ئەم کارە بۆ ئەو دژوار بوو. حەوارییەکانی بانگ کرد و خواردنی بۆ ئەوان دروست کرد، وتی: ئەمشەو لای من بن چوونکە کارم بەئێوەیە. کاتێك لای ئەو کۆبوونەوە، خواردنی پێدان و خزمەتی کردن. کاتێك لەخواردن تەواو بوون، دەستی ئەوانی شۆرد و بەدەستی خۆی پاکی کردەوە. دەستەکانی ئەوانی بەجلەکانی خۆی وشك کردەوە.ئەم کارەیان بەگەورە زانی و پەسندیان نەکرد.

عیسا وتی: هەرکەس ئەمشەو حاشا لەکارەکانی من بکات، لەمن نییە و منیش لەو نیم. حەوارییەکان بێدەنگ بوون.

کاتێك عیسا لەخزمەت کردنی ئەوان تەواو بوو، وتی: ئەوەی ئەمشەو ئەنجاممدا و خزمەتی ئێوەم کرد و دەستی ئێوەم بەدەستی خۆم شۆرد، نموونەیەك بێت بۆ ئێوە چوونکە من لەئێوە باشترم. شانازی بەسەر یەکەوە مەکەن. خزمەتی یەك بکەن بەهەمان شێوە کەمن خزمەتی ئێوەم کرد. ئەوەی دەمویست هاوکاری لەئێوە وەربگرم، ئەوەیە بپاڕێنەوە و دۆعا بکەن تا خواوەند مەرگی من دوا بخات.

کاتێك ویستیان دۆعا بکەن و لەخواوەند بپاڕێنەوە، خەویان لێکەوت. نەیانتوانی دۆعا بکەن. عیسا ئەوانی بەئاگا هێنایەوە و وتی: سبحان الله، یەك شەو ناتوانن لەبەر من نەخەون وهاوکاریم بکەن.

وتیان: سوێند بەخوا نازانین چی روویدا. گفتوگۆمان دەکرد و گفتوگۆکەمان درێژەی کێشا و کاتێك دەمانەوێت دۆعا بکەین، ناتوانین.

عیسا وتی: شوان دەبەن و مەڕەکان بڵاوەی لێدەکەن. قسەی هاوشێوەی هێنایە سەرزمان و لەمەرگی خۆی ئاگاداری کردنەوە. وتی: پێش ئەوەی کەڵەشێر سێ جاربقوڵێنێت، یەك لەئێوە حاشا لەمن دەکات و من بەچەند درەمێك دەفرۆشێت و بەهای من دەخوات.

حەوارییەکان ڕۆشتنەدەر و بڵاوەیان لێکرد. جوولەکەکان بەدوای عیسادا دەگەڕان. شەمعونیان گرت کەیەکێك بوو لەحەوارییەکان. وتیان: ئەمە لەهاوەڵانی عیسایە. حاشای کرد و وتی: من لەهاوەڵانی ئەو نیم. یەکیتر هات و بەهەمان شێوە حاشای کرد. بانگی کەڵەشێری بیست و گریا، کاتێك بەیانی بوویەوە، یەکێك

لەحەوارییەکان ڕۆشتە لای جولەکەکان و وتی: چیم پێدەدەن ئەگەر لەشوێنی عیسا ئاگادارتان بکەمەوە؟ سی درەمیان بۆ ئەو دیاری کرد. وەریگرت و کەسێکی نیشاندان کەهاوشێوەی عیسا بوو. ئەویان گرت و بەتەناف بەستیانەوە. تەنافەکەیان ڕاکێشا و وتیان: تۆ کەمردووت زیندوو دەکردەوە و شەیتانت دوور دەخستەوە و شیفای شێتەکانت دەدا، بۆ ناتوانیت خۆت لەم تەنافە رزگار بکەیت؟ تفیان تێکرد و چقڵ بارانیان کرد. بردیانە لای دارێك و دەیانویست بەو دارەوە هەڵیواسن. خواوەند ئەوی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و کەسێکی هاوشێوەی ئەویان لەداردا. حەوت ڕۆژ بەدارەکەوە مایەوە. دایکی عیسا و ژنێك کەئەوی لەشێتی رزگار کردبوو، دەهاتن و لای کەسی لەخاچ دراو دەگریان. عیسا هات و وتی: گریانی ئێوە بۆ چییە؟ پێیان وت.

وتی: خواوەند منی بۆ ئاسمان برد و هیچ زیانێك بەمن نەگەیشت. کەسێکی هاوشێوەی منیان گرت. بەحەوارییەکان بڵێن لەفلاّن شوێن من ببینن. یانزە کەس لەحەوارییەکان ئەویان لەشوێنی دیاریکراو بینی. ئەو کەسەی عیسای فرۆشت و شوێنی ئەوی نیشانی جوولەکەکاندا، ئامادە نەبوو. لەهاوەڵانی پرسیاری ئەوی کرد کەوتیان: لەکارەکەی خۆی پەشیمان بوویەوە و خۆی خنکاند.

عیسا وتی: ئەگەر تۆبەی دەکرد، خواوەند بەتۆبەکەی ڕازی دەبوو.

دواتر سەبارەت بەیەحیا ناوێك پرسیاری کرد کەشوێنکەوتەی ئەوان بوو، وتی: ئەویش هاوڕێی ئێوەیە، لەگەڵ خۆتان بیبەن چوونکە هەر کام لەئێوە بەزمانی نەتەوەیەك قسە دەکات و ئەوان ئاگادار وپێشنیاری خواپەرەستیان پێدەکات.

لەوەهب کوڕی مونبە دەگێڕنەوە:خواوەند بۆ ماوەی سێ ساڵ عیسای بێ گیان کرد. دواتر ئەوی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە.

بەلاّم کوڕی ئیسحاق دەڵێت: بەگومانی مەسیحیەکان خواوەند بۆ ماوەی حەوت کاژێر گیانی لێسەندەوە. دوای ئەوە زیندووی کردەوە و فەرمووی: دابەزە و لەکێوەکە بڕۆ لای مریەمی مەجدەلی چوونکە کەس وەك ئەو بۆ تۆ نەگریاوە وکەس وەك ئەو خەمی تۆی نەخواردووە. ئەو و حەوارییەکان کۆبکەرەوە و لەزەویدا بلاّوەیان پێبکە تا بانگەشەی خواپەرەستی بکەن چوونکە تۆ ئەو کارەت نەکرد.

خواوەند ئەوی بۆ لای مریەمی مەجدەلی برد. کێوەکە نوورانی بوو. حەوارییەکان لەدەوری کۆبوونەوە و عیسا ئەوانی بەزەویدا بلاّو کردەوە و وتی: ئەوەی خواوەند

فەرمانی پێداوە، لەزمانی ئەوەوە بەخەڵکانی رابگەیێنن.

خواوەند ئەوی بۆ لای خۆی گەڕاندەوە. باڵی پێبەخشی و جل و بەرگی نوورانی لەبەر کرد. لەخواردن و خواردنەوە بێ نیازی کرد. لەگەڵ فریشتەکان هەڵفڕی و هاوڕێ لەگەڵ ئەوان بەدەوری عەرشدا دەسووڕێتەوە. مرۆڤێکی – فریشتەیەکی ئاسمانی – زەمینییە.

حەوارییەکان بۆ ئەو شوێنیانەی راسپێردرابوون، بەرێکەوتن. ئەو شەوەی عیسا لەئاسمان هاتە خوار، ئەو شەوەیە کەمسیحیەکان بخوور دادەگیرسێنن. لەو حەواری و شوێنکەوتانەی عیسا رەوانەی کرد، پێترۆسی حەواری بوو کەپۆڵسی کردە هاوڕێی ئەو. پۆڵس لەشوێنکەوتەکان بوو بەڵام حەواری نەبوو. بەرەو رۆمیە رەوانە کرا و ئەندراییس و مەتی بۆ سەرزەمینی مرۆڤخۆرەکان رەوانە کرد کەسەرزەمینی سوودانە. توماسی بۆ سەرزەمینی بابل رەوانە کرد، فیلبسی بۆ قیروان و کارتاژ نارد کەهەمان ئەفریقیەیە، یەحنسی بۆ دفسوس نارد کەگوندی یارانی ئەشکەوتە. سەعقوبی بۆ ئورشەلیم رەوانە کرد کەهەمان ئیلیای بیت المقدسە. کوڕی تەلمای بۆ عەرابیە رەوانە کرد کەسەرزەمینی حیجازە. سیمەنی بۆ سەرزەمینی بەربەر نارد کەپێش ئەفریقیەیە. یەهوودای شوێنکەوتەی بۆ ئەریبوس رەوانە کرد و زەکەریا یوتای لەجیاتی یوزس دانا کەعیسای فرۆشتبوو.

لەزەرقی دەگێڕنەوە: یەکێك لەژنەکانی ئێمە نەزری کردبوو برواتە سەر جما کەکێوێکە لەعەقیق و لەدەرەوەی مەدینە. من لەگەڵ ئەودا ڕۆشتم، کاتێك گەشتیە سەر بەرزایی کێوەکە، گۆڕێکی گەورەمان بینی کەدوو کێلی گەورەی لەسەر بوو، یەکیان لای سەری و ئەوی دیکەیان لای قاچەکانی. نووسراوێکی لەسەر بوو، نەمزانی چییە. دوو بەردەکەم هەڵگرت. هێنانە خوارەوەیان قورس بوو، یەکیانم فڕێدا و ئەوەی دیکەیانم هێنایە خوار. نیشانی خەڵکی سریانی زمانمدا و وتم: ئایا نوسراوەکە دەناسنەوە؟ نەیانناسیەوە. نووسراوەکەم نیشانی زەبوور ناسەکانی یەمەندا هەروەها ئەو کەسانەی شارەزایی نووسینەکۆنەکان بوو، بەڵام نەیانتوانی بیخوێننەوە.

دەڵێت: کاتێك کەسم دەستنەکەوت نووسراوەکە بخوێنێتەوە، بەردەکەم خستە ژێر سنووقێکە و بۆ چەندین ساڵ بەو شێوەیە مایەوە. ئەوسا خەڵکانێك لەسەرزەمینی فارسەوە هاتن کەبەدوای خەزەراندا دەڕۆشتن. بەوانم وت: ئایا ئێوە نووسینتان هەیە؟

وتیان: بەڵێ.

بەردەکەم نیشانی ئەواندا، خوێندیانەوە چوونکە بەخەتی خۆیان نووسرا بوو. نووسرا بوو: ئەمە گۆڕی پێغەمبەری خوا، عیسا کوڕی مریەمە. بۆ خەڵکی ئەو دیارە نووسرا بوو کەلەو رۆژگارەدا عیسا لەناو ئەواندا مردبوو و لەسەر کێوەکە بەخاکیان سپاردبوو.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: هێرشیان کردە سەر پاشماوەی حەوارییەکان. ئەوانیان خستە بەرهەتاو و ئەشکەنجەیان کردن. بەناو خەڵکاندا ئەوانیان سووڕاند. پاشای رۆم کەجوولەکەکان لەژێر دەسەلاتی ئەودا بوون، ئەم داستانەی بیست وپێیان وت: کەسێك لەناو منالەکانی ئیسرائیلدا بوو کەهێرشیان کردەسەر و خوێنیان ڕشت. دەیوت: پێغەمبەری خوایە و کاری سەیر و سەمەرەی لێ بینراوە، مردوەکانی زیندووو کردۆتەوە و نەخۆشەکانی شیفا داوە. بەگڵ شێوەی مەلی دروست کردووە و دواتر فووی تێکردەوە و بەفەرمانی خواوەند بۆتە مەلێکی راستەقینە ولەغەیب ئاگادار بووە.

پاشای رۆم وتی: هاوار لەئێوە، بۆ لەبەسەرهاتی ئەو و منالەکانی ئیسرائیل منتان ئاگادار نەکردۆتەوە. چوونکە ئەگەر دەمزانی نەمدەهێشت دەستی جوولەکەکانی پێبگات.. دواتر کەسانێکی نارد و حەوارییەکانی لەدەست ئەوان رزگار کرد. سەبارەت بەعیسا و ئایینەکەی پرسیاری لێکردن و پاشایان ئاگادار کردەوە. باوەڕی بەدینەکەی ئەوان هێنا و بەدوای سەرجسدا گەڕا. ئەوی دۆزییەوە و ئەو دارەی عیسایان پێ لەخاچدا بوو، وەریگرتەوە و پاراستی و رێزی لێگرت لەبەر ئەوەی بەرجەستەی عیسا کەوتبوو. هێرشی کردە سەر منالەکانی ئیسرائیل وکەسانێکی زۆری لەوان کوشت. مەسیحیەتی رۆم لێرەوە دەستی پێکرد.

دەستەیەك لەشوێنکەوتەکانی هەواڵ وتوویانە، لەدایك بوونی عیسا لەچل و دووەم ساڵی پاشایەتی ئۆگۆستۆسدا روویدا. ئۆگۆستۆس دوای ئەو ماوەیەك پاشایەتی کرد. ساڵەکانی پاشایەتی ئەو پەنجا و شەش ساڵ بوو و بەوتەیەك چەند رۆژێك زیاتر.

دەڵێت: کاتێك جوولەکەکان دژی مەسیح راپەڕین، سەرۆکایەتی بیت المقدس لەدەستی قەیسەر دابوو. پاشای بیت المقدس بەنوێنەرایەتی قەیسر، هیرۆدۆسی گەورە بوو کەنێردراوانی پاشای فارس بۆ لای مەسیح بەهەڵە ڕۆشتنە لای ئەو و وتیان

کەپاشای فارس ئەوانی رەوانە کردووە و دیاری زێر و مڕ و کەندەریان لەگەڵ خۆیان هێناوە تا پێشکەشی مەسیحی بکەن چوونکە هەڵاتنی ئەستێرەکەی ئەویان بینیبوو و لەرووی زانستی ئەستێرەناسییەوە هەستیان بەلەدایك بوونی ئەو کرد. دیاریەکانیان لەبیت الحم پێشکەش بەمەسیح کرد و کاتێك هیرۆدۆس ئاگادار بوویەوە، بەشوێن مەسیحدا گەڕا تا بیکوژێت. خواوەند فەرمانی بەفریشتەدا تا یوسف کەهاوڕێی مریەم بوو لەکەنیسە، لەمەبەستی پاشا ئاگادار بکاتەوە و فەرمانی پێبدات تا دایك و منداڵەکە بۆ میسر ببات.

کاتێك هیرۆدۆس مرد، فریشتە یوسفی لەمیسر ئاگادار کردەوە کەهیرۆدۆس مردووە و ئەرکلاوسی کوڕی جێگەی ئەوی گرتۆتەوە. ئەو کەسەی مەبەستی کوشتنی منداڵەکەی دەکرد لەناوچووە. یوسف مەسیحی بۆ ناسرەی فەلەستین برد تا وتەکانی شۆعیای پێغەمبەر بێتەدی چوونکە وتبووی: بانگەوازەکەی تۆ لەمیسرەوە دەبێت.

کاتێك ئەرکلاوس مرد، هیرۆدۆسی بچوك پاشایەتی گرتەدەست. ئەو کەسە بوو کەهاوشێوەکەی مەسیحی لەخاچدا. لەو کاتەدا سەرۆکایەتی تایبەت بوو بەپاشاکانی یۆنانی و رۆمی وهیرۆدۆس و منداڵەکانی بەنوێنەرایەتی ئەوان پاشایەتیان دەکرد و نازناوی پاشایان پێوە بوو. پاشا گەورەکان بەقەیسەر ناودەبران. پاشای بیت المقدس لەکاتی لەخاچدرانی مەسیح، هیرۆدۆسی بچوك بوو کە بەنوێنەرایەتی تیباریۆس کوڕی ئەکۆستۆس پاشایەتی دەکرد بەڵام دەسەڵاتی داوەری کردنی نەبوو. پیاوێکی رۆمی بەناوی فیلاتوس دەسەڵاتی داوەری لەدەستدا بوو. لوس کوڕی بەهرس سەرۆکایەتی جالوتی دەکرد.

دەڵێن: ئەو کەسەی هاوشێوەی عیسا بوو و لەجیاتی ئەو لەخاچدرا، پیاوێکی ئیسرائیلی بوو بەناوی ئەیشوع کوڕی فەندیر.

پاشایەتی تیباریۆس بیست و سێ ساڵ و چەند رۆژ درێژەی کێشا. هەژدە ساڵ و چەند رۆژی لەکاتی دەرکەوتنی عیسا و پێنج ساڵ دوای عیسایش پاشایەتی کرد.

## گێڕانەوەکان سەبارەت بە پاشاکانی ڕۆم لەسەرزەمینی شام لەدەرکەوتنی مەسیح تارۆژگاری پێغەمبەری ئێمە

ئەبو جەعفەر دەڵێت: بەگومانی مەسیحیەکان دوای تیبارۆیۆس، گایۆس پاشایەتی شام و فەلەستین و ناوچەکانی دیکەی گرتەدەست و بۆ ماوەی چوار ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو کوڕێکی دیکەی تیباریۆس بەناوی کلۆدیۆس چواردەساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو نیرۆن چواردەساڵ پاشایەتی کرد. نیرۆن ئەو کەسەیە فەترس و پۆڵسی کوشت و سەرەوخوار هەڵیواسین.

دوای ئەو بوتلایۆس چوار مانگ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو ئەسفسیانۆس باوکی تەتوس دە ساڵ پاشایەتی کرد و لەسێیەم ساڵی پاشایەتییەکەی و ساڵی چلەمی بەرزبوونەوەی عیسا بۆ ئاسمان، تەتوسی کوڕی بۆ بیت المقدس ڕەوانە کرد و فەرمانی وێرانی کردنی ئەو سەرزەمینەی پێدا. بیت المقدسی وێران کرد و لەتۆڵەی خوێنی مەسیح دەستەیەکی زۆری لە منداڵەکانی ئیسرائیل کوشت.

دوای ئەو تەتوس کوڕی ئەسفسیانۆس دو ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو دومتاینۆس شانزە ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو نارواس شەش ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو ترایانۆس نۆزدە ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو هدریانۆس بیست و یەك ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو تەتوریس کوڕی بەتیاتوس بیست و دوو ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو مرکوس و کوڕەکانی نۆزدە ساڵ پاشایەتیان کرد.

دوای ئەو کوزۆمۆس سیانزە ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو فرتناجوس شەش مانگ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو سەبروس چواردە ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو ئەنتنیاوس حەوت ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو مرقیانوس شەش ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو ئەنتنیاوس چوار ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو ئەلحەسندروس سیانزە ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو کسمیانوس سێ ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو جوردیانوس شەش ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو فلیفوس حەوت ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو گاڵوس شەش ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو والرییانوس و کالینوس پانزە ساڵ پاشایەتیان کرد.

دوای ئەو کلۆدیوس یەك ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو کریتالیوس دوو مانگ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو ئورلیانوس پێنج ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو تیقتوس شەش مانگ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو فۆلۆریوس بیست و پێنج رۆژ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو فرابوس شەش ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو کوروس و دوو کوڕەکەی دوو ساڵ پاشایەتییان کرد.

دوای ئەو دووقلتیانوس شەش ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو محسمیانوس بیست ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو قوستەنتینوس سی ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو قوستەنتین بیست ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو ئەلیانوسی ریاکار دوو ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو یویانۆس یەك ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو واڵمتیانوس و گرتیانوس دە ساڵ پاشایەتییان کرد.

دوای ئەو خرتانوس و واڵنتیانوسی بچوك یەك ساڵ پاشایەتییان کرد.

دوای ئەوان تیاداسیسی گەورە حەفدە ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو ئەرکادیوس و ئەنوریوس بیست ساڵ پاشایەتییان کرد.

دوای ئەو تیاداسیسی بچوك و واڵنتیانوس شانزە ساڵ پاشایەتییان کرد.

دوای ئەوان مرکیانوس حەوت ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو ئولاون شانزە ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو ئوزانون هەژدە ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەوئەوانستاس بیست و حەوت ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو ئویوستنیانوس حەوت ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو یوستنیانوسی پیر بیست ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو یوستنیس دوانزە ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو تیباریۆس شەش ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو مریقیس و تاداسیسی کوڕی، بیست ساڵ پاشایەتیان کرد.

دوای ئەوان فوقا حەوت ساڵ و شەش مانگ پاشایەتی کرد و کوژرا.

دوای ئەو هێرقل سی ساڵ پاشایەتی کرد.

هێرقل ئەو کەسەیە پێغەمبەر(د.خ) نامەی بۆ نوسی.

بەپێی گێڕانەوەی ئەوان لەکاتی ئاوەدانی بیت المقدس لەدوای وێران بوونی لەسەر دەستی بەخت نەسر تا کاتی کۆچ هەزار و بیست و چەند ساڵە و لەپاشایەتی ئەسکەندەر تا کاتی کۆچ نۆسەد و بیست و چەند ساڵ کە لەکاتی دەرکەوتنی ئەسکەندەر تا لەدایك بوونی عیسا کوڕی مریەم سێسەد و سێ ساڵ بوو و لەلەدایك بوون تا بەرزبوونەوەی عیسا بۆ ئاسمان سی و دوو ساڵ و لەبەرزبوونەوەی عیسا تا کاتی کۆچ پێنسەد و هەشتا و پێنج ساڵ و چەند مانگ.

دەستەیەك لەشوێنکەوتەکانی هەواڵ وتوویانە، کوژرانی یەحیا کوڕی زەکەریا بەدەستی منداڵەکانی ئیسرائیل لەرۆژگاری ئەردەشێر کوڕی بابەك و لەهەشتەم ساڵی پاشایەتی ئەو روویدا. بەخت نەسر لەلایەن شاپوور پاشا کوڕی ئەردەشێر بابەك بۆ شەڕی جوولەکەکان روویکردە شام.

## وتار سەبارەت بەنیشتەجێ بوونی عەرەبەکان لەحیرە و ئەنبار

یەکێك لەرووداوەکانی رۆژگاری پاشای تیرەکان نیشتەجێ بوونی دەستەیەك لەهۆزە عەرەبەکان لەحیرە و ئەنبار بوو. ئەم هۆزانە لەگوندەکانی عێراقەوە هاتبوون.

لەهوشام کوڕی محەممەد دەگێڕنەوە: کاتێك بەخت نەسر مرد، ئەو عەرەبانەی لەحیرە نیشتەجێ کرابوون، پەیوەستی خەڵکانی ئەنبار بوون. حیرە چۆڵ و ماوەیەکیان بەمشێوەیە بەسەر برد و کەس لەسەرزەمینی عەرەبەوە نەهات. تەنیا ئەو خەڵکە لەئەنبار نیشتەجێ بوون و ئەو کەسانەی لەحیرەوە هاتبوون، لەهۆزەکانی عەرەب ونەوەکانی ئیسماعیل و لەنەژادی مەعد کوڕی عەدنان بوون.

کاتێك منداڵەکانی مەعد کوڕی عەدنان و هۆزەکانی دیکەی عەرەبی هاوڕێیان، ژمارەیان فراوان بوو، سەرزەمینی تەهامە و ناوچەکانی دەوروبەریان پڕکردەوە. شەڕەکان لەناو ئەوان هەڵگیرسا و بەڵاکان ڕووی تێکردن. بەمەبەستی دۆزینەوەی شوێنێکی بەربلاو و یەیلاقی بەرەو دیاری یەمەن و بەرزاییەکانی شام کۆچیان کرد. دەستەیەك لەهۆزەکان ڕۆشتن تا لەناوچەی بەحرەین دابەزین. دەستەیەك لەخەڵکانی ئەزد لەوێ نیشتەجێ بوون کە لەرۆژگاری عیمران کوڕی عەمرۆ بۆ ئەو ناوچەیە کۆچیان کردبوو و لەپاشماوەکانی منداڵەکانی عامر هەژمار دەکران. عامریان بە ماء السماء ناو دەبرد. کوڕی حارسەی غەتریف کوڕی سەعلەبە کوڕی ئەمرۆء ئەلقەیس کوڕی مازن کوڕی ئەزد بوو.

ئەو عەرەبانەی لەتەهامەوە هاتن، مالك و عومەر دوو کوڕەکەی فەهم کوڕی تیم الله کوڕی ئەسەد کوڕی وەبرە کوڕی تەغلەب کوڕی حیلوان کوڕی عیمران کوڕی ئەلحاف کوڕی قوزاعە بوون.

مالك کوڕی زوهەیر کوڕی عومەر کوڕی فەهم کوڕی تیم الله کوڕی ئەسەد کوڕی وەبرە لەگەڵ دەستەیەك لەخەڵکەکەیان.

حیقار کوڕی حیق کوڕی عومەیر کوڕی قنس کوڕی مەعد کوڕی عەدنان لەگەڵ

هەموو منالەکانی قنس.

ئەم کەسانەیش پەیوەستیان بوون:

غەتەفان کوڕی عەمرۆ کوڕی تەمسان کوڕی عوز مەنات کوڕی یەقدەم کوڕی ئەفسی کوڕی دەعمی کوڕی ئەییاد کوڕی فەزار کوڕی مەعد کوڕی عەدنان.

زوهرە کوڕی حارس کوڕی شەلەل کوڕی زوهر کوڕی ئەییاد.

سوبح کوڕی سوبح کوڕی حارس کوڕی دەعمی کوڕی ئەییاد.

ئەو دەستە لەهۆزەکانی عەرەب کە لەبەحرەین کۆبوونەوە، پەیمانی تنوخیان بەست، یانی نیشتەجێ بوون، بەڵێنیاندا یار و پشتیوانی یەك بن. ناوی تنوخ لەسەر ئەوان مایەوە بەشێوەیەك دەتووت یەك هۆزن.

دەڵێت: چەندین هۆز لەنەمارە کوڕی لەخم لەگەڵ ئەوان نیشتەجێ بوون.

مالك کوڕی زوهەیر، جەزیمە ئەلئەبرەش کوڕی مالکی ئەزدی بانگێشت کرد تا لەگەڵ ئەو نیشتەجێ ببێت و لەمیس خوشکەکەی خۆی و کچی زوهەیری کردە هاوسەری ئەو. جەزیمە لەگەڵ دەستەیەك لەئەزدییەکان لەوێ نیشتەجێ بوون و لەهۆزە نیشتەجێکان، مالیك و عەمرۆ کوڕەکانی فەهم و ئەزد بوونە هاوپەیمان و هاودەنگ.

کۆبوونەوەی ئەم هۆزانە لەبەحرەین و هاوپەیمانی ئەوان لەرۆژگاری پاشای تیرەکان روویدا کەئەسکەندەر دوای کوشتنی دارای پاشای فارس، ئەوانی کردبووە پاشا و ویلایەتەکانی لەنێوان ئەواندا دابەش کردبوو. کاتێك ئەردەشێر کوڕی بابەك پاشای فارسەکان بەسەر پاشای تیرەکاندا سەرکەوت و ئەوانی سەکوت کرد، هەموو خەڵکان ملکەچی فەرمانەکانی بوون و پاشایەتییەکەی بەهێز و سەقامیگر بوو.

دەڵێت: بۆیە بەپاشای تیرەکان ناویان دەبەن چوونکە سنووری فەرمانڕەوایەتی هەرکامیان سنورێکی بەرتەسك و کەم کەبریتی بوو لەچەند کۆشك و ماڵێك و خەندەکێکیان بەدەوریدا هەڵکەندبوو. دوژمنان لێیان نزیك و هاوشێوەی خۆیان سنووری فەرمانڕەوایەتییەکەیان بەرتەسك و سنووردار بوو. یەك لەوان وەك بروسکە هێرشی دەکردە سەری ئەوی دیکە و دەگەڕایەوە. ئەوعەرەبانەی لەناوچەی بەحرەین نیشتەجێ بوون، چاوی تەماحیان بڕیبوە گوندەکانی عێراق و

دەیانویست عەجەمەکان لەو سەرزەمینە دەربپەڕێنن یا ببنە شەریکی ئەوان. دژایەتی پاشای تیرەکانیان بەدەرفەت زانی و سەرۆکەکانیان بڕیاریاندا رووبکەنە عێراق و خەڵکەکەیان فەرمانەکانیان لەگوێ گرت. حیقار کوڕی حیق و خەڵکەکەی و دەستەیەکی دیکە یەکەمین خەڵکان بوون گەشتنە سەرزەمینی عێراق. کاتێك گەیشتن و ئەرمەنییەکان لەسەرزەمینی بابل و سنوورەکانی دەورروبەر تا مووسڵ نیشتەجێ بوون، لەگەڵ ئەردوانییەکان یانی پاشای تیرەکان سەرقاڵی شەڕ کردن بوون. سنووری پاشای تیرەکان گوندەی ئەفەر لەسوادی عێراق تا ئوبلە و سنورەکانی سارا بوو. عەرەبەکانیان لەسەرزەمینەکەی خۆیان جێگە نەکردەوە.

دەڵێت: عادیان بەئەرەم ناو برد و کاتێك عاد لەناوچوو، سەموودیان بەئەرەم ناو برد. ئەرمەنییەکان یانی نبتیەکانی سواد پاشماوەکانی ئەرەم بوون کەدیمەشقیشیان بەئەرەم ناو دەبرد.

دەڵێت: ئەم خەڵکەی لەبەحرەینەوە هاتن، خۆیان لەسوادی عێراق بەدوور گرت و لەنێوان عەرەبەکانی ئەنبار و عەرەبەکانی حیرە بڵاوبوونەوە. پاشماوەکانی قنس کوڕی مەعد لەوانن و ڕەچەڵەکی تایەفەی عەمرۆ کوڕی عودەی کوڕی نەسر کوڕی رەبیعە کوڕی عەمرۆ کوڕی حارس کوڕی مەسعود کوڕی مالیك کوڕی عەمم کوڕی نەمارە کوڕی لەخەم بۆ ئەوان دەگەڕێتەوە.

دەڵێت: ئەمە وتاری موزەر وحەمادراویەیە و راست نییە و سەبارەت بەقنس کوڕی مەعد هیچ وتارێك راستتر لەوتارەکەی جوبەیر کوڕی موتعیم نییە کەدەڵێت نەعمان لەنەوەکانی ئەوە.

دەڵێت: بۆیە بەئەنباریان دەوت ئەنبار، چوونکە پاشکەوتی خواردنەکان لەوێ بوو و خەڵکانی رۆژی کەسەکانی خۆیان لەوێ دەدا.

دوای ئەو مالك و عەمرۆ کوڕەکانی فەهم کوڕی تیم الله و مالك کوڕی زوهەیر کوڕی فەهم کوڕی تیم الله و غەتەفان کوڕی عەمرۆ کوڕی تەمسان و زوهر کوڕی حارس و سوبح کوڕی سوبح و هۆزەکانی نیشتەجێ لەگەڵ ئەوان لەئەنبار پۆشتنە لای پاشای ئەرمەنییەکان. نەمارە کوڕی قەیس لەگەڵ نەجدە کەهۆزێك لەعەمالیق بوون و ڕەچەڵەکیان بۆ کندە و مەلەکان کوڕی کندە دەگەڕێتەوە، هاوڕێ لەگەڵ مالك

و عەمرۆ کوڕەکانی فەهم و هاوپەیمانەکانیان ڕۆشتنە نەفەر و پەیوەستی پاشای ئەردەوانییەکان بوون کەئەوانی لەو قەڵای بەخت نەسر بۆ بازرگانە عەرەبەکان دروستی کردبوو، نیشتەجێ کرد. دانیشتوانی ئەنبار و نەفەر مانەوە و لەعەجەمەکان خۆیان بەدوور گرت تا توبەع ئەسعەد باوکی کەرب کوڕی مەلیکەرب لەگەڵ سوپاکەی خۆی گەیشتە ئەو ناوچەیە و لاوازەکانی سوپای لەوێ بەجێهێشت چوونکە توانای ڕێگە ڕۆشتنیان نەبوو. ئەم کەسانەی پەیوەستی کەسانی ناو قەڵاکە و لەگەڵ ئەوان تێکەڵاو بوون.

کەعب کوڕی جوعەیلی تەغلەبی شێعرێکی هەیە بەم ناوەرۆکە: توبەع لەسەفەرێك لەگەڵ نەتەوەی حەمیر بۆ شەڕ دەڕۆشت، لەحیرە لای خەڵکی عەدەن دابەزی.

توبەع ڕۆشت و گەڕایەوە و ئەوانەی نیشتەجێ ببوون، لەحاڵی خۆیاندا بەجێهێشت و بۆ یەمەن گەڕایەوە.

لەهەموو هۆزەکانی مناڵەکانی لەحیان کەپاشماوەی جورهەمیەکان بوون، کەسانی لەجوعفی و تەی و کەلب و تەمیم لەناو ئەواندا دەبینران. بەڵام پاشماوەکانی جورهەم تەنیا لەحیرە بوون.

کوڕی کەلبی دەڵێت: لەحیان پاشماوەی جورهەمیەکان بوون.

زۆر لەدانیشتووانی ئەنبار و حیرە و دەوروبەرەکانی حیرە لەکەناری فورات و ڕۆژئاوای فورات تا سنوری ئەنبار لەسایەوان و خێوەتەکاندا نیشتەجێ بوون. نەڕۆشتنە ناو ماڵە دروستکراوەکان و لەگەڵ خەڵکی شارەکاندا تێکەڵاو بوون. دەستەکانیان لەنێوان ئەنبار و حیرە پەیوەست بوو و بەعەرەبە دەرەکییەکان ناویان دەرکرد.

یەکەم کەس لەوان لەسەردەمی پاشایەتی تیرەکان، پاشایەتی گرتەدەست، مالیك کوڕی فەهم بوو. شوێنی نیشتەجێ بوونی سنوورەکانی ئەنبارە. کاتێك مالك مرد، براکەی عەمرۆ کوڕی فەهم پاشایەتی گرتەدەست وکاتێك عەمرۆ مرد، جەزیمە ئەلئەبرەش کوڕی مالك کوڕی فەهم کوڕی غانم کوڕی دوسی ئەزدی پاشایەتی گرتەدەست.

کوڕی کەلبی دەڵێت: پاشماوەی ڕەچەڵەکی ئەو بەمشێوەیە: دوس کوڕی عەدنان کوڕی عەبداللە کوڕی نەسر کوڕی زەهران کوڕی کەعب کوڕی حارس کوڕی کەعب کوڕی عەبداللە کوڕی مالك کوڕی نەسر کوڕی ئەزد کوڕی غەوس کوڕی مالك کوڕی زەید کوڕی کەهلان کوڕی سەبا.

دەڵێت: بەوتەیەك جەزیمە ئەلئەبرەش لەعەرەبەکانی عاربەی کۆن لەمناڵەکانی وەبار کوڕی ئەمیم کوڕی لوز کوڕی سام کوڕی نوحە و جەزیمە بۆ چارەسەرکردن و بوێری و دوور ئەندێشی گەورەی هەموو پاشاکانی عەرەب بوو. یەکەم کەس بوو پاشایەتی سەرزەمینی عێراقی گرتەدەست و عەرەبەکانی پەیوەستی خۆی کرد ولەگەڵ سوپا بۆ شەڕ بەرێکەوت. ئەو نەخۆشی پیسی(( جۆرە نەخۆشیەکەی کەپەڵەی بێ ڕەنگ لەسەر پێست دەردەکەوێت)) بوو. عەرەبەکان نەیانویست بەراشکاوی باسی نەخۆشییەکەی بکەن و لەبەر ئەمە ئەویان بەجەزیمەی ڕۆشن یا جەزیمەی ئەبرەش ناوبرد. ئەبرەش بەمانای دوورەنگە.

سنووری جەزیمە لەنێوان حیرە و ئەنبار و بەقە و هیت و دەوروبەرەکەی و عەین ئەلتەمەر و سنوورەکانی دەشت تا غەمیر و قەتقەتانە و خەفیە و دەوروبەرەکانی بوو. خەراجی بەدەست دەگەیشت و کەسەکان دەڕۆشتنە لای ئەو. ئەو لەناوچەی جەو و دەوروبەری هێرشی کردە سەر تسم و جەدیس. ڕووبەڕووی حسان کوڕی توبەع ئەسعەد کوڕی ئەبی کەرب بوویەوە کە لەیەمامە هێرشی کردبووە سەر تسم و جەدیس. جەزیمە لەگەڵ سوپاکەی خۆی گەڕایەوە و سوپاکەی توبەع دەستیان بەسەر دەستەیەك لەنێردراوانی جەزیمە گرت و ئەوانیان کوشت. جەزیمە لەمبارەوە شێعرێکی خەمباری هۆنییەوە.

شاعیری جاهلی سەبارەت بەشەڕەکانی ئەو لەگەڵ نەتەوە کۆنەکان و عەرەبەکانی عاربە و تالآنییەکانی ئەو دەڵێت:

جەزیمە لەیەبرین نیشتەجێیە

هەموو ئەو شتانەی عاد لەڕۆژگاری خۆی هەیبوو،

داگیری کردووە.

جەزیمە سەرقاڵی کاهینی و پێشگۆیی بوو. دوو بتی بوو کەزیزنان ناویان

دەبردن. شوێنی زیزنان لەحیرە بەناوبانگە. بەهۆی ئەوانەوە داوای بارانی دەکرد و دەیویست بەسەر دوژمندا سەرکەوتن بەدەست بێنێت. نەتەوەی ئەییاد لەعەین ئەباغ بوون. ئەباغ یەکێکە لەعەمالیق کەلای ئەم سەرچاوەیە نیشتەجێ بوون. جەزیمە لەگەڵ ئەییاد شەڕی کرد لەبەر ئەوەی گەنجێکی خاوەن شکۆ لەخەڵکی لەخم بەناوی عودەی کوڕی نەسر لای خاڵو ئەییادییەکانی خۆی بوو و سەبارەت بەجەزیمە لەگەڵ ئەو گفتوگۆیان کردبوو. جەزیمە بۆ شەڕی ئەییادییەکان بەرێکەوت.

ئەییادییەکان کەسیان نارد و جەزیمەیان سەرخۆش کرد. دوو بتەکەی ئەویان دزی و بردیان و پەیامیان بۆ جەزیمە رەوانە کرد: بتەکانت لەتۆ بێزار و خوازیاری ئێمە بوون. هاتنە لای ئێمە و ئەگەر پەیمان بدەیت، شەڕ لەگەڵ ئێمە نەکەیت، بتەکانی تۆ دەگەڕێنینەوە.

جەزیمە وتی: عودەی کوڕی نەسر تەسلیمی من بکەن. عودەی و بتەکانیان تەسلیمی ئەو کردەوە. ئەییادییەکانی پشتگوێ خست و عودەی پەیوەستی خۆی کرد. ئەوی کردە شەرابداری خۆی.

کاتێك رەقاش کچی مالك و خوشکی جەزیمە، عودەی بینی، عاشقی بوو، نامەی نووسی و وتی: خوازبێنی من لەپاشا بکە چوونکە لای ئەو رێز وپێگەت هەیە.

عودەی وەڵامی دایەوە: ناوێرم لەمبارەوە قسەی لەگەڵ بکەم و دڵنیا نیم لەوەی تۆ بکاتە هاوسەری من.

رەقاش وتی: کاتێك بۆ شەراب خواردنەوە دانیشت و کەنیزەکانی ئامادە بوون، شەرابی پاکی پێبدە و شەرابی کەسانی دیکە تێکەڵ بەئاو بکە. کاتێك سەرخۆشی شەراب بوو، خوازبێنی منی لێبکە چوونکە رازی دەبێت. کاتێك منی کردە هاوسەری تۆ، خەڵکان بەشایەت بگرە.

گەنجی لەخمی فەرمانەکەی رەقاشی ئەنجامدا. کاتێك جەزیمە سەرخۆش بوو، خوازبێنی رەقاشی لێکرد. جەزیمە خووشکەکەی کردە هاوسەری ئەو. عودەی رۆشت و هەمان شەو لەگەڵ ئەو پەیوەندی هاوسەر گیری بەست. بەرەبەیان

جەزیمەی ئەوی بینی کەزەعفەرانی بۆنخۆشی لەخۆیدابوو، هۆکارەکەی نەزانی و وتی: ئەی عودەی ئەمە چییە؟

وتی: شوێنەواری زاوایەتییە.

وتی: لەگەڵ کێ؟

وتی: رەقاش.

وتی: هاوار لەتۆ، کێ ئەوی کردە هاوسەری تۆ؟

وتی: پاشا ئەو کارەی کرد.

جەزیمەی لەناوچاوی خۆیدا و لەپەشیمانیدا گازی لەدەستی خۆی دەگرت. عودەی هەڵات.

کەس بیری ئەوی نەکردووە. جەزیمە کەسی بۆ لای خوشکەکەی رەوانە کرد و شێعرێکی بەم ناوەرۆکە بۆ نارد:

پێم بڵێ و دڵنیام درۆ ناکەیت.

ئایا لەگەڵ پیاوێکی ئازادە زینات کردووە یا دوو رەگە

یا لەگەڵ غولامێك چوونکە تۆ شیاوی بۆ غولامەکان.

یا لەگەڵ کەسێکی پەست چوونکەی شیاوی بۆ پەستەکان.

رەقاش وڵامی دایەوە: تۆ منت کردە هاوسەری پیاوێکی عەرەبی خاوەن نەژاد، لەگەڵ من راوێژت نەکرد و هیچ دەسەڵاتێکم نەبوو.

جەزیمە دەستی لێهەڵگرت و بەپاساوەکەی رازی بوو.

عودەی بۆ لای ئەییاد رۆشت. چەند رۆژێك لەگەڵ گەنجەکانی ئەییاد بەمەبەستی راو دەرۆشتنەدەر. یەکیان تیرێکی هاویشت، بەرعودەی کەوت وگیانی سپارد.

رەقاش دووگیان بوو. کورێکی هێنایە دنیا و بەعەمرۆ ناوی برد. پەروەردەی کرد و کاتێك گەورە بوو، بۆنی خۆشی لێدا و جل و بەرگی شایانەی لەبەر کرد و بردییە لای جەزیمە. جەزیمە کاتێك ئەوی بینی، خۆشەویستی منداڵەکەی کەوتە دڵەوە. پەیوەستی منداڵەکانی خۆی کرد ولەگەڵ ئەوان بوو.

بەرێکەوت لەساڵێکی پرگژوگیا کەکارگ فراوان بوو، شا رۆشتەدەر. لەناو

باخێکدا فەرشیان بۆ ڕاخست. عەمرۆ و منداڵەکانی جەزیمە سەرقاڵی کارگ چنینەوە بوون. کاتێك منداڵەکانی کارگێکی باشیان دەستدەکەوت، دەیانخوارد بەڵام عەمرۆ هەڵیدەگرت. منداڵەکان بەڕاکردن هاتن و عەمرۆ لەپێش ئەوانەوە بوو. شێعرێکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

من ئەمەم کۆکردۆتەوە و دەسەڵاتی لەدەستی خۆمدایە، کاتێك کۆمکردەوە کەئەوانی دیکە لەکاتی چنینەوەی دەیانخوارد.

جەزیمە بانگی کرد و خەڵاتی پێدا.

جنۆکە عەمرۆی ڕفاند. جەزیمە ماوەیەك بەدوایدا گەڕا، بەڵام هیچ هەواڵێکی دەست نەکەوت. بەرێکەوت دوو پیاو یەکیان بەناوی مالك و ئەوی دیکەیان عەقیل کەهەر دووکیان منداڵەکانی قارج بوون، بەمەبەستی ئەوەی دیارییەك پێشکەش بەپاشا بکەن، سەفەریان کرد و لەلێواری ئاوێك دابەزین. کەنیزێك بەناوی دایکی عومەریان لەگەڵدا بوو. قازانی خستە سەر ئاگر و خواردنی بۆ ئامادە کردن. لەکاتی خواردن، پیاوێکی خۆڵاوی قژ ژاکاو کەنینۆکەکانی درێژ بوو، هات و دانیشت و دەستی بۆ خواردنەکە درێژ کرد. کەنیزەکە ئێسقانێکی پێدا. خواردی بەڵام تێری نەخوارد. دووبارە دەستی درێژ کرد، کەنیز وتی: ئەگەر ئێسقانی ڕان بەمرۆڤەکان بدەیت داوای ئێسقانی باڵ دەکەن. ئەمە بۆخەڵکانی زیادەخواز بوو بەپەند. کەنیز شەرابی بۆ دوو پیاوەکە تێکرد و لێواری مەشکەکەی بەست. عەمرۆ کوڕی عودەی وتی:

ئەی دایکی عومەر، شەرابت بەئێمە نەدا، لەکاتێکدا جامی شەراب بەلای ڕاستا دەگێڕن، بەڵام ئەی دایکی عومەر، منی شەراب نەخواردوو، خراپتر لەوانی دیکە نیم.

ئەو دوو پیاوە وتیان: تۆ کێیت؟

وتی: ئەگەر من نەناسن، ڕەچەڵەکی من دەناسن. من عەمرۆ کوڕی عودەییم.

هەستان و ماچیان کرد. سەریان شۆرد و نینۆکەکانیان کرد. مووی سەر و ریشیان کورت کردەوە و بەجل و بەرگەکانی خۆیان ئەویان داپۆشاند، وتیان: هیچ دیارییەك بۆ پاشا بەرێزتر و ئازیزتر لەخوشکەزاکەی نییە کەخواوەند ئەوی بۆ

گەڕاندۆتەوە.

ڕۆشتن تا گەیشتنە لای جەزیمە، مژدەی زیندووو بوونی عەمرۆیان پێدا و شادمان بوو. ئەوی بۆ لای دایکی ڕەوانە کرد وبەوانی وت: ئێوە چیتان دەویت؟

وتیان: دەمانەوێت تا ئەو کاتەی دەمێنیت و دەمێنین، هاودەمی تۆ بین.

وتی: پێشکەشتان بێت. هاودەمە بەناوبانگەکانی جەزیمە ئەو دوو پیاوە بوون. موتەمەم کوڕی نەویرەی یەربوعی لەپرسەی براکەی خۆی کە بەدەستی خالیک کوڕی وەلید لەشەڕی بەتاح کوژرا، مەبەستی لەوانە کەدەڵێت: لەرۆژگارە درێژەکان ئێمە هاودەمەکانی جەزیمە بووین تا ئەوەی وتیان لەیەك جیا نابنەوە و کاتێك بلاوەمان لێکرد وەك بڵێی من و مالك، بەو هەموو کاتەی هاودەمی ئەو بووین، یەك شەو لای ئەو نەبووین.

باوکی خەراشی هەزەلی دەڵێت:

مەگەر نازانی پێش ئێمە مالك و عەقیل، هاوڕێ گیانی گیانییەکان، جیاببونەوە.

دایکی عەمرۆ بەدەورووبەری کوڕەکەیدا دەهات. خزمەتکارانی ڕەوانە کرد تا کاری گەرماو و حەمام کردنی ئەو سامان بدەن. کاتێك هاتەدەر، جل و بەرگی شایانەی لەبەر کرد و تەوقێکی زێری کردە ملی لەبەر ئەوەی نەزری کردبوو. وتی: برۆ لای خالۆت. کاتێك خالۆی ریشی ئەو و تەوقەکەی ملی بینی، وتی: تەمەنی عەمرۆ لەتەوق کردنە ملێ تێپەڕیوە. عەمرۆ لەگەڵ جەزیمەی خالی مایەوە و هەموو کارەکانی ئەوی لەئەستۆ گرت.

پاشای عەرەب لەسەرزەمینی جەزیرە و بەرزاییەکانی شام، عەمرۆ کوڕی زەرب کوڕی حسان کوڕی ئوزەینە کوڕی سەمیدع کوڕی هوبەری عەملەقی و بەوتەیەك عەملیقی بوو.

جەزیمە سوپایەکی لەعەرەبەکان کۆکردەوە و هێرشی کردەسەر. عەمرۆ کوڕی زەرب لەگەڵ سوپاکەی خۆی لەشام هاتەدەر. ڕووبەرووی یەك بوونەوە و شەڕێکی قورسیان دەستپێکرد. عەمرۆ کوڕی زەرب کوژرا و سوپاکەی بلاوەی لێکرد. جەزیمە هاوڕێ لەگەڵ سوپاکەی خۆی تەندروست گەڕایەوە هاوڕێ لەگەڵ تالانییە فراوانەکان.

دوای عەمرۆ، کچەکەی زەبا پاشایەتی گرتە دەست. ناوی نائیلە بوو.

سوپاکەی زەبا لەپاشماوەی عەمالیق و عەرەبەکانی عاربە و هۆزەکانی قوزاعە بوو. خووشکێکی بوو بەناوی زەبیبە. لەسەر لێواری رۆژئاوای فورات کۆشکێکی گەورەی بۆ دروست کرد و زستانی لای ئەو بەسەر دەبرد و بەهاران لە بەتن نەجار. هاتوچۆی تەدموری دەکرد.

کاتێك کاروبارەکان بۆ زەبا سەقامگیر بوو، بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوەی خوێنی باوکی، مەبەستی شەڕ کردن لەگەڵ جەزیمەی کرد. خوشکەکەی زەبیبە کەژنێکی وشیار و دوورئەندێش بوو، وتی: ئەگەر شەڕ لەگەڵ جەزیمە بکەیت و سەرکەوتن بەدەست بێنیت، تۆڵەی خۆت سەندۆتەوە بەڵام ئەگەر شکست بخۆیت، پاشایەتییەکەت لەناو دەچێت. شەڕ هەمیشە لەبەرەژوەندی یەك لایەندا نییە و هەڵە لەشەڕ، هیچ کات قەرەبوو ناکرێتەوە. سەرکەوتن و سەختی و رووداوت نەبینیوە و نازانی سەرئەنجامی کاروبارەکان بەچی کۆتایی دێت و بەخت یاری کێ دەبێت.

زەبا وتی: بۆچوونەکەت راستە. مەبەستی خۆی گۆڕی و رێگەی فرت و فێڵی گرتەبەر. نامەی بۆ جەزیمە نووسی: پاشایەتی ژنان پەسەند نییە و جگە لەتۆ کەس بەهاوشانی خۆم نازانم. بۆ لای من وەرە و پاشایەتی من پەیوەستی پاشایەتی خۆت بکە و سەرزەمینی من پەیوەستی سەرزەمینەکەت و کارەکانی من لەئەستۆ بگرە.

کاتێك نامەی زەبا بەجەزیمە گەیشت و نێردراوکانی هاتن، هەستی تەماحی جوولا و بۆ رازی بوون بەبانگێشتەکە ئارەزوومەند بوو. هاورێ بیرمەند وکۆنەکانی خۆی کۆکردەوە و راوێژی لەگەڵ کردن. هاوڕا بوون لەسەر ئەوەی بڕوات و پاشایەتییەکەی لەدەست بگرێت جگە لەقەسیر. ئەو قەسیر کوڕی سەعدی لەخمی بوو. باوکی سەعد یەکێك لەکەنیزەکانی جەزیمەی کردبووە هاوسەر و قەسیری هێنابوویە دنیا. قەسیر پیاوێکی دوورئەندێش و بیرمەند بوو. لای جەزیمە پێگەی دیاری هەبوو، لەبۆچوونەکەی ئەوان نارازی و وتی: بۆچوونێکی لاوازە و خیانەت بەئاشکرا لەم بانگێشتە دەبینرێت. ئەمە بووە پەند. بەجەزیمەی وت: نامەی بۆ بنووسە ئەگەر راست دەکات با بێتە لای تۆ. بەمشێوەیە ناکەویتە ناو داوی ئەو

چوونکە تۆ باوکی ئەوت کوشتووە.

بەڵام جەزیمە بەبۆچوونەکەی قەسیر رازی نەبوو. خوشکەزاکەی خۆی عەمرۆ کوڕی عودەی بانگ کرد و بۆچوونی ئەوی پرسی. عەمرۆ بۆ ڕۆشتن هانیدا و وتی: خەڵکانی نەمارە کەنەتەوەی منن، پەیوەستی زەبا بوون وئەگەر دەیانتوانی پەیوەستی تۆ دەبوون. جەزیمە بەبۆچوونەکەی رازی و پێچەوانەی بۆچوونەکەی قەسیری هەڵبژارد. قەسیر وتی: فەرمانەکانی قەسیر ئەنجام نادەن. ئەم وتەیە بوو بەپەند.

نەهشەل کوڕی حوڕی کوڕی زەمورە کوڕی جابری تەمیمی لەمبارەوە دەڵێت:

سەروەرێك فەرمانەکانی منی لەگوێ نەگرت و پشتی بەبۆچوونەکەی خۆی بەست

بەهەمان شێوە لەبەقە کەس گوێی لەوتەکانی قەسیر نەگرت.

کاتێك سەرەئەنجامی کارەکە دەرکەوت

ئارەزووی کرد خۆزگە بەقسەی منی دەکرد.

عەرەبەکان وتیان: لەبەقە هەموو شتێك کۆتای هات. ئەمە بوو بەپەند.

جەزیمە عەمرۆ کوڕی عودەی کردە جێگری خۆی و سالاری سوپاکەی بە عەمرۆ کوڕی عەبدولحەیدا.

لەگەڵ گەورەکانی خەڵکەکەی بەرێکەوت. لەکەنارەکانی رۆژئاوای فوراتەوە ڕۆشتن. کاتێك گەیشتە فەرەزە، قەسیری بانگ کرد و وتی: بۆچوونی تۆ چییە.

قەسیر وتی: لەبەقە گوویت لەبۆچوونەکەی من نەگرت. ئەم وتەیە بوو بەپەند.

نێردراوەکانی زەبا لەگەڵ دیارییەکان پێشوازیان لێکردن. بەقەسیری وت: چی دەبینی؟

قەسیر وتی: شتێکی کەم لەرووداوێکی گەورە. ئەمە بوو بەپەند.

دواتر وتی: سوپاکە بەتۆ دەگات، ئەگەر لەپێش تۆوە رێگەیان بڕی، ئەم ژنە راست دەکات.

ئەگەر لەدوو لاوە رێگەیان بڕی و دەوری تۆیان گرت، مەبەستی خیانەتیان لەسەردایە. سوار عەسا بە و من سوار عەسا بەدوای تۆدا دێم. عەسا ئەسپەکەی

جەزیمە و هاوتای نەبوو. کاتێك سوپاکە هات و لەنێوان ئەو و عەسا دیوارێکیان دروست کرد، قەسیر سواری بوو. کاتێك جەزیمەی بینی قەسیر سوار لەسەر عەسایە، وتی: دوور ئەندێشی لەسەر پشتی عەسا هەڵەیە. ئەم وتەیە بوو بەپەند. قەسیر تا ئاوا بوونی هەتاو لەسەر عەسا رێگەی بڕی. ئەسپەکە لەپێ کەوت چوونکە رێگەیەکی درێژی بڕیبوو. بورجێکیان دروست کرد و بەبورجی عەسا ناوی دەرکرد وعەرەبەکان وتیان: باشترین شت کەعەسا لەگەڵ خۆی هێنای. ئەم وتەیە بوو بەپەند.

جەزیمە ڕۆشت تا گەیشتە لای زەبا. کاتێك زەبا ئەوی بینی، خوارەوەی جەستەی خۆی رووت کرد. موووەکانی درێژ و وتی: ئەریتی بووکێنی بەمشێوەیە. ئەم وتەیە بوو بەپەند.

جەزیمە وتی: کار بەکۆتایی خۆی گەیشت و زەوی وشك و خیانەت ئاشکرا بوو.

زەبا وتی: ئەمە بەهۆی کەمی تیغ یا ئەداریەوە نییە، ئەریتی دەستەیەك لەخەڵکان بەمشێوەیە. ئەم وتەیە بوو بەپەند.

وتی: بیستوومە خوێنی پاشاکان چارەسەری نەخۆشی هاری دەکات. ئەوی لەسەر سفرەیەکی چەرمین دانیشاند و فەرمانیدا تا تەشتێکی زێڕیان هێنا و دایاننا. ئەوەندەیان شەراب دەرخواردداکەسەرخۆش بوو. فەرمانیدا تا دەمارەکانی ببڕن. تەشتەکەی بردە پێش. پێیان وتبوو ئەگەر دڵۆپێك خوێنی جەزیمە برژێتە سەرزەوی، تۆڵەی ئەو دەکەنەوە. نەریت نەبوو لەملی پاشاکان بدەن مەگەر لەکاتی شەڕ. ئەمە لەبەر ڕێزی پاشایەتی بوو. کاتێك دەستی سست و لاواز بوو، کەوت و چەند دڵۆپێك لەخوێنی ئەو ڕژایە سەر زەوی.

زەبا وتی: خوێنی شا بەفیڕۆ مەدەن.

جەزیمە وتی: گرنگی بەخوێنێك مەدەن کەخاوەنەکەی بەفیڕۆی داوە. ئەم وتەیە بوو بەپەند.

جەزیمە مرد و زەبا خوێنی ئەوی کوڵاند و لەپارچەیەکی ئاڵاند و خستیە ناو سنوقێکەوە..

قەسیر لەو شوێنەوەی عەسا لەپێکەوتبوو، بۆ لای عەمرۆ کوڕی عودەی لەحیرە گەڕایەوە. ئاشتی و سازگاری لەنێوان خەڵکان سەقامگیر کرد چوونکە دەستەیەك لەگەڵ عەبدولجنی جێرمی و دەستەیەك لەگەڵ عەمرۆ کوڕی عودەی بوون. لەنێوان ئەوان هاتوچۆی کرد تا لەسەر ئاشتی رێککەوتن. عەمرۆ کوڕی عەبدولجن ملکەچی فەرمانەکانی عەمرۆ کوڕی عودەی بوو. خەڵکانیش فەرمانەکانیان ئەویان جێبەجێ دەکرد.

قەسیر بەعەمرۆ کوڕی عودەی وت: خۆت ئامادە بکە و رێگە مەدە خوێنی خاڵۆت بەفیڕۆ بڕوات.

عەمرۆ وتی: لەگەڵ زەبا دەتوانم چی بکەم کەوەك هەڵۆ لەسەرزەمینەکەی من دوورە.

ئەم وتەیە بوو بەپەند.

زەبا پرسیاری لەکاهینەکەی خۆی کردبوو سەبارەت بەسەرئەنجامی پاشایەتییەکەی.

کاهین وتبووی: کوژرانی تۆ لەسەر دەستی غولامێکی ریسوا و باوەڕپێنەکراو بەناوی عەمرۆ کوڕی عودەیە. بەدەستی ئەو نامریت. بەدەستی خۆت دەمریت بەڵام بەهۆی عەمرۆ کوڕی عودەی.

زەبا ترسی عەمرۆی کەوتە دڵەوە. لەشوێنەکەی خۆی بۆ قەڵاکەی ناوشار، تونێلێکی دروست کرد و وتی ئەگەر رووداوێك رووبدات، لەتونێلەکەوە دەڕۆمە ناو قەڵاکەم. پیاوێکی نیگار کێشی بانگ کرد و وتی: وەك کەسێکی نەناسراو بڕۆ لای عەمرۆ کوڕی عودەی، تێکەڵاوی کەسەکانی ببە وهونەرەکەی خۆتیان نیشان بدە. نیگاری عەمرۆ بەدانیشتان، وەستان، بەجل و بەرگ و بەسیلاحەوە بکێشە و بۆمنی بێنە. نیگارکێش ڕۆشت تا گەیشتە لای عەمرۆ کوڕی عودەی. فەرمانەکەی زەبای ئەنجامدا و گەڕایەوە. زەبا دەیوست عەمرۆ کوڕی عودەی لەهەموو حاڵێکدا ببینێت بۆ ئەوەی بیناسێتەوە و خۆی لەو بەدوور بگرێت.

دەڵێت: قەسیر بەعەمرۆ کوڕی عودەی وت: لووتی من ببڕە و پشتم برینداار بکە.

عەمرۆ وتی: ئەو کارە ناکەم چوونکە شیاوی نیت بۆ ئەو کارە.

قەسیر وتی: کەواتە خۆم ئەو کارە دەکەم و کەس سەرکۆنەی تۆ ناکات.

کوڕی کەلبی دەڵێت: باوکی زەبا تونێلێکی بۆ زەبا و خوشکەکەی ئامادە کردبوو. قەلاَکەی ناوشار تایبەت بوو بەخوشکەکەی.

دەڵێت: عەمرۆ پێی وت: خۆت باشتر دەزانی. قەسیر لووتی خۆی بڕی و پشتی خۆی بریندار کرد و عەرەب وتی: قەسیر لووتی خۆی بۆ فێڵێك بڕی. ئەم وتەیە بوو بەپەند.

کاتێك قەسیر لووتی خۆی بڕی و پشتی خۆی بریندار کرد، ڕۆشتەدەر وەك بڵێی هەلاَتووە. واینیشاندا عەمرۆ ئەو بەلاَیەی بەسەر هێناوە لەبەر ئەوەی گومانی کردووە قەسیر بۆ کوشتنی خاڵۆی هاوکاری زەبای کردووە. بەڕیکەوت تا گەیشتە لای زەبا و پێیان وت: قەسیر لەبەر دەرگایە. ئەویان بردە لای زەبا. لووتی بڕاو و پشتی بریندار بوو.

وتی: ئەمە چییە دەیبینم.

قەسیر وتی: عەمرۆ کوڕی عودەی گومانی کرد فێڵم لەخاڵی کردووە و ئەوم بۆ هاتن بۆ لای تۆ هانداوە و بەمشێوەیە خیانەتم کردووە و هاودەستی تۆبووم. ئەو بەلاَی بەسەردا هێنام کەدەیبینی. ئێستا هاتوومە لای تۆ و دەزانم لای کەس بەئەندازەی تۆ ریسوا نیم.

زەبا بەزەیی پیاییدا هاتەوە و ڕێزی لێگرت. ئەوی بەپیاوێکی دوور ئەندێش و شارەزا لەکاروباری پاشاکان بینی.

کاتێك قەسیر زانی زەبا باوەڕی پێیکردووە، پێی وت: من لەعێراق سامانێکی زۆرم هەیە. ئەو دیارە، دیاری پێشکەشی و جل و بەرگە وبۆنەکان. من بۆ عێراق بنێرە تا سامانەکەی خۆم و جل و بەرگە جوان و رازاوەکان وبۆنە خۆشەکان بۆ تۆ بێنم تا سوودی فراوانت دەستکەوێت. پاشاکان پێویستیان بەو دیاریانەیە چوونکە هیچ دیارییەك وەك دیارییەکانی سەرزەمینی عێراق نییە. بەردەوام هانی زەبای دەدا تا ئەوەی کاروانێکی پێدا و وتی: بۆ عێراق بڕۆ و ئەو کاروانەی پێمداویت، بیفرۆشە و لەدیاری و جل و بەرگەکانی ئەویَ بۆ ئێمە بکرە.

قەسیر هاوریَ لەگەڵ کاروانەکەی زەبا بەرەو عێراق بەڕیکەوت. وەك کەسێکی

نەناسراو پۆشتە حیرە. پۆشتە لای عەمرۆ کوڕی عودەی و داستانەکەی بۆ باس کرد و وتی: پارچە و دیاری و کالاّ بەمن بدە ئەگەری هەیە خوا بەسەر زەبادا سەرکەوتنت پێببەخشێت و تۆڵەی خۆت بستێنیتەوە و دوژمنەکەت بکوژیت.

عەمرۆ، ئەوەی قەسیر داوای کردبوو، پێیدا و کاروانەکەی بەجۆرەکانی قوماش و دیارییەکان ئامادە کرد. قەسیر هەمووی بردە لای زەبا و نیشانیدا. زەبا سەریسوڕما و ڕەزامەندی خۆی نیشاندا. زیاتر باوەڕی بەقەسیر کرد و کاروانێکی گەورەتری لەجاری یەکەم خستە بەردەست. قەسیر بەڕیکەوت تا گەیشتە عێراق. چاوی بەعەمرۆ کوڕی عودی کەوت . ئەو شتانەی بار کرد کەدەیزانی زەبا پەسەندی دەکات. لەهیچ هەوڵێك درێغی نەکرد وهەرچی کالاّی باش بوو، لەگەڵ خۆی بردی.

بۆ جاری سێیەم گەڕایەوە بۆ عێراق و عەمرۆ کوڕی عودەی لەبەسەرهاتەکان ئاگادار کردەوە. وتی: هاوەڵان و سەربازە باوەڕپێکراوەکانی خۆت و جەواڵەکان ئامادە بکە.

کوڕی کەلبی دەڵێت: قەسیر یەکەم کەس بوو جەواڵی دروست کرد.

وتی: لەسەر هەر وشترێك دوو پیاو بکەرە ناو دوو جەواڵ. گرێی جەواڵەکان لەناوەوە بێت و کاتێك دەڕۆنە ناو شارەکەی زەبا، تۆ دەخەمە بەردەم ڕێگەی تونێلەکەی ئەو. پیاوەکان لەجەواڵەکان بێنەدەر و هێرش بکەنە سەر خەڵکانی شار. هەرکەس ڕووبەڕوویان بوویەوە، بیکوژن وئەگەر زەبا مەبەستی ئەوەی کرد بڕواتە ناو تونێلەکە، بتوانیت بیکوژیت.

عەمرۆ فەرمانەکانی قەسیری ئەنجامدا. پیاوەکانی لەناو جەواڵەکان بار کرد و وشترەکانی بەرە شارەکەی زەبا ڕەوانە کرد.باری وشترەکان پیاوە شەڕکەرەکان و شمشێر بوو. کاتێك لەشارەکە نزیك کەوتنەوە، قەسیر لەپێشەوە ڕۆشت و مژدەی پێدا کەجل و بەرگ و دیاری زۆری هێناوە. داوای لێکرد تابێت و ڕیزی وشترەکان و بارەکانیان ببینێت.

کوڕی کەلبی دەڵێت: قەسیر ڕۆژانە بۆسەی دادەنا وشەوانە ڕێگەی دەبڕی. یەکەم کەس بوو لەڕۆژدا بۆسەی نایەوە و لەشەودا ڕێگەی بڕی.

کاتێك زەبا هات، وشترەکانی بینی کە لەقورسی بارەکان قاچیان لەزەوی دەچەقی، بەقەسیری وت: بۆ وشترەکان بەخێرایی ڕێگە دەبڕن، مەگەر بارەکەیان بەرد یا ئاسنە؟

وشترەکان ڕۆشتنە ناو شارەکە و کاتێك دوایین وشتر لەدەروازە تێپەڕی، دەرگاوانەکان کەبێزار و بێ تاقەت ببوون، سیخێکیان کرد بەجەواڵی وشترەکەدا. سیخەکە لەسمتی پیاوێك چەقی و بایەکی لێ بەر بوو، دەرگاوان وتی: ((بشتا بسقا)) ئەمە لەزمانی نبتی یانی لەناو جەواڵەکاندا شەڕ هەیە. ئەم وتەیە بوو بەپەند.

کاتێك وشترەکان گەشتنە ناوەڕاستی شار، کەوتنە سەرچۆك. قەسیر عەمرۆی بۆ لای دەرگای تونێلەکە برد. شوێنەکەی نیشاندا. پیاوەکان لەجەواڵەکان هاتنەدەر و هێرشیان کردە سەر خەڵکی شارەکە. شمشێریان خستە ناویان. عەمرۆ کوڕی عەودەی لەبەر دەرگای تونێلەکە وەستا بوو. زەبا بەهەڵاتن هات تا بڕواتە ناو تونێلەکە. عەمرۆی بینی و لەرووی ئەو نیگارانەی نیگارکێش کێشابووی، ئەوی ناسییەوە. ئەنگوستیلەکەی خۆی مژی کەژەهری تێدا بوو، وتی: بەدەستی خۆم نەك بەدەستی عەمرۆ. ئەم وتەیە بوو بەپەند. عەمرۆ هاتە پێش و بەشمشێر لێیدا و کوشتی. تالأنی لەشارەکە کۆکردەوە و بۆ عێراق گەڕایەوە.

دوای جەزیمە، پاشایەتی کەوتە دەستی خوشکەزاکەی عەمرۆ کوڕی عودی. عەمرۆ یەکەم کەس بوو حیرەی کردە شوێنی نیشتەجێ بوونی پاشاکانی عەرەب. یەکەم کەس لەپاشاکانی عەرەبی عێراق بوو خەڵکانی حیرە لەکتێبەکانی خۆیان بەگەورەیی ناوی دەبەن. رەچەڵەکی پاشاکانی منداڵەکانی نەسر بۆ ئەو دەگەڕێتەوە.

عەمرۆ کوڕی عودەی تا تەمەنی سەد و بیست ساڵی پاشایەتی کرد. لەم ڕۆژگارە درێژەدا پاشایەکی سەربەخۆ و خۆویست بوو. چەندین شەڕی کرد و تالأنییەکانی کۆکردەوە. کەسان لەدەروی کۆدەبوونەوە، بەلأم کاری بەپاشای تیرەکان نەبوو. ئەوانیش بەهەمان شێوە گرنگیان بەعەمرۆ کوڕی عودەی نەدەدا تا ئەو کاتەی ئەردەشێر کوڕی بابەك لەگەڵ فارسەکان دەرکەوت.

ئاماژەمان بەم گێڕانەوەیە لەجەزیمە و عەمرۆ کوڕی عودەیدا لەبەر ئەوەی

پێشتر سەبارەت بەپاشاکانی یەمەن قسەمان کرد و وتمان پاشایەتی ئەوان نیزامی نەبوو و هەرکەس سالاری پێبڕا تەنیا بۆ ویلایەتەکەی خۆی بوو نەزیاتر. ئەگەر کەسێك لەناو ئەوان دەرکەوت و سنورەکانی خۆی بەزاند و لەویلایەتەکەی خۆی دوورکەوتەوە، لەبەر ئەوە نەبووە کەخۆی و باوکانی پاشایەتییەکەی سەقامگیریان بووبێت بەڵکو وەك دەستەیەك چەتەی سەرگەردان بوون کە بەناکاوگیری هێرشیان دەکرد سەر خەڵکانی ناوچەیەك و کاتێك شوێنیان دەکەوتن شوێنێکی دیاریکراویان نەبوو. بارودۆخی پاشاکانی یەمەن بەمشێوە بوو. هەندێ کات یەکێکیان سنووری ویلایەتەکەی خۆی دەبەزاند و تالانی کۆدەکردەوە و چوونکە ترسی تۆڵە و شوێنکەوتنی لەسەردا بوو، بۆ شوێنەکەی خۆی دەگەڕایەوە. هیچکەس جگە لەخەڵکی ویلایەتەکەی ملچکەی فەرمانەکانی نەبوو، خەراجی نەدەدا تا لەرۆژگاری عەمرۆ کوڕی عودەی خوشکەزای جەزیمە کەئاماژەمان بەبەسەرهاتەکەیدا، خۆی و منداڵەکانی وەك وتمان لەناوچەکانی عێراق و سارای حیجازی عەرەب لەلایەن پاشاکانی ئێرانەوە، پاشایەتیان دەکرد و کاروباری عەرەبەکانی سنوری خۆیان سامان دەدا تا ئەو کاتەی پەرویز کوڕی خوسرەو، نەعمان کوڕی مونزەری کوشت و پاشاکانی فارس، پاشایەتی ئەوانیان بەکەسانی دیکە سپارد. ئەم گێڕانەوەمان سەبارەت بەجەزیمە و عەمرۆ کوڕی عودەی بۆیە باس کرد- چوونکە دەمانەوێت مێژوو بەپێی ڕەوڕەوی مێژووی پاشا فارسەکان باس بکەین و بۆ ڕاستی داستانەکان سەبارەت بەوان بەڵگە بێنینەوە. کاری بنەماڵەی نەسر کوڕی ڕەبیعە و لێپرسراوانی دیکەی فارسی لەسنورەکانی سارای عێراق لای خەڵکی حیرە روون و ئاشکرایە و لەکەنیسەکان و کتێبەکانیان باسی لێوەکراوە.

هوشامی کەلبی دەڵێت: من مێژووی عەرەب و نەوەکانی بنەماڵەی نەسر کوڕی ڕەبیعە و ماوەی تەمەنی ئەوان و مێژووی پاشایەتی ئەوانم لەناو کەنیسەکانی حیرە دەرهێناوە کەلێپرسراو و نوێنەری پاشا فارسەکان بوون. پاشایەتی ئەم بنەماڵە و کارەکانیان لەوێدا تۆمار کراوە.

بەلاّم کوڕی ئیسحاق دەڵێت: ڕەبیعە کوڕی نەسر لەخمی خەوێکی بینی کەدوای

ئامادەدان بەزاڵبوونی حەبەشە بەسەر یەمەن، خەوەکەی لەگەڵ لێکدانەوەی شەق و سەتیح باس دەکەین و کاتێك رەبیعە کوڕی نەسر لەپرسیاری سەق و سەتیح تەواو بوو، ئەم ئەندێشەی لای دروست بوو پێشگۆیی ئەوان سەبارەت بەحەبەشە بەناچاری روودەدات لەبەر ئەمە بۆ منالەکان و بنەماڵەکەی خۆی کەرەستە پێویستەکانی سەفەر بۆ عێراقی ئامادە و نامەی بۆ شاپووری خورزاد نوسی وئەوانی لەحیرە نیشتەجێ کرد.

نەعمان کوڕی مونزەر پاشای حیرە لەپاشماوەکانی منالەکاتی نەسر بوو. ئەو نەعمان کوڕی مونزەر کوڕی نەعمان کوڕی مونزەر کوڕی عەمرۆ کوڕی عودەی کوڕی رەبیعە کوڕی نەسرە.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: ئێستا سەبارەت بەتسم و جەدیس قسە دەکەین کەداستانی ئەوان لەرۆژگاری پاشای تیرەکان روویدا.

لەناوچوونی جەدیس لەسەر دەستی حسان کوڕی توبەع بوو. پێشتر سەبارەت بەتەبعانی حەمیر لەرۆژگاری پاشایەتی پارسەکان، قسەمان کردووە.

لەکوڕی ئیسحاق و دەستەیەك لەشارەزایەتی مێژووی عەرەب دەگێڕنەوە: تسم و جەدیس لەدانیشتووانی یەمامە بوون ولەو رۆژگارەدا لەهەموو ناوچەیەك سەرسوزتر و ئاوەدانتر بوو. لەهەموو جۆرەکان لەوێ دەبینرا هاورێ لەگەڵ چەندین باخی سەرسوڕهێنەر و کۆشکی بەرز. پاشایەکی زۆردار و ستەمگەر لەتسم پاشایەتی دەکردن. هیچ شتێك نەدەبووە رێگر لەهەوا و هەوەسەکانی. ناوی عەملیق بوو. ئەم پاشایە خەڵکی جدیسی لاواز و ریسوا کردبوو. زیانێکی زۆری لێدابوون. یەکێك لەستەمەکانی ئەوەی فەرمانیدا بوو هیچ کچێك لەخەڵکانی جدیس نەبنە ماڵی هاوسەرەکەی مەگەر ئەوەی شەوی یەکەم بڕواتە لای پاشا تا پەردەی کچێنی ئەو هەڵبگرێت.

یەکێك لەپیاوانی جەدیس بەناوی ئەسوەد کوڕی غەفار بەسەرکردەکانی خەڵکەکەی خۆی وت: ئەم ئەنگ و ریسواییە دەبینن کە بۆسەگ ڕەوا نییە. فەرمانەکانی من جێبەجێ بکەن کەدەبێتە هۆکاری شەرەف بۆ رۆژگاران و لەناو بردنی ئەنگ و ریسوایی.

وتیان: فەرمانی تۆ چییە؟

وتی: من بۆ ئەم پاشایە و کەسەکانی لەخەڵکی تسم، خواردنێك ئامادە دەکەم و کاتێك هاتن، بەشمشێر هێرشیان دەکەینە سەر. من پاشا دەکوژم و هەرکام لەئێوە کەسێك لەوان بکوژێت.

جەدیسیەکان بەبۆچوون و قسەکانی رازی بوون. ئەسوەد خواردنێکی ئامادە کرد و بەخەڵکەکەی خۆی وت تا شمشێرەکان لەکالآن دەربێنن و لەریخەکاندا بیشارنەوە. بەوانی وت: کاتێك ئەوان بەزێڕەکانیانەوە هاتن، شمشێرەکانتان هەڵبگرن و پێش ئەوەی دانیشن، هێرشیان بکەنەسەر و گەورەکانیان بکوژن چوونکە کاتێك ئەوانتان کوشت کەسانی دیکە هیچ نابن.

شا هات و کوژرا. گەورەکانی خەڵکەکەیشی کوژران. هێرشیان کردە سەر کەسانی لاواز و ئەوانیشیان کوشتار کرد.

یەکێك لەخەڵکانی تسم بەناوی رەبیاح کوڕی موڕە هەڵات و ڕۆشتە لای حسان کوڕی توبەع. داوای هاوکاری لێکرد. حسان لەگەڵ خەڵکانی حەمیر بەرێکەوت و کاتێك گەیشتە سێ مەنزڵی یەمامە، رەبیاح بەحسانی وت: زیان لەتۆ بەدوور بێت، خوشکێکم هەیە وهاوسەرەکەی لەخەڵکی جەدیسە، کەس لەجیهان دووربینتر لەو نییە. سوار لەدووری سێ شەو رێگاوە دەبینێت و دەترسم خەڵکەکە لەهاتنی تۆ ئاگادار بکاتەوە. فەرمان بەسوپاییەکانی خۆت بدە تا هەرکام دارێك لەزەوی هەڵکەنن و لەبەر دەم خۆیانی بگرن و بەرێگادا بڕۆن. حسان ئەو فەرمانەی دەرکرد. رێگەیان بڕی و یەمامە سەیری کرد و ئەوانی بینی. بەخەڵکی جەدیسی وت: حەمیر کەوتۆتە رێ.

وتیان: چی دەبینیت؟

وتی: پیاوێك دەبینم لەناو دارێك کەگاز لەئێسقانێك دەگرێت یا پێڵاوەکەی دەدورێتەوە.

خەڵك باوەڕیان بەقسەکەی نەکرد. بەلآم قسەکانی راست بوو. حسان بەرەبەیان هێرشی کردە سەریان و لەناوی بردن. سەرزەمینی ئەوانی وێران و کۆشك و قەلآکانی خاپوور کرد. لەو رۆژگارەدا ناوچەی یەمامەیان بەجۆ و گوند ناو دەبرد.

یەمامە کچی مورەیان بردە لای حسان وفەرمانیدا چاوەکانی دەربێنن. دەماری ڕەشی تیا بوو. پێی وت: ئەم دەمارە ڕەشانە چییە؟

وتی: هی بەردێکی ڕەشە بەناوی ئەسمەد. بەوە سورمەی چاوەکانم دەکێشا. حسان فەرمانیدا تا ناوچەی جۆ بەیەمامە ناو ببەن.

حسان کوڕی توبەع کەجدیسی لەناو برد، زومعاهێر بوو و کوڕی توبەع تەبان ئەسعەد باوکی کەرب کوڕی مەلیکەرب و باوکی توبەع کوڕی حەسان بوو کە بەگومانی دانیشتووانی یەمەن بەرەو مەککە ڕۆشت و پەردەی بەکەعبەدا هەڵواسی و دۆڵی مەتابیخ بۆیە بەم ناوە ناونرا چوونکە مەتبەخکانی (چێشتخانەکان) لەوێ دروست کرد و خواردنی بەخەڵکاندا. ئەجیاد بۆیە بەو ناوە ناونرا چوونکە ئەسپەکان لەوێ بوو و ئەجیاد بەمانای ئەسپەکانە.

دەڵێن: ئەو هاتە یەسرب و لەو شوێنەی ئێستا بەماڵی شا ناوی دەبەن، دابەزی. ژمارەیەکی زۆر لەجوولەکەکانی کوشت لەبەر ئەوەی خەڵکانی ئەوس و خەزرەج سکالآیان لەوان کردبوو کەرێزی دراوسێیەتی ناگرن. هەروەها کوڕەکەی خۆی حسانی بەرەو سند نارد و شیمری زوئەلجەناحی بۆ سەمەرقەند و فەرمانیدا بۆ گەیشتن بەچین کێبڕکی بکەن. شیمر لای سەمەرقەند تێپەڕی و مایەوە تا دەستی بەسەر شارەکەدا گرت. پیاوانی کوشت و ئەسیر و تالآنی زۆری کۆکردەوە و ڕێگەی چینی گرتەبەر. لەوێ بەحسان گەیشت و دەستەیەك لەخەڵکی یەمەن گومان دەکەن ئەوان لەچین مردن و دەستەیەکیان لەگەڵ تالآنییەکان بۆ لای توبەع گەڕانەوە.

یەکێك لەڕووداوەکانی سەردەمی پاشای تیرەکان بەسەرهاتی ئەو گەنجانەیە کەپەنایان بۆ ئەشکەوت برد.

## یارانی ئەشکەوت

یارانی ئەشکەوت ئەو گەنجانەن اوەڕیان بەپەروەردگار بوو بەهەمان شێوە کەخواوەند وەسفی ئەوانی لەقورئاندا باس کردووە و بەپێغەمبەری فەرموو:

((ام حسبت ان اصحاب الکهف و الرقیم کانوا من آیاتنا عجبا.

واتاکەی: مەگەر گومانت کردووە لەنیشانەکانی ئێمە دانیشتووانی ئەشکەوت ونووسراوە سەرسوڕهێنەرەکان بوون.))

رقیم نووسراوێك بوو نەتەوەی ئەصحابی کەهف لەلەوحێکدا نووسیان و داستانی ئەوانیان گێڕایەوەو لەسەر دەرگای ئەشکەوتەکە هەڵیانواسی یا لەسەر ئەو کێوەی پەنایان بۆ بردبوو، هەڵیانکەند یا لەسەر لەوحێك نووسیان و خستیانە ناو سنوقێکەوە و لای گەنجە پەنابەرەکان بۆ ئەشکەوت دایاننا.

یارانی ئەشکەوت، وەك کوڕی عەباس وتوویەتی، حەوت کەس بوون و هەشتەمینیان سەگەکەیان بوو.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە، وتی خواوەند فەرموویەتی: جگە لەدەستەیەك کەس ژمارەی ئەوان نازانێت. و من لەو دەستە کەمەم، حەوت کەس بوون.

دەڵێت: ناوی ئەو کەسەیان خواردنی دەکڕی، یەمنیخ بوو و خواوەند سەبارەت بەو فەرموویەتی: کاتێك لەخەوی درێژ هەستان، وتیان: ((فابعثوا احدکم بورقکم هذه الی المدینة فلینظر ایها ازکی طعاما فلیأتکم برزق منه.

واتاکەی: یەکێکتان بەم دراوانە بۆ شار بنێرن تا بزانێت خواردنی کامیان پاکترە و خواردنێك لەویَ بۆ ئێوە بێنێت.))

بەڵام لەگێڕانەوەی کوڕی ئیسحاق ناوی ئەو بەیەملیخا هاتووە.

هەروەها کوڕی ئیسحاق دەڵێت: ژمارەی گەنجەکان هەشت کەس و بەپێی وتەی ئەو سەگەکە نۆیەم کەسیان بوو. سەبارەت بەناوی گەنجەکان دەڵێت: گەورەکەیان کە بەنوێنەرایەتی ئەوان لەگەڵ پاشا قسەی دەکرد ناوی مەکسملینایە و ئەویتریان مەحسملینا و سێیەمی یەملیخا و چوارەمی مرتوس و پێنجەمی کسوتولش و

شەشەمی بیرونس و حەوتەمی رسمونس و هەشتەمی بتونس و نۆیەمی قالووس بوو. هەموویان گەنج بوون.

لەموجاهید دەگێڕنەوە: دەستەیەکیان بەئەندازەیەك گەنج بوون کەدانەکانیان وەك زیو سپی بوو. لە رۆمییە بتپەرەستەکان بوون. خوا بۆ ئیسلام رێنوێنی کردن و بەوتەی دەستەیەك: لەزانا کۆنەکانی شەریعەتی عیسای پێغەمبەر(د.خ) بوون.

لەکوڕی قەیسی مەلائی دەگێڕنەوە: ئەصحابی کەهف و رەقیم لەسەر دینی عیسا بوون. شوێنکەوتەی ئیسلام و پاشاکەیان کافر بوو.

دەستەیەك گومانیان کردووە بەسەرهاتی ئەوان و پەنابردنیان بۆ ئەشکەوت پێش دەرکەوتنی عیسا بووە. مەسیح داستانی ئەوانی بۆ خەڵکەکەی باس کرد و وتی خواوەند دوای بەرزبوونەوی مەسیح لەنێوان ئەو و محەممەد ئەوانی لەخەو هەستاند.

بەڵام زاناکانی ئیسلام دەڵێن داستانی ئەوان دوای مەسیحە. هیچ کام لەزاناکانی کۆنی مێژوو ناکۆن نین لەسەر ئەوەی داستانەکەی ئەوان لەسەردەمی پاشایەتی تیرەکان روویداوە.

لەو رۆژگارەدا پاشایەکیان بوو بەناوی دەقینووس. بتی دەپەرەستی و ئاگادار بوویەوە کەگەنجەکان دینێکی جیاواز لەدینەکەی ئەویان هەڵبژاردووە. بەدوایاندا گەڕا بەڵام بۆ پاراستنی دینەکەی خۆیان هەڵاتن تا گەیشتنە کێوێك و بەپێی گێڕانەوەی موجاهید ناوی کێوەکە نیخلوسە.

وەهب کوڕی مونبە سەبارەت بەهۆکاری باوەڕی گەنجەکان و دژایەتی کردنی خەڵکەکەی خۆیان دەڵێت: یەکێك لەحەوارییەکانی عیسا کوڕی مریەم ڕۆشتە شاری ئەصحابی کەهف. ویستی بڕواتە ناو شارەکە، وتیان: لەشارەکەدا بتێکی لێیە و هەر کەس بڕواتە ناو شارەکە دەبێت کوڕنوشی بۆ ببات. ئەو نەڕۆشتە ناو شارەکە و لەنزیك شارەکە ڕۆشتە ناو گەرماوێك. لەوێ کاری دەکرد. کاری بۆ خاوەنی گەرماوەکە دەکرد. بەرەکەتی حەمامەکە زیادی کرد وڕۆژی خاوەنەکەی فراوان بوو. دەستەیەك لەگەنجەکانی شار شەیدای حەوارییەکە بوون کە لەهەواڵەکانی ئاسمان و زەوی ئاگاداری دەکردنەوە. سەرئەنجام باوەڕیان پێی هێنا و قسەکانی ئەویان

پشتراستکردەوە. حەواری لەگەڵ خاوەنی گەرماوەکە پەیمانی بەستبوو بۆ ئەوەی شەوانە ئازاد بێت ورێگە لەنوێژ خوێندنی ئەو نەگرێت. بەمشێوە بوو تا کوڕی پاشا لەگەڵ ژنێك هات. حەواری سەرکۆنەی کرد و وتی: تۆ کوڕی پاشاییت و لەگەڵ ئەم ژنە دڕۆیتە ناو حەمام. کوڕی پاشا شەرمی کرد و گەڕایەوە. جارێکی دیکە هات و ڕۆشتە ناو گەرماوەکە. ژنەکەیش هاوڕێیەتی دەکرد. حەواری قسەکانی جاری یەکەمی دووبارە کردەوە و بەتوندی سەرکۆنەی کرد. بەڵام کوڕی پاشا گرنگی پێنەدا و ڕۆشتە ناو گەرماوەکە. هەردووکیان لەناو گەرماوەکەدا مردن. شا ئاگادار بوویەوە و پێیان وت فلأنەکەس کوڕەکەتی کوشتووە. پاشا بەدوای حەواریدا گەڕا کەهەڵاتبوو. ئەوی نەدۆزییەوە. پرسیاری هاوەڵأنی ئەوی کرد و ناوی گەنجەکانیان پێوت. بەدوای یەکێکیاندا گەڕا. گەنجەکان لەشار ڕۆشتنەدەر وچاویان بەیەکێك لەهاوڕێکانی خۆیان کەوت کە لەکێڵگەکەی خۆیدا و هاودینی ئەوان بوو. پێیان وت : بەدوای ئێمەدا دەگەڕێن. ئەویش لەگەڵ ئەوان ڕۆشت وسەگەکەی خۆی برد. شەو پەنایان بۆ ئەشکەوتێك برد و وتیان: ئەمشەو لێرە دەمێنینەوە تا بەیانی بزانین چی ڕوودەدات.

خەویان لێکەوت. پاشا و داروودەستەکەی بەدوایاندا دەگەڕان. ئاگادار بوونەوە کەڕۆشتونەتە ناو ئەشکەوتەکە. کاتێك یەکیان دەیویست بڕواتە ناو ئەشکەوتەکە، دەترسا. هیچ کام نەیتوانی بڕواتە ناو ئەشکەوتەکە. یەکیان بەپاشای وت: ئەگەر ئەوانت بەردەست کەوێت، ئایا دەیانکوژیت؟

پاشا وتی: بەڵێ.

وتی: دەروازەی ئەشکەوتەکە بگرە با لەبرسیەتی و تینویەتی بمرن.

پاشا ئەو کارەی کرد. لەو کاتەوەی دەرگای ئەشکەوتەکەیان بەست، ڕۆژگارەکان تێپەڕی. شوانێك لەنزیك ئەشکەوتەکە گرفتاری لێزمەی باران بوو و وتی: چی دەبوو ئەگەر دەرگای ئەشکەوتەکەم دەکردەوە و مەڕەکانی خۆم دەبردە ناو ئەشکەوتەکە. هەوڵیدا و دەلاقەیەکی کردەوە و ڕۆشتە ناو. بۆ بەرەبەیان خواوەند دووبارە ڕۆحی بەخەوتوەکان بەخشی. یەکیان بەپارەوە ڕەوانە کرد تا خواردنیان بۆبکڕێت. کاتێك گەیشتە دەروازەی شارەکە، شتی سەیری بیینی.

سەرئەنجام ڕۆشتە لای پیاوێك و وتی: ئەم درەمانە بگرە و خواردنم پێبدە.

پیاو وتی: ئەم درەمانەت لەکوێوە هێناوە؟

وتی: من و هاوەڵانم دوێ شەو خەوتین و ئەم بەیانییە منیان ڕەوانە کرد تا شتیان بۆ بکڕم.

وتی: ئەم درەمانە لەڕۆژگاری فلان پاشا بووە، چۆن بەدەستی تۆ گەیشتووە؟

ئەوی بردە لای پاشا کەپیاوێکی خۆپارێز بوو، پرسی: ئەم درەمانەت لەکوێوە هێناوە؟

وتی: دوێنێکە من و هاوڕێکانم ڕۆشتینەدەر و شەومان لەفلانە ئەشکەوت بەسەر برد. ئەمڕۆ بەمنیان وت خواردنیان بۆ بکڕم.

پاشا وتی: هاوەڵانی تۆ لەکوێن؟

وتی: لەئەشکەوتەکە.

دەڵێت: لەگەڵ ئەودا ڕۆشتن تا گەیشتنە دەرگای ئەشکەوتەکە. وتی: ڕێگە بدەن پێش ئێوە بڕۆمە لای یارانم.

ئەویان بینی کاتێك لەوان نزیك کەوتەوە، خەوی لێکەوت. ئەوانی دیکەیش خەویان لێکەوت. هەرکەس دەیوست بڕواتە ناو ئەشکەوتەکە، ترس بەسەریدا زاڵدەبوو. نەیانتوانی لەوان نزیك بکەونەوە. بیناغەی کەنیسەیەکیان داڕشت و تیایادا خواپەرەستیان دەکرد.

لەعێکرمە دەگێڕنەوە: ئەصحابی کەهف منداڵەکانی پاشای ڕۆم بوون. خواوەند باوەڕی پێبەخشین. بەدینەکەی خۆیان دڵخۆش و خۆیان لەخەڵکەکەیان دوور دەخستەوە. ڕۆشتنە ناو ئەشکەوت و خواوەند ئەوانی خەواند. ڕۆژگارێکی درێژ بەو شێوە مانەوە تا ئەو کاتەی خەڵکەکەیان لەناوچوون و خەڵکی موسوڵمان جێگەی ئەوانی گرتەوە کەپاشاکەیان باوەڕدار و ئەوان سەبارەت بەڕۆح و جەستە جیاوازیان بوو. یەکیان دەیوت: ڕۆح و جەستە هەردووکیان پێکەوە زیندووو دەکرێنەوە. یەکیتر دەیوت: ڕۆح زیندووو دەکرێتەوە و زەوی جەستە دەخوات و نامێنێتەوە. پاشا لەجیاوازی بۆچوونەکانی ئەوان نارازی بوو. جل و بەرگی لەبەر کرد و لەسەر خۆڵەمێش دانیشت، لەخوا پاڕایەوە وتی: پەروەردگارا، جیاوازی

ئەوان دەبینیت، کەسێك رەوانە بکە تا بۆیان روون بکاتەوە. خواوەند ئەسحابی کەهفی زیندووو کردەوە. یەکیان رەوانە کرد تا خواردنیان بۆ بکڕێت. ئەو ڕۆشتە بازار و خەڵکانی نەناسیەوە بەلاّم رێگەکەکانی دەزانی. خەڵکی شارەکەی بەباوەڕدار بینی. بەنهێنی ڕۆشت تا گەیشتە لای پیاوێك و ویستی خواردنی لێ بکرێت. کاتێك پیاوەکە درەمەکانی بینی، سەرپیسوڕما و وتی: گومانم کرد بەچکە وشترە.

گەنجە وتی: مەگەر فلاّن کەس پاشای ئێوە نییە؟

وتی: نا، پاشای ئێمە فلاّن کەسە. گفتوگۆیان کرد تا ئەوی بردە لای پاشا. پاشا پرسیاری کرد و گەنجەکە داستانی خۆی و یارانی گێڕایەوە. شا کەسێکی رەوانە کرد و خەڵکانیان کۆکردەوە، وتی: سەبارەت بەرۆح و جەستە بۆچوونەکانتان جیاوازە. خواوەند نیشانەیەکی بۆ رەوانە کردوون. ئەمە پیاوێك لەنەتەوەی فلاّن. یانی پاشای رابردوو.

گەنج وتی: من بۆ لای هاوەلاّنم ببەن.

پاشا سوار و خەڵکان لەگەڵ ئەو سوار بوون. کاتێك گەیشتنە دەرگای ئەشکەوتەکە، گەنجەکە وتی: رێگە بدەن بڕۆمە لای یارانی خۆم. کاتێك ئەوانی بینی، خواوەند دووبارە ئەوی خەواندەوە و هاوەلاّنیشی خەویان لێکەوت. کاتێك نەگەڕایەوە، خەڵکان ڕۆشتنە ناو ئەشکەوتەکە و پەیکەرە بێ گیانەکانیان بینی. پاشا وتی: ئەمە نیشانەیەکە خواوەند بۆ ئێوەی رەوانە کردووە.

قتادە دەڵێت: کوڕی عەباس لەگەڵ حەبیب کوڕی مەسلەمە بۆ غەزا ڕۆشتبوون، لای ئەشکەوتەکە تێپەڕین. ئێسقانیان بینی و یەکیان وتی ئەمە ئێسقانی ئەسحابی کەهفە. کوڕی عەباس وتی: سێسەد ساڵ پێش ئێسك و پروسکی ئەوان لەناوچوو.

ئەبوجەعفەر دەڵێت:

## یەکێك لە پێغەمبەرەکان یونس کوڕی مەتا بوو

وەك وتوویانە، یونس یەکێك لەدانیشتووانی گوندێك لەگوندەکانی موسڵ کەبەنەینەوا ناویان دەبرد. خەڵکەکەی بتپەرەست بوون. خواوەند یونسی رەوانە کرد تا رێگەی پەرەستینی بتەکانیان لێبگرێت و بۆ تۆبە ناچاریان بکات و تەنیا خواوەند بپەرەستن.

داستانی یونس و خەڵکەکەی بەمشێوەیە کەخواوەند لەقورئاندا ئاماژەی پێداوە و دەفەرمێت: ((فلولا کانت آمنت فنفعها ایمانها الاقوم یونس لما آمنوا کشفنا عنهم عذاب الخزی فی الحیوة الدنیا و متعنهام الی حین.

واتاکەی: هیچ گوندێك نەبوو ((دوای سزا)) باوەڕ بێنێت و باوەڕهێنانیان سوودیان پێببەخشیچت مەگەر خەڵکەکەی یونس کەباوەڕیان هێنا و لەژیانی دنیا ئازابی ریسواکەرمان لەسەر ئەوان هەڵگرت و تاماوەیەك بەختەوەرمان کرد.))

هەروەها دەفەرمێت: ((وذالنون اذ ذهب مغاضبا فظن ان لن نقدر علیه فنادی فی الظلمات ان لا اله الا انت سبحانك انی کنت من الظالمین، فاستجبناله و نجیناه من الغم و کذلك ننجی المؤمنین.

واتاکەی: زوئەلنونت لەبیر بێت ئەوکاتەی تورە ڕۆشت و گومانی کرد کارمان پێی نابێت. کەواتە، لەتاریکییەکانەوە هاواری کرد کەخوایەك جگە لەتۆ نییە، بەپاکی ناوی تۆ دەهێنمە سەرزمان چوونکە من لەستەمگەران بووم. بەدۆعاکەی رازی بووم و لەتەنگانە رزگارمان کرد. باوەڕدارانیش بەمشێوەیە رزگار دەکەین.))

زاناکانی کۆنی ئۆمەتی محەممەد، پێغەمبەری(د.خ) ئێمە، سەبارەت بەڕۆشتنی یونس بەتورەیی کەگومانی کردبوو خواوەند کاروبارەکان لەو دژوار ناکات وئەوەی چ کاتێك بوو، بۆچوونەکانیان جیاوازە. دەستەیەك وتوویانە ئەم رووداوە پێش بانێگشتی خەڵکەکەی بۆ خواپەرەستی و پێغەمبەرایەتی ئەو بوو چوونکە کاتێك ئازابی خواوەند لەخەڵکەکەی نزیك کەوتەوە، فەرمانی پێدرا بڕواتە لای ئەوان و

لەتوندی ئازابەکە ئاگاداریان بکاتەوە بۆ ئەوەی تۆبە بکەن. داوای مۆڵەتی لێکرد و خواوەند مۆڵەتی پێنەدا. یونس لەپەلە کردنی خواوەند تورە بوو.

ئاماژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەشەهر کوڕی حەوەشب دەگێڕنەوە: جبرەئیل ڕۆشتە لای یونس و وتی: بۆ لای خەڵکی نەینەوا بڕۆ و ئاگاداریان بکەرەوە کەئازابی خوایی نزیکە. یونس وتی: مۆڵەت بدەن تا بەدوایی چوارپێیەکەدا بگەڕێم.

جبرەئیل وتی: کارەکە پەلەتر لەوەیە.

یونس وتی: پێڵاوێك لەپێ بکەم.

جبرەئیل وتی: خێراتر لەوەیش.،

یونس تووڕە بوو. بەرەو کەشتییەکە بەڕێکەوت و سواری بوو. کەشتی لەجووڵە کەوت. نەبۆ پێشەوە ڕۆشت نە بۆ دواوە. دەڵێت: تیروپشکیان هاویشت و بەناوی ئەو دەرهات. ماسی هات و کلکی رادەوەشاند. وەحی پێکرا: ئەی ماسی ئێمە یونسمان نەکردۆتە ڕۆژی تۆ، بەڵکو تۆمان کردۆتە پەناگە و نوێژگەی ئەو.

ماسی ئەوی قووتدا و لەوێ بردی تا لەئۆبلە تێپەڕی. دواتر ئەوی برد و لەدیجلە پەڕییەوە. دووبارە ئەوی برد تا گەیشتە نەینەوا.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: پێغەمبەرایەتی یونس دوای ئەوە بوو کە لەسکی ماسیەکە هاتەدەر.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە: ڕووداوەکە پێش ئەوە بوو چونکە پێشنیاری خواپەرەستی بەخەڵکەکەی کرد و پەیامەکەی خواوەندی بەوان گەیاندبوو. مژدەی ئازابی لەکاتێکی دیاریکراودا پێدان. کاتێك تۆبەیان کرد و پەشیمان بوونەوە، لەوان جیابوویەوە و کاتێك ئازابی خوایی گەیشت و گەماڕۆی ئەوانیدا بەهەمان شێوە کەخواوەند دەفەرمێت، ئازابەکەی لەسەر ئەوان هەڵگرت، یونس لەتەندروستی خەڵکەکەی و نەمانی ئازابی خوایی کەبەڵێنی بەخەڵکەکەی دابوو،

تووڕە بوو و وتی: ئەو بەڵێنەی بەخەڵکەکەمدا، درۆ لەناو دەرهات. تووڕە پەروەدگاری بەجێهێشت و نەیویست بۆ لای خەڵکەکەی بگەڕێتەوە چوونکە درۆکەی ئەویان بینیبوو.

ئاماژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: خواوەند، یونسی وەك پێغەمبەری گوندەکەی هەڵبژارد. بەپێشنیارەکانی رازی نەبوون و باوەڕیان نەهێنا.
خواوەند وەحی بۆ رەوانە کرد کەفلآنە و فیسارە ئازاب رەوانە دەکەم. لەناو خەڵکەکەت بڕۆدەر. ئەو خەڵکەکەی خۆی ئاگادار کردەوە.
وتیان: چاودێری ئەو بکەن چوونکە ئەگەر لەناو ئیوە بڕواتەدەر، ئازابی خوایی دەگات.
کاتێك ئەو شەوەهات کەبڕیار بوو بەیانییەکەی ئازاب بەسەر خەڵکەکەی بباریێت، خەڵکەکەی شوێنی کەوتن و لەشارەکە هاتنەدەر. ڕۆشتنە سەر تەپۆڵکەیەك و چوارپێکان و منالەکانیان جیا کردەوە. لەخواوەند پاڕانەوە و داوای بەخشینیان کرد. یونس چاوەڕوانی هەواڵی گوندەکەی دەکرد. کەسێك لای ئەو تێپەڕی و پرسی: خەڵکی شارەکە چییان کرد؟
وتی: کاتێك پێغەمبەرەکەیان ڕۆشت و زانیان بەڵێنەکەی راستە، لەشارەکە هاتنەدەر و ڕۆشتنە سەر تەپۆڵکەیەك. منالەکانیان لەدایکیان جیاکردەوە و پاڕانەوە و تۆبەیان کرد. خواوەند بەتۆبەکەیان رازی بوو و ئازابەکەی گەڕاندەوە.
دەڵێت: یونس تووڕە بوو و وتی: سوێند بەخوا هیچ کات بۆ لای ئەوان ناگەڕێمەوە چوونکە درۆکەم ئاشکرا بوو، من بەڵێنی ئازابم پێدان و ئازابیان پێنگەیشت. تووڕە ملی رێگەی گرتەبەر و شەیتان بۆ چەند ساتێك ئەوی فریودا.
لەرەبیع دەگێڕنەوە: لەرۆژگاری عومەر کوڕی خەتاب، یەکێك لەحافزانی قورئان، سەبارەت بەیونس قسەی کرد و خەڵکەکی ئاگادار کردەوە بەلآم بەدرۆزنیان زانی. یونس هۆشداری پێدان کەئازابی خواییان پێدەگات. لەوان جیابوویەوە و کاتێك

خەڵك بینیان ئازابی خوایی گەمارۆی داون، لەماڵەکانی خۆیان هاتنەدەر و ڕۆشتنە سەر بەرزاییەك. پاڕانەوە و بەدڵ تۆبەو داویان لەپەروەردگار کرد ئازابیان لەسەر هەڵبگرێت و پێغەمبەرەکەیان بگەڕێنێتەوە. خواوەند ئازابی لەسەر ئەوان هەڵگرت.

تەنیا خەڵکەکەی یونس بوون، ئازاب گەمارۆی دان و دواتر ئازابیان لەسەر هەڵگیرا. کاتێك یونس ئەمەی بینی، تووڕە بوو و گومانی کرد خواوەند کاروبارەکان لەو دژوار ناکات. سوار کەشتی بوو، تۆفان هات و وتیان ئەمە لەبەر گوناحی یەکێك لەنەفەرەکانی کەشتیە.

یونس زانی کەگوناحکارە، وتی: ئەمە لەبەر گوناحەکەی منە، من بخەنە ناو دەریا. بەڵام ڕازی نەبوون، تیروپشکیان هاویشت و ناوی یونس وەك گوناحکار دەرچوو، وتی: پێم وتن ئەمە لەبەر گوناحەکەی منە. دووبارە نەیانویست ئەو فرێبدەنە ناو دەریا و جارێکی دیکە تیروپشکیان هاویشت. ئەم جارەیش بەناوی یونسەوە دەرچوو و وتی: پێم وتن ئەمە لەبەر گوناحی منە. دووبارە نەیانویست فرییبدەنە ناو دەریا تا بۆ سێیەم جار تیروپشکیان هاویشت و دوبارە ناوی یونس دەرچوو. کاتێك ئەمەی بینی، خۆی هەڵدایە ناو دەریا. ئەمە لەکاتی شەودا بوو. ماسی ئەوی قووتدا.

یونس کەهەستی بەگوناحەکەی خۆی کردبوو، لەتاریکیدا هاواری کرد: خوایەك جگە لەتۆ نییە، بەپاکی ناوی تۆ دێنمە سەرزمان چوونکە من لەستەمگەران بووم. پێشتر چاکەکار بوو، خواوەند سەبارەت بەو دەفەرمێت:

((فلولا ان کان من المسبحین للبث فی بطنه الی یوم یبعثون فنبذناه بالعراء و هو سقیم.

واتاکەی: ئەگەر یەکێك لەو کەسانە نەدەبوو کەبەپاکی ناوی خواوەندی دەهێنایە سەر زمان، لەناو سکی نەهەنگدا دەمایەوە تا ئەو ڕۆژی خەڵکان زیندووو دەکرێنەوە. ئەوی بۆ سارا برد و نەخۆش بوو.))

کاتێك گەیشتە کەنار دەریا، خواوەند دارێکی کەدووی بۆ رواند. وەك وتوویانە داری کەدوو شیری پێدەدا تا ئەوەی هێزی بۆ گەڕایەوە. ڕۆژێك ڕۆشتە لای دارەکە و بینی وشکی کردووە. خەمبار بوو و دەستی بەگریان کرد. سەرکۆنە کرا و پێی وترا: بۆ دارێك خەمبار بوویت و گریاییت بەڵام بۆ سەد هەزار کەس یا زیاتر خەمبار نەبوویت و مەبەستی ئەوەت کرد هەموویان لەناو ببەیت.

دواتر خواوەند ئەوی لەگومڕایی دوور خستەوە. یونس هاتەوە ریزی خواپەرەست

و خۆپاریزان. فەرمانی پێدا تا بۆ لای خەڵکەکەی بڕوات و ئاگاداریان بکاتەوە خواوەند بەتۆبەکەی ئەوان رازی بووە. بەرەو لای خەڵکەکەی بەرێکەوت. گەشتە شوانێك و سەبارەت بەخەڵکی یونس پرسیاری لێکردن. شوان وتی: چاکەکارن و چاوەڕوانی گەڕانەوەی پێغەمبەرەکەیان دەکەن.

یونس وتی: پێیان بڵێ من یونسم بینیوە.

وتی: ناتوانم بێ بەڵگە ئەم وتەیە بێنمە سەرزمان.

یونس بزنێکی لەناو بزنەکانی نیشاندا و وتی: ئەم بزنە شایەتی دەدات کەتۆ یونست بینیوە.

وتی: چیتر؟

وتی: ئەم شوێنە شایەتی دەدات کەتۆ یونست بینیوە.

وتی: چیتر.

وتی: ئەم دارە شایەتی دەدات کەتۆ یونست بینیوە.

شوان بۆ لای خەڵکەکەی گەڕایەوە و وتی یونسی بینیوە. ئەویان بەدرۆزن لەقەڵەمدا ومەبەستی ئەوەیان کرد ئازاری بدەن شوان وتی: پەلە مەکەن تا بەرەبەیان بگات. کاتێك بەرەبەیان داهات، ئەوانی بۆ ئەو شوێنە برد کەیونسی بینیبوو. داوای قسەی لێکرد. شوێنەکە، بەخەڵکەکەی وت کەشوان یونسی بینیوە و پرسیاری لەبزنەکە کرد و بزنیش قسەکانی پشت راست کردەوە. لەدارەکە پرسیاریان کرد و ئەویش شوانەکەی بەراستگۆ زانی. دوای ئەوەی یونس گەڕایەوە بۆ ناو خەڵکەکەی. خواوەند لەمبارەوە دەفەرمێت:

((و ارسلناه الى مأة الف او يزيدون فآمنو فمتعناهم الى حين.

واتاکەی: ئەومان بۆ لای سەد هەزارکەس یا زیاتر رەوانە کرد، باوەڕیان هێنا و تا ماوەیەك بەختەوەرمان کردن.))

لەکوڕی مەسعود دەگێڕنەوە و ئەم گێڕانەوەی لەبیت ئەلمال گێڕایەوە: یونس بەڵێنی ئازاری بەخەڵکەکەیدا و وتی: تا سێ رۆژی دیکە ئازاری خوایی دەگات. خەڵکەکەی، دایکەکانیان لەمناڵەکانیان جیا کردەوە و لەماڵەکانیان هاتنەدەر. لەخوا پاڕانەوە و تۆبەیان کرد. یونس چاوەڕوانی ئازابەکەی دەکرد. هیچی نەبینی و درۆکەی ئاشکرا بوو چوونکە بەڵێنەکەی نەهاتەدی. تورە ملی رێگەی گرتەبەر و

لەتاریکیەکاندا هاواری کرد، تاریکیەکان تاریکی ناو سکی ماسی و تاریکی شەو و تاریکی دەریا بوو.

لە باوکی هورەیرە دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: کاتێك خواوەند مەبەستی ئەوەی کرد یونس لەناو سکی ماسیدا زیندانی بکات، وەحی بۆ ماسی رەوانە کرد کەبیگرە بەڵام گۆشتی مەڕووشێنە و ئێسقانەکانی مەشکێنە. ماسی یونسی گرت و لەناو دەریا بۆجێگەکەی خۆی برد. کاتێك گەیشتە قووڵای دەریا، دەنگێکی بیست و بەخۆی وت: ئەمە چییە؟

خواوەند لەناو سکی ماسیدا وەحی بۆ نارد: ئەمە پاڕانەوەی بوونەوەرەکانی دەریایە. دەڵێت ئەویش لەناو سکی ماسیدا دەستی بەپاڕانەوە کرد. کاتێك فریشتەکان دەنگی پاڕانەوەی ئەویان بیست، وتیان: خواوەندا، دەنگێکی لاواز لەسەرزەمینێکی نامۆ دەبیستین.

خواوەند فەرمووی:

ئەوە بەندەی من یونسە کەنافەرمانی کرد و ئەوم لەدەریا لەناو سکی ماسیدا زیندانی کردووە.

وتیان: هەمان بەندە خۆپارێزە کەشەو و رۆژ، کارە چاکەکانی بۆ ئاسمان بەرز دەبوویەوە؟

خواوەند فەرمووی: بەڵێ.

فریشتەکان بۆی پاڕانەوە. خواوەند فەرمانی بەماسیدا و لەکەناری دەریا ئەوی لەسکی هێنایەدەر. بەهەمان شێوە کەخواوەند دەفەرمێت، نەخۆش بوو. نەخۆشییەکەی لەبەر ئەوە بوو ماسی ئەوی وەك منداڵێك فرێدابوو و گۆشت و ئێسقانەکانی نەرم ببوون.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: ماسی ئەوی برد و لەکەنار دەریا فرێیدا کەهاوشێوەی منداڵێك بوو بەڵامی هیچ لەو کەم نەببوویەوە.

لەباوکی هورەیرە دەگێڕنەوە: ماسی یونسی لەکەنارەکان فرێدا و خواوەند دارێکی کەدووی بۆ رواند کەبەیانیان شیری پێدەدا تا ئەوەی گیان و هێزی گرت.

## لەڕووداوەکانی سەردەمی پاشای تیرەکان خواوەند سێ نێردراوی رەوانە کرد

خواوەند لەقورئاندا ئاماژەی بەواندا و دەفەرمێت:

((و اضرب لهم مثلا اصحاب القرية اذجائها المرسلون اذ ارسلنا اليهم اثنين فعززنا بثالث فقالوا انا اليكم مرسلون.

واتاکەی: بۆ ئەوان نمونەی ئەو گوندە باس بکە، کاتێك نێردراوەکان ڕۆشتنە لایان. کاتێك دوو نێردراومان بۆ لای ئەوانە رەوانە کرد، بەسێیەم نێردراو بەهێزمان کردن و وتیان: ئێمە پەیام هێنەرانی ئێوەیین.))

رابردووان سەبارەت بەوان بۆچوونیان جیاوازە. دەستەیەکیان وتوویانە ئەو سێ کەسەی خواوەند لەم ئایەدا باسی کردوون و داستانی ئەوانی گێڕاوەتەوە، ئەو نێردراوانە بوون کە بۆ لای پاشاکانی رۆم رەوانە کران. ناوی پاشا ئەنتیخس و ئەو شارەی پاشا لەوێ نیشتەجێ بوو و خواوەند نێردراوەکانی خۆی بۆ رەوانە کرد ئەنتاکیەیە.

ئاماژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەوەهب کوڕی مونبەی یەمەنی و لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: پیاوێك لەئەنتاکیە دەژیا بەناوی حەبیب. حەریری دەچنی و پیاوێکی نەخۆش بوو. گرفتاری نەخۆشی گوولی بوو. لەیەکێك لەدۆڵە دوورەکانی شار ژیانی بەسەر دەبرد. باوەڕدارێکی بەخشندە بوو، وەك وتوویانە شەوانە بەرهەمی داهاتەکەی خۆی دەکردە دووبەش. نیوەی بۆ رۆژی ماڵ و منداڵەکەی و نیوەی دەکردە خێر. لەبەر ئەوەی دڵێکی پاکی بوو، گرنگی بەنەخۆشی و لاوازی نەدەدا.

لەشارەکەدا فیرعەونێك دەژیا بەناوی ئەنتیخس کوڕی ئەنتیخس کوڕی ئەنتیخس کەبتەکانی دەپەرەست و باوەڕی بەخواوەند نەبوو. خواوەند سێ نێردراوی رەوانە کرد کەسادق و سەدوق و شەلوم بوون. دوو نێردراوی بۆ لای فیرعەون و خەڵکی شارەکە رەوانە کرد کەبەدرۆزن لەقەڵەمیاندان. خواوەند سێیەم کەسی رەوانە کرد.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە لەحەوارییەکانی عیسا کوڕی مریەم بوون نەك نێردراوی خواوەند. ئەوان نێردراوی عیسا کوڕی مریەم بوون بەڵام لەبەر ئەوەی عیسا

ئەوانی بەفەرمانی خواوەند رەوانە کردبوو، نێردراوی خواوەند بوون کەفەرمووی دوو کەسمان رەوانە کرد بەلاّم ئەوانیان بەدرۆزن لەقەڵەمدا و بەسێیەم کەس وتەکانی ئەوانمان پشتڕاست کردەوە.

ئاماژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەقتادە دەگێڕنەوە: عیسا کوڕی مریەم دوو کەس لەحەوارییەکانی بۆ ئەنتاکیە رەوانە کرد کەیەکێکە لەشارەکانی رۆم. ئەوانیان بەدرۆزن ناوبرد. سێیەم کەسی رەوانە کرد و وتیان: ئێمەیان بۆ لای ئێوە رەوانە کردووە.... تا کۆتاییە ئایەکە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك نێردراوان، پێشنیاری خواپەرەستیان بەپاشا کرد و فەرمانی خواوەندیان پێراگەیاند و رەخنەیان لەدینی خەڵکەکە گرت، وتیان: ((انا تطیر نابکم لئن لم تنتهوا لنرجمنکم و لیمسنکم منا عذاب الیم، قالوا طائر کم معکم ائن ذکرتم بل انتم قوم مسرفون.

واتاکەی: وتیان: پێشنیارەکانی ئێوە بەشێوەیەکی خراپ لێکدەدەینەوە، ئەگەر کۆتایی پێنەهێنن، بەردبارانتان دەکەین و ئازابێکی دەردهێنەر لەئێمەوە بەئێوە دەگات. وتیان: لەهەر شوێنێك ناوی ئێوە بێتە ناو ناوان، بەختێکی خراپ هاورێیەتیان دەکات چوونکە ئێوە خەڵکانێکی زێدەڕۆن.))

کاتێك پاشا و خەڵکان بۆ کوشتنی نێردراوان هاودەنگ بوون، حەبیب کە لەدەرەوەی شار ژیانی بەسەردەبرد، ئاگادار بوویەوە و هات و خواوەندی بیر خستنەوە و بۆ شوێنکەوتنی نێردراوان هانیدان و وتی: ((یا قوم اتبعوا المرسلین. اتبعوا من لایسئلکم اجرا و هم مهتدون.

واتاکەی: ئەی خەڵکینە، شوێن ئەم نێردراوانە بکەون. باوەڕ بەو کەسانە بێنن کەداوای کرێتان لێ ناکەن و خۆیان رێگەی راستیان دۆزیوەتەوە.))

لەقتادە دەگێڕنەوە: کاتێك حەبیب گەیشتە لای نێردراوان، وتی: ئایا بۆ ئەم کارە کرێتان دەوێت؟

وتیان: نە.

وتی: ئەی خەڵکینە، شوێن نێردراوەکان بکەون، باوەڕ بەو کەسانە بێنن کەرێگەی راستیان دۆزیوەتەوە و داوای کرێ لەئێوە ناکەن.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: حەبیب لەگەڵ خەڵکە بتپەرەستەکەی خۆی دژایەتی و دینەکەی خۆی وپەرەستینی پەروەردگاری ئاشکرا کرد. رایگەیاند تەنیا خواوەند دەتوانێت سوود و زیان بگەیەنێت و وتی:

(( و مالی لا اعبد الذی فطرنی و الیة ترجعون. اتخذ من دونة آلهة ان یردن الرحمان بضر لا تغن عنی شفاعتهم شیئا و لا ینقذون. انی اذالفی ضلال مبین، انی آمنت بربکم فاسمعون.

واتاکەی: من چیم بەسەر دێت کەئەو خوایەی منی ئافراندوە و بۆ لای ئەو دەگەڕێمەوە، نەپەرەستم. ئایا جگە لەو خواکانی دیکە هەڵبژێرم ئەگەر خواوەندی رەحمان مەبەستی زیان گەیاندن بەمن بکات، شیفاعەتی ئەوان هیچ سوودێکم پێ ناگەیەنێت و رزگارم ناکات. بەمشێوەیە من لەگومڕاییەکی ئاشکرادام. ((ئەی پێغەمبەران) من باوەڕم بەپەروەردگارتان هەیە ((باوەڕهێنانی) من ببیستن.))

یانی باوەڕم بەپەروەردگاری ئێوە هەیە کەحاشای لێدەکەن. وتارەکەی من ببیستن. هەموو خەڵك هێرشیان کردەسەر و کوشتیان چوونکە لاواز و نەخۆش بوو. کەس نەبوو بەرگری لێبکات.

کوڕی مەسعود دەڵێت: بەشێوەیەك پێشێلیان کرد کەقوڕگی لەدواوە هاتەدەر. خواوەند فەرمووی: بڕۆڕە ناو بەهەشت. بەزیندوووی ڕۆشتە ناو بەهەشت کە لەوێ رۆژی خۆی خوارد و خواوەند لەڕەنج و خەمی دنیا رزگاری کرد. کاتێك بەرەحمەت و بەخششەکانی خواوەند گەیشت، وتی:

(( یا لیت قومی یعلمون بما غفرلی ربی و جعلنی من المکرمین.

خۆزگە خەڵکەکەم بزانم خواوەند منی بەخشیوە و لەو کەسانەم کەدڵنەوایی کردووم.))

خواوەند لەبەر ئەو بەشێوەیەك ئازاری ئەو خەڵکەیدا کەکەسیانی بەزیندوووی نەهێشتەوە. دەفەرمێت: (( و ما انزلنا علی قومة من بعدة من جند من السماء و ما کنا منزلین. ان کانت الا صحیة واحدة فاذاهم خامدون.

واتاکەی: بەدوای ئەوە، سوپایەکمان لەئاسمانەوە رەوانە کرد. ئێمە هیچ سوپا رەوانە ناکەین. زیاتر لەیەك ((صیحە)) و ئەوسا هەموویان لەجووڵە کەوتن.))

خواوەند، پاشا و خەڵکی ئەنتاکیەی لەناو برد و لەناوچوون. کەس لەوان بەزیندوووی نەمایەوە.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: ئەو نێردراوەی داستانەکەی لە (یس)دا هاتووە، ناوی حەبیبە و گیرۆدەی نەخۆشی خۆرە ببوو.

هەروەها لەباوکی موخەلید دەگێڕنەوە: ناوی حەبیب کوڕی مەزی بوو.

## شەمشوون لەرۆژگاری پاشای تیرمکاندا بوو

شەمشوون نیشتەجێی یەکێك لەشارەکانی رۆم وخواوەند رێگەی راستی نیشاندا بوو. خەڵکەکەی بتپەرەست بوون. داستانەی ئەو و خەڵکەکەی بەو شێوەیە لەگێرانەوەی وەهب کوڕی مونبە ئامآژەی پێدراوە: شەمشوون پیاوێکی باوەڕدار بوو. دایکی ئەوی کردبووە نەزر. لەشارێکدا دەژیا خەڵکەکەی کافر و بتپەرەست بوون. شوێنی ژیانی چەند میلێك لەشارەوە دوور بوو. بەتەنیا شەڕی لەگەڵ خەڵکەکەی و لەرێگەی خوادا جیهادی دەکرد. نیازەکانی خۆی هەڵدەگرت، کوشتاری دەکرد و ئەسیر و سامانی دەبردەوە. بەهێز و بەئاسن و بەند نەدەبەسترایەوە. خەڵکەکەی توانای خۆڕاگری لەبەرابەر ئەویان نەبوو. سەرئەنجام وتیان: بەهاوکاری ژنەکەی دەتوانین بەسەر ئەودا زاڵ ببین. رۆشتنە لای ژنەکەی و برە پارەیەکیان بۆ دیاری کرد.

ژنەکەی وت: من دەیبەستمەوە.

تەنافێکیان پێدا و وتیان: کاتێك خەوت، دەستی بەملی ببەستەرەوە تا بێین و بیگرین.

کاتێك شەمشوون خەوت، ژنەکەی دەستی ئەوی بەملیەوە بەستەوە. کاتێك لەخەو هەستا، تەنافەکەی راکێشا و پچڕا، بەژنەکەی وت: بۆ ئەو کارەت کرد؟

وتی: دەمویست هێزی تۆ تاقی بکەمەوە چوونکە هیچ کات کەسی وەك تۆم نەبینیوە.

کەسی بۆ لای خەڵکەکەی رەوانە کرد و وتی: بەتەناف بەستمەوە، بەڵام بێ ئەنجام بوو.

زنجیرێکی ئاسنیان نارد وتیان: کاتێك خەوت، بەم زنجیرە بیبەستەرەوە. کاتێك شەمشوون خەوت، ژنەکەی ئەوی بەزنجیر بەستەوە.

کاتێك شەمشوون لەخەو هەستا، زنجیرەکەی راکێشا و قرتاندی و بەهاوسەرەکەی وت: بۆ ئەو کارەت کرد؟

ژن وتی: ویستم هێزی تۆ تاقیبکەمەوە چوونکە هاوشێوەی تۆم لەجیهاندا نەبینیوە. ئایا لەجیهاندا هیچ شتێك نییە بەسەر تۆدا زاڵ ببێت.

وتی: تەنیا یەك شت.

وتی: چییە؟

وتی: پێت ناڵێم.

ژن پێداگری کرد و شەمشوون کەقژی درێژ بوو، پێی وت: دایکم نەزری کردووە و هیچ شتێك جگە لەقژم من نابەستێتەوە و بەسەر مندا زاڵ نابێت.

کاتێك شەمشوون خەوت، ژنەکەی دەستی ئەوی بەقژی سەری بەستەوە ونەیتوانی دەستی خۆی بکاتەوە. کەسی بۆ لای خەڵکەکەی رەوانە کرد. هاتن و ئەویان گرت. لووتیان بری و چاوەکانیان کوێر کرد. بۆ ئەوەی خەڵك بیبینێت، بردیانە لای منارەیەك، منارەکە ستوونی هەبوو. پاشا ڕۆشتبوە سەر مەنارەکە و سەیری خەڵکانی دەکرد بۆ ئەوەی بزانێت چ بەلأیەك بەسەر شەمشووندا دەهێنن.

کاتێك ئەندامەکانی شەمشوونیان برییەوە، ئەویان هەستانە سەرپێ. داوای لەخواوەند کرد بەسەر ئەواندا زاڵی بکات. فەرمانی پێدرا تا دوو ستوون لەمنارەکە کەپاشاکان و هاورێکانی لەسەری بوون، بگرێت و بەرەو لای خۆی رایانکێشێت. خواوەند سۆمای چاوی بۆ گەڕاندەوە و شوێنەواری برینەکانی لەسەر جەستەی نەهێشت. منارە و پاشا وهەموو ئەو کەسانەی لەسەری بوون، کەوتن و لەناوچوون.

## گێڕانەوەکان سەبارەت بەداستانی جەرجیس

جەرجیس وەك وتوویانە بەندەیەکی خواپەرەستی فەلەستینی و چاوی بەپاشماوەی حەوارییەکانی عیسا کەوتبوو. بازرگانی دەکرد. بەهۆی بازرگانی کردنەوە نیازمەندی خەڵکان نەبوو. زیادەی داهاتەکەی لەناو هەژاراندا دابەش دەکرد. جارێکیان ڕۆشتە لای پاشای موسڵ.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: دازانە لەموسڵ و پاشایەتی هەموو شامی دەکرد. ستەمکارێکی یاخی بوو. کەس جگە لەخواوەند توانای خۆڕاگری لەبەرابەری ئەوی نەبوو. جەرجیس پیاوێکی خواپەرەست و چاکەکاری خەڵکی فەلەستین و باوەڕەکەی خۆی دەشاردەوە وەك ئەو کەسانەی پێشتر باوەڕی خۆیان دەشاردەوە. چاوی بەپاشماوەی حەوارییەکانی عیسا کەوتبوو. زانست و زانیارییەکان لەوانەوە فێر ببوو.

جەرجیس بازرگانی دەکرد. یارمەتی هەژارانی دەدا و هەندێ کات هەموو سامانی خۆی دەکردە خێر و هیچی بۆ نەدەمایەوە و خۆی نیازمەند دەبوو. دواتر هەوڵیدەدا و چەند بەرابەری سامانەکەی بەدەست دەهێنایەوە. بەمشێوەیە مامڵەی لەگەڵ سامانەکەی دەکرد و دەیبەخشیەوە. هەژاری لەدەوڵەمەندی زیاتر خۆش دەویست و لەفەرمانڕەوایی ناباوەڕان بێزار و دەترسا لەبەر دینەکەی ئازاری پێبگەیەنن یا لەدینەکەی پەشیمانی بکەنەوە. بەمەبەستی بینینی پاشای موسڵ ملی ڕێگەی گرتەبەر و سامانی زۆری لەگەڵ خۆیدا برد تا پێشکەشی بکات بۆ ئەوەی ڕێگە نەدات پاشاکانی دیکە زیانی پێ بگەیەنن.

کاتێك گەیشتە لای پاشا، لەکۆڕەکەی خۆی دانیشتبوو. گەورەکان و شاکانی خەڵکەکەی دانیشتبوون. ئاگرێکیان داگیرساندبوو و کەرستەکانی ئەشکەنجە کردنی نەیاران دانرابوو. فەرمانیدا بتەکەی بەپێ وە رابگرن کەناوی ئەفلوق بوو بۆ ئەوەی هەرکەس لای بتەکە تێپەڕی و سوجدەی بۆ نەبرد بیخەنە ناو ئاگر و بیکوژن. کاتێك جەرجیس ئەمەی بینی، خواوەند کینەی پاشای لەدڵی ئەودا چاند. بڕیاریدا دژایەتی بکات. سامانەکەی لەناو خەڵکاندا دابەش کرد و هیچی لێنەهێشتەوە. نەیدەویست بەهاوکاری سامانەکەی لەڕێگەی خوادا شەڕ بکات. حەزی دەکرد ئەم کارە بەگیان و

جەستەی خۆی ئەنجام بدات. بەشێوازێکی تورە ڕۆشتە لای پاشا و وتی: بزانە تۆ بەندەیەکی راسپێردراویت و هیچ کارێك بۆ خۆت و کەسانی دیکە ناتوانیت ئەنجام بدەیت، لەئاسمان پەروەردگارێك هەیە تۆی ئافراندووە و رۆژی پێداوییت. ئەوە تۆدەمرێنێت و زیندووت دەکاتەوە وسوود و زیانت پێ دەبەخشێت. تۆ یەکێك لەئافرێنراوە کەڕ و لاڵەکانی ئەو کەناتوانێت قسە بکات و سوود و زیان بەخەڵکان بگەیەنێت، لەجیاتی خوا دەپەرەستیت و فیتنەت لەناو خەڵکاندا بلاو کردۆتەوە. بتەکەی خۆت بەزێر و زیو رازاندۆتەوە و خەڵك بۆ پەرەستینی ناچار دەکەیت و بەخوا، ناوی دەبەیت.

بەمشێوە بۆ وەسف کردنی خواوەند و سەرکۆنە کردن و ئیهانە کردنی بتەکە زمانی کردەوە.

پاشا پرسیاری کرد: ئەو کێیە و خەڵکی کوێیە؟

جەرجیس وەلامی دایەوە: بەندەی خوا و منالی بەندەی خوا و منالی کەنیزی خوام. لەپێشگای ئەو لەهەموو بەندەکان لاوازتر و هەژارترم. لەخۆڵ منیان ئافراندووە و بۆ خۆڵم دەبەنەوە.

پاشا پرسیاری کرد: بۆ چ مەبەستێك هاتووە و چی دەوێت؟

پێشنیاری خواپەرەستی و پشت گوێ خستنی بتپەرەستی بەپاشا کرد.

پاشا پێشنیاری بتپەرەستی بەجەرجیس کرد و وتی: ئەگەر پەروەردگاری تۆ، کەگومان دەکەیت، پاشای پاشاکانە، بەو شێوە دەبوو کەدەبێت ببێت، شوێنەواری ئەو لەروخساری تۆدا دەبینرێت بەهەمان شێوە کەشوێنەواری من بەروخساری شاکانی خەڵکەکەمەوە دیارە.

جەرجیس لەوەلامدا کورنوشی بۆ خواوەند برد و وتی: ناتوانیت تەرقبلینا کەگەورەی خەڵکەکەی تۆیە و نیعمەتی لەتۆوە پێبڕاوە لەگەڵ ئەلیاس کە لەلایەن خواوە نیعمەتی پێبەخشراوە، بەراوەرد بکەیت. ئەلیاس لەسەرەتادا مرۆڤێك بووکەخواردنی دەویست. دڕۆشتە بازاڕ و لەبەخششی خواوەند باڵی پێبەخشرا و نووری پۆشی و بوو بەمرۆڤێکی _فریشتەیەکی ئاسمانی__ زەمینی کە لەگەڵ فریشتەکان هەڵدەفڕێت. مەجلیتیس کەگەورەی خەڵکەکەی تۆیە و لەتۆوە نیعمەتی پێبڕاوە ناتوانی لەگەڵ مەسیح کوڕی مریەم و ئەو نیعمەتی خواوەند پێی بەخشی،

بەراوەرد بکەیت چوونکە ئەوی پێش هەموو خەڵکانی جیهان خست. عیسا و دایکی کردە نیشانەیەك و وانەیەك بۆ هەموو خەڵکانی جیهان.

ئەوسا سەبارەت بەمەسیح و پێشنیارەکانی قسەی کرد و وتی: ( چۆن دەتوانرێت دایکێك کەخواوەندی بۆ وشەکانی خۆی هەڵبژارد و ناوسکی خۆی بۆ رۆحی خۆی پاك و خاوێن کردەوە و کردی بەسالاری کەنیزەکانی خۆی، لەگەڵ ئەزبیل کە لەتۆوە نیعمەتی پێبڕاوە، بەراوەردە بکرێت. ئەزبیل یەکێك لەشوێنکەوتەکانی تۆ و هاودینی تۆ بوو. خواوەند ئەوی پشتگوێ خست تا سەگەکان هێرش بکەنە سەر ماڵەکەی و گۆشت و خوێنی بخۆن و گورگ و کەمتیارەکان ئەندامەکانیان هەڵدڕی.

پاشا وتی: تۆ باسی شتێك دەکەیت ئێمە هیچ زانیاریەکمان لەسەری نییە. ئەم دوو پیاوەی باسیان دەکەیت، بیانهێنە بۆ لای ئێمە تا بیانبینین و وانەیەك لەکارەکانی ئەوان وەربگرین چوونکە ئەم کارانە لەتوانای مرۆڤەکاندا نییە.

جەرجیس وتی: حاشا کردنی تۆ لەوێوە سەرچاوە دەگرێت کەخواوەند ناناسیت و ناتوانی ئەم دوو پیاوە ببینیت. ئەوان نایەنە لای تۆ مەگەر ئەوەی کردەکانت هاوشێوەی ئەوان بێت و پێگەی ئەوان بەدەست بێنیت.

پاشا وتی: درۆزنی تۆ ئاشکرا بوو چوونکە باسی کارێك دەکەیت ناتوانیت بیسەلمێنیت.

پاشا جەرجیسی سەرپشك کرد لەوەی ئەشکەنجە بدرێت یا سوجدە بۆ ئەفلوق ببات و پاداشتی دەستکەوێت.

جەرجیس وتی: ئەگەر ئەفلوق ئاسمانی جێگیر کردووە ((باسی تواناییەکانی خواوەندی کرد)) چاکەی منت دەوێت و چاکەخوازی، ئەگەر بەپێچەوانەوەیە، گلاّوە و مەلعونی.

کاتێك پاشای بیستی جەرجیس جوێن بەخواکانی دەدات، لەوتەکانی تورە و فەرمانیدا تا دارێکیان هێنا. دارەکەیان بۆ ئەشکەنجەدانی ئەو هەڵواسی. شانەی ئاسنینیان لەسەر جێگیر کرد کەجەستەی ئەوی هەڵدڕی و گۆشت و ئێسقان و دەمارەکانی لەت لەت بوو. سرکە و خەردەلیان تێکرد.

کاتێك بینی جەرجیس بەم ئەشکەنجەیە نەمرد، فەرمانیدا شەش بزماری ئاسنینیان بۆ هێنا و سووریان کردەوە. کاتێك سوور بوونەوە، لەسەری جەرجیسدا

چەقاندیان و مۆخ لەسەری هاتەدەر.

کاتێك بینی بەم ئەشکەنجەیش نەمرد، فەرمانیدا و تەشتێکی مسینیان هێنا. لەژێرەوە ئاگرێکیان داگیرساند تا تەشتەکە سوور بوویەوە. فەرمانیدا جەرجیس بخەنە ناو تەشتەکە و بیبەستنەوە. جەرجیس بەهەمان شێوە لەناو تەشتەکەدا بوو تا فێنك و سارد بوویەوە.

کاتێك بینی بەم ئەشکەنجەیش نەمرد، ئەوی بانگ کرد و وتی: مەگەر بەم ئەشکەنجانە ئازارت پێنەگەیشت؟

جەرجیس وتی: مەگەر پێم نەوتی خواوەندێکت هەیە و لەتۆ بەتۆ نزیکترە.

پاشا وتی: پێت وتم.

جەرجیس وتی: ئەو بوو توانای بەرگە گرتنی ئەشکەنجەکانی تۆی پێدام تا بەڵگەکان نیشانی تۆ بداتز

پاشا کەئەم قسەی بیست، ترسا. لەپاشایەتی و گیانی خۆی دەترسا. بڕیاریدا بۆ هەمیشە جەرجیس زیندانی بکات. کەسانی پاشا پێیان وت: ئەگەر لەزینداندا بیهێڵیتەوە، لەگەڵ خەڵکان قسە دەکات و ئەوان دەکاتە نەیاری تۆ. فەرمان بدە تا لەزیندان ئەشکەنجەی بکەن بۆ ئەوەی نەتوانێت قسە بکات.

پاشا فرمانیدا لەزینداندا، بەدەمەوە خستیان و چوار بزماری ئاسنینیان بەدەست و پێیدا داکووتا. دواتر فەرمانیدا و ستوونێکی مەرمەڕیان هێنا و لەسەر پشتی ئەو دایاننا. حەوت کەس ویستیان ستوونەکە هەڵبگرن بەلاّم نەیانتوانی. چواردە کەس ستوونەکەی هەڵگرت و نەیانتوانی. سەرئەنجام هەژدە کەس هەڵیانگرت و هێنایان. هەموو ئەو رۆژە جەرجیس بەو شێوەیە لەژێر ستوونەکەدا بوو. کاتێك ئارەقی کردەوە، فریشتەیەك هاتە لای (( یەکەم جار بوو فریشتە دەهات بۆ لای)) ستوونەکەی لەسەر پشتی هەڵگرت و بزمارەکانی لەدەست و قاچی دەرکێشا. خواردن و خواردنەوەی پێدا و مژدەی پێبەخشی و دڵنەوایی کرد. بۆ بەیانی ئەویان لەزیندان دەرهێنا و فەرمانیان پێدا بۆ لای دوژمنەکەی خۆی یانی پاشا بڕوات. پێی وترا تا بەو شێوەی دەبێت لەرێگەی خوادا جیهاد بکات چوونکە خواوەند بەتۆ دەفەرمێت: دڵخۆش و خۆڕاگر بە چوونکە رێگە بەدوژمنەکەت دەدەم بۆ ماوەی حەوت ساڵ ئەشکەنجەت بکات و چوار جار بتکوژێت. دووبارە گیانت پێ دەبەخشمەوە و دوای چوارەم جار، گیانی تۆ بۆ لای

خۆم دەگەڕێنمەوە و پاداشتی تەواوت پێ دەبەخشم.

لەناکاو خەڵکان جەرجیسیان بینی کە لەسەر سەریان وەستاوە و پێشنیاری خواپەرەستیان پێدەکات.

پاشا وتی: تۆ جەرجیسیت؟

وتی: بەڵێ.

پرسی: کێ تۆی لەزیندان هێنایە دەر؟

وتی: ئەو دەسەڵاتەی لەسەروو دەسەڵاتەکەی تۆوەیە.

کاتێک پاشا ئەم وتەی بیست، لێوالێو بوو لەتوڕەیی و فەرمانیدا کەرەستە جۆراوجۆرەکانی ئەشکەنجەیان هێنا. کاتێک جەرجیس ئەو هەموو کەرەستەی بینی کەبۆ ئەشکەنجەدانی ئەو ئامادە کراوە، ترسا. ئەوسا بەدەنگی بەرز سەرکۆنەی خۆی کرد بەشێوەیەک کەسانی دیکەیش بیستیان. کاتێک لەسەرکۆنە کردنی خۆی تەواو بوو، ئەویان لەناو دووداردا راکێشا. شمشێرێکیان خستە سەرسەری و زەختیان لێکرد تا گەیشتە نێوان قاچەکانی و کردیان بەدوو کەرت. هەر نیوەیەکیان هەڵگرت و لەت لەتیان کرد. پاشا حەوت شێری دڕەندی بوو و لەناو چاڵێک ئەوانی رادەگرت. ئەوانی بۆ ئەشکەنجەدانی خەڵکان راگرتبوو. جەستەی لەت لەتی جەرجیسیان خستە بەردەم شێرەکان تا بیخۆن. بەڵام بەفەرمانی خواوەند شێرەکان سەری کوڕنوشیان دانەواند و هیچ کارێکیان نەکرد. جەرجیس بۆ ماوەی یەک رۆژ مرد. ئەمە یەکەم مەرگی ئەو بوو. کاتێک شەو داهات، خواوەند لەتەکانی جەستەی ئەوی کۆکردەوە و جەستەکە دووبارە یەکی گرتەوە. دووبارە گیانی پێبەخشی و فریشتەیەکی رەوانە کرد و ئەوی لەچاڵەکە دەرهێنا. خواردن و خواردنەوەی پێدا. مژدەی پێبەخشی و دڵنەوایی کردەوە.

بەرەبەیان فریشتە پێی وتی: ئەی جەرجیس.

جەرجیس وتی: ئامادەم.

فریشتە وتی: ئاگادار بە، دەسەڵاتی خواوەند، تۆی لەناو چاڵەکە دەرهێنا، بۆ لای دوژمنەکەی خۆت برۆ و لەرێگەی خوادا دژایەتی بکە. هاوشێوەی خۆڕاگران بمرە.

خەڵک لەدەوری بتەکەیان جەژنێکیان سازدابوو. دڵخۆش بوون و گومانیان نەکرد جەرجیس مردووە. لەناکاو جەرجیس دەرکەوت. کاتێک ئەویان بینی، وتیان: ئەمە

هاوشێوەی جەرجیسە.

دەستەیەکی دیکە وتیان: دەڵێی خۆیەتی.

پاشا وتی: جەرجیس خۆی نەشاردۆتەوە، جەرجیسە، ئارامی و نەترسی ئەو ببینن.

جەرجیس وتی: خۆمم، جەرجیس، چەندە خەڵکانێکی خراپ بوون منتان کوشت و لەت لەتتان کردم. خواوەند تۆتایی هەموو چاکیەکانە و لەئێوە مێهرەبانترە. منی زیندووو کردەوە و دووبارە گیانی پێبەخشیم. باوەڕ بەپەروەردگار بێنن چوونکە نیشانەکانی خۆی نیشاندان.

کاتێك ئەم قسانەی هێنایە سەرزمان، وتیان: جادووگەرێکە کەدەست و چاوی ئێوەی جادوو کردووە. هەموو جادووگەرانی دیارەکەی خۆیان کۆکردەوە و کاتێك هاتن، پاشا بەسالاری جادووگەرانی وت: لەجادووە سەرسوڕهێنەرەکانی خۆت، شتێکم نیشانبدە تا دڵخۆش بیم.

سالاری جادووگەران وتی: فەرمان بدە تا گایەکی نێر بێنن. کاتێك گاکەیان هێنا، فووی کرد بەگوێیدا و بوو بەدوو کەرت. دوواتر فووی بەگوێچکەکەی دیکەیدا کرد و بوو بە دوو گا. دواتر داوای تۆوی کرد، تۆوەکەی چاند، ڕوا و سەوز بوو، دروێنەی کرد، بەبایدا و کردی بەئارد و هەویر و نانی لێدروست کرد و خواردی. هەموو ئەم کارانەی لەماوەی یەك کاژێردا کرد.

پاشا پێی وت: ئایا دەتوانیت جەرجیس بکەیتە ئاژەڵ.

سالاری جادووگەران وتی: چ ئاژەڵێك؟

پاشا وتی: سەگ.

جادووگەر وتی: فەرمان بدە تا دەفرێك ئاو بێنن.

کاتێك دەفرە ئاوەکەیان هێنا، وتی: فەرمانی پێبدە تا ئەم ئاوە بخواتەوە.

جەرجیس ئاوەکەی تا دوایین دڵۆپ خواردەوە. کاتێك تەواو بوو، جادووگەر وتی: چۆنیت؟

جەرجیس وتی: زۆر باشم، زۆر تینوو بوم، خواوەند چاکەی لەگەڵ کردم و بەم خواردنەوەیە لەبەرابەر ئێوە هێزی پێبەخشیم.؟

کاتێك جادووگەر ئەم قسەی بیست، وتی: ئەی پاشا، ئەگەر ڕووبەڕووی پیاوێکی

هاوشێوەی خۆم دەبوومەوە، دەمتوانی بەسەریدا زاڵ ببم، بەڵام لەگەڵ ئافرێنەری ئاسمان و زەوی رووبەرووبیت، کەس ناتوانێت لەبەرابەر ئەو خۆڕاگری بکات.

ژنێکی نیازمەند لەجەرجیس و کارە سەیر و سەمەرەکانی ئەو ئاگادار بوویەوە، هات و جەرجیس گرفتاری بەڵاکان بوو،پێی وت: ئەی جەرجیس، ژنێکی نیازمەندم، بژێویم نییە جگە لەو مانگایەی کشتوکاڵم پێدەکرد، بەڵام ئەویش مرد. هاتووم تا بەزەییت بەمندا بێتەوە و داوا لەخواوەند بکەیت بۆ ئەوەی گاکەی من زیندوو بکاتەوە.

جەرجیس داردەستێکی پێدا و وتی: برۆ و بەم داردەستە لەگاکە بدە و پێی بڵێ، بەفەرمانی خواوەند زیندوو ببەرەوە.

ژن وتی: ئەی جەرجیس، گاکەی من چەندین رۆژ پێش ئێستا مردووە و تا ئێستا دڕندەکان لەت لەتیان کردووە. دووری شوێنەکەی من و تۆ چەندین رۆژ رێگەیە.

جەرجیس وتی: ئەگەر تەنیا یەك دانی گاکەت بدۆزیتەوە و بەداردەستەکە لێی بدەیت، بەفەرمانی خواوەند زیندوو دەبێتەوە.

ژن رۆشتە شوێنی مردنی گاکەی. دانێك و مووی کلکی ئەوی دۆزییەوە و بەهەمان شێوەی جەرجیس پێی وتبوو، ئەوانی لەیەك شوێندا دانا، بەداردەستەکەی لێیدا و ئەو وشانەی هێنایە سەرزمان کەجەرجیس فێری کردبوو. گاکە زیندوو بوویەوە و ژنەکە دووبارە کاری لێدەکێشایەوە. ئەم هەواڵە لەناو خەڵکاندا بڵاو بوویەوە.

کاتێك جادووگەر ئەو قسانەی بەپاشا وت، یەکێك لەگەورەکانی خەڵك کەدوای پاشا گەورەی هەمووان بوو، وتی: ئەی خەڵکینە ببیستن بزانن چی دەڵێم.

وتیان: بڵێ.

وتی: ئێوە ئەم پیاوە بەجادووگەر دەزانن و گومان دەکەن دەست و چاوی ئێوەی جادوو کردووە. بەشێوەیەك خۆی نیشان دەدات کەئێوە ئەشکەنجەی دەکەن بەڵام ئازاری پێناگات، نیشانی ئێوەی داوە کەئەوتان کوشتووە بەڵام نەمردووە، بەڵام ئایا هەرگیز جادووگەرێتان بینیوە بتوانێت مەرگ لەخۆی دوور بکاتەوە یا مردوێك زیندوو بکاتەوە. ئەوسا داستانی جەرجیس و ژنەکەی گێڕایەوە و دژایەتی بۆچوونی خەڵکەکەی کرد.

وتیان: گومان دەکەین گووێت لەقسەکانی ئەو گرتبێت.

وتی: بەڵێ و لەکردووەکانی ئەو سەرمسوڕماوە.

وتیان: کاریگەری لەسەر تۆ داناوە.

وتی: باوەڕم پێ هێناوە و لەبتەکانی ئێوە بێزارم.

پاشا و هاوەڵانی بەشمشێر هێرشیان کردەسەر و زمانیان بڕی. زۆری نەخایاند، مرد. وتیان تاعوونی گرتووە و پێش ئەوەی بتوانێت قسە بکات، ماڵئاوایی لەجیهان کرد. کاتێك خەڵکان لەمەرگی ئەو ئاگادار بوونەوە، ترسان و هەواڵی مەرگی ئەویان لەیەکتر دەشاردەوە. کاتێك جەرجیس ئەمەی بینی، ڕۆشتە ناو خەڵکان و نهێنی کارەکەی ئەوی ئاشکرا کرد. قسەکانی ئەوی گێڕایەوە و چوار هەزار کەس باوەڕییان پێ هێنا. ئەو خۆی مردبوو. دەیانوت: راستی وت، خوا لێی خۆش بێت.

شا ئەوانی گرت و زیندانی کردن. بەچەندین شێواز ئەشکەنجە و کوشتاری کردن. ئەندامەکانی ئەوانی بڕی و هەموویانی کوشت. کاتێك لەکوشتنی ئەوان تەواو بوو، رووی کردە جەرجیس و وتی: بۆ داوا لەخواکەی خۆت ناکەیت تا هاوەڵانت زیندووو بکاتەوە چوونکە ئەوانە لەسەر قسەکانی تۆ کوژران.

جەرجیس وتی: کاتێك ئەوانیان بەتۆ سپارد، پاداشتیان دەدەنەوە.

یەکێك لەگەورەکانی خەڵك بەناوی مەجلیتیس وتی: ئەی جەرجیس گومان دەکەیت، خواوەندی تۆ، بوونەوەرەکانیی ئافراندووە و دووبارە زیندوویان دەکاتەوە. من داوای شتێك لەتۆ دەکەم و ئەگەر خواوەند ئەو کارە ئەنجام بدات، باوەڕ بەتۆ دێنم و قسەکانت پشت راست دەکەمەوە و لەڕەنج و ئازاری خەڵك رزگارت دەکەم. وەك دەبینی چواردە کورسیمان لەژێر پێدایە و سفرەیەك راخراوە کە قاپ و دەفرە جۆراوجۆرەکانی لەسەرە هەموویان لەداری وشك دروستکراون و لەدارە جۆراوجۆرەکان. داوا لەپەروەردگار بکە ئەم قاپ و دەفر و ئەم سفرەیە بۆ شێوەی یەکەمی ئافراندیان بگەڕێنێتەوە یانی سەوز ببن و هەر کام لەدارەکان بەڕەنگی گەڵاکان و گوڵ و میوەکانیان بناسینەوە.

جەرجیس وتی: داوای کارێکت کرد بۆ من و تۆ دژوارە بەڵام بۆ خواوەند ئاسانە.

لەخواوەند پاڕایەوە. لەشوێنی خۆیان هەڵنەستابوون کەهەموو کورسی و قاپ و دەفرەکان سەوز بوون، بوون بەدار و توێکڵیان گرت. لقەکانیان دەرکەوت و کاتێك ئەمەیان بینی، مەجلیتیسیان بۆ ئەشکەنجە کردنی جەرجیس راسپارد، وتی: ئەم

جادووگەرە بەشێوەیەك ئەشكەنجە دەكەم فێڵ و جادووەكەی بێ بەها ببێت. جەستەی گایەكی گەورە ناو بەتاڵی لەمس دروست كرد. ئەوی لەنەوت و سورب و گۆگرد و زەرنیخ پڕ كرد. جەرجیسی كردە ناو پەیكەری گاكە و لەژێر پەیكەرەكە ئاگرێكی كردەوە تا سوور بوویەوە و ئەوەی ناو پەیكەرەكەدا بوو، توایە و تێكەڵ بوو. جەرجیس لەناو پەیكەرەكەدا مرد. كاتێك گیانی ئەسپەردە كرد، خواوەند بایەكی رەوانە كرد و ئاسمانی بەهەورێكی رەش تاریك كرد. هەورە بروسكە لێوانلێو بوو لەهەورە بروسكە. تۆفانێكی رەوانە و دیاری ئەوانی پڕ كرد لەدووكەڵ و تاریكی. نێوان ئاسمان و زەوی رەش و تاریك بوو. رۆژەكانیان بەتاریكی بەسەر دەبرد و نەیاندەتوانی شەو لەرۆژ جیا بكەنەوە.

خواوەند میكائیلی رەوانە كرد و ئەو پەیكەرەی جەرجیس لەناویدا بوو، هەڵیگرت و بەشێوەیەك كێشای بەزەویدا كەهەموو خەڵكانی شام ترسان و لەیەك ساتدا هەموویان بیستیان. پەیكەرەكە شكا و جەرجیس بەزیندوویی لەناو پەیكەرەكە هاتەدەر. كاتێك وەستا و لەگەڵ خەڵكان قسەی كرد، تاریكی نەما و نێوان ئاسمان و زەوی رووناك بوویەوە. خەڵك هاتنە خۆ. یەكیان بەناوی تەرقبلینا وتی: ئەی جەرجیس دەزانین ئەم كردانە لەكارەكانی تۆ یا پەروەردگاری تۆیە. ئەگەر كردەی پەروەردگاری تۆیە، داوای لێبكە تا مردووەكان زیندووو بكاتەوە. چوونكە وەك دەبینی ئەم گۆڕانە لێوانلێوە لەمردووەكانی ئێمە. دەستەیەكیان دەناسین و دەستەیەكیان رۆژگارێك پێش ئێمە مردوون. داوا لەخواوەند بكە زیندوویان بكاتەوە و بینە هەمان مرۆڤی سەردەمی خۆیان بۆ ئەوەی ئەوانەی كەدەیانناسین، بیانبینین و ئەوانەی نایانناسین، داستانی خۆیان بۆ ئێمە باس بكەن.

جەرجیس پێی وت: خوا بەمشێوەیە سازگاری لەگەڵ ئێوە دەكات و ئەم هەموو شتە سەیرەتان نیشان دەدات بۆ ئەوەی بەڵگەكانی خۆی بەتەواوەتی نیشانی ئێوە بدات و نەبنە هۆكاری تورەیی ئەو.

دواتر وتی و گۆڕەكانیان هەڵكەند كەتەنیا ئێسقان و خاكیان تیا بوو. دەستی بەدۆعا كردن كرد و هێشتا كەسەكان لەشوێنی خۆیان نەجووڵابوون حەڤدە كەس، نۆ پیاو و پێنج ژن و سێ منداڵیان بینی. یەكیان پیرێكی پەككەوتە بوو. جەرجیس وتی: ئەی پیرە پیاو، ناوت چییە؟

وتی: یوبیل.

وتی: کەی مردوویت؟

وتی: لەفلاّن و فلاّن کات. زانیان چوارسەد ساڵ پێشتر مردووە. کاتێك پاشا و هاوەڵانی ئەویان بینی، وتیان: بەهەموو شێوەیەك ئەشکەنجەتان کرد، جگە لەبرسیەتی و تینویەتی.

بەم جۆرویش ئەشکەنجەیان کرد. ئەویان بردە ماڵی پیرێژنێکی هەژار و دەستکورت. پیرێژن کوڕێکی کوێر و شەلی بوو. ئەویان لەو ماڵەدا زیندانی کرد، خواردن و خواردنەوەی پێنەدەگەیشت.

کاتێك برسیەتی تەنگی بەجەرجیس هەڵچنی، بەپیرێژنی وت: ئایا خواردن و خواردنەوە لای تۆ دەست دەکەوێت؟

وتی: نە، سوێند بەو کەسەی سوێندی پێدەخۆین لەفلاّن و فیسارە رۆژەوە خواردنمان نەبووە. ئێستا دەڕۆم بەو هیوایەی بتوانم شتێك بۆ تۆ ئامادە بکەم.

جەرجیس پێی وت: خوا دەناسیت؟

ژن وتی: نە.

جەرجیس پێشنیاری خوا پەرەستی پێکرد. ژن قسەکانی ئەوی پشت ڕاست کردەوە و ڕۆشت بۆ ئەوەی بتوانێك شتێك بۆ جەرجیس ئامادە بکات. ستوونێك لەداری وشك لەناو ماڵەکەدا بوو کەدارەکانی ماڵەکە پشتیان بەو ستوونە بەستبوو. جەرجیس لەخواوەند پاڕایەوە. زۆری نەخایاند ستوونە وشکەکە سەوز و هەموو جۆرەکانی خواردنی دەرکرد تەنانەت فاسۆلیا و لەبا.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: لەبا دارێکە لەشام دەڕوێت و دانەکانی دەخۆن.

لەستوونەکە لقێك جیابوویەوە و سێبەری لەدەوروبەری ماڵەکە دروست کرد. جەرجیس تا ئەو جێگەی دەیتوانی، خواردی. کاتێك ژنەکە گەڕایەوە وبینی دوای ڕۆشتنی ئەو چی لەماڵەکەیدا روویداوە، وتی: باوەڕم بەو کەسە هەیە کە لەماڵی برسیەتی خواردنی بەتۆ بەخشی. داوا لەخواوەند بکە تا کوڕەکەم شیفا ببەخشێت.

جەرجیس وتی: کوڕەکەت بێنەرە لای من.

کاتێك کوڕەکەی نزیك کردەوە، ئاوی دەمی کردە سەرچاوی و سۆمای چاوەکانی بۆ گەڕایەوە. فووی کرد بەگوێچکەیدا و توانی ببیستێت.

پیرێژن وتی: خوا لێت خۆش بێت، زمان و قاچی ئەویش بکەرەوە.

جەرجیس وتی: با بەو شێوەیە بێت چوونکە رۆژێکی گەورەی لەبەردەمدایە.

پاشا بەمەبەستی گەڕان رووی لەدەرەوەی شار کرد، کاتێک دارەکەی بینی، بەهاوەڵانی خۆی وت: لێرەدا دارێک دەبینم پێشتر بوونی نەبوو.

وتیان: ئەم دارە بەهۆی کرداری ئەو جادووگەرەوە رواوە کەدەتەویست بەبرسیەتی و تینویەتی ئەشکەنجەی بدەیت. ئێستا لەبەرهەمی دارەکە تێری خواردووە و ژنە هەژارەکەیشی تێر کردووە. هەروەها شیفای کوڕەکەیشی داوە.

شا فەرمانیدا ماڵەکە وێران بکەن و دارەکە ببڕنەوە. کاتێک ویستیان دارەکە ببڕنەوە، خوا دووبارە دارەکەی وشك کردەوە. ئەو کارەیان نەکرد. فەرمانیدا تا جەرجیس بەچوار گوڵمێخ بەدارەکەوە ببەستنەوە. چەرخێکیان هێنا و باری ئەویان قورس کرد. لەژێر چەرخەکە کێرد و خەنجەرەکانیان دانا. چل گایان بەچەرخەکەوە بەستەوە و بەیەك جووڵە رایانکێشا. جەرجیس لەژێر چەرخەکە بوو بەسێ کەرت. دواتر فەرمانیدا و لەتێکیان کردە ناو ئاگرەوە کەبوو بەخۆڵەمێش. کەسانێکی نارد و خۆڵەمێشی ئەویان کردە ناو دەریا. لەشوێنی خۆیان نەجوولابوون کەدەنگێکیان بیست: ئەی دەریا خواوەند فەرمانت پێدەدات، ئەوەی لەم پەیکەرە پاکە، دەڕژێتە ناو تۆ، بیپارێزە چوونکە دەمەوێت وەك خۆی زیندووی بکەمەوە.

خواوەند باکانی رەوانە کرد و خۆڵەمێشیان لەدەریاوە گەڕاندەوە. خۆڵەمێشەکەی کۆکردەوە . ئەوکەسانەی بۆ ڕژاندنی خۆڵەمێش لەدەریا راسپێردرابوون، لەشوێنی خۆیان نەجوولان کەخۆڵەمێشەکە دەستی بەجووڵە کرد. جەرجیس تۆزاوی لەناو خۆڵەمێشەکە هاتەدەر. سەری خۆی دەتەکاند.

کەسەکان گەڕانەوە و جەرجیسیش لەگەڵ ئەوان گەڕایەوە. کاتێک بۆ لای پاشاکە گەڕانەوە، داستانی باکە و زیندووبوونەوەی جەرجیسیان بۆ باس کرد.

پاشا وتی: ئەی جەرجیس، بەکارێك رازی دەبێت کەخێری من و تۆی تیا بێت؟ ئەگەر خەڵکان نەڵێن تۆ منت بەزاندووە، باوەڕ بە تۆ دێنم و دەبمە شوێنکەوتەی دینەکەت. یەکجار سوجدە بە ئەفلقون ببە یا مەڕێك بکەرە قوربانی بتەکەی من. ئەوسا کارێك دەکەم ببێتە هۆی رەزامەندی تۆی.

کاتێك جەرجیس ئەم قسەی بیست، بیری لەوە کردەوە: کاتێك پاشا بۆ لای

بتەکەی دەنێرێت، لەناوی ببات بەو هیوایەی کاتێك بتەکە لەناو دەچێت، پاشا باوەڕ بێنێت. فێڵی لەپاشا کرد و وتی: رازیم، من بۆ لای بتەکەی خۆت رەوانە بکە تا سوجدەی بۆ ببەم یا مەڕێکی بۆ بکەمە قوربانی.

پاشا بەقسەکەی رازی بوو، هەستا و دەست و قاچی ئەوی ماچ کردو وتی: داوا لەتۆ دەکەم ئەمڕۆ لەماڵەکەی من بەسەر ببەیت و ئەم شەو لەگەڵ من رۆژ بکەیتەوە. لەسەر جێگەکەی من بخەوە و بحەوێرەوە بۆ ئەوەی رەنجی ئەشکەنجە و ئازار لەتۆ بڕەوێتەوە و خەڵك رێز و گەورەیی تۆ لای من ببینن.

پاشا ماڵەکەی خۆی بۆ جەرجیس چۆڵ کرد. هەموو کەسانی ماڵەکەی خۆی بردەدەر. جەرجیس مایەوە تا شەو داهات. هەستا و نوێژی کرد و زەبووری خوێندەوە. دەنگی خۆش بوو. کاتێك ژنی پاشا دەنگی ئەوی بیست، بەرەو لای دەنگەکە ڕۆشت. لەناکاو جەرجیسی بینی لەپشت سەری وەستا و لەگەڵ ئەو دەگریت. پێشنیاری باوەڕهێنانی پێکرد و فەرمانی پێدا باوەڕەکەی خۆی بشارێتەوە. بۆ بەیانی ئەویان بۆ بتخانەکە برد تا سوجدە بۆ بتەکان ببات. بەو پیرێژنەی جەرجیس لەماڵەکەی ئەودا زیندانی بوو، وتیان: دەزانی دوای تۆ، جەرجیس شەیدای دنیا بوو و پاشا تەماحی پاشایەتی لەودا دروست کرد و ئەوی بۆ بتخانەکەی خۆی رەوانە کردووە تا سوجدە بۆ بتەکان ببات.

پیرێژمن لەگەڵ خەڵکان بەرێکەوت. کوڕەکەی خۆی کۆڵ کردبوو. سەرکۆنەی جەرجیسی کرد و خەڵك بەم کارەوە سەرقاڵ بوون.

کاتێك جەرجیس ڕۆشتە ناو بتخانەکە، خەڵکیش لەگەڵ ئەودا ڕۆشتن. پیرێژنەکەی بینی کەکوڕەکەی بەکۆڵەوە بوو. لەهەمووان زیاتر لەو نزیك بوو. کوڕی پیرێژنەکەی بەناوی خۆی بانگ کرد کەزمانی کرایەوە و وەڵامی دایەوە، پێشتر هیچ کات قسەی نەکردبوو. لەکۆڵی دایکی هاتەخوار و دەستی بەرێگە ڕۆشتن کرد. پێشتر هیچ کات لەسەر قاچی خۆی رێگەی نەبڕیبوو.

کاتێك لەبەردەم جەرجیسدا وەستا، پێی وت: برۆ و ئەم بتانە بۆ لای من بانگ بکە.

بتەکان لەسەر کورسییە زێڕەکان دانرا بوون. ژمارەیان حەفتا و یەك بت بوو کەخەڵك، خۆر و مانگیشیان لەگەڵ ئەوان دەپەرەستی.

کوڕ وتی: چی بەبتەکان بڵێم؟

جەرجیس وتی: پێیان بڵێ، جەرجیس سوێندتان دەدات بەئافرێنەرەکەتان تا بڕۆنە لای.

کاتێك کوڕ ئەم قسەی بەبتەکان وت، هەموویان بەتلاوتل بەرەو لای جەرجیس بەرێکەوتن. کاتێ گەیشتنە لای جەرجیس، بەپێ لەزەویدا و هەموویان بەزەویدا ڕۆشتنەخوار. ئیبلیس لەناو سکی یەکێك لەبتەکان هاتەدەر و هەڵات چوونکە دەترسا لەوەی بەناخی زەویدا بڕواتە خوار.

کاتێك بۆ لای جەرجیس گەڕایەوە، جەرجیس قژی ناوچاوانی گرت و پێی وت: ئەی گیانی ناپاك و ئەی ئافرێنراوی مەلعوون، خۆت و خەڵکان لەناو دەبەیت لەکاتێکدا باش دەزانی سەرئەنجامی تۆ و سوپاکەت جەهەننەمە.

ئیبلیس وتی: ئەگەر سەرپشکم بکەن لەنێوان هەموو ئەو شتانەی لەژێر هەتاودایە و تاریکی شەو لەوەوە سەرچاوە دەگرێت، بۆ من بێت یا یەکێك لەمناڵەکانی ئادەم بۆ یەك سات گومڕا بکەم، ئەو یەك ساتە هەڵدەبژێرم چوونکە ئەو چێژەی لەم کارە دەستم دەکەوێت، بەرابەر بەهەموو چێژەکانی خەڵکە.

ئەی جەرجیس مەگەر نازانی خواوەند هەموو فریشتەکانی بۆ سوجدە بردن بۆ ئادەم ناچار کرد و جبرەئیل و میکائیل و ئیسرافیل و هەموو فریشتە نزیکەکان و دانیشتووانی ئاسمان سوجدەیان بۆ برد جگە لەمن و وتم سوجدە بۆ ئەم ئافرێنراوە نابەم چوونکە لەو باشترم.

کاتێك شەیتان ئەم قسەی هێنایە سەرزمان، جەرجیس بەرەڵای کرد. لەو ڕۆژەوە ئیبلیس نەڕۆشتۆتە ناو سکی هیچ بتێك و چیتر ناڕوات لەترسی ئەوەی نەوەك بەناخی زەویدا بڕواتە خوار.

پاشا وتی: ئەی جەرجیس، فێڵت لەمن کرد و خواکانی منت لەناوبرد.

جەرجیس وتی: ئەم کارەم بەئەنقەست کرد بۆ ئەوەی وانە وەربگریت و بزانی ئەگەر بتەکان بەو شێوەی تۆ دەڵێت، خواکان دەبوون، دەیانتوانی خۆیان لەدەستی من ڕزگار بکەن. چۆن پشت بەو خوایانە دەبەستیت کەناتوانن لەئافرێنراوێکی لاوازی وەك من خۆیان بپارێزن.

دەڵێت: کاتێك جەرجیس ئەم قسانەی هێنایە سەرزمان، ژنی شا لەگەڵ خەڵکانی دەوروبەری قسە و باوەڕی خۆی ئاشکرا کرد. بێزاری لەدینەکەی ئەوان دەربڕی و

ئاماژەی بەکردەوەکانی جەرجیسدا و وتی: تەنیا ئەوە ماوەتەوە ئەم پیاوە دۆعا بکات بۆ ئەوەی خواوەند ئێوە بەناخی زەویدا بباتە خوار، بەهەمان شێوە کەبتەکانتان لەناوچوون. ئەی خەڵکینە، لەخواوەند بترسن و گیانی خۆتان مەخەنە مەترسییەوە.

پاشا پێی وت: هاوار لەتۆ، ئەسکەندەرە، ئەم جادووگەرە لەماوەی یەك شەودا تۆی گومڕا کرد. من بۆ ماوەی حەوت ساڵە رووبەرووی دەبمەوە و نەیتوانی من گومڕا بکات.

ژن وتی: مەگەر نابینی بەچ شێوەیەك خواوەند ئەو بەسەر تۆدا زاڵ دەکات و لەهەموو شوێنێك بەڵگەکانی خۆی بەئاشکرا و راشکاوی نیشانی تۆ دەدات.

پاشا فەرمانیدا بەو دارەوە هەڵیواسن کەجەرجیسیان پێهەڵواسی و شانە ئاسنییەکان بەجەستەی ئەودا بێنن. کاتێك ئازاری ئەشکەنجە بەژنەکە، گەیشت، وتی: ئەی جەرجیس لەخوا بپاڕێرەوە ئازارەکانم کەمبکاتەوە چوونکە لەئەشکەنجە رەنجێکی زۆرم بەرکەوتووە.

جەرجیس وتی: سەیری سەرەوە بکە. کاتێك سەیری کرد، پێکەنی.

جەرجیس وتی: بۆ پێدەکەنی؟

وتی: دوو فریشتە لەسەر سەری خۆم دەبینم کەتاجێك لەزێروزێوەکانی بەهەشتیان پێیە و چاوەڕێی گیانی منن تا بەو تاجەی بیرازێننەوە و بۆ بەهەشتی ببەن.

کاتێك خواوەند گیانی ئەوی گرت، جەرجیس دۆعای کرد و وتی: خودایە، بەم بەڵایانە رێزت لەمن گرت بۆ ئەوەی پێگەی شەهیدانم پێببەخشی. خواوەندا، رۆژەکانی کۆتایی من نزیك بۆتەوە کەبەڵێنت پێداوم، خودایە، داوا دەکەم گیانی من بستێنیت و لێرە ناڕۆم تا عازابی خۆت بۆ ئەم خەڵکە رەوانە و دڵی من ئاسوودە و چاوەکانم رووناك بکەیتەوە، چوونکە ستەمیان لەمن کرد و ئەشکەنجەیان دام. داوا لەتۆ دەکەم دوای من هەموو ئەو کەسانەی پێشنیاری خواپەرەستیم پێکردوون، بەبەلاً و زیانەکان گرفتار بن، بیری من بکەنەوە و هەرکەس بەناوی من لەتۆ پاڕایەوە، زیانی لەسەر هەڵبگریت و بەزەییت پییایدا بێتەوە.

کاتێك جەرجیس ئەم دۆعایەی بەرز کردەوە، خواوەند ئاگری بەسەر خەڵکەکەیدا باراند و کاتێك سووتان، هێرشیان کردە سەر جەرجیس و بەشمشێر لێیاندا چوونکە

لەتاو ئازاری سووتان، تووڕە بوون. بەمشێوەیە خواوەند، چوارەم مەرگی بەجەرجیس بەخشی. کاتێك شارەکەیان سووتا و بوو بەخۆڵەمێش، خواوەند ئەوی لەسەر زەوی هەڵگرت و بەرزی کردەوە، سەرەو خوار و ژێر و رووی کرد. بۆ رۆژگارێکی دوور و درێژ دووکەڵێکی بۆگەنی لێ بەرز دەبوویەوە و هەر کەس بۆنی دەکرد، نەخۆش دەکەوت. نەخۆشییەکان جۆراوجۆر و هاوشێوەی یەك نەبوون.

هەموو ئەو باوەڕدارانەی لەگەڵ جەرجیسدا کوژران، سی و چوار هەزار کەس بوون. ژنی پاشا، یەکێك بوو لەوان.

## گێڕانەوەکات سەبارەت بە پاشا فارسەکان

ن: کەرووداوە باوەڕپێکراوەکان لەدەورانی پاشای تیرەکان تا رۆژگاری ئەردەشێر لەنێوان فارس و منالەکانی ئیسرائیل و رۆم و عەرەبەکانمان باس کرد، باسی پاشا فارسەکان و سالەکانی پاشایەتی ئەوان دەکەین تا رەوڕەوی مێژووی بەرێگەی خۆیدا بڕواتە پێش.

لەکاتی پاشایەتی ئەسکەندەر لەسەر سەرزەمینی بابل بەوتەی مەسیحیەکان و شوێنکەوتەکانی کتێبی کۆن پێنسەد و بیست و سێ سالْ و بەوتەی ئاگرپەرستەکان دووسەد و شەشت و شەش سالْ تێپەڕی.

### ئەردەشێر پاشا کوڕی بابەك لەگەلْ فارسەکان شۆڕشی کرد

ڕەچەلەکی ئەو بەم شێوەیە: ئەردەشێر کوڕی بابەك کوڕی مەلەکخێر کوڕی ساسانی بچوك کوڕی بابەك کوڕی ساسان کوڕی بابەك کوڕی مەهومن کوڕی ساسان کوڕی بەهمەن شا کوڕی ئیسفەندیار کوڕی بەشتاسب کوڕی کەیوجی کوڕی کەمیمەنش.

بەوتەیەك ئەدرەشێر کوڕی بابەك کوڕی ساسان کوڕی بابەك کوڕی زەرار کوڕی بەهافەرید کوڕی ساسانی گەورە کوڕی بەهمەن کوڕی ئیسفەندیار کوڕی بەشتاسب کوڕی لەهراسبە.

ئەردەشێر دەیویست تۆلەی خوێنی دارا کوڕی دارا کوڕی بەهمەن کوڕی ئیسفەندیار بستێنێت کە لەگەلْ ئەسکەندەر شەڕی کرد و بەدەستی پەردەدارەکانی کوژرا و دووبارە پاشایەتی بۆ بنەمالەکەی بگەڕێنێتەوە و نەریت و ریْ و رەسمی پاشا کۆنەکان کەپێش پاشای تیرەکان بوون، زیندوو بکاتەوە و پاشایەتی تایبەت بەیەك سالار و یەك پاشا بێت.

دەلێن: ئەردەشێر لەیەکێك لەگوندەکانی ئیستەخر چاوی بەدنیا هەلهێنا بەناوی

تیرە کە لەگوندەکانی خەیر لەویلایەتی ئیستەخرە. باوەگەوریێی یانی ساسان پیاوێکی بوێر و شەڕکەر بوو. بەڕادەیەك دلێر و بوێر بوو بەتەنیا ڕووبەڕووی هەشتا کەس لەشەڕکەرانی ئیستەخر بوویەوە و ئەوانی بەزاند. هاوسەرەکەی لەنەژادی یەکێك لەپاشاکانی فارس و بەزەرنگیان ناویان دەبردن. ناوی مەبهێشت و زیاد لەرادە شۆخ و شەنگ بوو. ساسان سەرپەرەستی ئاتەشکەدەی ئیستەخر بوو کە بەئاتەشکەدەی ئاناهید ناویان دەبرد. ئارەزوومەندی ڕاو و سوارکاری بوو. کاتێك مەبهێشت بابەکی هێنایە دنیا، قژی ئەو زیاتر لەبستێك درێژ بوو. کاتێك گەورە بوو و گەشەی کرد، دوای باوکی ڕاپەڕاندنی کاروباری خەڵکانی لەئەستۆ گرت و ئەردەشێری هێنایە دنیا. پاشایەتی ئیستەخەر لەدەستی یەکێك لەزەرنگیەکاندا بوو کە بەوتەی هوشام کوڕی محەممەد ناوی جوزهەرە و بەوتەی دەستەیەکی دیکە جەزهەر. سەروەرێکی بوو بەناوی تیری کەلێپرسراوی دیوەخانی پاشا بوو. کاتێك تەمەنی ئەردەشێر بوو بەحەوت ساڵ، ئەوی بۆ بەیزابە بۆ لای جەزهەر برد و داوای لێکرد ئەردەشێر بەتیری بسپێرێت تا پەروەردەی بکات و دوای خۆی ببێتە سەرپەرەستی دیوەخان و قەلای پاشا. جەزهەر ڕازی و نامەیەکی نووسی و ئەوی بۆ لای تیری ڕەوانە کرد. تیری بەخۆشحاڵییەوە ڕازی و ئەوی بەزرکوڕی خۆی ناوبرد.

کاتێك تیری دەستی بەپەروەردە کردنی ئەردەشێر کرد، دەستەیەك لەئەستێرەناسەکان و پێشگۆکان وتیان دەبێتە پاشای ویلایەتەکان. ئەردەشێر لەخۆبووردوویی لەخۆی نیشان دەدا بەلاّم هەواڵەکە تا دەهات زیاتر لەناو خەڵکان بلاّو دەبوویەوە. شەوێك لەخەودا بینی فریشتەیەك لەسەر سەری دانیشتوە و پێی وت خواوەند پاشایەتی ویلایەتەکانی پێدەبەخشێت و خۆی بۆئەو کارە ئامادە بکات. کاتێك لەخەو هەستا، خۆشحاڵ بوو. یەکەم کاری ئەوە بوو بەرەو چوپانان بەرێکەوت کە شوێنێکە لەناوچەی دارابگەرد و پاشاکەی ئەو ناوچەی کوشت کەناوی فاسین بوو.

دواتر ڕووی لەکوسن کرد. پاشایەك لەوێ پاشایەتی دەکرد بەناوی مەنوچێهر، ئەویشی کوشت. ڕووی لەناوچەی لەرویر کرد و دارا پاشای ئەو ناوچەیشی کوشت. لەم شوێنانە کەسانی ڕاسپێردراوی خۆی کردە فەرمانڕەوا و سالار. داستانەکەی خۆی بۆ باوکی نووسی و فەرمانی پێدا هێرش بکاتە سەر جەزهەر لەبەیزا. بابەك ئەوی کارەی کرد و جەزهەری کوشت. تاجی لێ سەند و نامەی بۆ ئەردوان پاشای کێوەکان

و ناوچەکانی دەوروبەر نووسی و پاڕایەوە و داوای لێکرد تاجی جەزھەر بکاتە سەری شاپووری کوڕی. ئەردوان بەتوندی وەڵامی دایەوە و رایگەیاند خۆی و کوڕەکەی لەکوشتنی پاشاکان ھەڵەیان کردووە.

بابەك گرنگی پێنەدا و شاپووری کوڕی بابەك تاجی خستە سەر و لەجێگەی باوکی پاشایەتی گرتە دەست. نامەی بۆ ئەردەشێر نووسی تا بڕواتە لای.

ئەردەشێر رازی نەبوو، شاپوور لەم کارەی توڕە و سوپایەکی کۆکردەوە بۆ ئەوەی ھێرش بکاتە سەر ئەردەشێر.

کاتێك ئەردەشێر ئەم ھەواڵەی بیست، رووی لەئیستەخر کرد. لەوێ دەستەیەکی زۆر لەبراکانی خۆی بینی کەھەندێکیان بەساڵ و تەمەن لەو گەورەتر بوون. براکان کۆبوونەوە و تاج و تەختی پاشایەتیان ھێنا. ھەموویان ملکەچی فەرمانەکانی ئەردەشێر بوون. ئەردەشێر تاجی لەسەر کرد ولەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت. کاروبارەی بە بەھێزی دەست پێکرد. کەسانی بۆ ناوچەکان نارد وکەسێکی بەناوی ئەبر سام کوڕی رەحفەری کردە وەزیری خۆی. دەسەڵاتی پێدا و کاروبارەکانی بەو سپارد. فاھری کردە موبدی موبدان. ئاگادار بوویەوە براکانی لەگەڵ دەستەیەك لەکەسە نزیکەکانی خۆی مەبەستی کوشتنی ئەویان ھەیە. ژمارەیەکی زۆری لەوان کوشت.

دوای ئەوە خەڵکی دارابگەرد شۆڕشیان کرد. رووی کردە ئەو شارە و دەستی بەسەردا گرت و دەستەیەکی زۆری لەخەڵکەکەی کوشتار کرد.

دواتر بەرەو کرمان بەرێکەوت. بلاش لەوێ پاشایەتی دەکرد. شەڕێکی قورسی لەگەڵ کرد. ئەردەشێری خۆی جەنگا و بلاشی کوشت. شارەکەی گرت و کوڕەکەی خۆی کەئەویش ناوی ئەردەشێر بوو وەك پاشای شارەکە دەسنیشانی کرد.

لەسەر کەنارەکانی دەریایی فارس پاشایەك بەناوی ئەبتەنبود پاشایەتی دەکرد. خەڵکان دەیانپەرەستی و کڕنوشیان بۆ دەبرد. ئەردەشێر ھێرشی کردەسەر و کوشتی. بەشمشێرەکەی خۆی ئەوی کردە دوو لەت. کەسانی نزیکی ئەوی کوشتار و لەژێرخانەن و ساردخانەکان گەنجی زۆری بەدەست ھێنا.

ئەوسا لەئەردەشێرە خەرەوە نامەی بۆ ئەبرساس و دەستەیەك لەپاشاکانی ھاوشێوەی ئەو نوسی تا ملکەچی فەرمانەکانی بن. پاشاکان رازی نەبوون. ھێرشی

کردە سەریان و کاتێك مەهرەکی کوشت، بەرەو ناوچەی گوڕ بەرێکەوت و بناغەکەی دارشت. کۆشکی تەربالْ و ئاتەشکەدەیەکی لەوێ بنیاتنا. لەمکاتەدا نێردراوی ئەردوان بەنامەیەکەوە گەیشت.

ئەردەشێر کەسەکانی کۆکردەوە و نامەکەی خوێندەوە. ناوەرۆکەکەی بەمشێوە بوو: ئەی کوڕدی پەروەردە کراو لەخێوەتی کوردان، سنورەکانی خۆت بەزاند و مەرگی خۆتت پێش خست. کێ رێگەی پێداییت تاج بخەیتە سەر و دەست بەسەر ویلایەتەکاندا بگریت و پاشا و خەڵکان ملکەچی خۆت بکەیت؟ کێ فەرمانی پێداییت لەبیابان بناغەی شارێك دابرێژیت کە دەفەرسەخ درێژ بێت و بەئەردەشێر ناوی ببەیت. هەروەها نووسیبووی: پاشای ئەهوازی رەوانە کردووە بۆ ئەوەی بەند لەدەست وپێی بنێت و لەگەڵ خۆیدا بیبات.

ئەردەشێر لەوەلاّمدا نووسی: ئەو تاجەی خستمە سەرم و ئەو ویلایەتانەی دەستم بەسەردا گرت، خواوەند بەمنی بەخشی و هاوکاری کردم تا ستەمکاران و پاشاکان بکوژم. بەلاّم ئەو شارەی دەبێت دروستی بکەم و بەئەردەشێر ناوی ببەم، هیوادارم تۆ دەستگیر و سەری تۆی و گەنجینەکانت بۆ ئاتەشکەدەی ئەردەشێرە خەرە رەوانە بکەم.

ئەردەشێر مەبەستی ڕۆشتن بۆ ئیستەخری کرد و ئەبرسامی لەئەردەشێر خەرە بەجێهێشت. ئەوەندەی نەخایاند نامەی ئەبرسامی پێگەیشت کەپاشای ئەهواز هاتووە و بەزیو گەڕاوەتەوە. دواتر هێرشی کردە سەر ئیسفهان و شاز شاپوور پاشای ئیسفهانی ئەسیر و دواتر کوشتی.

ئەردەشێر هێرشی کردە سەر فارس و مەبەستی شەڕ کردن لەگەڵ نیروفەر پاشای ئەهوازی کرد. لەرامهوڕمۆزەوە بەرەو ئەرگان و ساروتاشان بەرێکەوت و دواتر ڕۆشتە سرق و لەگەڵ دەستەیەك لەهاوەلاّنی خۆی لەکەنارەکانی دوجەیل دابەزی. دەستی بەسەر شارەکەدا گرت و بناغەی شاری سوق الاهوازی دارشت و هاورێ لەگەڵ تالاّنییەکی فراوان بەرەو فارس گەڕایەوە.

جارێکی دیکە لەفارسەوە لەرێگەی کازەروون بەرەو ئەهواز بەرێکەوت و لەئەهوازەوە بەرەو میسا. پاشاکەی بەناوی بەندو کوشت و بناغەی شاری کەرخ نیسانی دارشت.

ئەردەشێر بۆ فارس گەڕایەوە و نامەی بۆ ئەردوان نوسی تا شوێنێك بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە دیاری بكات. ئەردوان وەڵامی دایەوە: لەكۆتایی مانگی مێهر لەسارای هورموزگان ڕووبەڕووی تۆ دەبمەوە.

ئەردەشێر پێش ئەردوان ڕۆشتنە شوێنی مەبەست و لەسارادا جێگیر بوو. خەندەكی لێدا دەستی بەسەر كانیاو و سەرچاوەكەی ئەو ناوچەیەدا گرت. ئەردوان هات و خەڵكان بۆ شەڕ ریزیان بەست. شاپوور كوڕی ئەردەشێر بۆ شەڕ كردن لەگەڵ ئەردوان بەرێكەوت. شەڕ دەستی پێكرد و دەربەنداز دەبیری ئەردوان بەدەستی شاپوور كوڕی ئەردەشێر كوژرا. ئەردەشێر هێرشی كردە سەر ئەردوان و ئەوی كوشت. ژمارەیەكی زۆر لەكەسە نزیكەكانی ئەردوان كوژران و ئەوانی دیكەیان هەڵاتن. دەڵێن ئەردەشێر پیادە بوو وسەری ئەردەوانی بەپێ شێلا. ئەو ڕۆژە ئەردەشێریان بەشای شاكان ناو برد.

ئەردەشێر لەشوێنی خۆیەوە بەرەو هەمەدان بەرێكەوت و دەستی بەسەر ئەو شارەدا گرت. دەستی بەسەر كێوەكان و ئازەربایجان و ئەرمینییە و موسڵدا گرت. دوای موسڵ، بەرەو سورستان بەرێكەوت كەهەمان سوادە. دەستی بەسەردا گرت و لەكەناری دیجلە ڕووبەڕووی شاری تەهسەبوون لەرۆژهەڵاتی مەداین بوو، لەرۆژئاوا شارێكی دروست كرد و بەئەردەشێر ناوی برد. كردی بەویلایەت و بەهرسیر و ڕومقان و نەهری لەقیت و كوسی و ڕووباری جوبەری پەیوەستی ئەو شارە كرد و كاربەدەستانی خۆی لەو ناوچانە دانا.

لەسوادەوە بەرەو ئیستەخر گەڕایەوە و لەوێوە بۆ سیستان و گورگان. لەگورگانەوە مەبەستی ڕۆشتن بۆ ئەبر شەهر و مەروی كرد و لەوێوە ڕۆشتە بەلخ و خارەزم كە لەنزیك خوراسان بوون. لەمەرو بەرەو فارس كەوتەرێ و لەشاری گور نیشتەجێ بوو. نێردراوانی پاشای كوشان و شای توران و شای مەكران ملكەچ و فەرمانبردار گەیشتنە لای ئەردەشێر.

ئەردەشێر لەشاری گورەوە بەرەو بەحرەین كەوتەرێ و گەمارۆی خستە سەر سەنتەرق شا. پاشا بەناچاری خۆی لەدیواری شارەكەوە خستە خوار و مرد. ئەردەشێر بەرەو مەداین بەرێكەوت و لەوێ مایەوە و تاجی بەشاپووری كوڕی بەخشی.

دەڵێت: لەگوندی لار لەدێهاتی کوجران، لەدێهاتەکانی کەناری ئەردەشێر خەرە، شاژنێك دەژیا کەخەڵکان دەیانپەرەست و کڕنوشیان بۆ دەبرد. ماڵ و گەنجینەی فراوانی لەبەر دەستا بوو. ئەردەشێر گەمارۆی خستە سەرشارەکەی، ئەوی کوشت و هەموو ماڵ و گەنجەکانی ئەوی تالآن کرد.

دەڵێن: ئەردەشێر بناغەی هەشت شاری دارشت ولەناو ئەوان: رام ئەردەشێر، ریو ئەردەشێر، ئەردەشێر خەرە کەهەمان شاری گورە و لەفارسە، هورموز ئەردەشێر کەهەمان سوق الاهوازە، لەئەهوازە ، بێە ئەردەشێر لەرۆژئاوای مەداین و ئوستاباز ئەردەشێر کەهەمان کەرخی میسانە لەسواد، فەسا ئەردەشێر کەهەمان شاری خەتە لەبەحرەین و بوزئەردەشێر کەهەمان حەزەیە لەموسڵ.

دەڵێن: ئەردەشێر لەکاتی دەرکەوتنی بۆ پاشای تیرەکان نامە پاراو و ئاشکراکانی نووسی. لەگەڵ ئەوان گفتوگۆی کرد و داوایکرد ملکەچی فەرمانەکانی بن. لەکۆتاییەکانی رۆژگاری خۆی وەسیەتی لای جێگرەکەی خۆی کرد. کردەوەکانی بەهەمان شێوە پەسەند کراو و پیرۆز بوو. هیچ کات سوپاکەی رووبەرووی شکست نەبوویەوە و ئاڵاکەی بەردەوام دەشەکایەوە. ویلایەتەکانی دروست کرد و بناغەی شارەکانی دارشت و ئاوەدانییەکانی ئاوەدان کردەوە. ماوەی پاشایەتی ئەو لەو کاتەوەی ئەردوانی کوشت، تا ئەو کاتەی کۆچی دوایی کرد، چواردەساڵی خایاند.

بەوتەیەك ماوەی پاشایەتی ئەو چواردەساڵ و دە مانگ بوو.

لەهوشامی کەلبی دەگێرنەوە: ئەردەشێر هاورێ لەگەڵ سوپای فارس روویان لەعێراق کرد تا دەست بەسەر پاشایەتی ئەم سەرزەمینەدا بگرێت. بابا، پاشای ئەرمەنییەکان بوو. ئەردەشێر پاشای ئەردوانییەکان.

هوشام دەڵێت: ئەرمەنییەکان نبتیەکانی سواد بوون و ئەردوانییەکان نبتیەکانی شام.

دەڵێت: ئەم دوو پاشایە کە لەسەر پاشایەتی شەری یەکیان دەکرد، بۆ شەر کردن لەگەڵ ئەردەشێر، یەکیان گرت. رۆژێك ئەم و رۆژێك ئەویان شەری دەکرد. ئەو رۆژەی نۆرەی شەری بابا بوو، ئەردەشێر شەری نەدەکرد و ئەو رۆژەی دەبوا ئەردوان شەر بکات، ئەردوان بۆ شەر نەدەهات. ئەردەشێر لەگەڵ بابا ئاشتی کرد بۆ ئەوەی دەست لەشەر هەڵبگرێت و ئەردوان بەتەنیا جێبێڵێت و ئەردەشێر کاری بەبابا وپاشایەتی ئەو

نەبێت. بەمشێوەیە ئەردەشێر بۆ شەڕ کردن لەگەڵ ئەردوان دەرفەت و هێزی تەواوی دەست کەوت و زۆری نەخایاند ئەردوانی کوشت و دەستی بەسەر پاشایەتیەکەیدا گرت. بابایش ملکەچی فەرمانەکانی بوو. ئەردەشێر دەستی بەسەر پاشایەتی عێراقدا گرت و پاشاکان ملکەچی فەرمانەکانی بوون. هەموو نەیارەکانی لەناو برد وهەمووانی بۆ ئەنجامدان و جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی ناچار کرد.

کاتێك ئەردەشێر، دەستی بەسەر پاشایەتی عێراقدا گرت، ژمارەیەکی زۆر لەتنوخیەکان نەیانویست لەسنووری ئەودا بمێننەوە و فەرمانەکانی ئەنجام بدەن. ئەو کەسانەی لەهۆزی قوزاعە بوون، لەگەڵ مالك و عەمرۆ کوڕانی فەهم و مالك کوڕی زوهەیر و کەسانیتر کۆبوونەوە تا بەرەو شام بڕۆن . ڕۆشتن و لەشام پەیوەستی هۆزەکانی قوزاعەی شام بوون.

ئەو عەرەبانەی لەناو خەڵکەکەی خۆیان، ڕووداوێکیان دەقەوماند یا بژێویان دەست نەدەکەوت، بەرەو عێراق ملی ڕێگەیان دەگرتەبەر و لەحیرە نیشتەجێ دەبوون. ئەوان سێ دەستە بوون: دەستەیەکیان تنوخیەکان بوون کە لەرۆژئاوا لەنێوان حیرە و ئەنبار و لەسایەوانەکان و خێوەتە مووین و پەشمینەکان نیشتەجێ بوون. دەستەیەکی دیکەیان عیبادییەکان کە لەحیرە مانەوە و لەوێ ماڵ و بینایان دروست کرد. دەستەی سێیەم ئەحلاف وپەیوەستی خەڵکی حیرە و لەگەڵ ئەوان نیشتەجێ بوون. لەتنوخیەکان و عیادییەکان نەبوون و ملکەچی فەرمانەکانی ئەردەشێ بوون. حیرە و ئەنبار لەرۆژگاری بەخت نەسر دروست کران. ئەنبار بۆ ماوەی پێنسەد و چەند ساڵ ئاوەدان بوو تا ئەو کاتەی لەرۆژگاری عەمرۆ کوڕی عودەی حیرە ئاوەدان بوویەوە. عەمرۆ لەو شارەدا نیشتەجێ بوو. حیرە بۆ ماوەی پێنسەد و سی و چەند ساڵ ئاوەدان بوو تا ئەو کاتەی بناغەی شاری کوفە داڕژا و موسوڵمانان لەو شارە نیشتەجێ بوون. هەموو پاشایەتی عەمرۆ کوڕی عودەی سەد و هەشت ساڵی خایاند: پەنجا و نۆ ساڵ لەرۆژگاری ئەردوان و پاشای تیرەکان و بیست و سێ ساڵ لەرۆژگاری پاشایەتی فارسەکان کەچواردە ساڵ و چەند مانگی لەرۆژگاری ئەردەشێر کوڕی بابەك و هەشت ساڵ و دوو مانگی لەرۆژگاری شاپوور کوڕی ئەردەشێردا بوو.

## گێڕانەوەکان سەبارەت بە پاشای فارسەکان دوای ئەردەشێر کوڕی بابەك

کاتێك ئەردەشێر کوڕی بابەك مرد، کوڕەکەی شاپوور پاشایەتی گرتەدەست. کاتێك ئەردەشێر کوڕی بابەك پاشایەتی گرتەدەست، ژمارەیەکی زۆری لەئەشکانییەکان کوشت کەپاشای تیرەکان لەوان بوون و لەناوی بردن. ئەمە لەبەر سوێندی ساسانی گەورە کوڕی ئەردەشێر کوڕی بەهمەن کوڕی ئیسفەندیار باوەگەورێی ئەردەشێری بابەك و سوێندی خواردبوو: ئەگەر ڕۆژێك پاشایەتی بگرێتەدەست، لەنەژادی ئەردەشێر کوڕی خەرە کەس بەزیندووی نەهێڵێتەوە و ئەمە لەسەر نەوەکانی خۆی کردە ئەمرێکی پێویست. وەسیەتی کرد ئەگەر پاشایەتیان گرتەدەست، یەك کەس لەوان بەزیندووی نەهێڵنەوە. یەکەم کەس لەمناڵەکانی ئەو کەپلەی پاشایەتی بەدەست هێنا، ئەردەشێری بابەك بوو کە لەسەر ڕاسپاردەی وەسیەتی باوەگەورێی خۆی ساسان، هەموویانی بەژن و پیاوەوە کوشت بەشێوەیەك کەدەڵێن یەك کەس لەوان بەزیندووی نەمایەوە.

ئەردەشێر لەسەرزەمینی دارا کچێکی دەستکەوت و عاشقی جوانییەکەی بوو. لەڕچەڵەکی ئەوی پرسی. ئەو کچی پاشای کوژراو بوو، بەڵام وتی خزمەتکاری یەکێك لەژنەکانی پاشا بووە. ئەردەشێر پرسیاری لێکرد: ژنی یا کچ؟

کچی وەڵامی دایەوە: کچم.

ئەردەشێر نزیکی لەگەڵ کرد و ئەوی کردە هاوسەری خۆی. لەئەردەشێر دووگیان بوو. کاتێك زانی بەهۆی دووگیانی خۆی، گیانی پارێزراو دەبێت، بەئەردەشێری وت لەنەوەکانی ئەشکە. ئەردەشێر بێزاری خۆی لەو دەربڕی. هەرچند کوڕی سامی بانگ کرد کەپیرەپیاوێکی پەککەوتە بوو، پێی وت کەژنەکەی لەنەوەکانی ئەشکە و ئێمە دەبێت بەرابەر بەوەسیەتی ساسانی باوەگەورێمان وەفادار بین. هەرچەند دەزانی زیاد لەرادە ئەوم خۆش دەوێت، بەڵام بیبە و بیکوژە.

پیرەکە ئەوی برد بۆ ئەوەی بیکوژێت. ژن لەدووگیانی خۆی ئاگاداری کردەوە. ماماکانیان هێنا و قسەکەیان پشتراست کردەوە. ئەوی خستە ژێرخانێك و پیاوەتی

خۆی بڕی و کردیە ناو کیسەیەك و مۆری لێدا. بۆ لای پاشا گەڕایەوە. پاشا پرسی: چیت کرد؟

هەرچەند وەڵامی دایەوە: ئەوم خستە ناو سکی زەوی. کیسەکەی بەپاشادا و وتی: بەئەنگوستیلەکەی خۆت مۆری لێبدات و بەخەزێنەی بسپێرێت.

شا ئەو کارەی کرد. ژنەکە لای پیرەپیاوەکە بوو تا منداڵەکەی هێنایە دنیا. پیرەکە نەیویست لەخۆوە ناو لەکوڕی پاشا بنێت و نەیوست لەکاتی منداڵی پاشا لەبوونی منداڵەکەی ئاگادار بکاتەوە تا ئەو کاتەی دەگاتە تەمەنی بلۆق و ئەدەب فێر دەبێت.

پیرەپیاو لەکاتی لەدایك بوونی منداڵەکە، ئەستێرەی بەختی ئەوی ناسی و زانی ڕۆژێك پاشایەتی دەگرێتەدەست. بەناوێکی تایبەت بانگی کرد کەتایبەتمەندی و ناوی ئەو بێت و کاتێك پاشا لەبوونی منداڵەکەی خۆی ئاگادار ببێتەوە، بتوانێت وەك پاشا هەڵیبژێرێت. بەشاهپووری ناوینا و یەکەم کەس بوو ئەو ناوەیان لێنا. عەرەب ئەو بەشابووری سوپا ناو دەبەن.

دەستەیەك وتوویانە: ناوینا ئەشەپوور. ئەشە ناوی پاشایەك بوو کەڕچەڵەکی دایکی بۆ ئەو دەگەڕایەوە.

ئەدەرشێر ڕۆژگارێکی درێژی بەسەر برد و منالّی بۆ نەهاتە دنیا. ڕۆژێك پیرەپیاوەکە ڕۆشتە لای پاشا و ئەوی بەخەمبار بینی، وتی: پاشا لەبەر چی خەمبارە؟

ئەردەشێر وتی: چۆن خەمبار نەبم، لەرۆژهەڵات و ڕۆژئاوا شمشێرم وەشاند تا بەمەبەستەکەم گەیشتم، پاشایەتی باوکانم زیندوو کردۆتەوە بەڵام ئێستا خۆم منالّم نییە و بیّ ئەوەی منالّێکم جێگەم بگرێتەوە، لەم دنیایە کۆچ دەکەم.

پیر وتی: ئەی پاشا، خوا لێت ڕازی بێت و تەمەنی درێژت پێبدات، تۆ لای من منالّێکت هەیە. داوای ئەو کیسە بکە بەتۆم سپارد و مۆرت لێدا، تا هەموو شتێکت بۆ باس بکەم.

ئەردەشێر داوای کیسەکەی کرد و مۆری ئەنگوستیلەکەی خۆی بەسەر کیسەکەوە بینی. کردیەوە و پیاوەتی پیاوەکەی بینی لەگەلّ نامەیەك بەم ناوەرۆکە.

من کچەکەی ئەشکم تاقیکردەوە و لەشای شاکان ئەردەشێر دووگیان بوو. فەرمانی کوشتنی ئەوی بەمندابوو، بەلآم لەناو بردنی کچی پاشام بەڕەوا نەزانی و کچی ئەشکم لەژێرخانی ماڵەکەمدا هێشتەوە بەهەمان شێوە کەپاشا فەرمانیدابوو. پیاوەتی خۆم بڕی تا بەهیچ شێوەیەك ئەندێشەی خراپ نەکات و بزانێت کەپاسەوانێکی چاکەکار و چاکەخوازی منالّی پاشا بووین تا لەفلاّن کاژێر لەفلاّن ساڵ پەیوەستی باوکی بێت.

ئەردەشێر فەرمانی پێدا کەکوڕەکەی لەگەڵ سەد و بەوتەیەك لەگەڵ هەزار کوڕ بەهەمان ئەندازە و بەهەمان جل و بەرگ بهێنێت. پیرەپیاو ئەو کارەی کرد و کاتێك ئەردەشێر سەیری کردن، لەناو ئەوان کوڕەکەی خۆی ناسیەوە بێ ئەوەی هیچ نیشارە یا ئاماژەیەکی بۆکرابێت یا پێی درابێت.

فەرمانیدا هەموویان بۆ حەوشی تەنیشت هەیوانەکە ببەن و چۆگانەکان بگرنەدەست و گەمە بەچۆگان و گۆی بکەن. ئەردەشێر لەهەیوان لەسەر تەختەکەی دانیشتبوو. گۆی کەوتە ناو هەیوانەکە و کەس بوێری ئەوەی نەبوو بڕوات گۆیەکە بێنێتەوە جگە لەشاپوور کەڕۆشت و ئەردەشێر بوێری ئەوی بۆ ئەم کارەی پەسەند کرد و نیشانەکانی منالّەکەی خۆی لەودا بینی.

ئەردەشێر پێی وت: ناوت چییە؟

وتی: شاپوور.

ئەردەشێر وشەی شاپووری هێنایە سەرزمان.

کاتێك دەرکەوت کەکوڕی خۆیەتی، تاجی پێبەخشی و ئەوی کردە جێگری خۆی. فارسەکان پێش ئەوەی شاپوور ببێتە پاشا، لەژیانی باوکی، زانست و ئاوز و دلێری و چاکەکاری ئەویان تاقیکردەوە.

کاتێك شاپووری تاجی کردەسەر، گەورەکان لای ئەو کۆبوونەوە. تەمەنی درێژیان بۆ ئەو خواست و چاکەکارییەکانی باوکیان بیرخستەوە. شاپوور بەوانی وت: هیچ شتێکی لەبیرخستنەوەی کردەوە چاکەکانی باوکی پێ پەسەندتر نییە. بەڵێنی چاکە و چاکەکاری پێدان.

فەرمانیدا لەخەزێنەکان بەسەران و سوپاییەکان و نیازمەندان ببەخشن. بۆ

کاربەدەستی ویلایەتەکان نامەی نووسی و فەرمانی ئەو کارەیشی بەواندا. بەخششەکانی ئەو دوور و نزیکی گرتەوە و بژێوی ئەوان رووی لەباش بوون کرد.

کاربەدەستانی هەڵبژارد و بەوردی چاودێری کاروباری تایبەت بەمسکێن و ژێر دەستەکانی دەکرد. چەندین هەواڵی لەخوراسانەوە پێگەیشت و بەناچاری دەبوا بۆ ئەو ناوچانە بڕوات. مەبەستی ڕۆشتن بۆ خوراسانی کرد و کاروبارەکانی ئەو شارەی ساماندا. ئەوسا بۆ نەسیبین گەڕایەوە.

دەڵێن: دیواری شارەکە دارما و کەلێنێکی تیادەرکەوت و شاپوور لەوێوە ڕۆشتە ناو شارەکە. خەڵکانێکی زۆری کوشت و ئەسیری گرت و دەستی بەسەر ماڵ و سامانی قەیسەردا گرت.

دواتر لەنەسیبینەوە بەرەو شام ودیاری رۆم بەرێکەوت و دەستی بەسەر زۆر لەشارەکانی ئەو سەرزەمینانەدا گرت. دەڵێن: لەناو ئەو شارانەی دەستی بەسەردا گرت، قالوقیە و قەزوقیە (کیلکیە و پادوکیە) دەبینران. لەئەنتاکیە گەمارۆی خستە سەر ئەلریانوس پاشای رۆم. ئەوی ئەسیر کرد ولەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان ئەوی برد و لەجوندی شاپوور نیشتەجێی کردن.

دەڵێن: ئەلریانووسی بۆ دروست کردنی بەندەر شووشتەر ناچار کرد و فەرمانی پێدا پانتاییەکەی بکاتە هەزار زەراع. ئەلریانوس، بەندەرەکەی بەهاوکاری کەسانێکی رۆمی دروست و دوای تەواو کردنی داوای ئازادی خۆی لەشاپوور کرد.

دەڵێن: سامانێکی زۆری لەو سەند و لووتی بڕی و ئازادی کرد. دەستەیەك دەڵێن: ئەوی کوشت.

لەبەرابەر تکریت، لەنێوان دیجلە و فورات، شارێك بوو بەناوی حەزەر. یەکێك لەجەرمەقیەکان بەناوی ساترون لەوێ نیشتەجێ بوو. هەمان کەسە کەباوکی داوودی ئەییادی سەبارەت بەو دەڵێت: ((مەرگ دەبینم لەحەزەرەوە بەسەر ساترون، پاشای ئەو دیارە دابەزیوە. عەرەبەکان بەزیزن ناوی دەبەن.

دەڵێن: زیزن لەخەڵکانی باجرمیە و بەوتەی هوشامی کەلبی عەرەبە. رەچەڵەکی ئەو بەمشێوەیە: زیزن کوڕی معاویە کوڕی عوبەید کوڕی ئەجرام کوڕی عەمرۆ

کوڕی نەخع کوڕی سەلیح کوڕی حیلوان کوڕی عیمران کوڕی ئەلحاف کوڕی قوزاعە. دایکی زیزن لەخەڵکانی تەزید کوڕی حیلوان و ناوی جەیهەلەیە. زیزن بەناوی دایکی بەناوبانگ بوو.

بەگومانی کوڕی کەلبی، زیزن پاشای سەرزەمینی جەزیرە و لەمناڵەکانی عوبەید کوڕی ئەجرام و هۆزەکانی قوزاعە خەڵکانێکی زۆر هاوڕێیەتی ئەویان دەکرد. پاشایەتی ئەو تا سنورەکانی شام درێژ دەبوویەوە.

ئەو کاتەی شاپوور کوڕی ئەردەشێر بەرەو خوراسان بەرێکەوت، هێرشی کردە سەر بەشێك لەسواد. کاتێك شاپوور گەڕایەوە و لەرووداوەکە ئاگادار بوویەوە، هێرشی کردەسەر و لای قەڵاکەی ئەو ئوردوی لێدا. زیزین لەناو قەڵاکە گەمارۆدرا.

بەگومانی کوڕی کەلبی شاپوور بۆ ماوەی چوار ساڵ گەمارۆی خستەسەر. نەیتوانی قەڵاکە وێران بکات و زیزن بکوژێت. بەڵام بەهەمان شێوە کە لەهۆنراوەکەی ئەشعی ئاماژەی پێدراوە، گەمارۆکە دوو ساڵی خایاند.

کچی زیزن ناوی نەزیرە بوو. یەکێك بوو لەجوانترین ژنانی رۆژگاری خۆی. ئازاری ژنانەی بوو. بۆ دەرەوەی شار رەوانە کرا. نەریتیان بەو شێوە بوو لەکاتی ئازار، ژنانیان دەناردە دەرەوەی شار. شاپوور وەك دەڵێن پیاوێکی قۆز و سەرنج راکێش بووە. کاتێك یەکیان بینی، عاشقی یەك بوون. کچ نامەی بۆ شاپوور نوسی: چ پاداشتێکم دەدەیت ئەگەر رێگەیەکت نیشان بدەم بۆ ئەوەی بتوانیت دیواری شارەکە وێران بکەیت و باوکم بکوژیت.

شاپوور وتی: داوای هەرچی بکەیت، تۆ دەکەمە شاژنی حەرەم و دەتکەم بەهاوسەری تایبەتی خۆم.

کچ وتی: کۆترێکی سەوز و تەوقدار بگرە و پێی ئەو بەخوێنی مانگانەی کچێکی چاوڕەش بنوسە و بەرەڵای بکە تا لەسەر دیواری شارەکە بنیشێتەوە و دارمێت. ئەمە تلیسمی شار و تەنیا بەم شێوەیە وێران دەکرا.

شاپوور خۆی ئامادە کرد. کچ وتی: من شەراب بەپاسەوانەکان دەدەم، کاتێك مەست و سەرخۆش بوون، ئەوان بکوژە و وەرە ناو شارەکە. کاتێك دیواری شارەکە دارما، بەزۆر وشەڕ دەستی بەسەر شارەکەدا گرت. زیزنی کوشت و هۆزەکانی

قوزاعەی هاورێی زیزن لەناوچوون. کەس لەوان نەمایەوە. دەستەیەك لەمناڵەکانی حیلوانیش لەناو چوون.

شاپوور شارەکەی وێران کرد و نەزیرە کچی زیزنی لەگەڵ خۆی برد و لەعەین ئەلتمەر ئەوی کردە بووکی خۆی.

دەڵێن: نەزیرە ئەو شەوە لەتاو توندی و زبری جێگەکەی تا بەیانی ناڵاندی. جێگەکەی لەحەریری پڕکراو لەمەوریشم بوو. شاپووری بەدوای هۆکاری بێ ئۆقرەیی ئەودا دەگەڕا. گەڵای داری مەوردی بینی کە بەسکیەوە نووسا بوو و برینداری کردبوو. دەڵێت: پێستی نەزیرە بەئەندازەیەك نەرم بوو مۆخی لەژێر پێستەکەوە دەبینرا. شاپوور پێی وت: باوکت چ خواردنێکی پێدەدایت؟

وتی: رۆنەکەرە و مۆخ و شیرەی خورمای تازە پێگەیشتوو و شەرابی پاك.

شاپوور وتی: ئەو بەڵایەت بەسەر باوکت هێنا کە ئەو هەموو چاکەی لەگەڵ دەکردی، چ بەڵایەك بەسەر مندا دەهێنیت. فەرمانی بەسوارکارێکدا تا سوار ئەسپێکی سەرکێش بوو. قژی ژنەکەی بەکلکی ئەسپەکەوە بەستەوە. ئەسپەکە غاریدا و جەستەی ئەو لەت لەت بوو.

شاعیرەکان لەهۆنراوەکانانی خۆیان ئاماژەیان بەزیزن داوە. عودەی کوڕی زەید لەهۆنراوەکەی خۆی مەبەستی ئەوی هەیە کەناوەرۆکەکەی بەمشێوەیە:

خاوەنی حەزەر بناغەی ئەوێی داڕشت
دیجلە و خابور خەراجیان بۆ ئەو رەوانە دەکرد
حەزەری لەمەرمەڕ دروست کرد و بەگەچ رازاندییەوە.
باڵندەکان لەترۆپکی ئەو هێلانەیان دروست کرد
رووداوەکانی رۆژگار دەست بەرداری نەبوون
پاشایەتییەکەی لەناوچوو و کەس لەبەر دەرگای ئەو نەمایەوە.

دەڵێن: شاپوور لەمیسان، بناغەی شادشاپووری داڕشت کە بەنبتی بەدیما ناوی دەبەن.

دەرکەوتنی مانی زەندیق لەرۆژگاری شاپووردا بوو.

دەڵێن: کاتێك شاپوور پۆشتە جێگەی جوندی شاپوور بۆ ئەوەی بناغەی

شارەکە دابڕێژێت، پیرەپیاوێکی بینی بەناوی بیل، لێی پرسی: ئایا ڕەوایە لێرە بناغەی شارێك دابڕێژرێت؟

بیل وەڵامی دایەوە: ئەگەر لەم تەمەنی من توانای نووسین ڕەوا بێت، ڕەوایە لەم شوێنەدا بناغەی شارێك دابڕێژرێت.

شاپوور وتی: هەر دوو کارەکە کەگومان دەکەیت، ئەگەری نییە، ئەگەری هەیە. نەخشەی شارەکەی ڕشت و بیلی بۆ لای مامۆستایەك رەوانە کرد و رایسپارد تا لەماوەی یەك ساڵ نووسین و حسێب کردنی فێر بکات. مامۆستا لای ئەو مایەوە، سەر و ریشی ئەوی تاشی تا بەهۆیەوە سەرقاڵ نەبێت. بۆ فێر کردنی ئەو هەوڵیدا و دوای ماوەیەك ئەوی بردە لای شاپوور کەزانستی نووسین و حسێب کردن فێر ببوو. شاپوور ژماردن و تۆمار کردنی خەرجیەکانی شاری بەو سپارد. ئەو ناوچەی کردە ویلایەت و بە بەهازەندیشاپوور ناوی برد کە ماناکەی ((باشتر لەئەنتاکیە)). بەشاری شاپووریش ناوی دەرکرد. ئەو شارەیە بەجوندی شاپوور ناوی دەبەن. خەڵکی ئەهواز ئەوشارە بەناوی سەرپەرەستەکەی بە شاری بیل ناو دەبەن.

کاتێك مەرگی شاپوور نزیك کەوتەوە، پاشایەتی بەکوڕەکەی خۆی هورموز بەخشی و پەیمانی لێوەرگت و رایسپارد تا بەپێی پەیمانەکە کردەکانی ئەنجام بدات.

سەبارەت بەماوەی پاشایەتی شاپوور بۆچوونەکان جیاوازە: دەستەیەك وتوویانە سی ساڵ و پانزە ڕۆژی خایاند. دەستەیەکی دیکە وتوویانە ماوەی پاشایەتی ئەو سی و یەك ساڵ و شەش مانگ و نۆزدە رۆژ درێژەی کێشا.

## دوای شاپوور کوڕەکەی، هورموز پاشایەتی گرتەدەست

نازناوی هورموز بوێرە. لەجەستە و کردار و روخسار هاوشێوەی ئەردەشێر بوو بەڵام لەئەندێشە و چارەسەر کردن جیاواز. لەبوێری و ئازایەتی هاوتای نەبینراوە.

دەڵێن: دایکی لەکچەکانی مێهرەك پاشایە. ئەردەشێر لەئەردەشێر خەرە تۆوی ئەوی چاند. ئەستێرە ناسەکان بەئەردەشێریان وتبوو یەکێك لەنەوەکانی ئەو دەبێتە پاشا. ئەردەشێر شوێن پاشماوەکانیان کەوت و هەموویانی کوشت. دایکی هەرموز رزگاری بوو. خاوەن ئاوز و شۆخ و شەنگ و کەسێکی خاوەن شکۆ بوو. رووی کردە سارا و پەنای بۆ شوانێك برد. رۆژێك شاپوور بەمەبەستی راو کردن ڕۆشتەدەرەوەی شار. بەدوای نێچیردا ماوەیەکی زۆر لەشار دوورکەوتەوە، تینویەتی تەنگی پێهەڵچنی. خێوەتەکانی دایکی هورموزی لەوێ بینی و بەرەو لای ئەوان بەرێکەوت. شوانەکان لەماڵ نەبوون. داوای ئاوی کرد و ژنەکە ئاوی پێدا. جوانی بێ وێنە و ئەندامی سەرسوڕهێنەری و روخساری دڵرفێنی ئەو بینی. زۆری نەخایاند شوانەکان گەڕانەوە. شاپوور سەبارەت بەو ژنە پرسیاری کرد و یەکیان ئەوی وەك کچی خۆی ناساند. شاپوور مەبەستی ئەوەی کرد وەك هاوسەری خۆی هەڵیبژێرێت. شوانەکە رازی بوو. شاپوور ئەوی بۆ شوێنی نیشتەجێ بوونی خۆی برد و فەرمانیدا پاك و خاوێنی بکەنەوە و جل و بەرگی لەبەر بکەن و بیرازێننەوە. مەبەستی نزیك بوونەوە لەژنەکەی کرد و لەگەڵ ئەودا بەتەنیا مایەوە. ئەوەی پیاو لە ژنی دەوێت، داوای لێکرد بەڵام ژنەکە رازی نەبوو و لەم بگرە وبێنەدا بەسەر شاپووردا سەرکەوت. شاپووری لەهێزی ئەو سەریسوڕما. کاتێك ئەم بگرە وبێنە درێژەی کێشا، ژن وتی کەکچی مێهرەکە و ئەو کارەی لەبەر ئەوە کردووە تا لەزیانی ئەردەشێر بەدوور بێت. شاپوور بەڵێنیدا نهێنییەکەی لای کەس نەدرکێنێت. لەگەڵ ئەو نزیکی کرد و هورموزی هێنایە دنیا. ئەم نهێنییە وەك خۆی مایەوە و ساڵەکان بەسەر چوون.

رۆژێك ئەردەشێر بەرەو ماڵی شاپوور بەرێکەوت چوونکە دەیویست گفتوگۆی لەگەڵ بکات. لەناکاو ڕۆشت و کاتێك ئارامی گرت، هورموز دەرکەوت. گەورە و

چۆگانێکی بەدەستەوە بوو و گەمە وبەدوای گۆیدا ڕایدەکرد. ئەردەشێر کاتێك ئەوی بینی، سەریسوڕما و نیشانەکانی ئەوی ناسیەوە کە لەناو بنەماڵەی پاشاکان و لەناو بنەماڵەی ئەردەشێر دیار و زەق بوون وەك جوانی ڕوخسار و گەورەیی ئەندامەکان و تایبەتمەندییەکانی دیکە. ئەردەشێر ئەوی بانگ کرد و سەبارەت بەشاپوور پرسیاری لێکرد. بەمشێوەیە دانی بەهەموو شتێکدا نا و باوکی لەڕووداوەکە ئاگادار کردەوە. ئەردەشێر خۆشحاڵ و پێی وت: پێشگۆیی ئەستێرەناسەکان سەبارەت بەنەوەکانی مێهرەك کەیەکێك لەوان پاشایەتی دەگرێتەدەست، دێتەدی. مەبەستیان هورموز بوو چونکە ئەو یەکێکە لەنەوەکانی مێهرەك. دڵی ئارام بوویەوە و چیتر نیگەران نەبوو.

کاتێك ئەردەشێر مرد و پاشایەتی بەشاپوور گەیشت، هورموزی کردە لێپرسراوی ولایەتی خوراسان. ئەوی بۆ ئەو شارە ڕەوانە کرد. هورموز لەکارەکان سەربەخۆیی لەخۆی نیشاندا و شاکانی دەوروبەری سەرکوت و ستەمکاری کردەپیشە.

ئاژاوەچییەکان هەواڵیان بۆ شاپوور هێنا و ئەویان خستە گومانەوە کەئەگەر هورموز بانگ بکات و ئەو نەڕوات، مەبەستی ئەوەی هەیە پاشایەتی بگرێتەدەست. ئەم هەواڵانە بەهورموز گەیشتەوە.

دەڵێن: لەتەنیاییدا دەستی خۆی بڕی و شتێکی خستە سەر بۆ ئەوەی شوێنەوارەکەی دیار نەبێت. ئەوی لەپۆششێکی گرانبایيەوە ئاڵاند و خستیە ناو کیسەیەك و ڕەوانەی شاپووری کرد. نامەیەکی بۆ نووسی و ڕایگەیاند دەستی خۆی بۆیە بڕیوە تا خۆی لەتۆمەتەکان بێ بەری بکات. نەریت بەو شێوەیە بوو کەکەسانی کەم ئەندام پاشایەتیان نەدەکرد. کاتێك نامە و کیسەکە بەدەستی شاپوور گەیشت، دڵی لەتاو ئازار لەت لەت و خەمباری خۆی بۆ نووسی و ڕایگەیاند ئەگەر هەموو ئەندامەکانی خۆی ببڕێت، پاشایەتی جگە لەو بەهیچ کەسێك نابەخشێت.

دەڵێن: کاتێك تاجی کردەسەر و لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت، گەورەکان لەدەوری کۆبونەوە و دۆعایان بۆکرد. بەشێوەیەکی پەسەند وەڵامی دانەوە و هەستیان بەڕاستی وتارەکەی کرد. دادپەروەری لەگەڵ ژێردەستەکان کردە پیشە و شێوازێکی پەسەند کراوی گرتەبەر. بناغەی ویلایەتی ڕامهورموزی دارشت. ماوەی پاشایەتیەکەی یەك ساڵ و دە ڕۆژی خایاند.

## دوای هورموز بەهرامی کوڕی پاشایەتی گرتەدەست

ئەو کوڕی هورموز کوڕی شاپوور کوڕی ئەردەشێر کوڕی بابەکە.

دوای مەرگی عەمرۆ کوڕی عودەی کوڕی نەسر کوڕی رەبیعە، کاربەدەستی شاپوور و کاربەدەستی هورموز و بەهرام لەسنوورەکانی عەرەب و هۆزەکانی رەبیعە و موزێر و هۆزەکانی سارای عێراق و حیجاز و جەزیرە، کوڕی عەمرۆ بوو کەبەئەمرو ئەلقەیس ناویان دەبرد. ئەو یەکەم پاشا لەبنەماڵەی نەسر کوڕی رەبیعە و کاربەدەستانی فارس بوو کەئایینی مەسیحی هەڵبژارد.

بەوتەی هوشامی کەلبی ئەمرۆ ئەلقەیس سەد و چواردەساڵ پاشایەتی کرد: بیست و سێ ساڵ و یەك مانگ لەرۆژگاری شاپوور کوڕی ئەردەشێر، ساڵێك و چەند رۆژ لەرۆژگاری هورموز کوڕی شاپوور و سێ ساڵ و سێ مانگ و سێ رۆژ لەرۆژگاری بەهرام کوڕی هورموز و هەژدە ساڵ لەرۆژگاری بەهرام کوڕی بەهرام.

دەڵێن: بەهرام کوڕی هورموز پیاوێکی خۆڕاگر و خەڵکان لەپاشایەتی ئەو دڵخۆش و رەزامەند بوون. کردەوەکانی چاك و لەبەرێوبردنی کاروباری پاشایەتی شێوەی باوکانی گرتەبەر.

دەڵێن: مانی زەندیق پێشنیاری دینەکەی بەبەهرام کرد. بەهرام دینەکەی ئەوی تاقیکردەوە و ئەوی بەشوێنکەوتەی شەیتان و بانگەشەکەری شەیتان پەرەستی ناساند و فەرمانیدا ، ئەویان کوشت و پێستیان داماڵی و پڕیان کردە لەکا و لەسەر یەکێك لەدەروازەکانی جوندی شاپوور هەڵیانواسی کە بەدەروازەی مانی ناوبانگی دەرکرد. شوێنکەوتەکانی دینەکەی ئەوی کوشتار کرد. ماوەی پاشایەتی ئەو سێ ساڵ و سێ مانگ و سێ رۆژ درێژەی کێشا.

## دوای بەهرام، بەهرامی کوڕی پاشایەتی گرتەدەست

ئەو بەهرام کوڕی بەهرام کوڕی هورموز کوڕی شاپوور کوڕی ئەردەشێر کوڕی بابەکە.

دەڵێن: لەکاروباری تایبەت بەپاشایەتی، شارەزا بوو. کاتێك لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت، گەورەکانی خەڵك دۆعایان بۆ کرد بەهەمان شێوە کەدۆعایان بۆ باوکی کردبوو. وەڵامی چاکەی دانەوە. شێوازێکی پەسند کراوی گرتەبەر و وتی: ئەگەر رۆژگار هاوکاریمان بکات، سپاسی ئەم بەخششەی دەکەین و ئەگەر جیاواز لەمە بێت، بەبەشی خۆمان رەزامەندین.

سەبارەت بەماوەی پاشایەتی ئەو بۆچوونەکان جیاوازە: دەستەیەك وتوویانە ماوەی پاشایەتی ئەو هەژدە ساڵی خایاند و دەستەیەك دەڵێن حەفدە ساڵ.

## دوای ئەو بەهرامی ناسراو بەشای شاکان، پاشایەتی گرتەدەست

ئەو کوڕی بەهرام کوڕی بەهرام کوڕی هورموز کوڕی شاپوور کوڕی ئەردەشێر کوڕی بابەکە.

کاتێك لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت، گەورەکان کۆبوونەوە و هیوای تەمەنێکی درێژیان بۆخواست. بەشێوەیەکی چاك و پەسەند کراو وەڵامی دانەوە.

پێش ئەوەی پاشایەتی بگرێتە دەست، فەرمانڕەوایەتی سیستانی دەکرد. ماوەی پاشایەتی ئەو چوارساڵی خایاند.

## دوای ئەو نێرسی پاشایەتی گرتەدەست

نێرسی کوڕی بەهرامە و برای بەهرامی سێیەمە. کاتێك لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت، سەرانی خەڵك لەدەوری کۆبوونەوە و هیوای تەمەنێکی

درێژیان بۆ خواست. بەشێوەیەکی پەسەند کراو وەڵامی دانەوە. وتی: تا لەکاروبارەکان هاوکاری بکەن. لەگەڵ ئەوان هەڵس و کەوتێکی پەسەند کراوی گرتەبەر. ئەو ڕۆژەی لەسەر تەخت دانیشت، وتی:

لەسپاس کردنی خواوەند بۆ ئەو نیعمەتی پێی بەخشیوین، بێ ئاگا نابین.

ماوەی پاشایەتی ئەو نۆ ساڵ درێژەی کێشا.

## دوای ئەو هورموز پاشایەتی گرتەدەست

هورموز کوڕی نێرسی کوڕی بەهرام کوڕی بەهرام کوڕی هورموز کوڕی شاپوور کوڕی ئەردەشێر کوڕی بابەکە.

خەڵك لەو دەترسان چوونە توندوتیژیان لەکردەوەکانی ئەودا بینیبوو. رایگەیاند ترسی خەڵکان لەلێپێچینەوە و لێپرسینەوەی ئەو لەکار و باری فەرمانڕەوایەتی بووە بەڵام سەبارەت بەتوند و تیژی کرداری رایگەیاند کە کرداری خۆی گۆڕیوە. زۆر لەسەر خۆ کاروبارەکانی هەڵدەسووڕاند و لەگەڵ ژێر دەستەکان دادپەروەی کردە پیشە. بۆ باشتر کردنی بارودۆخی نیازمەندان و ئاوەدانی ویلایەتەکان و دادپەروەری لەگەڵ ژێر دەستەکان هەوڵی دەدا.

کاتێك هورمز مرد، کوڕی نەبوو جێگەی بگرێتەوە. ئەمە لای خەڵکان دژوار بوو. پرسیاریان لەژنەکانی کرد و زانیان یەکێك لەوان دووگیانە.

دەستەیەك وتوویانە هورموز پاشایەتی بەمناڵێکی ناوسکی یەکێك لەژنەکانی بەخشی و شاپووری شانکونکەر چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

ماوەی پاشایەتی هورموز بەوتەی دەستەیەك شەش ساڵ و پێنج مانگ درێژەی کێشا و بەوتەی دەستەیەك حەوت ساڵ وپێنج مانگ.

## دوای ئەو شاپووری شانکونکەر چاوی بەدنیا هەڵهێنا

شاپوور کوڕی هورموز کوڕی بەهرام کوڕی بەهرام کوڕی هورموز کوڕی شاپوور کوڕی ئەردەشێر کوڕی بابەکە. بەهۆی وەسیەتی باوکی پاشایەتی بۆ مایەوە. خەڵك لە لەدایك بوونی ئەو شادمان بوون. ئەم هەواڵەیان لەهەموو سوچ و قوژبنێکی وڵاتدا بڵاو کردەوە. نامەکانیان نووسی و پەیکیان بۆ هەموو ویلایەتەکان رەوانە کرد. وەزیر و دەبیرەکانی سەردەمی باوکی درێژەیان بەکارەکانی خۆیاندا.

بەمشێوە بوو تا هەواڵەکە بڵاو بوویەوە و پاشاکانی وڵاتەکانی دەوروبەر ئاگادار بوونەوە و زانیان کەفارسەکان پاشایان نییە. منداڵێك لەناو لانکەدایە کەنازان سەرئەنجامەکەی بەچی کۆتایی دێت. تورك و رۆم چاوی تەماحیان لەوڵاتی فارسەکان بڕی. سەرزەمینی عەرەبەکان لەهەموو شوێنێك نزیکتر لەسنوری پاشایەتی فارسەکان بوو و لەهەموو خەڵکانیتر زیاتر نیازمەندی ئەوە بوون دەست بەسەر هۆکارەکانی بژێوی و سەرزەمینی ئەواندا بگرن چوونکە بەدەست هێنانی بژێوی بۆ ئەوان دژوار بوو. دەستەیەکی کاروان لەوان لەدیاری عەبدقەیس و بەحرەین و کازیمە لەدەریاوە هاتن و لەکەنارەکانی ئەردەشێر خەرە و کەنارەکانی فارس دابەزین. مەڕ و بەرهەمی کشتوکاڵی خەڵکانیان برد و وێرانی و خاپووریەکی فراوانیان بەجێهێشت. بۆ ماوەیەکی زۆر مانەوە و کەس لەفارسەکان مەبەستی شەڕ و رووبەروو بوونەوەی ئەوانی نەکرد چوونکە تاجی پاشایەتیان بەمنداڵێك بەخشیبوو.

دەڵێن: یەکەم نیشانەکانی چارەسەر کردن و تێگەیشتنی شاپوور ئەمە بوو: شەوێك لەکۆشکی پاشای تیبسون بوو. بەرەبەیان لەدەنگەدەنگی خەڵکان لەخەو هەستا، وتی: چی روویداوە؟

پێیان وت: ئەم دەنگە دەنگە تایبەتە بەو کەسانەی دێن و ئەو کەسانەی دەڕۆن کە لەسەر پردی دیجلە قەرەباڵغیان دروست کردووە. فەرمانیدا پردێکی دیکە دروست بکەن بۆ ئەوەی یەکیان تایبەت بێت ئەو کەسانەی کەدێن و یەکیان بۆ ئەو

کەسانەی دەڕۆن و چیتر خەڵکان قەرەباڵغی دروست نەکەن. خەڵك لەوشیاری ئەو شادمان بوون کە بەو تەمەنە هەستی بەچارەسەری ئەم کێشەیە کرد. فەرمانەکەی ئەویان ئەنجامدا.

دەڵێن: پێش ئەوەی هەتاوی ئەو ڕۆژە ئاوا ببێت، پردێکی هاوشێوەی پردەکەیان دروست کرد و بەمشێوەیە خەڵك لەمەترسییەکانی سەر پردەکە ڕزگاریان بوو.

شاپوور لەیەك ڕۆژ بەئەندازەیەك گەشەی دەکرد کەمناڵەکانی دیکە لەچەند ڕۆژدا. دەبیر و وەزیرەکان کارەکانیان دەخستە بەردەمی. یەکێك لەو کارانە، کاروباری تایبەت بەسوپای سنوورەکان بوو کەڕووبەڕووی دوژمن ببوونەوە. هەواڵیان پێگەیشتبوو کەزۆربەیان سستی و لاوازی لەخۆیان نیشاندەدەن. بابەتەکەیان لەبەرچاوی شاپووردا گەورە کرد. بەڵام وتی: ئەم بابەتە زۆر گرنگ نییە چوونکە چارەسەرەکەی ئاسانە. فەرمانیدا نامە بۆ سوپاییەکان بنووسن کەکاتی مانەوەیان لەو ناوچانە درێژ بۆتەوە و ماوەیەکی زۆر لەکەسان و هاوڕێیانی خۆیان بەدوور بوون. هەر کەس دەخوازێت بگەڕێتەوە، مۆڵەتی ئەو کارەی پێدەدرێت. هەرکەس دەخوازێت بمێنێتەوە،، بمێنێتەوە وئەو کەسانەی گەڕانەوە هەڵدەبژێرن تا کاتی پێویست لای کەسەکانی خۆیان بمێننەوە و لەدیاری خۆیان دوور نەکەونەوە.

کاتێك وەزیرەکان ئەم قسەیان بیست، پەسەندیان کرد و وتیان: ئەگەر لەچارەسەر کردنی کاروباری تایبەت بەسوپا ئەزموونی دوور ودرێژی دەبوو، سەقامگیر بیروڕا و ڕاستی لۆژیکی ئەو زیاتر لەمە نەدەبوو.

فەرمانەکانانی بەردەوام بەویلایەت و سنوورەکان دەگەیشت و کاری سوپاکەی بەهێز و جێگیر کرد. دژمنان لاواز بوون تا ئەو کاتەی ساڵەکانی تەمەنی گەیشتە شانزە وئێسقانەکانی ڕەق بوون و توانی چەك و سیلاح بەدەستەوە بگرێت و سوار ئەسپ ببێت. سەرکردەکانی سوپا و هاوەڵانی خۆی کۆکردەوە و لەناو ئەواندا وتارێکی پێشکەش کرد. بیری نیعمەتەکانی خواوەندی کردەوە کەبەخۆی و باوکانی بەخشرا بوو و باسی ئەو کێشانەی کرد کە لەسەردەمی مناڵی ئەو

هاتبوونەوە ئاراوە و وتی بۆ بەرگری کردن لەسنوورەکانی ولآت دەست بەکار دەبێت و مەبەستی ئەوەی کردووە بۆ شەڕ هێرش بکاتە سەر دەستەیەک لەدوژمنان و هەزار پیاوی شەڕکەر لەگەڵ خۆی دەبات.

خەڵکان هەستان و پاڕانەوە و سپاسیان کرد. داوایان لێکرد لەشوێنەکەی خۆی بمێنێتەوە و سالارەکان وسوپاییەکان رەوانە بکات تا ڕەنجی ڕۆشتن و شەڕ کردن لەسەر شانی ئەو هەڵبگرن بەلآم رازی نەبوو. داوایان لێکرد سوپایەکی زیاتر و گەورەتر لەگەڵ خۆی ببات.

هەزار کەس لەئازاکان و بوێرەکانی سوپای هەڵبژارد و پێی وتن بەفەرمانەکانی ئەو بجووڵێنەوە و لەو عەرەبانەی رووبەروویان دەبنەوە، کەسیان بەزیندوویی نەهێڵنەوە و بەکۆکردنەوەی تالآنییەکان سەرقاڵ نەبن. لەگەڵ ئەوان بەرێکەوت و ئەو عەرەبانەی ناکاوگیر کرد کەهێرشیان کردبووە سەر سنووری فارسەکان. ژمارەیەکی زۆر لەوانی کوشت و کەسانێکی زۆری لێ ئەسیر کردن و ئەوانیتر هەلآتن.

هاوریێ لەگەڵ سوپاکەی خۆی لەدەریا پەڕییەوە و هێرشی کردە سەر سەرزەمینی بەحرەین و خەڵکانی کوشت، بەلآم تالآنیان کۆنەکردەوە.

لەسەر ڕۆشتن بەردەوام بوو تا گەیشتە هجر کەدەستەیەک لەعەرەبەکانی تەمیم و بەکر کوڕی وایل و عەبدقەیس لەوێ نیشتەجێ بوون. دەستی بەکوشتاری ئەوان کرد و بەرادەیەک خوێنی ڕشت کەوەک لافاوی باران رەوان بوو. هەلآتووان نەیاندەزانی لەکێو و ئەشکەوت و دوورگەکانی دەریا لەدەستی ئەو لەئەماندا نابن.

بەرەو دیاری عەبد قەیس بەرێکەوت و خەڵکەکەی لەناو برد جگە لەوانەی هەلآتن و پەنایان بۆ ریخەلآنەکان برد. لەوێوە هێرشی کردە سەر یەمامە و کوشتاری خەڵکەکەی کرد. هەموو کانیاو و سەرچاوەی ئاوی عەرەبەکانی کوێر و چالآوەکانی پردەکردەوە.

تا نزیک مەدینە ڕۆشت. لەهەر شوێنێك رووبەرووی عەرەبەکان بوویەوە، ئەوانی کوشتار و ئەسیر کرد. دوای ئەوە هێرشی کردەسەر دیاری بەکر و تەغلەب کە لەسەرزەمینی شام لەنێوان ولآتی فارسەکان و ڕۆمیەکان جێگیر بوو. عەرەبەکانی

کوشتار و ئەسیر و ئاوەکانی کوێر کردەوە.

شاپوور، دەستەیەک لەمناڵەکانی تەغلەبی لەدارینی بەحرەین کەپێی دەڵێن هیج، نیشتەجێ کرد. مناڵەکانی عەبدقەیس و دەستەیەک لەهۆزەکانی تەمیمی لەهجر جێگە کردەوە و مناڵەکانی بەکر کوڕی وایلی بۆ کرمان برد کە بە بەکر ئەبان ناویان دەرکرد. مناڵەکانی حەنزەلەی بۆ رەمیلەی ئەهواز برد و فەرمانیدا دروست کردنی شارێکی لەسەرزەمینی سوادادا و ناوینا گەورە شاپوور کەهەمان ئەنبارە. لەسەرزەمینی ئەهواز دوو شاری دروست کرد کەیەکیان ئیرانخەرەی شاپوور، یانی شاپوور و سەرزەمینی ئەو و بەسریانی پێی دەڵێن کەرخ و ئەوی دیکەیان شووش بوو. ئەم شارەی لەنزیك ئەو قەلایە دروست کرد کەتابووتی دانیالی پێغەمبەر لەوێدایە.

هەروەها هێرشی کردە سەر سەرزەمینی رۆم و ئەسیری زۆری گرت و لەشاری ئیرانخەرەی شاپوور نیشتەجێی کردن. عەرەبەکان بەشێوەیەکی کورت بەشوش ناویان دەبرد. فەرمانیدا لەباری جەرمی شارێکیان دروست کرد و بەخەنی شاپوور ناوی برد. ئەو شارەی کردە ویلایەتێك. لەسەرزەمینی خوراسان بناغەی شارێکی دارِشت و ناوینا نەیشابوور و کردی بەویلایەت.

شاپوور لەگەڵ قوستەنتین پاشای رۆم ئاشتی کرد. قوستەنتین ئەو کەسەیە بناغەی شاری قوستەنتینەی دارِشت. ئەو یەکەم کەس لەپاشاکانی رۆمە باوەڕی بەمەسیحیەت هێنا.

کاتێك وادەی مەرگی قوستەنیتن نزیك بوویەوە، سەرزەمینەکەی لەنێوان سێ کوڕەکەی دابەش کرد و کاتێك سێ کوڕەکەی مردن، رۆمیەکان یەکێك لەبنەماڵەی قوستەنتین بەناوی للیانوسیان وەك پاشای خۆیان هەڵبژارد. ئەو لەسەر ئایینی رۆمیەکان بوو کەپێش مەسیحیەت لەئارادا بوو. پێش ئەوەی پاشایەتی بگرێتە دەست، ئایینەکەی خۆی دەشاردەوە و بەرواڵەت خۆی وەك کەسێکی مەسیحی نیشاندەدا. کاتێك پاشایەتی گرتەدەست، دینەکەی خۆی ئاشکرا کرد و بەهەمان شێوەی پێشوو لەناو خەڵکدا بلاّوی کردەوە و برەوی پێدا و فەرمانیدا دینەکەیان زیندووو رابگرن و کەنیسەکان وێران و قەشە و شوێنکەوتە مەسیحیەکان کوشتار

بکەن.

للیانوس سوپایەکی لەرۆمیەکان و خەزەرەکانی ولأتەکەی و عەرەبەکان کۆکردەوە تا شەڕی شاپووریان پێبکات. عەرەبەکان بۆ تۆڵە سەندنەوە لەشاپوور ئەم دەرفەتەیان بەهەڵ زانی و سەد و حەفتا هەزار کەس لەوان پەیوەستی سوپاکەی للیانوس بوون. ئەوانی لەگەڵ یەکێك لەبەتریقەکانی خۆی بەناوی یوسانوس لەپێشەوەی سوپاکەی جێگیر کرد.

للیانوس هات و گەشتە سەرزەمینی فارسەکان. کاتێك شاپوور لەفراوانی سوپای رۆم و عەرەبەکان ئاگادار بوویەوە، ترسا و سیخوڕەکانی رەوانە کرد تا لەژمارە و چۆنییەتی سوپاکە هەواڵی بۆ بێنن. وتار و گێڕانەوەی سیخوڕەکان سەبارەت بەللیانوس و سوپاکەی جیاواز بوو. شاپوور لەگەڵ دەستەیەك لەباوەڕپێکراوانی خۆی بەشێوەیەکی نەناسراو بەرێکەوت تا خۆی سەیری سوپای رۆمیەکان بکات. کاتێك گەیشتە نزیك ئوردوگای یوسانوسی ئالأداری للیانوس، کەسانێکی لەهاوڕێیانی خۆی بۆ ناو ئوردوگاکە رەوانە کرد تا لەراستییەکان ئاگاداری بکەنەوە. رۆمیەکان هەستیان بەوان کرد و هەموویانیان گرت. ئەوانیان بردە لای یوسانوس بەلأم هیچ کام لەوان یوسانوسیان لەمەبەستیان بۆ هاتن بۆ ناو ئوردوگاکە ئاگادار نەکردەوە، جگە لەیەك کەسیان کەهەموو شتەکانی بەراستی باس کرد و شوێنی شاپووری نیشاندان. پێی وتن تا سوپایەکی لەگەڵدا رەوانە بکەن بۆ ئەوەی شاپووریان تەسلیم بکات.

یوسانوس کاتێك ئەم قسانەی بیست، یەکێك لەکەسە نزیك و تایبەتەکانی خۆی بۆ لای شاپوور رەوانە ەکرد و لەڕووداوەکە ئاگاداری کردەوە. شاپوور بۆ ئوردوگاکەی خۆی گەڕایەوە.

ئەو عەرەبانەی لەسوپاکەی للیانوسدا بوون، داوای مۆڵەتیان لێکرد تا شەڕ لەگەڵ شاپوور بکەن. مۆڵەتی پێدان. هێرشیان کردە سەر شاپوور و بلأوەیان بەسوپاکەی کرد و ژمارەیەکی زۆریان لەفارسەکان کوشت. شاپوور لەگەڵ پاشماوەی سوپاکەی هەلأت و للیانوس دەستی بەسەر شاری تیسبوندا گرت کەشوێنی نیشتەجێ بوونی شاپوور بوو. هەموو سامان و خەزێنەکانی لەو شارە

کوشتار و ئەسیر و ئاوەکانی کوێر کردەوە.

شاپوور، دەستەیەك لەمناڵەکانی تەغلەبی لەدارینی بەحرەین کەپێی دەڵێن هیج، نیشتەجێ کرد. مناڵەکانی عەبدقەیس و دەستەیەك لەهۆزەکانی تەمیمی لەهجر جێگە کردەوە و مناڵەکانی بەکر کوڕی وایلی بۆ کرمان برد کە بە بەکر ئەبان ناویان دەرکرد. مناڵەکانی حەنزەلەی بۆ رەمیلەی ئەهواز برد و فەرمانیدا دروست کردنی شارێکی لەسەرزەمینی سوادیدا و ناوینا گەورە شاپوور کەهەمان ئەنبارە. لەسەرزەمینی ئەهواز دوو شاری دروست کرد کەیەکیان ئیرانخەرەی شاپوور، یانی شاپوور و سەرزەمینی ئەو و بەسریانی پێی دەڵێن کەرخ و ئەوی دیکەیان شووش بوو. ئەم شارەی لەنزیك ئەو قەلآیە دروست کرد کەتابووتی دانیاڵی پێغەمبەر لەوێدایە.

هەروەها هێرشی کردە سەر سەرزەمینی رۆم و ئەسیری زۆری گرت و لەشاری ئیرانخەرەی شاپوور نیشتەجێی کردن. عەرەبەکان بەشێوەیەکی کورت بەشوش ناویان دەبرد. فەرمانیدا لەباری جەرمی شارێکیان دروست کرد و بەخەنی شاپوور ناوی برد. ئەو شارەی کردە ویلایەتێك. لەسەرزەمینی خوراسان بناغەی شارێکی دارشت و ناوینا نەیشابوور و کردی بەویلایەت.

شاپوور لەگەڵ قوستەنتین پاشای رۆم ئاشتی کرد. قوستەنتین ئەو کەسەیە بناغەی شاری قوستەنتینەی دارشت. ئەو یەکەم کەس لەپاشاکانی رۆمە باوەڕی بەمەسیحیەت هێنا.

کاتێك وادەی مەرگی قوستەنیتن نزیك بوویەوە، سەرزەمینەکەی لەنێوان سێ کوڕەکەی دابەش کرد و کاتێك سێ کوڕەکەی مردن، رۆمیەکان یەکێك لەبنەماڵەی قوستەنتین بەناوی للیانوسیان وەك پاشای خۆیان هەڵبژارد. ئەو لەسەر ئایینی رۆمیەکان بوو کەپێش مەسیحیەت لەئارادا بوو. پێش ئەوەی پاشایەتی بگرێتە دەست، ئایینەکەی خۆی دەشاردەوە و بەرواڵەت خۆی وەك کەسێکی مەسیحی نیشاندەدا. کاتێك پاشایەتی گرتەدەست، دینەکەی خۆی ئاشکرا کرد و بەهەمان شێوەی پێشوو لەناو خەڵکدا بلآوی کردەوە و برەوی پێدا و فەرمانیدا دینەکەیان زیندووو رابگرن و کەنیسەکان وێران و قەشە و شوێنکەوتە مەسیحیەکان کوشتار

کەوتە دەست للیانوس.

شاپوور نامەی بۆ سوپاییەکانی خۆی لەهەموو ناوچەکان نارد و ئاگاداری کردنەوە کەچ بەلأیەکیان لەللیانوس و عەرەبەکان بەسەردا هاتووە. فەرمانی بەسەرکردەی سوپاکاندا هاوریٚ لەگەلْ سوپاییەکان بەمەبەستی شەڕ کردن بەرێکەون. زۆری نەخایاند لەهەموو ناوچەکانەوە سوپاکان گەیشتن. شاپوور بەرێکەوت و شەڕی لەگەلْ للیانوس کرد. شاری تیسبونی وەرگرتەوە و للیانوس لەگەلْ سوپاکەی خۆی لەشاری بێە ئەردەشێر دابەزی. نێردراوان لەنێوان شاپوور و للیانوس هاتوچۆیان دەکرد. رۆژێك کەللیانوس لەشوێنەکەی خۆی دانیشتبوو، تیرێکی نەزانراو بەردلْی کەوت و مرد. سوپاکەی لەم رووداوە ترسان و لەپێشڕەوی لەدیاری فارسەکان بیٚ هیوا بوون. سالار و پاشایان نەبوو. داوایان لەیوسانوس کرد پاشایەتی لەئەستۆ بگرێت بەلأم رازی نەبوو. پێداگریان کرد. یوسانوس وتی باوەڕی بەئایینی مەسیحی هەیە و نابێتە پاشای کەسانێك کەباوەڕیان بەئایینەکەی نەبێت. رۆمیەکانیش دینی خۆیان ئاشکرا کرد و وتیان لەترسی للیانوس دینی خۆیان دەشاردەوە. خواستی یوسانوس و خەلْکانی رۆم وەك یەك و ئەویان وەك پاشا هەلْبژارد و ئایینەکەی خۆیان ئاشکرا کرد.

کاتێك شاپوور لەمەرگی للیانوس ئاگادار بوویەوە، کەسی بۆ لای سەرکردەکانی رۆم رەوانە کرد و وتی: خواوەند ئێوەی بەزاند و سەرکەوتنی بەئێمە بەخشی چوونکە ستەمتان لەئێمە کرد و هێرشتان کردە سەر سەرزەمینەکەمان. هیوادرام لێرە، لەبرسانا لەناو بچن و پێویستمان بەشەڕ کردن لەگەلْ ئێوە نەبێت. ئەگەر کەسێکتان وەك سالاری خۆتان دەستنیشان کردووە، ئەو بۆ لای ئێمە رەوان بکەن.

یوسانوس مەبەستی ئەوەی کرد بڕواتە لای شاپوور بەلأم هیچ کام لەسەر کردەکانی سوپا رازی نەبوون. یوسانوس گرنگی بەبیرورای ئەوان نەدا و لەگەلْ هەشتا کەس لەگەورەکانی سوپا بۆ لای شاپوور بەرێکەوت. تاجی لەسەردا بوو. شاپوور لەهاتنی ئەو ئاگادار بوویەوە وپێشوازی لێکرد. رێزیان لەیەك گرت و شاپوور بۆ رێزگرتن لەکارەکەی، ئەوی لەئامێز گرت. ئەو رۆژە لەگەلْ ئەو نانی

خوارد.

دوای ئەوە شاپوور کەسی بۆ لای سەرکردە و گەورەی خەڵکانی رۆم رەوانە کرد و وتی ئەگەر جگە لەیوسانوس کەسێکی دیکە وەك پاشای خۆیان هەڵبژێن، لەسەرزەمینی فارسەکان لەناو دەچن. پاشایەتی یوسانوس ئەوان لەبەلاَ و بەدبەختیەکان رزگار دەکات. بەم پێیە پاشایەتی بۆ یوسانس سەقامگیر بوو.

شاپوور وتی رۆمیەکان هێرشیان کردۆتە سەرسەرزەمینی ئێمە و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکانیان کوشتووە و دار و دارخورماکانی سەرزەمینی سوادیان بڕیوەتەوە و ئاوەدانییەکانیان وێران کردووە. پێویستە بەهای ئەم وێرانی و کوشتارە بدەن یا لەجیاتی ئەوە، نەسیبین بەئێمەبسپێرن چوونکە ئەم ویلایەتە لەسنووری فارسەکاندا بووە و رۆمیەکان دەستیان بەسەردا گرتووە.

یوسانوس و سەرکردەکانی هاورێی، بەداواکارییەکەی رازی بوون و نەسیبییان بەشاپووردا. خەڵك ئاگادار بوونەوە و لەپاشایەتی پاشایەك کەدینەکەی جیاواز بوو، ترسان و بەرەو شارەکانی رۆم کۆچیان کرد. شاپوور ئاگادار بوویەوە و داونزە هەزار بنەماڵەی لەخەڵکانی ئیستەخر و ئیسفەهان و ویلایەتەکانی دیکەوە هێنا و لەو شارەدا نیشتەجێی کردن.

یوسانوس لەگەڵ سوپاکەی بۆ رۆم گەڕایەوە و بۆ ماوەیەك پاشایەتی کرد و مرد.

شاپوور دەستەیەکی فراوانی لەعەرەبەکان کوشتار کرد. شانی سەرکردەکانی عەرەبی دەرهێنا و لەبەر ئەمە ئەویان بە ذوالاکتاف ناو برد (ئەکتاف کۆی کتف ە و کتف لەزمانی عەرەبی بەمانای شانە.))

دەستەیەك لەشوێنکەوتەکانی هەواڵ وتوویانە: شاپوور دوای ئەوە ژمارەیەکی فراوانی لەعەرەبەکان کوشت و لەسنوری دەسەلاَتی فارسەکان و بەحرەین و یەمامە ئەوانی دەرپەڕاند. ڕۆشتە شام و لەسنوورەکانی رۆم نزیك کەوتەوە. بەهاوەلاَنی خۆی وت مەبەستی ئەوەی کردووە بڕواتە ناو رۆم و لەنهێنییەکانیان ئاگادار ببێتەوە و هەواڵی شارەکان و ژمارەی سوپاکانی ئەوان بزانێت. رۆشتە رۆم و بۆ ماوەیەك لەوێ گەڕا و لەبارودۆخ ئاگادار بوویەوە و زانی قەیسەر ئاهەنگێکی ساز

کردووە و بەهەموو خەڵکانی وتووە لەسەر سفرەکەی ئامادە بن. شاپوور وەك کەسێکی خوازیار ڕۆشت و لەئاهەنگەکە بەشداری کرد تا قەیسەر و چۆنییەتی سفرەکەی ئەو ببینێت. ئەویان ناسیەوە و گرتیان. قەیسر فەرمانیدا و ئەویان کردە ناو پێستی مانگایەك. دواتر لەگەڵ سوپاکەی خۆی بەرەو سەرزەمینی فارسەکان بەرێکەوت و شاپووری بەو شێوەیە لەگەڵ خۆیدا برد. ژمارەیەکی زۆری لەخەڵکان کوشت و شار و گوندەکانی وێران و خاپوور کرد. دار و دارخورماکانی بڕی تا گەیشتە شاری جوندیشاپوور. خەڵکەکەی لەپشت دیواری شارەکە خۆیان حەشاردا. قەیسەر بەردهاوێژەکانی دانا و بەشێك لەشارەکەی وێران کرد.

شەوێك پاسەوانە ڕۆمیەکانی شاپوور ئاگا مانەوە و دەستەیەك لەئەسیرەکانی ئەهواز لای ئەو بوون. پێی وتن تا لەمەشکە ڕۆنەکانی زەیتون بکەن بەسەر پێستەکەدا. ئەو کارەیان کرد و پێستەکە نەرم و شاپوور لەناوی هاتەدەر. ڕۆشت تا گەیشتە دەروازەی شارەکە و ناوی خۆی بەپاسەوانەکان وت.

کاتێك ڕۆشتە ناو شارەکە، خەڵك لەبوونی ئەویان هەستیان بەخۆشحاڵی و سپاسی خوایان کرد و لەخواوەند پاڕانەوە بەشێوەیەك سوپاکەی قەیسەر لەدەنگە دەنگی خەڵکی شارەکە لەخەو هەستان. شاپوور خەڵکی شارەکەی کۆکردەوە و ئامادەی کردن. بەرەبەیان هێرشی کردە سەر ڕۆمیەکان و ئەوانی کوشتار کرد. قەیسەری ئەسیر و دەستی بەسەر سامان و ژنەکانی ئەودا گرت.

بەبەندێکی ئاسنین قەیسەری بەستەوە وبۆ ئاوەدان کردنەوەی وێرانییەکان کاری لێکێشایەوە و بەوتەیەك فەرمانی پێدا لەسەرزەمینی ڕۆم خۆڵ بۆ مەداین بێنێت تا وێرانییەکان ئاوەدان بکاتەوە و لەجیاتی دارخوارما بڕاوەکان داری زەیتون بروێنێت. ئەوسا پاژنەی ئەوی بڕی و بەسواری کەر بۆ ڕۆمی ڕەوانە کرد و وتی: سزای دەستدرێژییەکەی تۆ ئەمەیە.

دوای ئەوە شاپوور بۆ ماوەیەك لەسەرزەمینەکەی خۆی مایەوە و ئەوسا بۆ شەڕ لەگەڵ ڕۆمیەکان بەرێکەوت. ژمارییەکی زۆری لەوان کوشت و خەڵکانێکی زۆری بەئەسیری گرت. لەناوچەی شووش بناغەی شارێکی داڕشت و بەئێرانشار ناوی برد. ئەسیرەکانی لەو شارەدا نیشتەجێ کرد. دوای ئەوەی دەستی بەساماندان

وریکخستنی کاری عەرەبەکان کرد. دەستەیەك لەهۆزەکانی تەغلەب و عەبدقەیس و بەکر کوڕی وایل لەکرمان و توج و ئەهواز نیشتەجێ وبناغەی شاری نەیشابووری لەگەڵ شارەکانی دیکە لەسند و سیستان دارشت. پزیشکێکی لەهیندەوە هێنا و لەکەرخی شووش نیشتەجێی کرد. کاتێك مرد، خەڵکانی شووش بوونە میراتگەری پیشەی پزیشکی ئەو. لەبەر ئەمە ئەو ناوچەیە لەهەموو عەجەمەکان زیاتر شارەزای نهێنییەکانی پزیشکین.

شاپوور ئەردەشێری برای وەك جێگری خۆی دەستینشان کرد. ماوەی پاشایەتی شاپوور حەفتا و دوو ساڵی خایاند.

لەرۆژگاری شاپوور، ئەمرۆ ئەلقەیس کاربەدەستی ئەو لەناوچەی موزێر و رەبیعە مرد. شاپوور کوڕەکەی ئەو عەمرۆ کوڕی ئەمرۆ ئەلقەیسی لەجێگەی ئەودانا کەلەپاشماوەی دەورانی پاشایەتی شاپوور و هەموو رۆژگاری پاشایەتی براکەی ئەردەشێر کوڕی هورموز و بەشێك لەرۆژگاری شاپوور فەرمانڕەوایی ئەو ناوچانەی دەکرد. بەوتەی کوڕی کەلبی، هەموو دەورانی پاشایەتی ئەو لەسەر عەرەبەکان سی ساڵی خایاند.

دوای شاپووری شانکونەکەر

ئەردەشێر لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت

ئەو کوڕی هورموز کوڕی نێرسی کوڕی بەهرام کوڕی بەهرام کوڕی هورموز کوڕی شاپوور کوڕی ئەردەشێر کوڕی بابەکە.

کاتێك لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت، گەورەکانی خەڵکی کۆکردەوە. کاتێك کۆبوونەوە، هیوای تەمەندرێژیان بۆ خواست و رێزیان لەشاپووری برای گرت. بەشێوەیەکی پەسەند وەڵامیان دایەوە و سپاس کردنی خەڵکانی لەبراکەی پەسەند کرد.

کاتێك پاشایەتی سەقامگیر بوو، خۆی بەگەورە وسەرکردەکانەوە سەرقاڵ کرد و دەستەیەکی زۆری لەوان کوشت.

## دوای شاپوور کوڕەکەی شاپوور لەسەر تەخت دانیشت

ئەو کوڕی شاپووری شانکونکەر کوڕی هورموز کوڕی نێرسیە. خەڵکان شادمان بوون لەوەی پاشایەتی باوکی بۆ گەڕاوەتەوە. نامەی بۆ کاربەدەستانی خۆی نووسی تا بەشێوەیەکی پەسەندکراو لەگەڵ ژێر دەستەکان هەڵس و کەوت بکەن. فەرمانی بەدەبیر و وەزیر و کەسانی دەوروبەری خۆیدا و وتارێکی پاراوی بۆ خوێندنەوە. لەگەڵ مسکێنەکان و خەڵکان بەگشتی بەشێوەیەکی دادپەروەرانە هەڵس و کەوتی دەکرد چوونکە هەستی بەگوێڕایەڵی و ملکەچی ئەوان کردبوو. مامی لەسەر کار لابراوی یانی ئەردەشێر، فەرمانەکانی ئەوی جێبەجێ دەکرد.

سەران و گەورەی بنەماڵەکان، تەناف خێوەتەکەی ئەویان بڕی. خێوەتەکەی بەسەردا کەوت و مرد. ماوەی پاشایەتی ئەو پێنج ساڵی خایاند.

## دوای ئەو بەهرامی برای پاشایەتی گرتەدەست

بەهرام کوڕی شاپووری شانکونکەرە و نازناوەکی کرمانشا. لەبەر ئەوەی باوکی لەسەردەمی پاشایەتی خۆی ئەوی کردبووە فەرمانڕەوای ویلایەتی کرمان. ئەو نامەی بۆ سەرکردەکانی سوپا نووسی و بۆ ملکەچی و گوێڕایەڵی و خێرخوازی و چاکەخوازی بۆ پاشا هانیدان. لەکرمان بناغەی شارێکی داڕشت. لەگەڵ ژێر دەستەکان بەشێوەیەکی دادپەروەرانە هەڵس وکەوتی دەکرد. بۆ یانزە ساڵ پاشایەتی کرد. دەستەیەك لەشەڕکەران دژی ئەو شۆڕشیان کرد. یەکیان تیری بۆ هاویشت و کوشتی.

## دوای ئەو یەزدگێردی خراپەکار پاشایەتی گرتەدەست

ئەو کوڕی بەهرامی ناسراو بەکرمانشا کوڕی شاپووری شانکوکەرە. بەوتەی دەستەیەك لەڕەچەڵەك ناسە فارسەکان یەزدگێردی خراپەکار برای بەهرامی کرمانشا بوو نەك کوڕی ئەو. هوشامی کەلبی لەو کەسانەیە ئاماژەیان بەم بابەتە داوە و ڕەچەڵەکی ئەو بەمشێوەیە باس دەکەن.

وەك دەڵێن یەزدگێرد پیاوێکی تووڕە و بێ بەزەیی بوو. ئیراد و کێشەی فراوانی تیا دەبینرا. گەورەترین ئیرادی ئەمە بوو: فێری هۆشیاری و ئەدەب و شێوازە جۆراوجۆرەکانی زانست و لەناو زانستەکاندا کەسێکی پسپۆڕ بوو. ئەوەی نەدەبوا بەکاری دەبرد و بەردەوام ئارەزووی بۆ ئەنجامی ئەو کارانە دەکرد کەزیانیان لێدەکەوتەوە. هەموو زانایی خۆی بۆ ئاژاوەنانەوە و فرت و فێڵ بەکار دەبرد. تامەزرۆی شەڕ بوو و جیاواز لەمانە کەسێکی تووڕە و توند و تیژ بوو. هەڵەیەکی بچوك لەبەر چاوی ئەو گەورە و کەمترین تاوانی بەکارێکی مەترسیدار لەقەڵەم دەدا.

هیچ کەس تەنانەت کەسە نزیکەکانی بوێری ئەوەیان نەبوو سەبارەت بەکەسێك تکاکاری بکەن. گومانی لەهەموو کەسێك دەکرد و کەسی بەئەمینی خۆی نەدەزانی و پاداشتی بەکەس نەدەبەخشی. ئەگەر کەسێکی ریسوا و پەستیان دەهێنا، ڕێزی لێدەگرت و ئەگەر کەسێك سەبارەت بەیەکیتر قسەی لەگەڵ دەکرد، دەیپرسی: بۆ ئەم قسانەت چەندەت وەرگرتووە و کرێکەی تۆ چەندە؟ کەس جگە لەنێردراوی پاشاکان نەیدەتوانی لەگەڵ ئەو قسە بکات. ژێردەستەکان بەپێی داب و نەریت و ڕێ ورەسمەکان لەزیانەکانی ئەو بەدوور بوون بەڵام بۆ لەناو بردنی هاودەستە و هاوڕا.

بڕوای وابوو هەرکەس هەڵەیەك بکات، بەئەندازەیەك سزای دەدرێت کە لەماوەی سێسەد ساڵدا ئەشکەنجەی لەو چەشنە ئەگەری نەبێت.

سزاکانی فراوان وبەرادەیەك دژوار بوون کەخراپتر لەوە گومان ناکرێت. ئەگەر ئاگادار دەبوویەوە یەکێك لەکەسە نزیکەکانی پەیوەندی لەگەڵ یەکێك لەهاوکارانی

هەیە، ئەوی لەسەر کار لادەبرد.

لەسەرەتادا نێرسی کردە وەزیر کەبیرمەندی رۆژگار و لەئەدەب و زانست سەروەی هەموو خەڵکان بوو. ئەویان بەمێهر نێرسی و مێهر نێرسە ناو بردووە. نازناوەکەی هەزار بەندەیە. ژێردەستەکان هیوادار بوون یەزدگێرد دەستبەرداری کارە خراپەکانی ببێت و یانێرسی ئەو لەکارەکانی پەشیمان بکاتەوە. کاتێک پاشایەتی بۆ ئەو سەقامگیر بوو، ئیهانە و سەرکۆنەی گەورەکانی کرد و ئازاری بەکەسانی لاواز گەیاند. خوێنی زۆری رشت و بەرادەیەک ستەمی لەخەڵکان کرد کەژێردەستەکان تا ئەو رۆژگارە هاوشێوەیان نەبینیبوو.

کاتێک سەرکردە و گەورەکان بینیان ستەمی ئەو بەردەوام فراوانتر و زیاتر دەبێت، کۆبوونەوە و لەستەمەکانی ئەو لای خواوەند سکاڵایان کرد. پاڕانەوە و گریان تا زووتر لەدەستی ئەو رزگاریان بێت.

دەڵێن: لەگورگان بوو. لەناو کۆشکەکەی دانیشتبوو، ئەسپێک هات. یەزدگێرد تا ئەو کاتە هاوشێوەی ئەوی نەبینیبوو. خەڵکانیش بەهەمان شێوە سەریان سوڕما چوونکە تا ئەو رۆژگارە ئەسپی لەو چەشنەیان نەبینیبوو. یەزدگێردیان ئاگادار کردەوە و فەرمانیدا ئەسپەکەی بۆ زین و لغاو بکەن. کەس نەیتوانی ئەم کارە بکات. پێیان وت ئەسپەکە سەرکێشە. یەزدگێرد ڕۆشتە لای ئەسپەکە و بەدەستی خۆی لغاوی کرد. زینی خستە سەر پشتی ئەسپەکە و توندی کرد. ئەسپەکە تەکانی نەخوارد. کاتێک کلکی بەرز کردەوە بۆ ئەوەی دواوەی زینەکە توند بکات، ئەسپەکە پشتی تێکرد و لەقەیەکی لەسەر دڵیدا کەدەستبەجێ مرد و چیتر کەس ئەسپەکەی نەبینی.

دەڵێن: ئەسپەکە بەخێرایی ڕۆشت و کەس نەیتوانی بیگرێت و هیچ کەس هۆکارەکەی نەزانی. ژێردەستەکان و خەڵکان بەگشتی رزگاریان بوو و وتیان: ئەمە بەخشش و بەزەیی خواوەند بوو.

ماوەی پاشایەتی یەزدگێرد بەوتەی دەستەیەک بیست و دووساڵ و پێنج مانگ و شانزە رۆژ درێژەی کێشا و بەوتەیەک یانزە ساڵ و پێنج مانگ و هەژدە رۆژ.

کاتێک عەمرۆ کوڕی ئەمرۆ ئەلقەیس مرد، بەوتەی هوشام، شاپوور کاروباری

بەدەستی ئەوس کوڕی قەلام سپارد.

دەڵێت: ئەو لەعەمالیقە و لەمناڵەکانی عەمرۆ کوڕی عەملیقە. جەحجەبا کوڕی عەتیك دژی ئەو راپەڕی و خوێنی ڕشت. ماوەی فەرمانڕەوایەتی ئەو پێنج ساڵی خایاند. مەرگی ئەو لەدەورانی بەهرام کوڕی شاپووری شانکوکەر بوو.

دوای ئەو ئەمرۆ ئەلقەیس کوڕی عەمرۆ جڵەوی کاروبارەکانی گرتەدەست و بۆ ماوەی بیست و پێنج ساڵ فەرمانڕەوایەتی کرد. لەرۆژگاری یەزدگێردی خراپەکار مرد و یەزدگێرد جڵەوی کاروبارەکانی بەنەعمان کوڕی ئەمرۆ ئەلەقیس کوڕی عەمرۆ سپارد. دایکی نەعمان شەقیقە کچی باوکی رەبیعە کوڕی زوهەل کوڕی شەیبان بوو.

نەعمان سوارچاکی شەڕی حەلیمە و خاوەنی خوەرنەق بوو. خورەنەقی لەبەر ئەوە دروست کرد چوونکە یەزدگێردی خراپەکار کوڕی بەهرامی کرمانشا کوڕی شاپووری شانکونکەر، مناڵەکانی بەزیندووی نەدەمانەوە. فەرمانیدا تا بەدوای شوێنێکی پاك و خوێن و دوور لەنەخۆشیدا بگەڕێن. دەرەوەی حیرەیان نیشاندا. بەهرامی گوری بەنەعمان سپارد و فەرمانی دروست کردنی خوەرنەقی پێدا تا بەهرامی گور لەو کۆشکەدا نیشتەجێ بکات و لەناو ساراکانی عەرەبدا بیگەڕێنێت.

ئەو کەسەی خوەرنەقی دروست کرد، پیاوێك بوو بەناوی سنمار. کاتێك لەبینا کردنی کۆشکەکە تەواو بوو، سەریان لەجوانی و رازاوەیی کۆشکەکە سوڕما، وتی: ئەگەر دەمزانی کرێکەم دەدەن و پاداشتێکی شیاوم پێدەبەخشن، بینایەکەم دروست دەکرد تا لەگەڵ هەتاودا بسوڕێتەوە.

نەعمان وتی: دەتوانی باشتر لەمە دروست بکەیت و نەتکرد؟

دواتر فەرمانیدا و ئەویان لەبەرزایی کۆشکەکەوە فڕێدایە خوار.

باوکی تەمحانی قینی لەمبارەوە دەڵێت:

سوێند بەخوا و بەلات و عوزا

پاداشتی سنماریان پێبەخشی.

سەلیت کوڕی سەعد دەڵێت:

کوڕەکانی باوکی غەیلان لەبەرابەر پیری

و چاکەکاری ئەو

پاداشتی سنماریان پێدا.

یەزید کوڕی ئەیاسی نەهشەلی دەڵێت:

خوا کرداری خراپەکار

پاداشتی سنمار بدات و بەتەواوی بیدات.

عەبدولعوزا کوڕی ئەمرۆ ئەلقەیس کەلبیش لەمبارەوە هۆنراوەیەکی هەیە. داستانەکە بەمشێوەیە: ئەو چەندین ئەسپی بەحارس کوڕی ماریەی غەسانی پێشکەش کرد. ڕۆشتە لای ئەو و ئەسپەکانی پەسەند کرد. ئارەزوومەندی عەبدولعوزا و قسە کردن لەگەڵ ئەو بوو. پاشا کوڕێکی بۆ هاتە دنیا کە لەناو منداڵەکانی حەمیم کوڕی عەوف لەتیرەی منداڵەکانی عەبدوود لەهۆزی کەلب لەرەزاع بوو. مارێك ئەوی گەست و پاشا گومانی کرد ئەویان کوشتووە و بەعەبدولعوزای وت: ئەم خەڵکانە بێنەرە لای من.

عەبدولعوزا وتی: ئەوان خەڵکانێکی ئازادەن و من بەرەچەڵەك و نەژاد گەورەتر لەوان نیم.

حارس وتی: یا بیانهێنە یا فلآنە و فیسارە کار دەکەم.

عەبدولعوزا وتی: بەبەخششەکانی تۆ هیوادار بووم بەڵام سزاکانی تۆ بوونە لەمپەر. دوو کوڕەکەی خۆی شەراحیل و عەبدولحارسی بانگ کرد و بەواندا هۆنراوەیەکی بۆ خەڵکەکەی رەوانە کرد بەم ناوەرۆکە:

پاداشتی سنمار بەمن دەدات

خواوەند سزای خراپەی بداتەوە

سنمار هیچ گوناحێکی نەبوو

جگە لەوەی لەماوەی بیست ساڵدا ئەو کۆشکەی تەواو کرد

خشت و چیمەنتۆی گرتەوە

کاتێك بیناکە بەرز بوویەوە

هاوشێوەی کێوێکی سەربڵند

سنمار چاوەڕوانی پاداشت و بەخششەکانی دەکرد

وتی: ئەم ناجوامێرە لەبەرزایی کۆشکەکە فڕێبدەنە خوار

بەراستی ئەمە لەهەموو سەرسوڕهێنەرەکان سەرسوڕهێنەرتر بوو.

منیش لای بنەماڵەی جەفنە هیچ گوناحێکم نەبوو

ئەو دژی کەلب سوێندی خوارد

کە بەسوپایەك هێرش دەکاتە سەر سەرزەمینەکەیان

زیانت دوور بێت و لەوتەی شیتانە و بەپەلەکەی خۆت پاشگەز ببەرەوە

چوونکە رووبەرووی کوڕی جەفنە

پیاوانێك وەستاون کەستەم لەخەڵکان دوور دەخەنەوە.

هوشام دەڵێت: نەعمان چەندین جار شەڕی لەگەڵ شامیەکان کرد و چەندین زیان و بەڵای بەسەر خەڵکەکەیدا هێنا. ئەسیر وتاڵانییەکانی کۆکردەوە و لەهەموو پاشاکان بەرابەر بەدوژمن سەختگیرتر بوو. زیاتر لەهەموویان شوێن دوژمنەکانی دەکەوت. پاشای فارسەکان دوو دەستەی کردبووە هاورێی ئەو. بەیەکیان دەوت دووسەر و لەخەڵکانی تەنوخ بوون و بەدەستەکەی دیکەیان دەوت شەهبا و لەخەڵکانی فارس بوون. ئەم دوو دەستەیان بەدوو هۆزیش ناو بردووە. نەعمان بەهاوکاری ئەوان هێرشی دەکردە سەر شام و هۆزەکانی عەرەب کە لەسنوورەکانی خۆیەوە نزیك نەبوون.

دەڵێت: رۆژێکی بەهاری نەعمان لەکۆڕێك دانیشتبوو. لەوێوە نەجەف و بێستانەکان و باخەکانی دارخورما و رووبارەکانی لەلای رۆژئاوا دابنێن کە لەلای رۆژهەڵات و لەناوەڕاستی شاری نەجەفدا بوو. شەیدای جوانی و پاکی رووبارەکان بوو. بەوەزیر وهاودەمەکەی خۆی وت:

هیچ کات دیمەنێکی لەمشێوەت بینیوە؟

وتی: ئەگەر خاوەن پەیمان دەبوویت.

وتی: خاوەن پەیمان چییە؟

وتی: ئەوەی لەو دنیا و لای خواوەندە.

وتی: چۆن دەتوانم بەدەستی بێنم؟

وەڵامی دایەوە: بەخۆ دوور خستنەوە لەدنیا و پەرەستینی خواوەند و داوا

کردنی ئەوەی لای ئەوە.

هەمان شەو نەعمان دەستی لەپاشایەتی هەڵگرت. جل و بەرگێکی شڕۆلەی لەبەر کرد و شەوانە هەڵات. کەس نەیزانی. بەرەبەیان خەڵك بێ ئاگا لەبەر دەرگاکەی ئەو کۆبوونەوە بەلأم هاوشێوەی ڕۆژەکانی پێشوو دەرگاکە کراوە نەبوو. و کاتێك بۆ ماوەیەکی زۆر چاوەڕوان بوون، بەدوایدا گەڕان بەلأم نەیاندۆزییەوە. عودەی کوڕی زەیدی عیبادی لەمبارەوە دەڵێت:

بیر لەخواوەندی خوەرنەق بکەرەوە

کە ڕۆژێك لەسەرەوە دانیشتبوو

بۆ ڕێنوێنیکران نیشانەکان فراوانن.

لەحاڵی خۆی و پاشایەتییەکەی

و دەریا و کۆشکی سەدیر

دڵخۆش بوو

دڵی کەوتە تەپەتەپ و وتی:

ئەو ژیانەی بەمەرگ کۆتایی بێت، خۆش نییە.

چوونکە دوای سەرکەوتن و پاشایەتی

دەڕۆنە ناو گۆڕ

هاوشێوەی گەڵا وشکەکان

کە بای سەبا و دەبوور گاڵتەیان پێدەکەن.

پاشایەتی نەعمان تا ئەو کاتی پاشایەتی بەجێهێشت، بیست و نۆ ساڵ درێژەی کێشا.

کوڕی کەلبی دەڵێت: پانزە ساڵی لەڕۆژگاری یەزدگێرد، چوار ساڵی لەڕۆژگاری بەهرامی گوڕ کوڕی یەزدگێرددا بوو. بەلأم شارەزایانی مێژووی فارس بەو شێوە باسی دەکەن کەئاماژەمان پێدا.

## دوای یەزدگێرد بەهرامی گوڕی کوڕی پاشایەتی گرتەدەست

ئەو کوڕی یەزدگێردی تورە، کوڕی بەهرامی کرمانشا کوڕی شاپووری شانکونکەرە.

دەڵێن: لەدایك بوونی ئەو لەهورموزد ڕۆژی فەروەردین مانگ، حەوت کاژێر دوای هەڵاتنی هەتاو بوو. باوکی لەکاتی لەدایك بوونی ئەو ئەستێرە ناسەکانی بانگ کرد و فەرمانیدا بەخت و شانسی کوڕەکەی دیاری بکەن و لەچارەنوسی ئەو ئاگاداری بکەنەوە.

ئەستێرە ناسەکان پلەی هەتاویان وەرگرت و شانسی ئەویان بینی و بەیەزدگێردیان وت: خواوەند پاشایەتی باوکی بەبەهرام دەبەخشێت، لەرەزاع نیشتەجێ دەبێت لەکاتێدا فارسەکان لەوێ نین. باشترە لەدەرەوەی سەرزەمینی خۆی پەروەردە بکرێت. یەزدگێرد بیری کردەوە ڕەزاع و پەروەردە کردنی ئەو بەعەرەبەکان یا ڕۆمییەکانی دەربارەکەی خۆی بسپێرێت. نەعمان کوڕی مونزەری بان کرد و ئەوی کردە سەرپەرەستی بەهرام. ڕێزی لێگرت و ئەوی کردە پاشای عەرەبەکان و دوو پلەی بەرزی پێبەخشی یەکیان: رام ئەبزود و یەزدجێرد))، وتیان یانی: ڕەزامەندی یەزدجێردی زیاد کرد. ئەوی دیکەیان بە(( مەهشت)) ناو برد یانی: باشترین هەڵبژێردراو.

فەرمانیدا بەئەندازەی پێگە و لەپێشی ئەو کاڵا و پێشکەی پێببەخشن. هەروەها فەرمانی پێدا بەهرام بۆ سەرزەمینی عەرەبەکان بیات.

مونزەر ئەوی بۆ شوێنی نێشتەجێ بوونی خۆی برد و بۆ پەروەردە کردنی ئەو سێ ژنی ئەنجدام جوان و وشیار و پەروەردە کراوی گەورەکانی هەڵبژارد تا شیری پێبدەن. دوانیان عەرەب بوون ویەکیان عەجەم. فەرمانیدا راخەر و جل و بەرگ و هەموو کەرەستە پێویستەکانیان پێبدەن. بۆ ماوەی سێ ساڵ بەنۆرە شیریان پێدا و لەچوارەم ساڵ لەمەمکیان بڕییەوە.

دوای ئەوەی بەهرام ساڵەکانی تەمەنی گەیشتە پێنج، بەمونزەری وت: مامۆستایەکی شارەزا بێنە تا ئەدەب و سوارکاری و تیر هاویشتنم فێر بکات.

مونزەر وتی: هێشتا منالێت و کاتی ئەم کارانە نییە، ئێستا وەك منالآنی دیکە سەرقاڵی کاری خۆت بە تا بگەیتە ئەو تەمەنی شیاو بیت بۆ ئەوەی ئەدەب فێر ببیت. ئەوسا مامۆستا دەهێنم تا وەك پێویست بێت، فێرکاری تۆ بگرێتە ئەستۆ.

بەهرام وتی: من کەم تەمەنم بەلآم ئاوزێکی وشیارم هەیە و تۆ پیریت بەلآم ئاوزێکی ئەوتۆت نییە مەگەر نازانی هەر شتێك لەپێشەوە مەبەستی بەدەست هێنانی بکەن، لەکاتی خۆیدا دەستیان دەکەوێت و هەر شتێك لەکاتی خۆیدا مەبەستی بەدەست هێنانی نەکەن، هیچ کات دەستیان ناکەوێت. من شازادەم و بەفەرمانی خواوەند پاشایەتی دەگرمەدەست. شاکان پێویستە بۆ بەدەست هێنانی زانست هەوڵ بدەن تا ببێتە هۆکاری رازاندنەوە و بەهێزی پاشایەتییەکەیان. لەزووترین کات ئەو مامۆستایانەی داوام کرد، ئامادەیان بکە.

مونزەر دەرباری پاشای لەوتەکانی بەهرام ئاگادار کردەوە. دەستەیەك لەیاساناسە فارسەکان و مامۆستاکانی تیرهاویشتن و سوارکاری خەت و زانست، لەگەڵ چەند کەس لەبیرمەندانی فارس و رۆم و شاعیرانی عەرەب هاتنەی لای مونزەر. بەهرام لەگەڵ ئەوان قسەی و بۆ هەرکام لەبەشەکان کاتێکی دیاری کرد. مامۆستاکان لەو کاتەدا دەهاتن و لەزانستەکەی خۆیان بەهرەوەریان دەکرد.

بەهرام ئەوەی دەیویست، فێری بوو. گوێی لەبیرمەندان گرت وئەوەی بیستی، بەزەینی سپارد. کاتێك ساڵەکانی تەمەنی گەیشتە دوانزە، مامۆستاکان و بیرمەندان دانیان بەلەپێشی ئەودانا. بەهرام خەلآتی بەمامۆستاکانی خۆی بەخشی و مۆڵەتی رۆشتنی پێدان. تەنیا مامۆستاکانی تیرهاویشتن و سوارکاری هێشتەوە تا بەتەواوی هونەری ئەوان فێر ببێت.

بەهرام، نەعمان کوڕی مونزەری بانگ کرد و وتی عەرەبەکان ئاگادار بکاتەوە تا ئەسپە نێر و مێ ڕەسەنەکانی خۆیان بێنن.

نەعمان عەرەبەکانی ئاگادار کردەوە و کاتێك مونزەر لەبۆچوونی بەهرام سەبارەت بەهەڵبژاردنی ئەسپەکەی خۆی ئاگادار بوویەوە، پێی وت: عەرەبەکان بۆ غاردانی ئەسپەکانیان ناچار مەکە، تەنیا پێیان بڵێ ئەسپەکان نیشانی تۆ بدەن، ئەوسا ئارەزووی هەرکامیانت کرد، هەڵیبژێرە.

بەهرام وتی: قسەیەکی چاکت کرد بەلآم من لەشەرەف و بنەماڵە لەهەموویان

گەورەترم و پێویستە ئەسپەکەم لەئەسپی هەموویان باشتر بێت. باشی ئەسپیش تەنیا بەتاقی کردنەوە دەردەکەوێت و هیچ تاقیکردنەوەیەك باشتر لەغاردانی ئەسپەکان نییە.

مونزەر بەقسەکەی ڕازی بوو. نەعمان فەرمانی بەعەرەبەکاندا ئەسپەکانی خۆیان بێنن. بەهرام و مونزەر بۆ ئامادە بوون لەکێبڕکێکە دانیشتن. ئەسپەکان لەدوو فەرسەخی غاردانیان دەستپێکرد. ئەسپێکی سووررنگ لەپێش هەموویانەوە بوو. ئەسپەکانی دیکە لەدواوە دەهاتن. دوو ئەسپ بەدوای ئەسپە سووررەنگەوە بوون. سێ ئەسپی دیکە دوورتر و ئەسپێك نزیك لەکۆتایی بوو. مونزەر ئەسپە سووررەنگەکەی نیشانی بەهرامدا و وتی: پیرۆزت بێت.

بەهرام فەرمانیدا ئەسپەکە بگرن. ڕازی بوو و سپاسی مونزەری کرد.

ڕۆژێك بەهرام سوار ئەسپەکە بوو. بۆ ڕاو ڕۆشت. مۆتەکەیەکی بینی و تیری بۆ هاویشت. شێرێکی بینی هێرشی کردبووە سەر کەرێك و پشتی ئەوی بەدان گرتبوو تا هەڵیدرێت. بەهرام تیری بۆ پشتی شێرەکە هاویشت کە لەسکی ئەو و پشتی کەرەکە هاتەدەر و لەزەوی چەقی. ئەمە بەئامادە بوونی کەسانێك لەعەرەبەکان و پاسەوانەکانی بەهرام بوو. بەهرام فەرمانیدا ئەم دیمەنە بکێشنەوە.

بەهرام بەمونزەری وت: مەبەستی ئەوەی هەیە بڕواتە سەردانی باوکی. ملی ڕێگەی گرتەبەر. یەزدگێرد خراپەکار بوو و گرنگی بەمناڵەکەی نەدا. بەهرامی بەخزمەتکاران سپارد. بەهرام بێزار بوو. براکەی قەیسر بەناوی سیازوس لەگەڵ وەفدێك بەمەبەستی داواکردنی ئاشتی هاتنە دەرباری یەزدگێرد. بەهرام داوای لێکرد لەگەڵ یەزدگێرد قسە بکات بۆ ئەوەی ڕێگەی پێبدات بۆ لای مونزەر بگەڕێتەوە. یەزدگێرد مۆڵەتی پێدا و بۆلای مونزەر گەڕایەوە. ڕۆشتە سەرزەمینی عەرەبەکان و ژیانی بەخۆشی و کامەرانی بردە سەر.

کاتێك یەزدگێرد مرد، بەهرام ئامادە نەبوو. دەستەیەك لەگەورەکان و سەرکردەکان هاوڕابوون کەبەهۆی خراپی کردەوەکانی یەزدگێرد کەس لەبنەماڵەکەی ئەو وەك پاشا هەڵنەبژێرن. وتیان: یەزدگێرد جگە لەبەهرام کوڕی نییە بتوانێت پاشایەتی بگرێتەدەست. بەهرام هیچ کات ویلایەت یا کارێکی نەبووە و بەهۆیەوە تاقیکرابێتەوە و جیاواز لەوە داب و نەریت و ڕێ ورەسمی فارسەکان فێر نەبووە و زیاتر

لەعەرەبەکانەوە نزیکە و خوو و عادەتی هاوشێوەی ئەوانە چوونکە لەناو ئەوان گەورە بووە.

هەموویان کۆك بوون لەسەر ئەوەی رێگە نەدەن بەهرام پاشایەتی بگرێتە دەست. پاشایەتیان بەیەکێك لەبنەماڵەی ئەردەشێر کوڕی بابەك بەخشی بەناوی خوسرەو.

هەواڵی مردنی یەزدگێرد و پاشایەتی خوسرەو بەبەهرام گەیشت. لەو کاتەدا لەسارای عێراقدا بوو. مونزەر و نەعمان کوڕی مونزەر و دەستەیەك لەگەورەکانی عەرەبی بانگ کرد و وتی: باوکم لەگەڵ فارسەکان سەختگیر بوو بەڵام گومان ناکەم حاشا لەبەخششەکانی ئەو بۆ عەرەبەکان بکەن. ئەوسا لەمردنی باوکی و ئەوی کەکەسێکی دیکەیان وەك پاشا هەڵبژاردوە، ئاگاداری کردنەوە.

مونزەر وتی: مەترسە و خەم مەخۆ تا رێگە چارەیەك بدۆزینەوە.

مونزەر دەهەزار کەس لەسوارکارە عەرەبەکانی ئامادە کرد و لەگەڵ کوڕەکەی خۆی بۆ تیسبون و ئەردەشێر، دوو شاری پاشایەتی رەوانەی کردن و فەرمانی پێدا لەنزیك ئەو شارانە ئوردو لێبدات و پێشەنگەکان بۆ شارەکان رەوانە بکات. ئەگەر کەسێك رووبەروویان بوویەوە، بجەنگێت و هێرش بکاتە سەر شوێنی نزیکەکان و ئەسیر بگرێت و لەگەڵ ئەوەیشدا رێگەی خوێنڕشتنی لێگرت.

نەعمان بەرێکەوت و لەنزیك دووشارەکە دابەزی. پێشەنگەکانی بۆ شارەکان رەوانە کرد و لەشەڕ لەگەڵ فارسەکان خۆی بەدوور گرت.

گەورە و سەرکردەکان کە لەدەرباری پاشایەتی بوون، ((جوانی)) نامەداری یەزدگێردیان بۆ لای مونزەر رەوانە کرد و نامەیان بۆ نووسی و لەکارەکەی نەعمان ئاگاداریان کردەوە.

کاتێك جوانی گەیشتە لای مونزەر و نامەکەی خوێندەوە، پێی وت: برۆ و بەهرامی پاشا ببینە. کەسی رەوانە کرد و ئەوی بۆ لای بەهرام برد. کاتێك جوانی ڕۆشتە لای بەهرام، لەجوانی و زانایی ئەو سەرسوڕما، کوڕنوشی نەبرد و بەهرام زانی کرداری ئەو لەسەرسوڕمانەوە سەرچاوەی گرتووە. گفتوگۆی لەگەڵ کرد و بەڵێنی چاکەی پێدا و ئەوی بۆ لای مونزە رەوانە کردەوە و پەیامی بۆ نارد تا وەڵامی نامەکە بداتەوە.

مونزەر بەجوانی وت: سەبارەت بەو نامەی هێنات، بیرم کردەوە. بەهرام، نەعمانی رەوانە کردووە چوونکە خواوەند دوای باوکی پاشایەتی بەو بەخشیوە و ئەوی بەئێوە

بەخشیوە.

کاتێك جوانی وتەکانی مونزەری بیست و شکۆ و مەزنی بەهرامی بیرکەوتەوە، بیری کەوتەوە کەهەموو ئەو کەسانەی بۆ وەرگرتنەوەی پاشایەتی لەبەهرام هاوڕا بوون، گرفتاری دوژمنی بوون. بەمونزەری وت: من وەڵامەکە نابمەوە، بەڵام ئەگەر دەتەوێت برۆ نشینگەی پاشایەتی تا سەران و سەرکردەکان و گەورەی بنەماڵەکان لەدەوری تۆ کۆببنەوە و راوێژت لەگەڵ بکەن. بەشێوەیەکی پەسند کراو قسەیان لەگەڵ بکە و دڵنیابە دژایەتی تۆ ناکەن.

مونزەر جوانی رەوانە کرد و خۆی ئامادە بوو. رۆژێك دوای رۆشتنی جوانی هاوڕێ لەگەڵ بەهرام لەگەڵ سی هەزار کەس لەسوارکارانی عەرەب بەرەو دوو شاری پاشایەتی کەوتەڕێ. کاتێك گەیشت، فەرمانیدا و خەڵکیان کۆکردەوە. بەرهەم لەسەر کورسی زێر و رازاوە بەجەواهیر دانیشت. مونزەر لای راستی ئەو بوو. گەورەکان و سەرکردەکانی فارس دەستیان بەقسە کردن کرد و ئاماژەیان بەستەم و خراپەکاریەکانی یەزدگێرددا و وتیان: بەهۆی گومان و دڵپیسی زەوی وێران و کوشتار و ستەمی لەخەڵکان کرد. لەسنوری وڵاتەکەی خۆی خەڵکانی کوشت و کارە قێزەونەکانی هێنایە ئاراوە لەبەر ئەمە پەیمانیان داوە پاشایەتی لەمناڵ و نەوەکانی یەزدگێرد بستێننەوە. داوایان لەمونزەر کرد لەکاروباری پاشایەتی بۆ کارێکی ناخۆش و ناپەسەند ناچاریان نەکات.

مونزەر وتەکانی بەزەین سپارد و بەبەهرامی وت: تۆ دەبێت وەڵامی ئەم خەڵکە بدەیتەوە چوونکە لەمن بۆ ئەو کارە شیاوتریت.

بەهرام وتی: وتارەکەی ئێوە سەبارەت بەخراپەکاری و ستەمی یەزدگێرد بەدرۆ نازانم چوونکە لەو کاتەوەی ئاگادارم لەکردەوەکانی ئەو رازی نەبووم. شێوازی ئەوم نەگرتۆتەبەر وبەردەوام لەخوا پاڕاومەوە تا پاشایەتی بەمن ببەخشێت بۆ ئەوەی وێرانییەکان ئاوەدان و کەلێنەکان پڕ بکەمەوە. ئەگەر یەك ساڵ بەسەر پاشایەتی من تێپەڕی کردو بەڵێنەکانی خۆم نەبردەسەر، بەدڵخوازی ئێوە دەست لەپاشایەتی هەڵدەگرم و خواوەند و فریشتەکان و موبدەکان بۆ وتەکانی خۆم دەکەمە شایەت و موبدی موبدەکان لەنێوان من وئێوەدا داوەری بکات. رازیم هەرکەس تاجی پاشایەتی لەنێوان دوو شێری دڕندە هەڵبگرێت، پاشایەتی بۆ ئەو بێت.

کاتێك خەڵك وتاری بەهرام و بەڵێنەکانی ئەویان بیست، ڕەزامەند و هیوادار بوون. بەیەکیان وت: ناتوانین بەقسەکانی بەهرام رازی نەبین و ئەگەر پێداگری بکەین ئەگەری هەیە لەناو بچین چوونکە سوپای عەرەبەکان هاوکاری دەکەن. ئەو تاقیدەکەینەوە چوونکە ئەوەی هێنایە سەرزمان، سەرچاوەی لەباوەڕ بەخۆ بوون و بوێریە. ئەگەر بەو شێوە بێت، پاشایەتی بەو دەسپێرین و ملکەچی فەرمانەکانی دەبین و ئەگەر بەهۆکاری لاوازی و سستی لەناو بچێت، نابینە هۆکارێك بۆ مردنی ئەو و لەشەڕ و زیانەکانی ئەو پارێزراو دەبین.

لەسەر ئەم باوەڕە کۆك بوون. بەهرام دوای ئەو قسانەی کردی، هاتە ناو کۆڕەکەو دانیشت. نەیارانیش هاتن و بەوانی وت: یا وەڵامی وتەکانی دوێنێکەی من بدەنەوە، یا بێدەنگ و ملکەچی فەرمانەکانم بن.

وتیان:ئێمە خوسرەومان وەك پاشا هەڵبژاردووە و لەو تەنیا چاکەکاریمان بینیوە، بەڵام رازین تاجی پاشایەتی بخەنە ناو دوو شێری دڕندە و تۆ و خوسرەو بۆ بەدەستهێنانی هەوڵ بدەن، هەرکەس تاجەکەی هەڵگرت، پاشایەتی بەو دەسپێرین.

بەهرام بەوتەکەی ئەوان رازی بوو. موبدی موبدەکان کە تاجی پاشایەتی دەکردە سەرپاشا، تاجەکەی هێنا و لەشوێنێك داینا و بەستامی سوپاسالار، دوو شێری دڕندەی برسی هێنا. یەکیانی لای شوێنی تاجەکە و ئەوی دیکەیانی لەولا بەرەڵا کرد. بەهرام بەخوسرەوی وت: تاجی پاشایەتی هەڵبگرە.

خوسرەو وتی: دەسپێکردنی ئەو کارە مافی تۆیە چوونکە پاشایەتی بەمیرات بۆ تۆماوەتەوە و من دەستم بەسەردا گرتووە.

وتەکانی خوسرەو بەهرامی ناڕاحەت نەکرد چوونکە لەبوێری و ئازایەتی و هێزی خۆی دڵنیا بوو.

گورزێکی هەڵگرت وبەرەو تاجەکە بەرێکەوت. موبدی موبدەکان پێی وت: گیانبازی تۆ لەم ڕێگایە بەدڵخوازی خۆتە و بۆچوونی هیچ کام لەفارسەکان نییە. ئێمە لای خواوەند لەوەی تۆ گیانی خۆت دەکەیتە قوربانی، لەگوناح بەدوورین.

بەهرام وتی: ئێوە بێ گوناحن و هیچ گوناحێك لەسەر شانی ئێوە نییە.

بەرەو دوو شێرەکە ڕۆشت. کاتێك موبدی موبدەکان پێداگری ئەوی بینی وتی:

گوناحەکانی خۆت ئاشکرا و تۆبە بکە، ئەوسا ئەگەر دەبێت برۆیت، برۆ.

بەهرام هەموو گوناحەکانی خۆی ئاشکرا کرد. بەرەو لای شێرەکان رۆشت. یەکێك لەشێرەکان بەرەو رووی هات. کاتێك نزیك بوویەوە، بەهرام پەری و سوار پشتی شێرەکە بوو. دوو کەلەکەی ئەوی بەئەژنۆکانی خۆی گووشی. شێرەکە سست و لاواز بوو. ئەوسا بەهرام بەگورزەکەی دەستی لەسەری شێرەکەی دەدا. شێرەکەی دیکە پەلاماریدا. بەهرام دوو گوێچکەی شێرەکەی گرت و بەهەر دوو دەست رایکێشا. سەری شێرەکەی کێشا بەسەری شێرەکەیتردا. مۆخی شێرەکان پرژایە سەرزەوی. هەر دوو شێرەکەی کوشت و خوسرە و ئامادەبووان بینەری ئەم کارە بوون.

بەهرام تاجەکەی هەڵگرت. خوسرەو یەکەم کەس بوو هاواری کرد و وتی: خواوەندا، تەمەنی درێژە بەبەهرام ببەخشە کەهاوەڵ و ملکەچی زۆری هەیە و پاشایەتی حەوت هەرێمەکەی پێ ببەخشە.

هەموو ئامادەبووان هاواریان کرد و وتیان ملکەچ و فەرمانبەری فەرمانەکانی بەهرامین و بەپاشایەتی ئەو رازی و دڵخۆشین.

رۆژێکی دیکە سەران و گەورەکان و فەرمانرەواکانی ویلایەتەکان و وەزیرەکان، مونزەریان بینی و داوایان لێکرد تا لەگەڵ بەهرام قسە بکات بۆ ئەوەی چاو لەخراپەکانی ئەوان ببەخشێت. بەهرام ئەوانی بەخشی و چاوپۆشی لەهەڵەکانیان کرد.

مونزەر لەگەڵ بەهرام قسەی کرد و وتی: ئەویە لەدڵیدایە، بیبەخشێت. بەهرام رازی بوو و ئەوانی هیوادار کرد.

بەهرام بیست ساڵە بوو کەپاشایەتی گرتەدەست. وتی ژێردەستەکان ئاسوودە و ئارام بن. حەوت رۆژ خەڵکانی میوان کرد و مژدەی پێبەخشین و بۆ خۆپارێزی و خواپەرەستی هانیدان.

بەهرام دوای گرتنەدەستی پاشایەتی، رابواردنی پێش کارەکانی دیکە دەخست بەشێوەیەك خەڵکان بەگشتی رەخنەیان لێگرت. پاشاکانی دەوروبەر چاوی تەماحیان برییە سەرزەمینەکەی. یەکەم کەس مەبەستی هێرش کردنە سەر دیاری فارسەکانی کرد، خاقانی پاشای تورك بوو کەبەسوپایەکی دوسەد و پەنجا هەزار کەسی هێرشی کردەسەر سەرزەمینی ئێران. فارسەکان ئاگادار بوونەوە کەخاقان بەسوپایەکی گەورە

مەبەستی هێرش کردنە سەر دیاری ئەوانی هەیە. ترسان و دەستەیەك لەگەورەکان و سوپاسالاران ڕۆشتنە لای بەهرام و وتیان: ئەی پاشا، هێرش کردنی ئەم پاشایە، ڕێگرە لەبەردەم رابواردن وخۆشگوزەرانی تۆ، بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمن خۆت ئامادە بکە تا ڕووداوێکی ناخۆش ڕوونەدات و ناوت بەشێوەیەکی خراپ نەکەوێتە سەر زمانان.

بەهرام وەڵامی دایەوە کەخواوەندی ئێمە بەهێزە و ئێمە هاورێی ئەوین. لەسەر رابواردن زیاتر پێداگری کرد و بەرەو ئازەربایەجان بەرێکەوت تا لەئاتەشکەدەی ئەویٚ لەخوا بپارێتەوە. حەوت کەس لەسەرکردەکان و گەورەی بنەماڵەکانی لەگەڵ سێسەد کەس لەهاوەڵە بوێرەکانی لەگەڵ خۆیدا برد. کاروباری تایبەت بەپاشایەتی بەبراکەی نێرسی سپارد.

کاتێك خەڵکان ئاگادار بوونەوە کەبەهرام ڕۆشتووە و کاروباری بەبراکەی سپاردووە، دڵنیا بوون مەبەستی هەڵاتن لەدوژمن و تەسلیم کردنی پاشایەتییە. مەبەستی ئەوەیان کرد دەستەیەك بۆ لای خاقان ڕەوانە بکەن و بەڵێنی پێدانی خەراجی پیٚ بدەن چوونکە دەترسان ئەگەر فەرمانەکانی جێبەجیٚ نەکەن، سەرزەمینەکەیان تاڵان و شەڕکەرانیان بکوژێت.

خاقان ئاگادار بوویەوە کەخەڵکان ڕێککەوتون بۆ ئەوەی ملکەچی فەرمانەکانی بن. لەوان ئاسوودە بوو و فەرمانی بەسوپاکەیدا هێرش نەکەنە سەر هیچ شوێنێك و تاڵانی نەکەنە پیشە.

بەهرام یەکێکی ڕەوانە کردبوو تا هەواڵەکانی تایبەت بەخاقانی بۆ بێنێت. نێردراو گەڕایەوە و لەمەبەستی خاقان ئاگاداری کردەوە. بەهرام لەگەڵ هاوەڵانی خۆی بەرێکەوت و لەناکاو هێرشی کردە سەر خاقان. ئەوی بەدەستی خۆی کوشت و لەسوپاکەی دەستەیەکی زۆری کوشتار کرد. پاشماوەی سوپاکەی هەڵاتن و بەهرام شوێنیان کەوت. کوشتاری کرد و ئەسیر و تاڵانییەکانی کۆکردەوە و هاوریٚ لەگەڵ سوپاکەی خۆی تەندروست گەڕانەوە.

تاج و سەرپۆشەکەی خاقان کەوتە دەست بەهرام و ویلایەتی تورکەکان لەسنوری خاقانی گرت و سنورداریٚکی وەك کاربەدەستی خۆی بۆ ئەو ناوچەیە ڕەوانە کرد وتەختێکی زیوی پێدا. ئەو کەسانەی لەسەرزەمینەکانی دەوروبەری خاقان کەوتبونە

دەستی بەهرام، وەك كەسانی ملكەچ وگوێڕایەڵ هاتنە لای بەهرام و داوایان لێكرد لەنێوان خۆی وئەوان سنوورێك دیاری بكات بۆ ئەوەی سنوورەكە نەبەزێنن. ئەو سنوری دەستنیشان و منارەیەكی دروست كرد. هەمان منارەیە كەفیروز پاشا كوڕی یەزدگێرد فەرمانیدا بۆ ناو سەرزەمینی توركەكان بیبەنە پێش.

بەهرام یەكێك لەسەردارەكانی خۆی بۆ ماوەرائەلنەهر ڕەوانە كرد و فەرمانی پێدا شەڕیان لەگەڵ بكات. سالار، شەڕی دەست پێكرد و ژمارەیەكی فراوانی كوشتار كرد تا ئەوەی بەبەندایەتی و دانی خەراج ڕازی بوون.

بەهرام بەرەو ئازەربایەجان بەرێكەوت تا بڕواتە شوێنی نیشتەجێ بوونی خۆی لەسواد. فەرمانیدا هەموو یاقووتە سوورەكان و جەواهیرەكانی دیكەی تاجی خاقان لەئاتەشكەدەی ئازەربایەجان هەڵبواسن.

بەرەو تیسبون بەرێكەوت و لەكۆشكی پاشایەیت نیشتەجێ بوو. نامەی بۆ سوپا و كاربەدەستانی خۆی نووسی و لەكوژرانی خاقان و تێكشكانی سوپاكەی ئاگاداری كردنەوە.

بەهرام ویلایەتی خوراسانی بەنێرسی برای سپارد. فەرمانی پێدا لەبەلَخ نیشتەجێ بێت. هەموو ئامادەكارییەكی بۆ كرد.

بەهرام لەكۆتاییەكانی ڕۆژگاری خۆی بەرەو ماه بەرێكەوت و مەبەستی ڕاوی كرد. هێرشی كردە سەر كەڵە كێویەك وبۆ مەودایەكی دوور شوێنی كەوت و كەوتە ناو چاڵێك و خنكا. دایكی ئاگادار بوویەوە و بەماڵ و سامانێكی فراوانەوە بەرێكەوت و لەنزیك چاڵەكە دابەزی و وتی: ئەو ماڵ و سامانە بەكەسێك بدەن بەهرام لەچاڵەكە دەربێنێت. لەناو چاڵەكە قوڕ و لیتەی زۆریان دەرهێنا بەڵام نەیانتوانی جەستەی بەهرام بدۆزنەوە.

دەڵێن: كاتێك بەهرام دوای شەڕ لەگەڵ توركەكان بۆ وڵاتەكەی خۆی دەگەڕایەوە، چەندین ڕۆژی یەك لەدوای یەك وتاری بۆ دانیشتووانی وڵات دەخوێندەوە و ئەوانی بۆ خواپەرەستی هاندەدا و وتی مەبەستی ئەوەی هەیە بۆ خێر و ئاسوودەی ئەوان تێبكۆشێت و ئەگەر لەڕێگەی ڕاست بگەڕێنەوە، كردارێكی خراپتر لەوەی باوكی دەگرێتەبەر چوونكە باوكی لەسەرەتای پاشایەتی بەشێوەیەكی دادپەروەرانە لەگەڵ ئەوان هەڵس وكەوتی دەكرد بەڵام ڕێزیان نەگرت وپێیان نەزانی لەبەر ئەمە شێوازێكی

ناپەسەند ولێوانلێو لەتوند و تیژی گرتەبەر و خوێنی زۆر لەخەڵکانی ڕشت.

گەڕانەوەی بەهرام لەشەڕ لەگەڵ تورکەکان لەرێگەی ئازەربایەجانەوە بوو. هەموو یاقوت و جەواهیری تاجەکەی خاقان و شمشێرە گەوهەر نیشانەکەی ئەوی بەئاتەشکەدەی شیز بەخشی و خاتوونی ژنی خاقانی وەك خزمەتکاری ئەو شوێنە دەستنیشان کرد. بۆ سپاس کردن لەو سەرکەوتنەی بەدەستی هێنابوو، بۆ ماوەی سێ ساڵ خەراجی لەخەڵکان وەرنەگرت. سامانی لەناو هەژاران و نیازمەندان دابەش و بیست هەزار هەزاری درەمی بەبنەماڵە خاوەن نەژادەکان بەخشی. سەبارەت بەکاری خاقان نامەی بۆ هەموو سوچ و قوژبنەکانی ولات نووسی و وتی کاتێك لەهاتنی خاقان ئاگادار بوویەوە، سوپاسی خواوەندی بەجێهێنا و ئەوسا لەرێگەی ئازەربایەجان و کێوەی قەبقەوە بەرێکەوت و لەگەڵ کەسانی بنەماڵەکان و سێسەد کەس لەهاوەڵە بوێرەکانی خۆی تا بیابانەکانی خارەزم ڕۆشتە پێش و خواوەند سەرکەوتنی پێبەخشی. باسی هەڵگرتنی خەراجی کرد.

بەهرام کاتێك پاشایەتی گرتەدەست، وتی پاشماوەی خەراج بەخەراجدەرەکان ببەخشن. ئاگاداریان کردەوە پاشماوەکەی حەفتا هەزار هەزار درەمە. وتی: وەرینەگرن ویەك لەسەر سێی خەراجی ئەو ساڵەیش ببەخشن.

دەڵێن: کاتێك بەهرامی گور لەشەڕی تورکەکان بۆ تیسبون گەڕایەوە، ویلایەتی خوراسانی بەنێرسی برای بەخشی و ئەوی لەبەڵخ نیشتەجێ کرد. مێهر نێرسی کوڕی بەرازەی کردە وەزیر و کردی بەیەکێك لەکەسە نزیکەکانی خۆی و پێی وت کەبەرەو سەرزەمینی هیند دەڕوات و بۆ ئەوەی لەهەواڵ و بارودۆخی ئەو دیارە ئاگادار ببێتەوە و ڕێگە چارەیەك بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی بەشێك لەو ولاتە پەیوەستی ولاتەکەی خۆی بکات و بەمشێوەیە کەمێك لەقورسایی خەراج لەسەر شانی خەڵکەکەی هەڵبگرێت. بەهرام کارە پێویستەکانی ئەنجامدا و بەرێکەوت و نەناسراو ڕۆشتە سەرزەمینی هیند. ماوەیەك لەوێ مایەوە و کەس لەخەڵکانی ئەوێ سەبارەت بەکاری ئەو پرسیاری نەکرد بەلام لەسوارکاری و ئازایەتی ئەو سەرپان سوڕما بوو. بەمشێوەبوو تا ئاگادار بوویەوە لەبەشێك لەسەرزەمینەکەیان فیلێك ڕێگەی گرتووە و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکانی کوشتووە. داوای لەکەسێك کرد تا شوێنی فیلەکەی نیشان بدات بۆ ئەوەی بیکوژێت. ئەم هەواڵە بەپاشا گەیشت و ئەوی بانگ کرد. یەکێکی لەگەڵ ئەو ڕەوانە

کرد بۆ ئەوەی هەواڵەکانی بۆ بگوازێتەوە. کاتێك بەهرام و نێردراوی پاشا گەیشتنە شوێنی فیلەکە، نێردراوی پاشا ڕۆشتە سەر دارێك تا سەیری کارەکەی بەهرام بکات. بەهرام بەدوای فیلەکەدا گەڕا و بانگی دەکرد. فیل هات. کەف کەوتبووە سەر لێوی. دەنگێکی گەورە و دیمەنێکی ترسێنەری بوو. کاتێك لەبەهرام نزیك کەوتەوە، بەهرام تیرێکی بۆ هاویشت کەبەر نێوچاوانی کەوت. ئەوەندە چەقی کەکەمێکی دەبینرا. تیری دەهاویشت تا گەیشتە نزیك فیلەکە. پەڕی و لووتی فیلەکەی گرت ورایکێشا. فیل کەوتە سەر چۆك. بەهرام بەردەوام لێی دەدا تا کوشتی. سەری فیلەکەی بڕی و رایکێشا تا گەیشتە سەر ڕێگەکە. نێردراوی پاشا سەیری دەکرد.

کاتێك نێردراو گەڕایەوە و پاشای لەڕووداوەکە ئاگادار کردەوە، پاشا لەبوێری وئازایەتی ئەو سەری سووڕما و بەخششێکی گەورەی پێبەخشی. سەبارەت بەکاری بەهرام پرسیاری کرد. بەهرام وتی: یەکێکم لەگەورەکانی فارس. پاشای فارس لێم توڕەیە و پەنام بۆ تۆ هێناوە.

پاشا دوژمنێکی بوو کە لەسەر تەخت و تاجی پاشایەتی دژایەتی دەکرد. نەیاری پاشا بەسوپایەکی فراوان هێرشی کردبووە سەر. پاشا دەترسا چوونکە لەدەسەلاٌتی ئەو ئاگادار بوو. نەیاری پاشا داوای گوێڕایەڵی و خەراجی لێدەکرد. پاشا دەیویست رازی ببێت. بەهرام ڕێگەی ئەو کارەی لێگرت و پێی وت کۆتایی بەو کێشەیە دێنێت. پاشا لەوتەکەی بەهرام دڵخۆش و ئارام بوو. کەرەستەکانی شەڕی هەڵگرت و کاتێك ڕووبەڕووی دوژمن بوویەوە، بەسوارەکانی هیندی وت:

چاودێری پشتسەری من بکەن. هێرشی کردە سەر دوژمن، شمشێری لەسەری یەکێك دەدا تا دەگەیشتە دەمی و ئەوسا شمشێری لەکەمەری یەکێتر دەدا و دوو لەتی دەکرد. لووتی فیلی بەشمشێر دەقرتاند و سوارەکانی لەسەر زین دەخستە خوار. هیندیەکان تیرهاویشتن نازانن و زۆربەیان پیادەن چوونکە چوارپێیان نییە. بەهرام تیری بۆ هەرکەس دەهاویشت، دەیکوشت.

کاتێك ئەمەیان بینی، هەلاٌتن. پاشای هاوڕێی بەهرام ئوردوگاکەی تالاٌن کرد و دڵخۆش گەڕایەوە. بەهرام هاوڕێیەتی ئەوی دەکرد. لەپاداشتی ئەم کارە کچەکەی خۆی کردە هاوسەری ئەو و دیبل و مەکران و سەرزەمینی سندی پێدا و بەشێوەیەکی نووسراو بۆی نووسی و چەندین کەسی کردە شایەت و وتی ئەم سەرزەمینانە

پەیوەستی وڵاتی عەجەمەکان بکەن و خەراجەکەی بدەن بەبەهرام. بەهرام دڵخۆش گەڕایەوە.

دوای ئەوە بەهرام، مێهر نێرسی کوڕی بەرازەی لەگەڵ چل هەزار شەڕکەر بۆ ڕۆم ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا مەبەستی کوشتنی سالاری خەڵکی ڕۆم بکات و سەبارەت بەباج و شتەکانی دیکە کەجگە لەمێهرنێرسی کەسی بەشیاو نەدەبینی، قسەی کرد. ئەو لەگەڵ سوپاکە بەڕێکەوت و ڕۆشتە قوستەنتینە و کردەوەیەکی سەیری لێ دەبینرا. گەورەی ڕۆمەکان ئاشتی لەگەڵ کرد. مێهر نێرسی هەموو مەبەستەکانی بەهرامی هێنایە دی و گەڕایەوە.

بەهرام بەردەوام ڕێزی لەمێهر نێرسی دەگرت و فەرمانیدا ناوی ئەو کورت بکەنەوە و بەنێرسی بانگی بکەن و هەندێ کاتیش بەمێهر نێرسە. مێهرنێرسی کوڕی بەرازە کوڕی فەروخزاد کوڕی خورهوباز کوڕی سیسفاز کوڕی سیسنابروە کوڕی کەی ئەشك کوڕی دارا کوڕی بەهمەن کوڕی ئیسفەندیار بەشتاسبە.

هەموو پاشا فارسەکان مێهر نێرسیان بەعەزیز دەزانی و ئەمە لەکردەوە چاکەکانی خۆیەوە سەرچاوەی گرتبوو.

مێهر نێرسی چەندین کوڕی بوو کەتایبەتمەندییەکانی باوکیان لەواندا دەبینرا و خزمەتی پاشاکانیان دەکرد و لەپلە و پێگەی باوکیان نزیك بوونەوە. سێ کەس لەوان دیار و ناسراو بوون. یەکیان زەرئونداد بوو کەمێهر نێرسی ئەوی بۆ فێر کردنی زانستە دینییەکان راسپارد و سەرکەوتنی بەدەست هێنا. بەهرامی گوڕ ئەوی کردە هیربودانی هیربود کەپێگەیەکە هاوشێوەی موبدی موبدەکان. یەکێکی دیکە لەکوڕەکانی ناوی ماجەشنەسە. لەڕۆژگاری بەهرامی گور بەردەوام ئۆدەداری دیوانی خەراج بوو و نازناوەکەی ((راتسرای و شانسلان)) بوو. سێیەم کوڕی ناوی کاردە و سالاری گەورەی سوپا بوو و نازناوی ئێسترلان سەلانی پێبڕا. ئەمە پێگەیەکە هاوشێوەی سوپاسالار.

نازناوی مێهر نێرسی وەزیری وەزیرەکان سەرکردەی سەران بوو.

دەڵێن: مێهر نێرسی لەگوندی ئیروان لەدێهاتی دەشتبارین لەویلایەتی ئەردەشێرخەرە بوو. لەو شارە کە یەکێك بوو لەشارەکانی ویلایەتی شاپوور و پەیوەستی دەشتبارین ببوو، چەندین بینای بەرز و بڵندی دروست کرد. یەکێك لەوان

ئاتەشکەدەیەك بوو کەوەك دەڵێن تا ئێستا ماوەتەوە و ئاگر تیایدا داگیرساوە و بەمێهر نێرسیان ناوی دەبەن.

هەروەها لەنزیك ئیروان چوار گوندی دروست کرد و لەهەر کامیان ئاتەشکەدەیەکی دروست کرد. یەکیانی تایبەت کرد بەخۆی و بە ((فراز مرا آور خدایان)) ناوی برد کەبەمانای سەروەرم روو لەمن بکە و ئەوی دیکەیانی تایبەت کرد بەزەرئونداد و بەزەرئەندودان ناوی برد. ئەوی دیکەیانی بەکارد بەخشی و ئەوی دیکەیان بە ماجەشنس بەخشی و بەجەشنسفان ناوی برد.

هەروەها لەو ناوچەیە سێ باخی دروست کرد و لەهەر باخێك دوانزە هەزار دارخورمای رواند. لەباخێکیان دوانزە هەزار نەمامی زەیتوونی چاند لەباخێك دوانزە هەزار سەروی چاند. ئەم گوند و باخانە تا ئێستا لەدەستی نەوەکانی ئەودا ماوەتەوە. وەك دەڵێن بەباشترین شێوە پارێزگاری و بەخێو دەکرێن.

دەڵێن: بەهرام دوای تەواو بوون لەکاری خاقان و پاشای رۆم لەرێگەی یەمەنەوە رووی کردە سوودان و خەڵکانێکی زۆری کوشت و دەستەیەکی فراوانی ئەسیر کرد. ئەوسا بۆ وڵاتەکەی خۆی گەڕایەوە. مردنی بەو شێوە بوو کەباسمان کرد.

سەبارەت بەساڵەکانی پاشایەتی بەهرام، بۆچوونەکان جیاوازن: دەستەیەك ماوەی پاشایەتی ئەو بەهەژدە ساڵ و دە مانگ و بیست رۆژ دەزانن و دەستەیەك ماوەی پاشایەتی ئەو بیست و سێ ساڵ و دوو مانگ و بیست رۆژ بوو.

## دوای ئەو یەزدگێرد پاشایەتی گرتەدەست

ئەو کوڕی بەهرامی گورە. کاتێك لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت، گەورەکان و سەرانی خەڵك لەدەوری کۆبونەوە و پاڕانەوە و پیرۆزباییان لێکرد. وەڵامی چاکەی دانەوە و باسی باوکی وکارەکانی کرد. لەدادپەروەری ئەو لەگەڵ ژێردەستەکان ئاخاوت و لەگەڵیان دانیشت. رایگەیاند ئەگەر هەڵس و کەوتی ئەو وەك باوکی نەبینن، بزانن کەبیر لەرێگەکانی باشتر کردنی بارودۆخی ولآت و فریودانی دوژمنان دەکاتەوە و وتی کەمێهرنێرسی کوڕی بەرازە و وەزیری باوکی وەك وەزیر دەستنیشان کردووە ولەگەڵ ژێر دەستەکان بەشێوەیەکی دادپەروەرانە هەڵس و کەوت دەکات و نەریتە کۆنە پەسەند کراوەکان زیندووو دەکاتەوە و بەردەوام شەڕ لەگەڵ نەیاران و دوژمنان دەکات.

یەزدگێرد دوو کوڕی بوو: یەکیان هورموز کەفەرمانڕەوایەتی ویلایەتی سیستانی دەکرد و ئەوەی دیکەیان فیروز. هورموز دوای باوکی پاشایەتی گرتەدەست. فیروز لەدەستی ئەو هەلآت و ڕۆشتە سەرزەمینی هیبتالیەکان. داستانی خۆی و براکەی بۆ پاشای ئەو دیارە باس کرد و پێی وت کەپاشایەتی مافی ئەوە. داوای لێکرد سوپایەکی پێبدات تا بەهاوکاری سوپاکە شەڕ لەگەڵ هورموز بکات و پاشایەتی باوکی وەربگرێتەوە.

پاشای هیبتالیەکان رازی نەبوو تا ئەو کاتەی فیروز وتی: هورموز پاشایەکی ستەمکارە. پاشای هیبتالیەکان وتی: خواوەند ستەم پەسەند ناکات و چاکسازی لەکاری ستەمگەران ناکات. لەسنووری پاشای ستەمگەر تەنیا بەستەم دادپەروەری جێبەجێ دەکرێت. سوپایەکی بۆ هاوکاری فیروز رەوانە کرد. فیروز تاڵەقانی پێدا و بەهاوکاری سوپاکە شەڕی لەگەڵ هورموز کرد. ئەوی کوشت و بلآوەی بەسوپاکەی کرد و پاشایەتی گرتەدەست.

ڕۆمیەکان ئەو خەراجەی بەبەهرامیان دەدا، بەیەزدگێرد کوڕی بەهرامیان نەدا. ئەو مێهرنێرسی کوڕی بەرازەی لەگەڵ سوپایەکی هاوشێوەی ئەو سوپای بەهرام رەوانەی کردبوو، بۆ ڕۆم نارد و بەمەبەستەکانی گەیشت.

ماوەی پاشایەتی یەزدگێرد بەوتەیەك هەژدە ساڵ و چوار مانگ درێژەی کێشا و بەوتەیەك حەوت ساڵ.

## فیروز پاشایەتی گرتەدەست

ئەو کوڕی یەزدگێرد کوڕی بەهرامە. پاشایەتی دوای ئەوە گرتەدەست کەبراکەی و سێ کەس لەکەسانی بنەماڵەکەی خۆی کوشت.

لەهوشام کوڕی محەممەد دەگێڕنەوە: فیروز لەخوراسان سوپای ئامادە و داوای هاوکاری لەخەڵکانی تەخارستان وسەرزەمینەکانی دەوروبەر کرد. هێرشی کردە سەر براکەی کە نیشتەجێی شاری رەی بوو. دایکیان دینەك و نیشتەجێی مەداین و کاروبارەکانی ئەو ناوچەی هەڵدەسووڕاند. فیروز بەسەر براکەیدا سەرکەوت. ئەوی زیندانی و دادپەروەرانە لەگەڵ خەڵکان هەڵس و کەوتی دەکرد. کەسێکی دیندار و خواپەرەست بوو.

لەرۆژگاری فیروز بۆ ماوەی حەوت ساڵ قاتوقڕی بەرۆکی خەڵکانی گرت. بەباشترین شێوە چارەسەری ئەم بەڵای کرد و ئەوەی لەخەزێنەکاندا بوو، بەسەر خەڵکاندا دابەشی کرد و لەم ساڵانەدا خەراجی وەرنەگرت. دەڵێن لەماوەی ئەو حەوت ساڵەدا تەنیا یەك کەس لەبرسانا مرد.

فیروز هێرشی کردە سەر دیاری هیبتالیەکان کەفەرمانڕەوایەتی تەخارستانیان دەکرد. لەسەرەتایی پاشایەتی خۆی، فەرمانڕەوایەتی ئەوانی پشتراست کردبوویەوە لەبەر ئەوەی دژی براکەی هاوکاریان کردبوو.

وەك دەڵێن: ئەم خەڵکە داب و نەریتەکانی نەتەوەی لوت لەناویاندا بڵاوبوویەوە. لەبەر ئەمە فیروز بەرەوای نەزانی ئەو سەرزەمینە بەوان بسپێرێت. شەڕی لەگەڵ کردن کە لەم شەڕەدا کوشتیان. چوار کوڕ و چوار برای لەم شەڕەدا لەناوچوون کەهەموویان نازناوی پاشایەتیان بوو. هیبتالیەکان دەستیان بەسەر هەموو خوراساندا گرت و یەکێك لەفارسەکان بەناوی سوخرە کەدانیشتوی شیراز بوو، هێرشی کردە سەریان.

سوخرە لەناو خەڵکەکەی کەسێکی باوەڕپێکراو بوو. لەگەڵ کەسانی دەوروبەری بەدڵخواز و لەرێگەی خوا بۆ شەڕ بەرێکەوت. رووبەرووی سالاری هیبتالیەکان بوویەوە و ئەوی لەخوراسان دەرپەڕاند و بەئاشتی لەیەك جیابوونەوە بەو مەرجەی لەئەسیرەکانی ئوردوگای فیروز، ئەوانەی زیندووو مابوونەوە، رادەستی فارسەکان

بکەنەوە.

ماوەی پاشایەتی فیروز بیست و حەوت ساڵ درێژەی کێشا.

جگە لەهوشام، شوێنکەوتەکانی هەواڵ وتوویانە کە: فیروز پاشایەکی توندوتیژ و فێڵباز بوو. بۆ خۆی و خەڵکان شووم و زۆربەی کارو کردەوەکانی زیانی خەڵکان و ولآتی لێدەکەوتەوە.

دەڵێن لەرۆژگاری پاشایەتی ئەو بۆ ماوەی حەوت ساڵ قاتوقڕی بەرۆکی خەڵکانی گرت. کانی و جۆگە و سەرچاوکان کوێر بوونەوە و دارستانەکان وشکیان کرد. کێو و کشتوکاڵ و جەنگەڵەکان لەناوچوون و باڵندە و دڕندەکان مردن. مەڕوماڵآت نەمانەوە و ئاوی دیجلە کەمی کرد. خەڵکان گرفتاری ڕەنج و برسیەتی بوون. نامەی بۆ مسکێنەکان نووسی و رایگەیاند خەراج و کاری زۆرملێ لەسەر خەڵکان هەڵگیراوە و دەسەلآتی ژیانیان لەدەستی خۆیاندایە. فەرمانیدا بۆ بەدەست هێنانی بژێوی هەوڵ بدەن و لەنامەیەکی دیکەدا نووسی، هەرکەس ئەنبار و پاشەکەوتی هەیە، کەدەبێتە هۆکاری بژێوی خەڵك، ئاشکرا و تایبەت بێت بەهەموو خەڵکان، دەوڵەمەند وهەژار و لاواز وەك یەك بن. رایگەیاند ئەگەر ئاگار ببێتەوە کەسێك لەبرسا مردووە، خەڵکی ئەو گوند یا ناوچەیە سزا دەدات.

لەو دەورانە دژوارەدا کەبرسیەتی تەنگی بەخەڵکان هەڵچنیبوو، بەشێوەیەك کاروبارەکانی تایبەت بەخەڵکانی هەڵسووڕاند کەکەس لەبرسانا نەمرد جگە لەیەکێك لەگوندەکانی ویلایەتی ئەردەشێر خەرە بەناوی بەدیە. گەورەکانی فارس و خەڵکی ئەردەشێر خەرە و فیروز ئەمەیان بەرووداوێکی گەورە لەقەڵەمدا. فیروز لەخواوەند پاڕایەوە تا نیعمەتەکانی لەخۆی و خەڵکان دریغ نەکات و باران ببارێنێت. خواوەند دۆعاکەی گیرا کرد، ویلایەتەکە هاوشێوەی پێشوو ئاوەدان و پڕئاو بوویەوە و دارەکان گیانێکی تازەیان گرت.

فیروز فەرمانیدا لەشاری ڕەی شارێك دروست بکەن و ناوی بنێن فیروز. لەنێوان گورگان و دەربەندی سولیش شارێکیان دروست کرد و بەناوی رەوشەن فیروز ناویان برد. لەئازەربایەجانیش بناغەی شارێکیان داڕشت و بەشەهرام فیروز ناوی برد و کاتێك سنووری ولآتەکەی بوژایەوە وپاشایەتیەکەی سەقامگیر ودوژمنانی سەرکەوت کرد و لەدروست کردنی ئەم سێ شارە تەواو بوو، لەگەڵ سوپاکەی خۆی رووی

لەخوراسان کرد و مەبەستیی هێرش کردنە سەر ئەخشنوار شای هیپتالیەکانی کرد. کاتێك ئەخشنوار ئاگادار بوویەوە، ترسا.

دەڵێن: یەکێك لەهاوەڵانی ئەخشنوار، گیانی خۆی کردە قوربانی و وتی: دوو دەست وپێی من ببڕە و بۆ لای فیروز، رەوانەم بکە بەڵام لەگەڵ ماڵ و منداڵەکانم چاکەکاری بکە.

مەبەستی لەم کارە فێڵ کردن لەفیروز بوو. ئەخشنوار دەست وپێی بڕیەوە و رەوانەی کرد. کاتێك فیروز ئەوی بینی، هۆکارەکەی ئەزانی و پرسیاری لێکرد. وتی: ئەخشنوار ئەو کارەی کرد لەبەر ئەوەی وتم توانای خۆڕاگری لەبەرابەر فیروز و سوپای فارسەکانت نییە.

فیروز بەزەیی بەودا هاتەوە و فەرمانیدا لەگەڵ خۆیان ببەن. ئەو پیاوە بەفیروزی وت: بۆ وەڵامدانەوەی ئەم چاکەی فیروز، رێگەیەکی قەوبڕیان نیشان دەدات کەتا ئێستا کەس لەو رێگەوە هێرشی نەکردۆتە سەر پاشای هیپتالیەکان. فیروز فریو درا و سوپاکەی لەو رێگەوە برد کەپیاوەکە نیشانیدا. بیابان لەدوای بیابان رێگەیان بڕی و کاتێك لەتینویەتی سکاڵایان دەکرد، دەیوت، کۆتایی بیابان نزیکە و کاتێك ئەوانی گەیاندە شوێنێك کەدڵنیا بوو توانای پێشڕەوی و گەڕانەوەیان نییە، نهێنییەکەی خۆی ئاشکرا کرد و هاوەڵانی فیروز پێیان وت: ئەی پاشا، پێشتر پێمان وتیت دەبێت خۆت لەم پیاوە بەدوور بگریت و نەتگرت. ئێستا دەبێت پێشڕەوی بکەین تا رووبەرووی دوژمن دەبینەوە.

بەرێکەوتن و زۆربەیان لەتینویەتیدا مردن. فیروز و ئەوانەی رزگاریان ببوو، رووبەروی دوژمن بوونەوە و کاتێك بەو شێوە هیلاك و شەکەتە رووبەرووی دوژمن بوونەوە، پێشنیاری ئاشتیان بەئەخشنوار کرد بەو مەرجەی رێگەیان بۆ بکاتەوە و فیروزیش پەیمانیدا هیچ کات هێرشیان نەکاتە سەر و مەبەستی سەرزەمینەکەی ئەوان نەکات و سوپا بۆ شەڕی ئەوان نەنێرێت. لەنێوان دوو وڵاتدا سنورێك دیاری بکات و سنورەکە نەبەزێنێت.

ئەخشنوار بەمە رازی بوو. فیروز پەیمان نامەیەکی نووسی و مۆری کرد و خۆی کردە شایەت. شای هیپتالیەکان رێگەی بۆ کردەوە و گەڕانەوە.

کاتێك گەیشتە وڵاتەکەی خۆیان، دەمارگیری دووبارە بۆ هێرش کردنە سەر

ئەخشنوار هانیدا و هێرشی کردەسەر و گرنگی بەبۆچوونی وەزیر و کەسە نزیکەکانی خۆی نەدا کەپەیمان شکێنیان پەسەند نەدەکرد.

لەو کەسانەی فیروزی لەپەیمان شکێنی دوور دەخستەوە، یەکێك لەکەسە تایبەتەکانی خۆی بوو کەهەمیشە گرنگی بەبۆچوونەکانی دەدا. ناوی مەزدبوز بوو.

کاتێك مەزدبوز پێداگری و سور بوونی ئەوی بینی، ئەوەی گفتوگۆی لەبارەوە کرابوو، لەنامەیەکدا نووسی و داوای لەفیروز کرد مۆری لێبدات. فیروز بەرەو دیاری ئەخشنوار بەرێکەوت. ئەخشنوار لەنێوان خۆی و دیاری فیروز خەندەکێکی گەورەی هەڵکەندبوو. کاتێك فیروز گەیشتە خەندەکە، پەردەکانی هەڵبەست و ئاڵاکانی هەڵواسی و بۆ گەڕانەوەی سوپاکەی خۆی کردی بەنیشانە و هێرشی کردە سەر هیپتالیەکان.

کاتێك گەیشتە ئوردوگای ئەوان، ئەخشنوار پەیمانەکەی بیرخستەوە. پێی وت تا پەیمانەکەی نەشکێنێت و رێز لەپەیمانەکەی بگرێت. فیروز پێداگری کرد. بۆ ماوەیەکی زۆر ئاخاوتن و ئەوسا شەڕ دەستی پێکرد. سوپاکەی فیروز بەهۆی ئەو پەیمانەی لەگەڵ هیپتالیەکان بەستبوویان، لاوازیان لەخۆیان نیشاندا. ئەخشنوار پەیمانەکەی فیروزی کرد بەنووکی رمێکەوە و وتی: خواوەند رێز لەبەندەکانی ئەم پەیمانە بگرە.

فیروز شکستی خوارد و شوێنی هەڵکردنی ئاڵاکانی لەبیر کرد و کەوتە ناو خەندەکەکە و مرد. ئەخشنوار باروبنەی فیروز و هاوسەر و سامان و دیوانەکانی ئەوی تالان کرد. سوپای فارسەکان شکستیان خوارد، شکستێك کەپێشتر هاوشێوەیان نەبینیبوو.

یەکێك لەخەڵکانی ویلایەتی ئەردەشێر خەرە لەسیستان بەناوی سوخرا کەکەسێکی بوێر و خاوەن زانست بوو و دەستەیەك لەسوارکاران هاورێیەتیان دەکرد، کاتێك لەهەواڵی کارەکانی فیروز ئاگادار بوویەوە، شەوانە بەرێکەوت تا لەئەخشنوار نزیك کەوتەوە. کەسی رەوانە کرد و شەڕی راگەیاند و هەڕەشەی لەناوبردنی لێکرد. ئەخشنوار سوپایەکی گەورەی بۆ شەڕی ئەو نارد. کاتێك رووبەرووی یەك بوونەوە، سوخرا سوار لەسەر ئەسپ بەرەو لای ئەوان رۆشت.

دەڵێن: تیری بۆ یەکێك لەوان هاویشت کە لەنێوچاوانی ئەسپەکەی چەقی بەشێوەیەك تیرەکە لەسەری ئەسپەکەدا ونبوو. ئەسپەکە کەوت، سوخرا سوارەکەی

نەکوشت و پێی وت، برۆ و ئەم ڕووداوەیان بۆ باس بکە. ئەو سوارە ڕۆشتە لای ئەخشنوار و ئەسپەکەیان لەگەڵ خۆیان برد. کاتێك شوێنەواری تیرەکەی بینی، سەریسوڕما و کەسی بۆ لای سوخرا ڕەوانە کرد کەپێشنیارەکانی خۆت باس بکە.

سوخرا وەڵامی دایەوە: دەمەوێت دیوان بۆ من بگەڕێنیتەوە و ئەسیرەکان ئازاد بکەیت.

کاتێك دیوانی بەدەست گەیشت و ئەسیرەکان ئازاد کران، پێرستی گەنجینەکانی فیروزی لەناو دیوانەکە دەرهێنا و نامەی بۆ ئەخشنوار نووسی کەناگەڕێتەوە تا هەموو سامان و گەنجینەکانی فیروزی دەست کەوێتەوە.

کاتێك ئەخشنواری پێداگری ئەوی بینی، گیانی خۆی کڕییەوە. سوخرا دوای ئازادی ئەسیرەکان و وەرگرتنەوەی دیوان و خەزێنەکەی، بۆ وڵاتی فارسەکان گەڕایەوە. کاتێك ڕۆشتە لای عەجەمەکان، ئەویان بەگەورە وەسف کرد و پێگەی ئەو بەرادەیەك بەرز کردەوە کەتەنیا پاشا لەو بەرزتر و مەزنتر بوو.

سوخرا کوڕی ویسابوور کوڕی ڕەهان کوڕی نێرسی کوڕی ویسابور کوڕی قارن کوڕی کروان کوڕی ئەبید کوڕی ئەوبید کوڕی تیرویە کوڕی کردەنك کوڕی ناور کوڕی توس کوڕی نودکا کوڕی مەنشو کوڕی نەوزەر کوڕی مەنوچێهرە.

دەستەیەك لەشارەزایانی مێژووی فارس بەمشێوەیە داستانی فیروز و سوخرا دەگێڕنەوە کەباسمان کرد بەڵام زیادیان کردووە کەکاتێك فیروز بەمەبەستی شەڕ کردن لەگەڵ ئەخشنوار بەڕێکەوت، سوخرای لەشاری تیسبون و شاری بەهرسیر کەشاری شاکان بوو، وەك جێگری خۆی دەستنیشانی کرد.

دەڵێت: پێگەی سوخرا، قارن بوو و لەگەڵ تیسبون و بەهرسیر، فەرمانڕەوایەتی سیستانی دەکرد. کاتێك بەهرامی گور لەنێوان سەرزەمینی خوراسان و سنوری تورکەکان منارەیەکی دروست کرد تا تورکەکان سنووری فارسەکان نەبەزێنن و نەڕۆنە ناو خوراسان و ئەمە لەبەر ئەو پەیمانەی نێوان ئەم دوو وڵاتە بوو بۆ ئەوەی هێرش و دەستدرێژی نەکرێتە سەر خوراسان. فیروز لەگەڵ ئەخشنوار پەیمانی بەستبوو لەمنارەکەی بەهرامی گور تێنەپەڕێت و هێرش نەکاتە سەر دیاری هیپتالیەکان. کاتێك فیروز گەیشتە منارەکە، فەرمانیدا پەنجا فیلیان بەمنارەکەوە بەستەوەو بەسێسەد پیاو منارەکەیان بۆ پێشەوە برد و بەدوای منارەکەدا ڕۆشتن. دەیویست بەمشێوەیە ڕێز

لەپەیمانەکەی خۆی و ئەخشنوار بگرێت.

کاتێك ئەخشنوار لەکارەکەی فیروز و منارەکە ئاگادار بوویەوە، کەسی بۆ لای ئەو رەوانە کرد و وتی: لەوشوێنەی پێشنیانی تۆ بەسەندەیان کردووە، بەسندە بکە، ئەوان هیچ کارێکیان نەکردووە، تۆیش مەیکە. بەڵام فیروز گرنگی بەوتەکانی نەدا و شەڕ کردن لەگەڵ ئەخشنواری پێ خۆش بوو. داوای رووبەروو بوونەوەی لێکرد. بەڵام ئەخشنوار حەزی بەشەڕ نەدەکرد و شەڕ کردنی بەناخۆش دەزانی لەبەر ئەوەی زۆربەی شەڕی تورکەکان لێوانلێو بوو لەفرت و فێڵ.

ئەخشنوار وتی لەپشت ئوردوگاکەی خەندەکێك بە دەزەراع پانایی و بیست زەراع قووڵی هەڵکەنن. هەڵیانکەند و بەدارە وشکەکان دایانپۆشی و خۆڵی کردە سەردارەکان. دواتر لەگەڵ سوپاکەی خۆی بەرێکەوت.

کاتێك فیروز ئاگادار بوویەوە کە ئەخشنوار و سوپاکەی لەئوردوگاکە ڕۆشتووە، لەهەڵاتنی ئەوان دڵنیا بوو. فەرمانیدا تەپڵیان لێدا و لەگەڵ سوپاکەی خۆی شوێن ئەخشنوار و سوپاکەی کەوت. بەخێرایی رێگەیان دەبڕی و رێگاکەیان لەسەر خەندەکەکە بوو. کاتێك گەشتنە ئەو شوێنە، هەنگاویان خستە سەر خەندەکە سەرداپۆشراوەکە. فیروز و زۆربەی سوپاکە کەوتنە ناو خەندەکەکە و لەناوچوون.

ئەخشنوار بۆ ئوردوگاکەی فیروز گەڕایەوە و دەستی بەسەر هەموو سامانەکاندا گرت. موبدی موبدەکانی ئەسیر و کچەکەی فیروز و ژنەکانی کەوتنە بەردەستی ئەخشنوار. فەرمانیدا جەستەی فیروز و هەموو ئەو کەسانەی کەوتبوونە ناو خەندەکەکە، دەربێنن و بیانخەنە ناو تابووتەکان.

ئەخشنوار مەبەستی نزیکی لەگەڵ کچەکەی فیروزی کرد بەڵام رازی نەبوو.

کاتێك هەواڵی مردنی فیروز بەوڵاتی فارسەکان گەیشت، ترسان و کاتێك سوخرا لەراستی و چۆنییەتی هەواڵەکە ئاگادار بوویەوە، خۆی ئامادە کرد و لەگەڵ زۆربەی سووپاکەی بەرەو دیاری هیپتالیەکان بەرێکەوت. کاتێك گەیشتە گورگان، ئەخشنوار لەهاتنی سوخرا و سوپاکەی ئاگادار بوویەوە و کەسی بۆ پێشوازی کردنی ئەو رەوانە کرد تا لەمەبەست و داواکارییەکانی بپرسێت. هەروەها سەبارەت بەناو وپێگەی ئەو پرسیاری کرد.

سوخرا وەڵامی دایەوە: ناوی سوخرایە و پێگەکەی قارنە. هاتووە تۆڵەی فیروز

بستێنێتەوە.

ئەخشنوار کەسی رەوانە کرد و وتی: سەرئەنجامی تۆ هاوشێوەی سەرئەنجامەکەی فیروزە کە لەشەڕ کردن لەگەڵ من هەرچەندە سوپاکەی فراوان بوو، تەنیا مردنی پێبڕا. سوخرا گرنگی بەوتەکانی نەدا. فەرمانیدا و سوپاکەی ئامادە بوون، چەکیان هەڵگرت و هێرشی کردە سەر ئەخشنوار. پیاوێکی بوێر و ئازا بوو. ئەخشنوار رێگەی ئاشتی گرتەبەر بەڵام سوخرا تەنیا بەو مەرجە بەئاشتی رازی بوو کەهەموو ئەو شتانە وەربگرێتەوە کە لەئوردوگاکەی فیروز تاڵان کراوە. ئەخشنوار هەموو سامان و گەنجینەکان و ژنەکانی فیروز و کچەکەی فیروز و موبدی موبدەکان و گەورەکانی فارسی تەسلیم کردووە. سوخرا بۆ وڵاتەکەی خۆی گەڕایەوە.

سەبارەت بەماوەی پاشایەتی فیروز بۆچوونەکان جیاوازن. دەستەیەک وتوویانە بۆ ماوەی بیست و شەش ساڵ پاشایەتی کرد و دەستەیەکی دیکە وتوویانە بیست و یەک ساڵ.

## وتار سەبارەت بەکاربەدەستانی یەزدگێرد لەسەر عەرەبەکان و خەڵکانی یەمەن

لەهوشام کوڕی محەممەد دەگێڕنەوە: منداڵەکانی ئەشراف حەمیر خزمەتی پاشاکانی خۆیان دەکرد. لەو کەسانەی خزمەتی حسان کوڕی توبەعی دەکرد، عەمرۆ کوڕی حجری کیندی و لەرۆژگاری خۆیدا سالاری خەڵکەکەی بوو. کاتێك حسان کوڕی توبەع بەرەو جەدیس بەڕێکەوت، ئەوی کردە لێپرسراوی بەشێك لەکارەکانی خۆی و کاتێك عەمرۆ کوڕی توبەع براکەی خۆی حسان کوڕی توبەعی کوشت و پاشایەتی گرتەدەست، عەمرۆ کوڕی حجری کیندی بەخزمەت گرت چوونکە پیاوێکی شەریف و خاوەن دەنگ بوو و هەروەها بۆ ئەوەی ڕێزی لەعەمرۆ گرتبێت و سووکایەتی بەبراکانی خۆی کردبێت، کچەکەی حسان کوڕی توبەعی وەك هاوسەری ئەو دیاری کرد. حەمیریەکان لەمبارەوە قسەیان کرد و بەبەڵایەکی گەورەیان زانی چوونکە هیچ کام لەعەرەبەکان تەماحی هاوسەرگیریان لەم بنەماڵە نەبوو.

کچی حسان کوڕی توبەع بۆ عەمرۆ کوڕی حجر، حارس کوڕی عەمرۆی هێنایە دنیا. دوای عەمرۆ کوڕی توبەع، عەبد کەلال کوڕی مەسوب پاشایەتی گرتەدەست لەبەر ئەوەی منداڵەکانی حسان کەم تەمەن بوون جگە لەتوبەع کوڕی حسان کەجنۆکە دەستی لێوەشاندبوو. عەبد کەلال کوڕی مەسوب پاشایەتی گرتەدەست تا هیچ کەس لەدەرەوەی بنەماڵەی پاشایەتی چاوی تەماح لەپاشایەتی نەبڕێت. بەشێوەیەکی پەسەند کراو کاروباری خەڵکانی هەڵدەسوڕاند. وەك وتوویانە شوێنکەوتەی ئاینی مەسیحی کۆن و دەیویست خەڵکەکەی لایەنگیری لەم دینە بکەن. ئەو کەسەی پێشنیاری مەسیحیەتی پێکردبوو، پیاوێك لەهۆزی غەسان و لەشامەوە بۆ لای ئەو هاتبوو. حەمیریەکان هێرشیان کردە سەر ئەو پیاوە غەسانییە و کوشتیان. توبەع کوڕی حسان چاك بوویەوە و لەهەموو کەسەکان لەزانستی ئەستێرەناسیدا شارەزاتر و لەهەموو بیرمەندانی سەردەمی خۆی زاناتر بوو. باسی ڕووداوە کۆنەکان و پێشهاتەکانی داهاتووی دەکرد.

کاتێك توبەع کوڕی حسان کوڕی توبەع پاشایەتی گرتەدەست، خەڵکانی حەمیر و عەرەبەکان ئەویان بەکەسێکی خاوەن شکۆ و مەزن بینی. توبەع خوشکەزاکەی خۆی

بەناوی حارس کوڕی عەمرۆ کوڕی حجر کیندی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ دیاری مەعد و حیرە و سەرزەمینەکانی دەوروبەر ڕەوانە کرد. حارس کوڕی عەمرۆ هێرشی کردە سەر نەعمان کوڕی ئەمرۆ ئەلقەیس کوڕی شەقیقە. شەڕی دەستپێکرد و نەعمان و دەستەیەك لەبنەماڵەی ئەوی کوشت و بڵاوەی بەهاوەڵانی کرد. مونزەر کوڕی نەعمانی گەورە و دایکی ماء ئەلسەماء کە ژنێك لەخەڵکانی نەمر بوو، هەڵاتن. پاشایەتی بنەماڵەی نەعمان کۆتایی پێهات وحارس کوڕی عەمرۆ پاشایەتی ئەوانی گرتەدەست.

بەڵام هوشام دەڵێت: دوای نەعمان کوڕی مونزەر کوڕەکەی مونزەر کوڕی نەعمان پاشایەتی گرتەدەست. دایکی ئەو هیند کچی زەید مەنات کوڕی زەید الله کوڕی عەمرۆ غەسانییە. ماوەی پاشایەتی مونزەر چل و چوار ساڵی خایاند، هەشت ساڵ و نۆ مانگ لەرۆژگاری بەهرامی گور کوڕی یەزدگێرد و هەژدە ساڵ لەرۆژگاری یەزدگێرد کوڕی بەهرام و حەفدە ساڵ لەرۆژگاری فیروز کوڕی یەزدگێرد.

دوای ئەو مونزەر کوڕی ئەسوەد کوڕی مونزەر پاشایەتی گرتەدەست. دایکی ئەو هرمڕ کچی نەعمان لەمناڵەکانی هیجمانە کچی عەمرۆ کوڕی باوکی رەبیعە کوڕی زوهەل کوڕی شەیبان بوو. ئەو بۆ ماوەی بیست ساڵ لەدەستی فارسەکاندا ئەسیر بوو. ماوەی پاشایەتی ئەسوەد بیست ساڵ درێژەی کێشا، دەساڵ لەرۆژگاری فیروز کوڕی یەزدگێرد و چوار ساڵ لەرۆژگاری بلاش کوڕی یەزدگێرد و شەش ساڵ لەرۆژگاری قوباد کوڕی فیروز.

## دوای فیروز بلاشی کوڕی پاشایەتی گرتەدەست

ئەو کوڕی فیروز کوڕی یەزدگێرد کوڕی بەهرامی گورە. براکەی قوباد لەسەر پاشایەتی دژایەتی ئەوی کرد و شکستی خوارد و بۆ لای خاقانی پاشای تورك هەڵات. داوای هاوکاری لێکرد. کاتێك بلاش لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت، گەورەکانی خەڵك لەدەوری کۆبوونەوە و پیرۆزباییان لێکرد. داوایان لێکرد پاداشتی سوخرا بدات لەبەر ئەو کارانەی کردبووی. بلاش، سوخرای کردە یەکێك لەکەسە نزیکەکانی خۆی و ڕێزی لێگرت.

شێوازی پەسند کراوی بلاش پەسەند کراو و ئارەزوومەندی ئاوەدانی بوو. یەکێك لەچارەسەرە گونجاوەکانی بلاش ئەوەیە کە ئەگەر دەیبیست ماڵێك وێران بووە و

خەڵکەکەی کۆچیان کردووە، کوێخاوی گوندەکەی سزا دەدا کە بۆ هاوکاری نەکردوون تا ناچار بەکۆچ کردن نەبن.

ئەو لەسواد، بناغەی شارێکی دارشت و بەبلاشاواز ناوی برد کەهەمان شاری ساباتی نزیک مەداینە.

ماوەی پاشایەتی بلاش چوار ساڵ درێژەی کێشا.

## دوای ئەو قوباد پاشایەتی گرتەدەست

قوباد کوڕی فیروز کوڕی یەزدگێرد کوڕی بەهرامی گورە. پێش ئەوەی پاشایەتی بگرێتە دەست، ڕۆشتە لای خاقان و دژی براکەی خۆی داوای هاوکاری لێکرد. لەسەر ڕێگەی لەسنوری نەیشابوور تێپەڕی. چەند کەسێك لەهاورێکانی لەگەڵدا بووکەبەشێوەی نەناسراو لەگەڵ ئەو سەفەریان دەکرد. زەرمێهر کوڕی سوخرا یەکێك بوو لەوان. تامەزرۆی نزیك بوونەوەی لەژن و ئەم حەزەی خۆی لای زەرمێهر باس کرد. داوای لێکرد ژنێکی خاوەن نەژادی بۆ بدۆزێتەوە. زەرمێهر ئەو کارەی کرد و ڕۆشتە لای ژنی خاوەن ماڵەکەی خۆی کەهاوسەرەکەی یەکێك لەسوارچاکەکان بوو. کچێکی جوانی بوو. سەبارەت بەکچەکەی قسەی لەگەڵ کرد و پێی وت تا کچەکەی بۆ لای قوباد ڕەوانە بکات. ژن لەگەڵ پیاوەکەی ڕاوێژی کرد. زەرمێهر بەردەوام هانی ژن و پیاوەکەی دەدا تا ئەو کارەیان کرد. کچ ڕۆشتە لای قوباد. ناوی کچەکە نیوندۆخت بوو. قوباد هەمان شەو لەگەڵی خەوت و بەئەنەوشیروان دووگیانی کرد. فەرمانیدا تا بەشێوەیەکی باش خەڵات و دیاری پێببەخشن.

دەڵێن: دایکی کچەکە سەبارەت بەقوباد پرسیاری لەکچەکەی کرد. وەڵامی دایەوە: هیچ شتێك نازانێت جگە لەوەی عابایەکی بەزێرچنراوی لەبەردابوو. دایکی زانی کوڕی یەکێك لەپاشاکانە و دڵیخۆش بوو.

قوباد بەرەو وڵاتی خاقان بەرێکەوت و کاتێك گەیشت، وتی: لەسەر پاشایەتی کێشەی لەگەڵ براکەیدا هەیە و بەزێنراوە و بەمەبەستی هاوکاری کردن هاتۆتە لای خاقان.

خاقان بەڵێنی چاکەی پێدا. قوباد بۆ ماوەی چوار ساڵ لای خاقان بوو بەڵام بەڵێنەکانی خاقان نەهاتنەدی.

کاتێك ماوەی مانەوەی درێژ بوویەوە، قوباد کەسی بۆ لای ژنی خاقان رەوانە کرد. داوای لێکرد ئەو بەبەکێك لەمناڵەکانی خۆی بزانێت و لەگەڵ هاوسەرەکەی قسە بکات. ژن ئەو کارەی کرد و بەردەوام لەگەڵ خاقان قسەی دەکرد تائەوەی سوپایەکی لەگەڵ قوباددا رەوانە کرد. قوباد لەگەڵ سوپاکە بەرێکەوت و کاتێك گەیشتە سنورەکانی نەیشابوور، لەو پیاوەی کچەکەی بۆ هێنابوو، سەبارەت بەکچەکە پرسیاری کرد. پیاوەکە لەلایەن دایکی کچەکەوە هەواڵی بۆهێنا کەکورێکی بۆ هاتۆتە دنیا.

قوباد فەرمانیدا و کچەکەیان بردە لای. کچ هات و ئەنەوشیروانی پێبوو. کاتێك پۆشتە لای قوباد، سەبارەت بەکورەکە پرسیاری کرد. کچ وتی: مناڵەکە کوری ئەوە، کورەکە لەجوانی و روخساردا هاوشێوەی قوباد بوو.

دەڵێن:لەهەمان شوێن هەواڵی مەرگی بلاش بەقوباد گەیشت. کورەکەی بەپیرۆز زانی و فەرمانیدا کورەکەی و دایکی لەناو کەژاوەی شاژنەکان لەگەڵ خۆیان ببەن. کاتێك گەیشتە مەداین و پاشایەتی گرتەدەست، سوخرای کردە یەکێك لەکەسە نزیك و تایبەتییەکانی خۆی. کاروبارەکانی بەو سپارد و رێزی لەخزمەتی کورەکەی گرت. دواتر سوپای بۆ دەوروبەر رەوانە دوژمنانیان سەرکوت و ئەسیریان گرت. لەنێوان ئەهواز و فارس بناغەی شاری ئۆرگانی دارشت. هەروەها شاری حیلوانی دروست کرد و لەویلایەتی ئەردەشێر خەرە لەناوچەی کارزین شارێکی دروست کرد بەناوی قوباد خەرە. ئەمە جگە لەو گوند و شار و رووبار و جۆگانەیە لەسەردەمی قوباد بناغەیان بۆ دارێژرا و ئاوەدان کرانەوە.

کاتێك چەندین ساڵ بەسەر پاشایەتی قوباد تێپەری کرد و سوخرا کاروبارەکانی هەڵدەسووراند، خەڵکان لەدەوری ئەو کۆبوونەوە و گرنگی ئەوتۆیان بەقوباد نەدەدا. قوباد نەیتوانی بەمەرازی بێت. نامەی بۆ شاپووری رازی نووسی کە لەبنەماڵەی مێهرەك و سوپاسالاری شاری رەی بوو تا لەگەڵ سوپاکەی خۆی بێت.

رۆژێکیتر شاپوور پۆشتە لای قوباد، سوخرا لای ئەو دانیشتبوو، شاپوور پۆشتە لای قوباد، لەسوخرا تێپەری و گرنگی پێنەدا. سوخرایش گرنگی پێنەدا تا ئەو کاتەی بەندی خستە ملی و رایکێشا. بەمشێوەیە سوخرای بردەدەر و زیندانی کرد. وتیان: بای سوخرا خاڵی بوویەوە و بای مێهران دەستی بەهەڵکردن کرد. ئەم وتەیە بوو بەپەند.

قوباد فەرمانی کوشتنی سوخرای دەرکرد.

دوای تێپەڕینی دەساڵ لەرۆژگاری پاشایەتی قوباد، موبیدی موبدان و گەورەکانی خەڵك هاودەنگ بوون و ئەویان لەپاشایەتی دوورخستەوە و زیندانیان کرد چوونکە باوەڕی بەئایینی پیاوێك بەناوی مەزدەك هێنابوو کەدەیوت: خواوەند رۆژییەکانی لەنێوان بەندەکانی دابەش کردووە تا بەندەکان بەشێوەیەکی وەك یەك لەناو خۆیاندا دابەشی بکەن. خەڵك لەم کارەدا ستەمکارییان کردە پیشە چوونکە گومانیان دەکرد لەخاوەن سامانەکان بۆ هەژارانی وەردەگرن و لەدارا بەنەداری دەبەخشن. هەرکەس ماڵ و ژن و مەبەستەکانی زیاتر لەپێویست و کەسانی دیکە هەیە، ماڵی بەسەریانەوە نییە.

چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵ ئەمەیان پەسەند کرد و بەدەرفەتیان زانی. شوێن مەزدەك و هاوباوەڕانی کەوتن. هێزیان پەیا کرد تا ئەو جێگەی دەڕۆشتنە ماڵی کەسەکان و دەستیان بەسەر ژن و سامانەکەیدا دەگرت. کەس توانای رووبەروو بوونەوەی ئەوانی نەبوو. قوبادیان بۆ برەودان بەم ئایینە ناچار کرد و هەڕەشەی لەسەر کار لابردنیان لێکرد. زۆری نەخایاند کەس منداڵی خۆی نەدەناسیەوە و منداڵەکان، نەیاندەزانی کێ باوکیانە. هیچ کەس خاوەنی هیچ شتێك نەبوو. قوبادیان بردە شوێنێك کەدەستی کەسی پێنەدەگەیشت. براکەی ((جاماسب))یان لەجێگەی ئەو دانا و بەقوبادیان وت لەرۆژگاری پێشوو گوناحت ئەنجامداوە و پاك نابیتەوە مەگەر ئەوەی ژنەکانی خۆت بەخەڵکان بدەیت. مەبەستی ئەوەیان کرد سەری ببڕن و بیکەنە قوربانی.

کاتێك زەرمهێر کوڕی سوخرا ئەمەی بینی، لەگەڵ گەورە و سەرکردەکانی هاوپەیمانی خۆی، شۆڕشی کرد و ژمارەیەکی زۆر لەمەزدەکیەکانیان کوشت و قوبادیان بۆ پاشایەتی گەڕاندەوە و جاماسبیان لەسەر کار لابرد. دوای ئەوە، مەزدەکیەکان دژی زەرمهێر قوبادیان هاندا تا ئەوەی بەکوشتنی ئەو ناچاریان کرد.

قوباد یەکێك بوو لەباشترین پاشاکانی فارس تا ئەو کاتەی مەزدەك بۆ ئەو کارانە ناچاری کرد. وڵات پەرێشان و ئاژاوە لەسنورەکاندا پەرەی سەند.

دەستەیەك لەمێژووناسەکانی فارس وتوویانە، گەورەکانی فارس قوبادیان زیندانی کرد لەبەر ئەوەی باوەڕی بەئایینی مەزدەك و باوەڕەکەی هێنابوو. براکەی

یانی جاماسبیان کردە پاشا. خوشکەکەی قوباد ڕۆشتە زیندان بۆ ئەوەی بیبینێت. زیندانوان ڕێگەی لێگرت و چاوی تەماحی تێبڕی و لەمەبەستەکەی خۆی ئاگاداری کردەوە.

خوشکەکەی قوباد پێی وت دژایەتی هەوەسی ئەو ناکات و ڕێگەی پێدرا بڕواتە ناو زیندان. ڕۆژێك لای قوباد بوو، وتی لەناو یەکێك لەفەرشەکانی زیندان بیشارنەوە. فەرمانی بەیەکێك لەغولامە بەهێزەکانی خۆیدا تا فەرشەکە هەڵبگرێت وبەمشێوەیە لەزیندان ئازادی بکەن. کاتێك غولام گەیشتە زیندانوان، پرسیاری کرد بەڵام وەڵامی دەست نەکەوت. خوشکەکەی قوباد بەدوایدا هات و وتی ئەمە جێگەی سەردەمی ژنێتی ئەوە. دەیبات تا بیشوات و بیگەڕێنێتەوە. زیندانوان باوەڕی بەقسەکانی کرد. دەستی لەفەرشەکە نەدا و لێی نزیك نەکەوتەوە چوونکە لەناپاکی فەرشەکە دەترسا. ڕێگەی بۆ غولامەکە کردەوە. فەرشەکەیان برد و خوشکی قوباد بەدوایەوە بوو.

قوباد هەڵات و ڕۆشتە سەرزەمینی هیپتالیەکان. داوای هاوکاری لەپاشاکەیان کرد تا دژی نەیارانی خۆی شەڕ بکات. لەرێگەی خۆی لەئەبر شەهر لای یەکێك لەگەورەکان دابەزی. کچێکی هەبوو. لەم سەفەرەدا دایکی کەسرا ئەنەوشیروانی کردە هاوسەر و لەکاتی گەڕانەوە، ئەنەوشیروان و دایکی لەگەڵ خۆی برد. جاماسبی برای سەرکوت کرد. ماوەی پاشایەتی جاماسب شەش ساڵ بوو.

دوای ئەوە، قوباد بەمەبەستی شەڕ کردن لەگەڵ ڕۆمیەکان بەرێکەوت و دەستی بەسەر یەکێك لەشارەکانی جەزیرە گرت بەناوی ئامەد. خەڵکەکەی ئەسیر و لەنێوان فارس و سەرزەمینی ئەهواز بناغەی شارێکی داڕشت و بەرام قوباد ناوی برد. ئەو شارەیە کە موقباد و ئورگانیشی پێدەڵێن. ویلایەتێکی دروست کرد و گوندەکانی ویلایەتی سەرق و ویلایەتی رامهورموزی پەیوەست کرد.

قوباد پاشایەتی بەمناڵەکەی خۆی کەسرا ئەنەوشیرواندا. فەرمانێکی نوسراوی لەمبارەوە نووسی مۆری کرد. کاتێك مرد، کەسرا، وەسیەتەکانی قوبادی بەئەنجام گەیاند.

ماوەی پاشایەتی قوباد لەگەڵ پاشایەتی براکەی جاماسب چل و سێ ساڵ درێژەی کێشا.

## گێڕانەوەی ئەو ڕووداوانەی عەرەبەکان لەرۆژگاری قوباد لە پاشایەتی ئەودا دروستیان کرد

لەهوشام کوڕی محەممەدی کەلبی دەگێڕنەوە: کاتێك حارس کوڕی عودەی کێندی ڕووبەڕووی نەعمان کوڕی مونزەر کوڕی ئەمرۆ ئەلەقیس کوڕی شەقیقە بوویەوە و ئەوی کوشت و مونزەر کوڕی نەعمانی گەورە، گیانی ڕزگار کرد و حارس کوڕی عەمرۆ دەستی بەسەر پاشایەتی نەعماندا گرت، قوباد کوڕی فیروزی پاشای فارس، نامەی بۆ حارس کوڕی عەمرۆ نووسی: لەنێوان ئێمە و پاشای پێش تۆ پەیمانێك بوو، دەمەوێت تۆ ببینم.

قوباد بێ باوەڕێکی چاکەکار و لەخوێن ڕشتن بێزار بوو. سازگاری لەگەڵ دوژمنان لەخۆی نیشاندەدا. لەرۆژگاری ئەو هەڵیت و پڵیت بێژی فراوان و خەڵکان بوێر بوون. حارس کوڕی عەمرۆ لەگەڵ دەستەیەك هات و لەسەر پردی فیوم چاویان بەیەك کەوت. قوباد فەرمانیدا و خورمایان هێنا، ناوکی لەدەنکەکانی خورما دەرهێنا و بڕێکی دیکە خورمایان هێنا و تێکەڵ بەخورمای ناوکداری کرد. لەبەر دەم ئەواندا دایاننا. خورما ناوکدارەکان لەبەردەم حارسدا بوو. قوباد لەخورماکانی بەردەم خۆی دەخوارد و بەحارسی وت: بۆ هاوشێوەی من ناخۆیت؟

حارس وتی: وشتر و مەڕەکانی ئێمە ناوکی خورماکەیان خوارد. نەیزانی قوباد گاڵتەی پێدەکات.

لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کەحارس کوڕی عەمرۆ و هاوڕێکانی ئەسپەکانی خۆیان تا سنورەکانی فورات بێنن و زیاتر پێشڕەوی نەکەن. کاتێك حارس لاوازی قوبادی بینی، چاوی تەماحی لەسواد بڕی و بەئۆردوگاکانی خۆی وت سنورەکانی فورات ببەزێنن و هێرش بکەنە سەر سواد.

قوباد لەمەداین بوو کەهاواری هاوکاری بەرز بوویەوە و وتی: ئەمە بەدەسیسەی پاشاکەیانە.

کەسی بۆ لای حارس کوڕی عەمرۆ ڕەوانە کرد کەدەستەیەك لەدزەکانی عەرەب سەرقاڵی تالآنی کردنن و دەیەوێت بیبینێت. حارس هات و قوباد پێی وت: کارێکت ئەنجامدا کەس پێشتر بوێری ئەو کارەی نەبوو.

حارس وتی: بێ ئاگام، ئەوانە دز و چەتەکانی عەرەبن. تەنیا بەسامان و سوپا دەتوانم بەرنگاری عەرەبەکان ببمەوە.

قوباد وتی: چیت دەوێت؟

وتی: دەمەوێت بەشێك لەسواد پەیوەستی من بکەیت تا هاوکاری لێوەربگرم.

قوباد فەرمانیدا خوارەوەی فورات کەنزیك سنووری عەرەبەکان بوو، بەو ببەخشن کەبریتی بوو لەشەش بەش. حارس کوڕی عەمرۆ نامەی بۆ توبەع لەیەمەن نووسی: تەماحم بڕیوەتە پاشایەتی عەجەمەکان و دەستم بەسەر شەش بەشیدا گرتوە. سوپا ئامادە بکە چوونکە ولآتەکەیان بەرگری لێناکرێت. پاشا گۆشت ناخوات و ڕشتنی خوێن بەڕەوا نازانێت چوونکە باوەڕی بەئایینی بێ باوەڕان هەیە.

توبەع سوپای کۆکردەوە و فەرمانیدا ڕووبارێکی تا نەجەف بۆ هەڵبکەنێت. حارس ئەو کارەی کرد کەهەمان ڕووباری حیرەیە. توبەع لەوێ دابەزی و شیمر زو ئەلجەناحی برازای خۆی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی قوباد ڕەوانە کرد. شیمر شەڕی کرد و شکستی بەقوباد هێنا. قوباد بۆ ڕەی هەڵات. شیمر لەڕەی پێگەیشتەوە و خوێنی ڕشت.

توبەع، شیمری بۆ خوراسان ڕەوانە کرد و کوڕەکەی خۆی حسانی بۆ سەغد. فەرمانیدا هەرکەس خێراتر بەچین بگات، دەبێتە فەرمانڕەوا. هەرکام سوپایەکی گەورەی لەگەڵدا بوو کەدەڵێن شەشسەد هەزار و چل هەزار بوو. یەعفەری برازای بۆ ڕۆم ڕەوانە کرد. یەعفەر بەرێکەوت گەیشتە قوستەنتینە. خەڵکان ملکەچی بوون و باجیان پێدا.

بەرەو ڕۆمییە بەرێکەوت کە دووریەکەی لەقوستەنتینە چوار مانگە ڕێگەیە. گەمارۆی خستە سەر ئەوشارە. برسیەتی تەنگی بەسوپاکەی هەڵچنی و تاعوون لەناویاندا بڵاوبوویەوە. لاواز بوون. کاتێك ڕۆمییەکان بەمەیان زانی، هێرشیان

کردنەسەر و هەموو سوپاکەیان کوشتار کرد. هیچ کەس لەوان رزگاری نەبوو.

شیمر زوو ئەلجەناح تا سەمەرقەند پێشڕەوی کرد. گەمارۆی خستە سەر ئەوشارە بەڵام هیچ کارێکی بۆ نەکرا. کاتێك ئەمەی بینی، لای پاسەوانەکانی شار تێپەڕی و یەکێك لەخەڵکانی ئەو شارەی ئەسیر کرد و سەبارەت بەباروودۆخی شار و سوپاکە پرسی. وتیان: پاشای شار کەسێکی نەزانە وتەنیا خواردن و خواردنەوە دەزانێت و کچەکەی کاروباری خەڵکان هەڵدەسوڕێنێت.

شیمر بەو پیاوە چەندین دیاری گرانبایی بۆ کچی پاشا رەوانە کرد و پەیامیدا: لەسەرزەمینی عەرەبەکانەوە بۆیە رووم کردۆتە ئەم شارە لەبەر ئەوەی ئازناوی بیرمەندی و زانایی تۆ بەمن گەیشتووە. دەمەوێت ببیتە هاوسەری من تا کوڕێك بێتە دنیا و پاشایەتی عەرەب و عەجەم لەدەست بگرێت. من بۆ تالآنی نەهاتووم چوونکە چوارهەزار سنوقی زێر و زیوم پێیە و بەتۆی دەبەخشم. لێرەوە بەرەو چین دەڕۆم. ئەگەر دەستم بەسەر ئەو سەرزەمینەدا گرت، تۆدەبیتە هاوسەری من و ئەگەر کوژرام، ئەم گەنجە بۆ تۆ دەبێت.

کاتێك پەیام بەکچی پاشا گەیشت، وتی: رازیم، سامانەکە رەوانە بکە.

شیمر چوار هەزار سنوقی بۆ ئەو رەوانە کرد. لەهەر سنوقێك دووپیاوی حەشاردابوو. سەمەرقەند چوار دەروازەی بوو و لەسەر هەر دەروازەیەك چوار هەزار کەس ئێشکیان دەگرت. دەنگی زەنگیان کردە نیشانە. ئەمەی لەگەڵ ئەو کەسانەدا کردە نیشانە کەلەگەڵ سنوقەکان رەوانەی کردن.

کاتێك ڕۆشتنە ناو شارەکە، زەنگ لێدرا. هاتنەدەر و دەستیان بەسەر دەروازەکاندا گرت. شیمر هاوڕێ لەگەڵ سوپاکەی هاتە ناو شارەکە. خەڵکانی کوشتار کرد و دەستی بەسەر هەموو سامانی شارەکەدا گرت.

ئەوسا شیمر بەمەبەستی گرتنی چین بەرێکەوت. رووبەرووی ژمارەیەکی فراوان لەتورکەکان بوویەوە. ئەوانی شکستدا و بەرەو چین بەرێکەوت بەڵام ئاگادار بوویەوە کەحسان کوڕی توبەع سێ ساڵ پێش ئەو گەشتۆتە چین. وەك دەستەیەك ئاماژەیان پێداوە، لەوێ مانەوە تا مردن. ماوەی مانەویان لەچین یانزە ساڵی خایاند.

ئەوانەی گومانیان کردووە شیمر و حسان کوڕی توبەع لەچین مانەوە تا کاتی مردن، دەڵێن: توبەع لەنێوان خۆی و ئەوان منارەکانی دروست کرد. کاتێك ڕووداوێك ڕوویدەدا، شەوانە ئاگریان دادەگیرساند ولەیەك شەودا یەکتریان لەهەواڵەکان ئاگادار دەکردەوە. نیشانەی نێوانیان ئەمە بوو ئەگەر دووجار ئاگر لەلای یەمەنەوە هەڵکرێت، بەمانای لەناچوونی یەعفەرە و ئەگەر سێ جار ئاگر داگیرسا، نیشانەی لەناوچوونی توبەعە. ئەگەر ئاگر لەلای ئەوانەوە بێت نیشانەی لەناچوونی حسانە و ئەگەر دوو جار ئاگر داگیرسێت نیشانەی مردنی هەردووکیانە.

دوو ئاگریان داگیرساند و نیشانەی مردنی یەعفەر بوو. دوای ئەوە سێ ئاگریان داگیرساند و نیشانەی مردنی توبەع بوو.

بەڵام ئەو گێڕانەوەی باوەڕ پێکراوە بەمشێوەیە: شیمر و حسان لەو ڕێگەی کەڕۆشتبوون، هاورێ لەگەڵ تالانی و ئەسیر و جۆرەکانی گەوهەر و بۆنەخۆشەکان لەچینەوە بۆ لای توبەع و سەرزەمینی خۆیان گەڕانەوە. توبەع ڕۆشتە مەککە و لەدۆڵێك دابەزی و بیناغەی چێشتخانەکانی داڕشت.

مەرگی توبەع لەیەمەن بوو. دوای ئەو، هیچ کام لەپاشاکانی یەمەن، یەمەنی بەجێنەهێشت و لەسەرزەمینەکانی دیکە شەڕی تاقینەکردەوە. ماوەی پاشایەتی توبەع سەد و یانزە ساڵ درێژەی کێشا.

دەڵێت: وتوویانە، توبەع باوەڕی بەئاییینی جوولەکە هێنا. ئەمە بەهۆی ئەو ئەحبارانەوە بوو هاورێ لەگەڵ ئەو لەیەسریبەوە بەرەو مەککە کۆچیان کرد. دەڵێن: ژمارەیان فراوان بوو.

هەروەها وتوویانە: زانستی کەعب الاحبار لەپاشماوەی میراتی ئەحبارەکانی یەسریبە و کەعب الاحبار لەخەڵکانی حەمیرە.

بەڵام بەوتەی کوڕی ئیسحاق ئەو کەسەی بەرەو ڕۆژهەڵات ڕۆشت، توبەع تەبان ئەسعەد باوکی کەرب کوڕی مەلکیکەرب کوڕی زەید کوڕی عەمرۆ کوڕی زی ئەلئەزعار، باوکی حسان بوو.

## ئەنەوشیروان پاشایەتی گرتەدەست

ئەو، کوڕی قوباد کوڕی فیروز کوڕی یەزدگێرد کوڕی بەهرامی گورە. کاتێك پاشایەتی گرتەدەست، بۆ چوار سنووورداری دیاری فارس کەهەرکام فەرمانڕەوایەتی بەشێکی ولاٚتی دەکرد، نامەی نووسی. نامەی بۆ سنورداری ئازەربایەجان بەمشێوە بوو: بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان، لەپاشا کەسرا کوڕی قوباد بۆ واری کوڕی نەخەیر جان سنورداری ئازەربایەجان و ئەرمەنییە و دەوروبەرەکان و دۆنباوەند و تەبەرستان و سنورەکانی، سلاٚو لەئێوە، ئەوەی خەڵك دەبێت بەراستی لێی بترسن، نەبوونی کەسێك کە بەنەبوونی ئەو نیعمەتەکان بەرەو کەمی دەڕۆن و ئاژاوە دروست دەبێت و روداوە خراپەکان روودەدات بۆ گیان و مەڕوماڵاٚت و سامان و ئازیزان. لای ئێمە هیچ ترس و نەبوونێك لەپێشتر لەنەبوونی پاشایەکی شیاو نییە.

کاتێك پاشایەتی کەسرا بەهێز و سەقامگیر بوو، ئایینی پیاوێکی دووررووی لەدانیشتوانی فەسا بەناوی زەرادەشت کوڕی خەرگان لەناو برد کەدیاردەیەکی تازەی لەناو ئایینی زەردەشتی هێنابوویە کایەوە و خەڵکان شوێنی کەوتبوون. پیاوێك لەدانیشتوانی مەزریە بەناوی مەزدەك کوڕی بامداد خەڵکی بۆ شوێنکەوتنی ئەو هاندەدا. لەو شتانەی بەخەڵکانی دەوت و لەناو ئەوان بلاٚوی دەکردەوە، یەکسان بوون لەژن و سامان بوو، دەیوت: ئەمە کارێکی چاکەیە، خواوەند پەسەندی دەکات و پاداشتی چاکەی دەداتەوە، ئەگەر ئەم کارانە هاوشێوەی ئەرکێکی دینی نەدەبوون، کردارێکی پەسند کراون. خەڵکانی ژێردەستی دژی دەسەلاٚتداران هاندەدا. لای ئەو کەسانی پەست تێکەڵ بەشەریفەکان و رێگەی ستەم بۆ ستەمکار و ستەمکاری کرایەوە. خراپەکاران دەرفەتی تێرکردنی هەوەسەکانیان بەدەست هێنا و لەو ژنانە نزیك بوونەوە کەهیچ کات نەیاندەتوانی چاوی تەماحیان تێبڕن. خەڵك گرفتاری ئەزمون و بەلاٚیەکی گەورە بوون کەکەس هاوشێوەی نەبیستبوو. کەسرا رێگەی شوێنکەوتنی خەڵکانی لەئایینی زەرادەشت کوڕی خەرگان و مەزدەك گرت و دیاردەکانی ئەوانی لەناو برد. کەسانێکی زۆری لەشوێنکەوتەکانی ئەوان کوشت کەئامادە نەبوون دەست لەئایین و دینەکەی خۆیان هەڵبگرن. ئایینی مانی و شوێنکەوتەکانی لەناو برد و دینی زەردەشتی سەقامگیر و بەهێز کردەوە کەهێشتایش

لەناو فارسەکان شوێنکەوتەکانی فراوانە.

پێش پاشایەتی کەسرا، سوپاسالاری وڵات کسالاری سوپا بوو، لەژێر دەستی یەك کەسدا بوو. سوپا ئەم پێگەی لەناو چوار سوپاسالاردا دابەش کرد. یەکیان سوپاسالاری رۆژهەڵات بوو کەخوراسان و ناوچەکانی دەوروبەری دەگرتەوە، سوپاسالاری رۆژئاوا ، سوپاسالاری نیمەرۆ کەوڵاتی یەمەنە و سوپاسالاری ئازەربایەجان و ناوچەکانی دەوروبەری کەویلایەتی خورە بوو. ئەمەی کردە سەرچاوەی رێکخستن و نەزمی وڵات. چوارپێ و کەرەستەکانی شەڕی لەناو سوپاییەکان بلاو کردەوە. دووبارە دەستی بەسەرئەو ویلایەتانەدا گرتووە کە لەسنوری فارسەکاندا بوون و دوای داگیرکردنیان لەلایەن قوبادەوە بەهۆکاری جیاواز کەوتبوونە ژێردەستی پاشاکانی دیکە وەك سند و بست و رەخج و زابولستان و تەخارستان و دێهستان و کابولستان. ژمارەیەکی فراوانی لەخەڵکانی بارز کوشت و پاشماوەی ئەوانی ناچار کرد لەدیاری خۆیان کۆچ بکەن و لەشوێنەکانی دیکەی وڵات نیشتەجێ ببن. لەشەڕەکان کەڵکی لەهاوکاری ئەوان وەردەگرت و فەرمانیدا تا خەڵکانی سوڵیان ئەسیر کرد و هێنایانن. هەموویانی کوشت و تەنیا هەشتا کەس لەکەسە بوێرەکانی ئەوانی هێشتەوە و لەبەهرام فیروز نیشتەجێی کردن بۆ ئەوەی لەشەڕەکاندا کەڵکیان لێوەربگرێت.

نەتەوەی ئەبخەز و نەتەوەی بەنجەر و بەلەنجەر و ئالان، پەیمانیان بەست هێرش بکەنە سەر وڵاتەکەی. هێرشیان کردە سەر ئەرمەنییە و تالآنیان کرد. رێگەکەیان ئاوەڵا و ئاسان بوو. کەسرا گرنگی بەکارەکەیان نەدا و کاتێك لەسەرزەمینەکەی ئەو بلاو بوونەوە، سوپایەکی رەوانە کرد و لەناوی بردن جگە لەدە هەزار کەسیان کەئەسیر و لەئازەربایەجان و ناوچەکانی دەوروبەر نیشتەجێ کران.

فیروز لەناوچەی سوڵ و ئالان بینایەکی لەبەرد دروست کردبوو تا دیاری خۆی لەتالآن کردنی ئەو نەتەوە ئامارە پێدراوانە بپارێزێت. قوباد دوای باوکی چەندین بینای دیکەی لەوێ دروست کرد و کاتێك پاشایەتی کەوتە دەستی کەسرا، فەرمانیدا تا لەناوچەی سوڵ و ناوچەی گورگان بەبەردی داتاشراو شارەکان و قەڵاکان و چەندین بینا دروست بکەن تاپەناگەی دانیشتووانی ویلایەتەکە بێت بۆ ئەوەی ئەگەر دوژمن هێرشی کردەسەریان، بتوانن لەو شوێنانە پەنا بگرن.

سەنجبوای خاقان لەهەموو تورکەکان بوێرتر و ئازاتر و سوپایەکی فراوانتری لەبەردەستا بوو. لەگەڵ وزر پاشای هیپتالیەکان شەڕی کرد. لەبوێری و فراوانی ئەوان

نەترسا. وزری پاشا و زۆربەی سوپاکەی کوشتار کرد و سامانەکانی کردە تالآنی. دەستی بەسەر سەرزەمینەکەیاندا گرت جگە لەو ناوچانەی لەژێر دەستی کەسرادا بوو. هەروەها نەتەوەی ئەبخەز و بەنجر و بەڵەنجەری ناچار کرد ملکەچ و گوێرایەڵی فەرمانەکانی بن. وتیان: پاشای فارسەکان فیدیەیان پێداون تا هێرش نەکەنە سەر وڵاتەکەی. سەنجبوا بەسوپایەکی سەد و دەهەزار کەسییەوە هات و لەدیاری سوڵ نزیك کەوتەوە. کەسی بۆ لای کەسرا رەوانە و هەڕەشەی لێکرد. بەرز فڕی و مەبەستی ئەوەی کرد کەسرا سامانی بۆ رەوانە بکات و ئەو فیدیەی پێش پاشایەتی کەسرا بەخەڵکانی ئەبخەز و بەنجەر و بەڵەنجەریان دەدا، بەوان بدات و ئەگەر خێرا رەوانەی نەکات، هێرش دەکاتە سەر سەرزەمینەکەی و دەستی بەسەردا دەگرێت. کەسرا گرنگی بەهەڕەشەکانی نەدا و مەبەستەکەی بەراوەردە نەکرد چوونکە دەربەندی سوڵی بەهێز کردبوو. رێگە و دۆڵەکان کەسەنجبوای خاقان ناچار بوو لێیان تێپەڕێت، بەباشترین شێوە پارێزگاریان لێدەکرا. هەروەها سنووری ئەرمەنییە بەسوپایەکی پەنجا هەزار کەسی پێکهاتوو لەسوار وپیادە لەدەستدرێژی دوژمن پارێزراو بوو.

کاتێك سەنجبوای خاقان زانی کەسرا بەباشترین شێوە پارێزگاری لەسنورەکانی سوڵ دەکات، بێ هیوا هاورێ لەگەڵ سوپاکەی گەڕایەوە. ئەو و دژومنانی لەبەرابەر گورگان ریزیان بەستبوو، نەیانتوانی هێرش بکەنە سەر ئەو قەڵآیانەی کەسرا دروستی کردبوون و تالآنیان بکەن.

کەسرا ئەنەوشیروان بەرێوبەرێکی زانا و بیرمەند و بوێر و دوورئەندێش و میهرەبان بوو. کاتێك لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت، گەورەکان و سەرکردەکانی وڵات لەدەوری کۆبوونەوە و پیرۆزباییان لێکرد. کاتێك تەواو بوون، کەسرا وتارێکی پێشکەش کرد: سوپاسی خوای کرد کەخەڵکانی ئافراندووە و چارەسەری بۆ کێشەکانی ئەوان داناوە و رۆژی بۆ دیاری کردوون. لەوتارەکەی خۆیدا هەموو شتێکی باس کرد.

ئەوسا سەبارەت بەگرفتاری وزیانەکانی خەڵك و بەفیرۆچوونی ماڵ و خێزان و بژێوی قسەی کرد و وتی: مەبەستی ئەوەی لەسەردایە کاروبارەکان رێکبخات و گەندەڵی لەناو ببات. داوای هاوکاری و هاریکاری لێکردن.

فەرمانی کوشتنی گەورەکانی ئایینی مەزدەکیدا و سامانی ئەوانی لەناو هەژاراندا دابەش کرد. هەروەها ئەو کەسانەی کوشت بەزۆر دەستیان بەسەر ماڵ و مڵکی

خەڵکاندا گرتبوو. فەرمانیدا هەر منداڵێك کەباوکی نادیارە و زانراو نییە، پەیوەستی کەسێك بکرێت کەهەڵیدەگرێتەوە و شتێك لەسامانی پیاوەکەی پێبدەن. هەروەها ئەو ژنانەی بەزۆر بردوویانە، مارەیی ئەوان وەك تاوان دیاری و کەسەکانی رازی و ژنەکە سەرپشك بکەن کەلای ئەو پیاوە بمێنێتەوە یا ببێتە هاوسەری پیاوێکی دیکە مەگەر ئەوەی هاوسەری هەبێت و بیەوێت بۆ لای هاوسەرەکە کۆنەکەی بگەڕێتەوە.

فەرمانیدا هەرکەس زیانی لەسامانی کەسێکی دیکەداوە، ماف لێ بستێننەوە و ستەمکار بەئەندازەی ستەمەکەی سزا بدەن. فەرمانیدا کچانی خاوەن نەژاد بکەنە هاوسەری پیاوە شیاوەکان ((ئەوانەی سەرپەرەستەکانیان مردبوو)) و مارەی ئەوان لەخەزێنەی دەوڵەت بدەن. ژنی بنەماڵە گەورەکانیان کردە هاوسەری گەنجەکان. مارەیی ئەوانیدا و بێ نیازی کردن و پێی وتن ببنە هاورێکانی ئەو تا بتوانێت هاوکاریان لێوەربگرێت. هاوسەرەکانی باوکی سەرپشك کرد کەلەگەڵ ژنەکانی ئەو بمێننەوە و رۆژی وەربگرن و یا بەدوای پیاوی هاوشانی خۆیان بگەڕێن. فەرمانی هەڵکەندنی رووبار و کارێزەکانیدا. فەرمانیدا پێش بەها بەخەڵکانی ئاوایی کوش بدەن و بەهێزیان بکەن. فەرمانیدا پردە رووخاوەکانی گوندە وێرانەکان سەرلەنوێ نۆژەن بکرێتەوە. سوارکارانی بەهێز و چوارپێی بەهەژار و دەسکورتەکاندا و رۆژی بۆ دیاری کردن. پاسەوانی بۆ ئاشکەدەکان دانا، رێگاکانی ئەمن کردەوە و بینا و قەڵاکانی لەسەر رێگاکان دروست کرد. کەسانی شیاوی وەك فەرمانڕەوای ویلایەتەکان دیاری کرد و بەباشترین شێوەی رێزی لەکەسە هەڵبژێردراوەکان گرت. شێواز و رێ و رەسمی پاشایەتی ئەردەشێری کردە نموونە.

دوای چەندین ساڵ پاشایەتی و سەقامگیر بوونی نیزامی پاشایەتی و ملکەچی و گوێرایەڵی ویلایەتەکان، بەرەو ئەنتاکیە بەرێکەوت کەسەرکردەکانی سوپاکەی قەیسەر لەوێ بوون. دەستی بەسەر شارەکاندا گرت و فەرمانیدا شاری ئەنتاکیە بەدووری و ژمارەی مەنزڵەکان و رێگاکان و ئەوەی لەو شارەدابوو، بەنەخشە بکێشن و لەتەنیشت شاری مەداین شارێکی هاوشێوە دروست بکەن. شارەکە بەرۆمیە ناسرا و هاوشێوەی ئەنتاکیە دروستیان کرد. خەڵکی ئەنتاکییەی کۆچ پێکرد و لەوشارەدا نیشتەجێی کردن.

کاتێك لەدەرگای شارەکە رۆشتنە ناو، ئەندامانی هەرماڵێك رۆشتنە ناو ماڵێك هاوشێوەی ماڵەکەیان لەئەنتاکیە، وەك بڵێی هەرگیز لەو شارە نەرۆشتونەتەدەر.

ئەوسا مەبەستی هێرش کردنە سەر هێرقلی کرد ودەستی بەسەرداگرت. دواتر

دەستی بەسەر ئەسکەندەریە و شارەکانی دیکە گرت. قەیسەر ملکەچی خۆی دەربڕی و فدیەیدا. کەسرا، دەستەیەک لەسوپاکەی خۆی لەسەرزەمینی ڕۆم جێگیر کرد.

کاتێک لەڕۆم گەڕایەوە و بەرەو خەزەر بەڕێکەوت، تۆڵەی ئەو خوێنانەی وەرگرتەوە کەلەژێردەستەکان و مسکێنەکانی وڵاتەکەی ڕشتبوویان. لەوێوە بەرەو عەدەن بەڕێکەوت و لەنزیک سەرزەمینی حەبەشە لەشوێنێك لەدەریا لەنێوان دوو کێو بەکەشتیە گەورەکان و بەرد و ستونە ئاسنینەکان، ڕێگەی بەست و گەورەکانی ئەو دیارەی کوشتار و بۆ مەداین گەڕایەوە. هەموو ویلایەتەکانی ڕۆم کە ئەم لای هێرقەلە بوو لەگەڵ ئەرمەنییە و هەموو ویلایەتەکانی سنووری عەدەن تا دەریا ملکەچی فەرمانەکانی ببوون.

لەم کاتەدا مونزەر کوڕی نەعمانی کردە پاشای عەرەبەکان و ڕێزی لێگرت. خۆی لەمەداین مایەوە و کاروبارەکانی ساماندەدا.

دوای ئەوە بەمەبەستی تۆڵە سەندنەوەی باوەگەوڕێی خۆی یانی فیروز هێرشی کردە سەر سەرزەمینی هیپتالیەکان. پێشتر ئەنەوشیروان ببوە زاوای خاقانی چین. پێش ڕۆشتن نامەی بۆ نووسی و لەمەبەستەکەی خۆی ئاگاداری کردەوە و فەرمانی پێدا هێرش بکاتە سەر هیپتالیەکان. هێرشی کردەسەریان و پاشاکەیانی کوشت و بنەماڵەکەی لەناو برد. لەبەلخ و سنورەکانی ئەودیو بەلخ تێپەڕی و سوپاکەی خۆی لەفەرغانە دابەزاند.

لەخوراسان گەڕایەوە و کاتێك گەشتە مەداین، دەستەیەك هاتن و دژی حەبەشە داوای هاوکاریان لێکرد. یەکێك لەسەردارەکانی خۆی هاوریێ لەگەڵ سوپایەك لەخەڵکانی دەیلەم و دەوروبەرەکانی رەوانە کرد کەمەسروقی حەبەشیان لەیەمەن کوشت و لەوێ نیشتەجێ بوون.

ئەنەوشیروان بەردەوام سەرکەوتوو و بەختەوەر بوو. هەموو نەتەوەکان شکۆ و مەزنی ئەویان لەدڵدا بوو و نێردراوان لەچین و تورك و خەزەر و نەتەوەکانی دیکە لەبەردەرگای ئامادە بوون. ڕێزی لەزاناکان دەگرت.

ماوەی پاشایەتی ئەنەوشیروان چل و هەشت ساڵ درێژەی کێشا و لەدایك بوونی پێغەمبەر(د.خ) لەکۆتاییەکانی ڕۆژگاری ئەو بوو.

هوشام دەڵێت: ماوەی پاشایەتی ئەنەوشیروان چل و حەوت ساڵ درێژەی کێشا و عەبدالله کوڕی عەبدولموتەلیب باوکی پێغەمبەر(د.خ) لەساڵی چل و دووەم

لەپاشایەتی ئەو چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

بەوتەی هوشام کاتێك کاروبارەکان و پاشایەتی ئەنەوشیروان سەقامگیر بوو، مونزەر کوڕی نەعمانی گەورەی بانگ کرد و حیرە و پاشایەتی بنەماڵەی حارس کوڕی عەمرۆ ناسراو بەئاکول ئەلمەراری بەو سپارد. دایکی مونزەر، ماء ئەلسەما لەخەڵکانی نەمر و لەپاشایەتی حیرەدا مایەوە تا ئەو کاتەی مرد.

دەڵێت: ئەنەوشیروان هێرشی کردە سەر خەڵکانی بەرجان و گەڕایەوە و بەنداوی باب و ئەبوابی دروست کرد.

هوشام دەڵێت: لەدوای ئەسوەد کوڕی مونزەر براکەی مونزەر کوڕی مونزەر کوڕی نەعمان لەلایەن پاشاکانی فارسەوە پاشایەتی عەرەبەکانی گرتەدەست و بۆ ماوەی حەوت ساڵ پاشایەتی کرد.

دایکی نەعمان دایکی مەلەك کچی عەمرۆ کوڕی حیجر خوشکی حارس کوڕی عەمرۆ کێندی بوو.

دوای ئەو باوکی یەعفەر کوڕی عەلقەمە کوڕی مالك کوڕی عودەی کوڕی زەمیل کوڕی سور کوڕی ئەسەس کوڕی رەبی کوڕی نەمارە کوڕی لەخم بۆ ماوەی سێ ساڵ پاشایەتی عەرەبەکانی کرد.

دوای ئەو مونزەر کوڕی ئەمرۆ ئەلقەیس ئەلبەه پاشایەتی گرتەدەست. نازناوەکەی زولقەرنەیین بوو. بۆیە ئەم نازناوەی پێبڕا چوونکە بەدوو دەستە پرچەکانی دەهۆنییەوە. دایکی مونزەر ماریە ناسراو بەماء ئەلسەماء کچی عەوف کوڕی جەشم کوڕی هیلاك کوڕی رەبیعە کوڕی زەید کوڕی مەنات کوڕی عامر ئەلزەحیان کوڕی سەعد کوڕی خەزەرەج کوڕی تیم الله کوڕی نەمر کوڕی قاست بوو. ماوەی پاشایەتی ئەو چل و نۆ ساڵ درێژەی کێشا.

دوای ئەو کوڕەکەی عەمرۆ کوڕی عەمۆ کوڕی مونزەر بۆ ماوەی شانزە ساڵ پاشایەتی کرد. دایکی عەمرۆ هیند کچی حارس کوڕی عەمرۆ کوڕی حجر ئاکل ئەلمەرار بوو.

دەڵێت: هەشت ساڵ و هەشت مانگ لەپاشایەتی عەمرۆ کوڕی هیند تێپەڕی کەپێغەمبەر چاوی بەدنیا هەڵهێنا. ئەمە لەرۆژگاری ئەنەوشیروان و لەساڵی فیلدا بوو کەئەبرەهە ئەلاشەرم باوکی یەکسوم هێرشی کردە سەر ماڵی خوا،

## وتار سەبارەت بەئەحوالی توبەع لەرۆژگاری قوباد و ئەنەوشیروان و بەرێکەوتنی سوپای فارسەکان بۆ یەمەن بەمەبەستی شەڕ لەگەڵ حەبەشیەکان

لەمحەممەد کوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: دوایین توبەع کەتەبان ئەسعەد باوکی کەرب بوو، کاتێك لەرۆژهەڵات گەڕایەوە، لەرێگەکەی بەمەدینەدا تێدەپەڕی. یەکەم جار کە لەو شارە تێپەڕی کرد، خراپەی بەرابەر بەخەڵکەکەی نەکرد و کوڕەکەی خۆی لەوێ دانا کەکوژرا. کاتێك بۆ مەدینە گەڕایەوە، مەبەستی وێران کردن و لەناو بردنی ئەو شارە و بڕینی دارخورماکانی کرد. ئەنساریەکان کاتێك ئەمەیان بیست، کۆبوونەوە بۆ ئەوەی رێگەی ئەو کارەی لێبگرن. سەرکردەکەیان عەمرۆ کوڕی زەللە یەکێك لەمناڵەکانی نەجاڕ بوو. دوای ئەو عەمرۆ کوڕی مەبزول سەرکردایەتی ئەوانی لەئەستۆدا بوو. بەمەبەستی شەڕ کردن و بەرگری بەرێکەوت و کاتێك توبەع لەوێ دابەزی، یەکێك لەخەڵکانی مەدینە لەمناڵەکانی عودەی کوڕی نەجار بەناوی ئەحمەر، یەکێك لەپیاوەکانی توبەعی لەناو باخی دارخورماکانی خۆی بینی کەدارخورمای دەبڕییەوە، بەداس لێیدا و ئەوی کوشت و خستیە ناو چاڵێك کە بەزات تومان ناویان دەبرد. ئەم رووداوە بێزاری و رقی توبەعی زیاتر کرد. لەم کاتەدا ئەنسارییەکان بەرۆژ شەڕیان لەگەڵ دەکرد و شەوانە وچانیان دەگرت. لەکاری ئەوان سەریسوڕمابوو و دەیوت، سوێند بەخوا، ئەمانە خەڵکانێکی بەخشندەن. دوان لەئەحباری جوولەکە لەمناڵەکانی قورەیزە ڕۆشتنە لای کەخاوەن زانست و بیرمەند بوون و بیستبوویان مەبەستی وێران کردنی مەدینە و کوشتاری خەڵکەکەی هەیە، پێیان وت: ئەی پاشا ئەم کارە مەکە، چوونکە ئەگەر پێداگری بکەیت، خوا رێگەی ئەو کارەت لێدەگرێت و دەترسین سەرئەنجام بەسزای خوای گرفتار ببیت.

توبەع وتی: بۆ دەبێت ئەوە روویدات؟

وتیان: دوایین پێغەمبەر(د.خ) لەنەتەوەی قوریش بۆ ئێرە کۆچ دەکات. ئەم شارە ماڵ و نشینگەی ئەوە.

کاتێك ئەم قسانەیان بیست، لەمەبەستەکەی پەشیمان بوویەوە. لەقسەکانی ئەوان سەریسوڕما و لەمەدینە ڕۆشت. ئەوانی لەگەڵ خۆی بۆ یەمەن برد و باوەڕی

بەدینەکەیان هێنا. ناوی ئەو دوانە کەعب و ئەسەد و لەمناڵەکانی قورەیزە بوون. ئامۆزا و زاناترینی خەڵکانی رۆژگاری خۆیان بوون.

دەڵێت: توبەع و هاوەڵانی بتپەرەست بوون. لەرێگەی مەککەوە و دەرۆشتە یەمەن. لەنێوان مەککە و مەدینە چەند کەسێك لەخەڵکانی هوزەیل رۆشتنە لای و وتیان: ئەی پاشا، دەتەوێت رێگەی بیت المالی کۆنت نیشان بدەین کەپاشاکان لێی بێ ئاگا بوون؟ چوونکە لەو شوێنەدا مرواری و زەمورود و یاقوت و زێر و زێر حەشاردراوە.

توبەع وتی: بەڵێ.

وتیان:ماڵێك لەمەککەدایە کەخەڵکان لەو ماڵەدا خواپەرەستی دەکەن و نوێژی تیا دەخوێنن.

هوزەیلیەکان بەم کارە دەیانویست لەناوی ببەن چوونکە زانیبوویان هەر کام لەپاشاکان مەبەستی ئەو ماڵە بکات و دەستدرێژی بکاتە سەر، لەناو دەچێت.

کاتێك وتەکانی ئەوانی بیست، کەسی بۆ لای کەعب و ئەسەد رەوانە کرد و بۆچوونی ئەوانی پرسی، وتیان: ئەم خەڵکە مەبەستی لەناو بردنی تۆ و سوپاکەتیان هەیە، ئەگەر ئەو کارە ئەنجام بدەیت کەئەوان پێشنیاری دەکەن، لەناو دەچیت و هەرکەس لەگەڵ تۆدا بێت، لەناو دەچێت.

وتی: کاتێك گەشتمە ئەوێ دەبێت چیبکەم؟

وتیان: کاتێك گەشتیت، ئەو کارە بکە کەخەڵکانی ئەوێ ئەنجامی دەدەن، بەدەوری ماڵی خوادا بسوڕێرەوە و رێزی بگرە، سەر بتاشە و لەخۆبوردووی بکەرە پیشە تا لەوێ دەڕۆیت.

وتی: بۆ ئێوە ئەو کارە ناکەن؟

وتیان: سوێند بەخوا ئەمە ماڵی باوکی ئێمە ئیبر اهیمە. راستیەکانمان بەتۆ وت، بەلام خەڵکانی ئەوێ بەهۆی ئەو بتانەی لەو ماڵە دایانناوە و ئەو خوێنانەی لەوێ ڕشتوویانە، رێگری ئەم کارەمان لێدەکەن چوونکە خەڵکانێکی بێباوەڕ و ریاکارن.

توبەع زانی ئەوان چاکەخوازن. هوزەیلیەکانی هێنا و دەست و پێی ئەوانی بڕییەوە. بەرێکەوت تا گەیشتە مەککە. لەخەودا پێی وترا ماڵەکە دابپۆشێت. وەك وتوویانە توبەع یەکەم کەس بوو ماڵەکەی داپۆشی و پێشنیاری بەکاربەدەستانی خۆی لەجورهەمیەکان کرد ماڵەکە بەپاك و خاوێنی رابگرن و خوێن و مردوو و ژنی نەخۆش

((سووڕی مانگانە)) نەبەنە ناو ماڵەکە. دەرگا و کلیلی بۆ ماڵەکە دروست کرد و لەگەڵ سوپاکەی و کەعب و ئەسەد بۆ یەمەن گەڕایەوە. کاتێك گەیشتە یەمەن، فەرمانی بەخەڵکەکەی خۆیدا باوەڕ بەدینەکەی بێنن. ئەوان رازی نەبوون تا ئەو کاتەی داوای داوەری لەو ئاگرە بکەن کە لەیەمەندا بوو.

لەئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی تەڵحە دەگێڕنەوە: کاتێك توبەع لەیەمەن نزیك کەوتەوە تا بڕواتە ناو شارەکە، حەمیریەکان ڕێگەیان لێگرت و وتیان: تۆ کەپشتت کردۆتە دینەکەی ئێمە، نابێت بێیتە ناو وڵاتەکەی ئێمە.

توبەع پێشنیاری ئایینەکەی خۆی بەوان کرد و وتی: ئەم ئایینە، لەدینەکەی ئێوە باشترە.

وتیان: داوەری دەبەینە لای ئاگر. توبەع رازی بوو.

وەك خەڵکانی یەمەن دەڵێن، لەیەمەندا ئاگرێک بوو و کاتێك لەسەر کارێك جیاوازی روویدەدا، ئاگرەکە لەنێوان ئەوان داوەری دەکرد بەو شێوە کەستەمکاری دەخوارد و زیانی لەستەملێکراو نەدەدا. کاتێك ئەم پێشنیارەیان بەتوبەع کرد، وتی: دادپەروەرییە.

خەڵکان بتەکانی خۆیان هێنا. کەعب و ئەسەد هاتن. کتێبەکانی خۆیان بەگەردنیانەوە هەڵواسیبوو و لەشوێنێك کەئاگرەکە دەهاتەدەر، دانیشتن. ئاگرەکە هاتەدەر و کاتێك لەوان نزیك بوویەوە، دوور کەوتنەوە، ترسان. ئەو خەڵکانەی لەوێ ئامادە بوون، سەرکۆنەیان کردن و وتیان: خۆڕاگری بکەنە پیشە. ئەوان خۆڕاگریان کرد تا ئاگرەکە هات و بتەکانی خەڵکانی حەمیری خوارد. کەعب و ئەسەد هاوڕێ لەگەڵ ئەو کتێبانەی بەملیانەوە بوو، تەندروست هاتنەدەر. ناوچاوانیان ئارەقی کردبوویەوە، بەڵام زیانیان بەرنەکەوتبوو. حەمیریەکان باوەڕیان بەدینەکەی توبەع هێنا. ئایینی جوولەکە لەیەمەن لەم رووداوەوە سەرچاوە دەگرێت.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: کەعب و ئەسەد و ئەو حەمیریانەی لەگەڵ ئەوان ڕۆشتبوونەدەر، بەدوای ئاگرەکەدا ڕۆشتن تا بۆ شوێنەکەی خۆی ببەنەوە. ووتیان: هەر کەسێك ئاگرەکە بۆ شوێنەکەی بگەڕێنێتەوە، ماف و راستی لەگەڵدایە. کەسانێك لەحەمیریەکان هاوڕێ لەگەڵ بتەکانی خۆیان نزیك کەوتنەوە تا ئاگرەکە بۆ شوێنی خۆی بگەڕێننەوە. ئاگرەکە نزیك کەوتەوە و ئەوانی خوارد. دەستیان بەخوێندنەوەی

تەورات کرد و ئاگرەکە پاشەکشێی کرد. حەمیریەکان باوەڕیان بەدینەکەی ئەوان هێنا. ماڵێکیان بوو بەناوی رەئام و لەکاتی بێ باوەڕی کوڕنوشیان بۆ دەبرد. شوێنی قوربانی کردنەکەیان لەو ماڵەدا بوو و لەوێوە دەنگ و قسەیان دەبیست. کەعب و ئەسەد بەتوبەعیان وت: ئەمە شەیتانە فریویان دەدات و گەمە بەئاوزیان دەکات، ئەو بەئێمە بسپێرە. توبەع وتی: بەئێوەم سپارد.

وەك خەڵکان بۆیان باس کردووم، سەگێکی ڕەشیان لەماڵەکە هێنایەدەر و سەریان بڕی و ماڵەکەیان وێران کرد. بیستوومە پاشماوەکەی لەیەمەنە و شوێنەواری خوێنی سەگەکە، هێشتا ماوەتەوە.

توبەع سەبارەت بەم سەفەرەکە و مەبەستەکەی بۆ وێران کردنی مەدینە و هەڵس و کەوتی لەگەڵ هوزەیلیەکان و کردەوەکانی بەرابەر بەماڵی خوا لەمەککە و ئەوەی کەعب و ئەسەد سەبارەت بەپێغەمبەر بۆیان باس کرد، قەسیدەیەکی هەیە بەم ناوەڕۆکە:

بۆ خەوتنی تۆ هاوشێوەی خەوتنی نەخۆشەکانە
کەنەخۆشیت وەك بڵێ هەرگیز نەخەوتوویت.
لەکینەی دو سەبت کە لەیەسرب جێگیر بوون
کەشیاون بۆ سزای ڕۆژی ڕەش
من لەمەدینە منزڵێکم هەبوو
مانەوە لەو شوێنە سازگار و خەوتن تیایدا دڵرفێن بوو
لەبەرزاییەك لەنێوان عەقیق و بەقیع نشینگەیەکم هەبوو
کاتێك لەیەسرب دادەبەزیم، دڵمان بۆ کوشتار قوڵتی دەدا
سوێندم خواردبوو ئەگەر بڕۆمە ناو یەسرب
لەوێ خورما و دار خورما نەهێڵم
بەڵام کەعب و ئەسەدی زانا لە قورەیزەوە هاتنە لای من
کەسالاری جوولەکەکانن
ووتیان: لەم گوندە دەست هەڵبگرە
چونکە بۆ پێغەمبەر پارێزراوە
ئەو لەقورەیشە و ڕێنیشاندەری خەڵکەکەیەتی
چاوپۆشیم لەوان کرد

لەترسی سزای ڕۆژی درێژ
بەهیوایی بەخشینی خواوەند لەرۆژی هەستانەوە و رزگار بوون لەجەهەننەمی سوتێنەر
ئەوانم پشتگوێ خست
و لەخەڵکەکەی خۆم
پیاوێکی خاوەن نەژاد و بوێرم
لەوێ بەجێهێشت
کەبەردەوام سەرکەوتن هاورێیەتی دەکرد
بەم کارەم، چاوەڕوانی بەخشین لەخواوەندی محەممەد بووم
نەمدەزانی خواوەند لەدۆڵی مەککە
ماڵێکی پاکی هەیە کەلەوێ دەیپەرەستن
کەسانێك لەهوزەیل هاتنە لای من
وتیان لەمەککە ماڵێکی کۆن هەیە
لێوانلێوە لەگەنج و مرواری
مەبەستی تاڵان کردنیم کرد بەڵام پەروەردگار رێگەی نەدا
خواوەند رێگر بوو لەوێران کردنی ماڵەکە
لەهیواکانم چاوپۆشیم کرد
ئەوانم کردە وانەیەك بۆ بینەران و داهاتووان
پێش من زولقەرنەیین موسوڵمان بوو
و پاشایەك کەخەڵکان گوێرایەڵی فەرمانەکانی بوون
پاشای رۆژهەڵات و رۆژئاواکان بوو
لەحەکیمی رێبەر زانستی دەخواست
ئاوابوونی هەتاوی بینی
کە لەسەرچاوەیەك رۆدەچوو
پوورەکەم بەلقیس لای ئەو بوو
پاشایەتی کرد تا ئەوەی شانە بەسەر رۆشتە لای.
لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: ئەنسارییەکان دەڵێن: توبەع لەگەڵ دەستەیەك

لەجوولەکەکانی دژایەتی و دوژمنایەتی دەکرد. کاتێك هاتە مەدینە، مەبەستی لەناو بردنی ئەو شارەی کرد. ئەنسارییەکان ڕێگەیان لێگرت و شارەکەی بەجێهێشت. لەبەر ئەمە لەهۆنراوەکەی خۆیدا دەڵێت:

لەکینەی دو سەبت کە لەیەسرب جێگیر بوون

کەشیاون بۆ سزای ڕۆژی ڕەش.

هەروەها لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: پێش ئەوە، شافیع کوڕی کەلیبی سەدەفی کاهین، ڕۆشتە لای توبەع و ماوەیەك لای ئەو مایەوە. کاتێك مەبەستی جیابوونەوەی کرد، توبەع وتی: چی لەزانستەکەی تۆ ماوەتەوە؟

شافیع وتی: هەواڵێکی ئاشکرا و ڕاست.

وتی: ئایا هیچ نەتەوەیەك پاشایەکی هاوشێوەی پاشایەتی منی هەیە؟

شافیع وتی: نە، بەڵام پاشای غەسان، کەسێکی گەورەی بەدوادا دێت.

وتی: ئایا پاشایەتییەکەی گەورەتر لەپاشایەتی منە؟

شافیع وتی: بەڵێ.

وتی: ئەو کێیە؟

شافیع وتی: چاکەکارێك کەوەسفی لەزەبووردا هاتووە و نەتەوەکەی لەکتێبەکان پێش خەڵکانی دیکە کەوتوون، تاریکی بەنوور لەناو دەبات، ئەحمەدی پێغەمبەر(د.خ)، خۆزگەم بەنەتەوەکەی، کاتێك چاو بەدنیا هەڵدەهێنێت، یەکێکە لەمناڵەکانی لۆئەی، لەتیرەی قوسەی.

توبەع کەسی ڕەوانە کرد و زەبووریان هێنا. سەیری کرد و تایبەتمەندیەکانی پێغەمبەری(د.خ) بینی.

دەڵێن: یەکێك لەپاشاکانی لەخم لەنێوان توبەعەکانی حەمیر پاشایەتی دەکرد. ناوی ڕەبیعە کوڕی نەسر بوو.. پێش پاشایەتی ئەو توبەعی یەکەم پاشایەتی دەکرد. ئەو، زەید کوڕی عەمرۆ زی ئەلئەزعار کوڕی ئەبرەهە کوڕی زی ئەلمەنار کوڕی رائیش کوڕی قەیس کوڕی سەیفی سەبای بچوك کوڕی کەهف ئەڵزوڵم کوڕی زەید کوڕی سەهل کوڕی عەمرۆ کوڕی قەیس کوڕی معاویە کوڕی جوشەم کوڕی وائیل کوڕی غەوس کوڕی قەتن کوڕی عەریب کوڕی زوهەیر کوڕی ئەیمەن کوڕی هەمیسع کوڕی عەرنجی حەمیر کوڕی سەبای گەورە کوڕی یەعرب کوڕی یەشجب کوڕی قەحتان بوو.

ناوی سەبا عەبد شەمسە و بەسەبا ناویان دەبرد لەبەر ئەوەی یەکەم کەس لەعەرەبەکانە ئەسیری گرت. بەئەسیر دەڵێن سەبی.

ئەمە بنەماڵەی پاشایەتی حەمیر بوو کەتوبەعەکانن.

دوای توبەعی یەکەم، زەید کوڕی عەمرۆ شەمریەرعش کوڕی یاسر یەنعەم کوڕی عەمرۆ زی ئەلئەزعار کوڕی پووری ئەو بوو. شەمریەرعش ئەو کەسەیە لەگەڵ چینییەکان شەڕی کرد و بناغەی شاری سەمەرقەندی داڕشت و حیرەی دروست کرد. هەروەها ئەم هۆنراوە هی ئەوە:

من شمر کوڕی باوکی کەربی یەمانیم
کەئەسپم لەیەمەن و شامەوە هێنا
تا هێرش بکەمە سەر ئەو بەندانەی
لەپشت چین و لەعەسم و یام
دەستدرێژیان کردبووە سەر ئێمە
لەولاتی خۆمان بەدادپەروەری هەڵس وکەوت دەکەین
دادپەروەری ئێمە هەموو خەڵکان دەگرێتەوە.
ئەمە هۆنراوەیەکی دوور و درێژە.

دەڵێت: دوای شەمر یەرعەش کوڕی یاسر یەنعەم، توبەعی بچوك بوو. ئەو تەبان ئەسعەد باوکی کەرب کوڕی ملکیکەرب کوڕی زەید کوڕی توبەعی یەکەم کوڕی عەمرۆ زو ئەلئەزعارە. ئەو کەسە بوو بەرەو مەدینە ڕشت و دوو حبرەکەی (کەعب و ئەسەد) لەگەڵ خۆی بۆ یەمەن برد. بیت الحرامی ئاوەدان کردەوە و داپپۆشی و ئەو هۆنراوەی هۆنییەوە.

هەموو توبەعەکان پێش پاشایەتی ڕەبیعە کوڕی نەسری لەخمی بوون. کاتێك ڕەبیعە مرد، پاشایەتی سەراسەری یەمەن بەحسان کوڕی تەبان ئەسعەد کوڕی باوکی کەرب کوڕی ملکیکەرب کوڕی زەید کوڕی عەمرۆ زوئەلئەزعار گەیشت.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: ڕەبیعە کوڕی نەسر خەوێکی بینی. خەوەکە، ترسی لەدڵی ئەودا دروست کرد. لەناو ولاتەکەی خۆی هەرچی ئەستێرەناس و کاهین بوو، کۆیکردەوە و پێی وتن: خەوێکم بینیوە وبۆتە هۆی پەرێشان بوونی من، لێکدانەوەی

ئەو خەوەم پێبڵێن.

وتیان: خەوەکەت بگێڕەرەوە تا لێکدانەوەی بۆ بکەین.

وتی: ئەگەر خەوەکەم بەئێوە بڵێم، لەلێکدانەوەکەتان دڵنیا نابم چوونکە هەر کەس لێکدانەوەی خەونەکان بزانێت، پێشتر لەخەوەکانیش ئاگادارە.

کاتێك پاشا ئەم قسەی هێنایە سەرزمان، یەکێك لەناو ئەو کەسانەی لەوێ ئامادە بوو، وتی: ئەگەر پاشا ئەوەی دەوێت، کەس بەدوای شەتیح و شەق ڕەوانە بکات چونکە کەس لەوان زاناتر نییە و لەهەموو شتەکان ئاگادارت دەکەنەوە. ناوی سەتیح، رەبیع کوڕی رەبیعە کوڕی مەسعود کوڕی مازن کوڕی زەئب کوڕی عودەی کوڕی مازن کوڕی غەسانە. بەزەئبییش ناوی دەبەن چونکە ڕەچەڵەکی بۆ زەئب کوڕی عودەی دەگەڕێتەوە. شەق، کوڕی سەعب کوڕی یەشکر کوڕی رەهم کوڕی ئەفرەك کوڕی نەزیر کوڕی قەیس کوڕی عەققەر کوڕی ئەنمارە. کاتێك پاشا نامەی بیست، کەسی بەدوای ئەواندا ڕەوانە کرد. سەتیح پێش شەق هات و لەرۆژگاری ئەوان کاهینی وەك خۆیان نەبینراوە. کاتێك سەتیح هات، ئەوی بانگ کرد و وتی: ئەی سەتیح، خەوێکم بینیوە و پەرێشانی کردوم، لەخەوەکەم ئاگادارم بکەرەوە چونکە ئەگەر خەوەکە بزانیت، دەتوانیت لێکدانەوەی بۆ بکەیت.

سەتیح وتی: ئەو کارە دەکەم، کاسەی سەرت بینیوە کە لەتاریکیەوە هات و لەناو سەرزەمینێکی گەرم کەوتە خوار. هەر کەسێك ژیری هەبێت، لێی خوارد.

پاشا وتی: ئەی سەتیح، راستت ووت، لێکدانەوەکەی چییە؟

وتی: سوێند بەوەی لەنێوان دوو وەرزی کشتوکاڵدایە، حەبەشیەکان هێرش دەکەنە سەر سەرزەمینەکەی ئێوە و لەنەبیت تا جەرش دەخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە.

پاشا وتی: ئەی سەتیح، سوێند بەگیانی باوکت، ڕووداوێکی بەئازار و ڕەنجهێنەرە، کەی ڕوودەدات، لەرۆژگاری من یا کەسانی دوای من؟

سەتیح وتی: ماوەیەکی زۆر لەدوای تۆ دەبێت، زیاتر لەشەست یا حەفتا ساڵ.

پاشا وتی: ئایا پاشایەتی ئەوان درێژە دەکێشێت یا کۆتایی پێدێت؟

سەتیح وتی: دوای حەفتا و چەند ساڵ کۆتایی پێدێت. هەموویان دەکوژرێن یا هەڵدێن.

پاشا وتی: لەناو بردن و کوشتنی ئەوان بەدەستی کێ دەبێت؟

سەتیح وتی: لەسەر دەستی ئەرەم زی یەزن کە لەعەدەنەوە دێت و کەس لەوان لەناو یەمەندا ناهێڵێتەوە.

پاشا وتی: ئایا پاشایەتی ئەو درێژە دەکێشێت؟

سەتیح وتی: کۆتایی پێدێت.

پاشا وتی: کێ کۆتایی پێدێنێت؟

سەتیح وتی: پێغەمبەرێکی پاك و خاوێن کەلەلایەن خواوەندەوە وەحی بۆ دێتەخوار.

پاشا وتی: ئەم پێغەمبەرە کێیە؟

سەتیح وتی: یەکێك لەمناڵەکانی غالب کوڕی قەهر کوڕی مالك کوڕی نەزر، پاشایەتی خەڵکەکەی تا ڕۆژی کۆتایی بەردەوام دەبێت.

پاشا وتی: ئەوەی باست کرد، ڕاستە؟

سەتیح وتی: بەڵێ، سوێند بەئاسۆ و بەتاریکی کەلەڕۆژێکی گەورە یەکدەگرنەوە، ئەوەی باسم کرد، ڕاستە.

کاتێك، کۆتاییان بەگفتوگۆکە هێنا، شەق گەیشت. پاشا ئەوی بانگ کرد و وتی: ئەی شەق، خەوێکم بینیوە وبۆتە هۆکاری پەرێشان بوونم. باسی خەوەکەم بکە. ئەگەر خەوەکە بزانیت، دەتوانیت لێکدانەوەی بۆ بکەیت. بەڵام لەوتەکانی سەتیح ئاگاداری نەکردەوە تا بزانێت ئایا بۆچوون و لێکدانەوەکانیان چوونییەکە یا جیاواز.

شەق وتی: بەڵێ، کاسەی سەرت بینیوە کە لەتاریکیەوە هات و کەوتە ناو باخ و تەپۆڵکەیەك و هەموو بونەوەرکان لێیان خوارد.

کاتێك پاشا بینی قسەکانی ئەوان وەکیەکە، وتی: ڕاستە، بەڵام لێکدانەوەکەی چییە؟

شەق وتی: سوێند بەمرۆڤەکانی نێوان دووبەردی ڕەشی گەورە، سوپاییەکان دێنە ناو وڵاتەکەی ئێوە و بەسەر هەموو پەنجە ناسکەکاندا زاڵدەبن و لەئەبیەن تا نەجران داگیر دەکەن.

پاشا وتی: ئەی شەق، سوێند بەگیانی باوکت، ڕووداوێکی بەئازار و دڵتەزێنە، کەی ڕوودەدات، لەرۆژگاری من یا کەسانی دوای من؟

شەق وتی: ماوەیەك دوای پاشایەتی تۆ روودەدات. كەسێكی خاوەن نەژاد و بوێر، ئێوە لەستەمی ئەوان رزگار و لەناویان دەبات.

پاشا وتی: ئەم خاوەن نەژادە كێیە؟

شەق وتی: گەنجێكە كەلەماڵی زی یەزنەوە دێتەدەر.

پاشا وتی: ئایا پاشایەتی ئەو بەردەوام دەبێت یا كۆتایی پێدێت؟

شەق وتی:بەپێغەمبەرێك كۆتایی پێدێت كەلەنێوان خەڵكان، بروا و ماف و دادپەروەری بڵاو دەكاتەوە و پاشایەتەی خەڵكەكەی تا رۆژی فەیسەڵ بەردەوام دەبێت.

پاشا وتی:رۆژی فەیسەڵ چییە؟

شەق وتی: ئەو رۆژەی فەرمانڕەواكان سزا دەدرێن و دەنگ لەئاسمانەوە دێت كەزیندووەكان و مردووەكان دەبیستن و خەڵكان لەشوێنی دیاریكراو كۆدەبنەوە و ئەوەی چاكەی كردبێت، بەختەوەر دەبێت.

پاشا وتی: ئایا ئەوەی باسی دەكەیت، راستە؟

شەق وتی: بەڵێ، سوێند بەخواوەندی ئاسمان و زەوی و ئەوەی لەناو ئەواندایە، ئەوەی باسم كرد، راستە و درۆی تیا نییە.

كاتێك پاشا كۆتایی بەگفتوگۆكەی لەگەڵ ئەوان هێنا، بیری كەوتەوە، ئەو روداوەی باسیان كرد لەخەڵكانی حەبەشەوە سەرچاوە دەگرێت. كوڕەكان و بنەماڵەكەی خۆی بۆ عێراق رەوانە كرد و بۆ یەكێك لەپاشاكانی فارس بەناوی شاپور كوڕی فەروخزاد نامەی نووسی و داوای لێكرد تا ئەوان لەحیرە نیشتەجێ بكات. نەعمان كوڕی مونزەر پاشای حیرە لەنەوەكانی رەبیعە كوڕی نەسر بوو. رەچەڵەكی ئەو لای خەڵكانی یەمەن بەمشێوەیە:

نەعمان كوڕی مونزەر كوڕی نەعمان كوڕی مونزەر كوڕی عەمرۆ كوڕی عودەی كوڕی رەبیعە كوڕی نەسر.

هەروەها لەكوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: كاتێك سەتیح و شەق ئەو قسانەیان بۆ رەبیعە كوڕی نەسر باس كرد، رەبیعە ماڵ و بنەماڵەكەی خۆی بۆ عێراق رەوانە كرد. ئەم وتارە لەناو عەرەبەكان بڵاو بوویەوە و هەمووان زانیان. كاتێك حەبەشیەكان روویان كردە یەمەن، ئەو روداوەی باسیان كردبوو، هاتەدی. ئەعشی بەكری كەیەكێك

لەمناڵەکانی قەیس کوڕی سەعلەبەیە، هۆنراوەکەی خۆی بۆ بیرهێنانەوەی داستانی دوو کاهینەکە بەمشێوەیە هۆنییەوە:

بەراستی هیچ مژدەدەرێك بەو شێوەیە گومانی نەکرد

کەزەئبی لەوتە پاڕاوەکانی خۆی هێنایە سەرزمان.

عەرەبەکان سەتیحیان بەزەئبی ناو دەبرد لەبەر ئەوەی لەمناڵەکانی زەئب کوڕی عودەی بوو.

کاتێك رەبیعە کوڕی نەسر مرد و پاشایەتی یەمەن بۆ حسان کوڕی تەبان ئەسعەد کوڕی باوکی کەرب کوڕی ملکیکەرب کوڕی زەید کوڕی عەمرۆ زوئەلئەزعار سەقامگیر بوو، یەکێك لەو هۆکارانەی پاشەکشێی بەحەبەشیەکان کرد و پاشایەتی حەمیر لەناوچوو و دەسەڵاتەکەیان ڕووخا، ئەوە بوو کەحسان کوڕی تەبان ئەسعەد کوڕی کەرب، لەگەڵ خەڵکانی یەمەن بەرێکەوت و مەبەستی ئەوەی کرد هێرش بکاتە سەر سەرزەمینی عەرەب و عەجەم بەهەمان شێوەکە توبەعەکانی پێش خۆی ئەو کارەیان کردبوو. کاتێك گەیشتە سەرزەمینی عێراق، حەمیریەکان و هۆزەکانی یەمەن نەیانویست لەگەڵ ئەودا بڕۆن و مەبەستی گەڕانەوە بۆ وڵاتەکەی خۆیان کرد. لەگەڵ عەمرۆ براس حەسان قسەیان کرد و وتیان: براکەت بکوژە و ئێمە لەجێگەی ئەو، تۆ وەك پاشا هەڵدەبژێرین بۆ ئەوەی بمانگەڕێنیتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆمان.

عەمرۆ بەقسەکانی ئەوان رازی بوو. عەمرۆ و حەمیریەکان و هۆزەکانی یەمەن بۆ کوشتنی حسان یەکیانگرت جگە لەزی رەعینی حەمیری کەرێگەی ئەو کارەی لەعەمرۆ گرت و وتی: ئێوە بنەماڵەی پاشایەتی ئێمەن، براکەت مەکوژە و کاروباری بنەماڵەکەی خۆت پەرێشان مەکە.

بەلاّم عەمرۆ رازی نەبوو. زی رەعین کەیەکێك بوو لەگەورەکانی حەمیر، وەرەقەیەکی هەڵگرت و هۆنراوەیەکی نووسی بەم ناوەرۆکە:

چ کەسێکە بێداری بەخەو دەکرێت

بەختەوەر کەسێکە بتوانێت بەئاسوودەیی بخەوێت

حەمیریەکان جەنایەتیان کرد

خواوەند بەبەڵگەکانی زی رەعین رازی نابێت.

دواتر وەرەقەکەی مۆرکرد وبردییە لای عەمرۆ و وتی: ئەم نووسراوەیە لای خۆت

بپارێزە چونکە نیازم پێی دەبێت.

کاتێك حسان ئاگادار بوویەوە کەبراکەی و هۆزەکانی یەمەن و حەمیر بۆ کوشتنی ئەو یەکیانگرتووە، هۆنراوەیەکی بۆ براکەی هۆنییەوە بەم ناوەڕۆکە:

ئەی عەمرۆ، بۆ کوشتنی من پەلە مەکە

چونکە پاشایەتیت بێ هیچ کوت و بەندێك دەست دەکەوێت.

عەمرۆ لەسەر کوشتنی براکەی پێداگری دەکرد و ئەوی کوشت و لەگەڵ سوپاکەی بۆ یەمەن گەڕایەوە. یەکێك لەشاعیرانی حەمیر شێعرێکی بەم ناوەڕۆکە نووسی:

خواوەند کەی لەڕۆژگارە کۆنەکان

کوژراوێکی هاوشێوەی حەسانی بینیوە

قیلان لەترسی سوپا، ئەویان کوشت

وتیان: ترسمان نییە

مردووەکەی ئێوە چاکەکارە

و زیندووی ئێوە سالاری ئێمەیە

هەموو ئێوە سالار و پاشان.

کاتێك عەمرۆ کوڕی تەبان ئەسعەد کوڕی باوکی کەرب کوڕی ملکیکەرب، گەشتە یەمەن، چیتر خەوی لێنەدەکەوت و گرفتاری بێ خەوی بوو. کاتێك کەوتە ڕەنجەوە، لەپزیشك و کاهین و خواپەرستەکان پرسیاری دەرمانی دەردی خۆی دەپرسی و دەیوت: خەوم نەماوە و لەبێخەوی ڕەنج دەکێشم. یەکێك لەوان وتی: سوێند بەخوا هەرکەس وەك تۆ براکەی بەستەم بکوژێت، گرفتاری ئەو بەڵایە دەبێت و خواوەند بێ خەوی بەسەردا زاڵدەکات.

کاتێك ئەم قسانەی بیست، دەستی بەکوشتنی هەموو گەورەکانی حەمیر و هۆزەکانی یەمەن کرد کە بۆ کوشتنی براکەی هانیاندابوو. کاتێك گەیشتە زی ڕەعین و مەبەستی کوشتنی ئەوی کرد، وتی: من ئەمان نامەیەکەم لای تۆ هەیە.

وتی: ئەمان نامەکەی تۆ چییە؟

وتی: نووسراوێکم بەتۆ سپارد.

نووسراوەکەی هێنا و ناوەڕۆکەکەی خوێندەوە. زی ڕەعین وتی: ڕێگەی کوشتنی براکەتم لێگرتی بەڵام گوێت لەمن نەگرت. ئەم نووسراوەم بەتۆ سپارد تا ببێتە

بەڵگەیەك بۆ پاکی من چونکە دەترسام ئەگەر براکەت بکوژێت، گرفتاری ئەم بەڵایە ببیت و مەبەستی کوشتنی ئەو کەسانە بکەیت بۆ ئەو کارە هانیاندایت. ئەم نووسراوە دەبێتە هۆی رزگاری من.

عەمرۆ کوڕی تەبان ئەسعەد ئەوی ئازاد کرد. لەگەورەکانی حەمیر تەنیا ئەوی نەکوشت لەبەر ئەوەی چاکەخوازی ئەوی بۆ سەلما.

عەمرۆ کاتێك گەورەکانی حەمیری دەکوشت، هۆنراوەیەکی بەم ناوەرۆکە هۆنییەوە:

ئێمە خەومان بەبێداری فرۆشت
کاتێك تاوانیان کرد و هاواریان کرد ترسمان نییە.
بەڵگەکەی زی رەعین ئاشکرا بوو
ئەو کەسانەی فێڵ و فریویان دەکرد
لەتۆڵەی کوڕی رەهم کوشتار کران
ئەوانم لەتۆڵەی حسان کوڕی رەهم کوشت
چونکە حسان کوژراوی شۆڕشگێڕەکان بوو
ئەوانمان کوشت و کەس لەوان نەمایەوە
و چاوی ژنە ئازادەکان کەپڕبیوو لەگریان
ئارامیان گرت
ئەو ژنانەی شەوانە دەبنە هۆی ئارامی دڵەکان
کاتێك روناکی هۆنراوەیەك هەڵبێت، دەبنە چاوڕەشەکان
لەکاتی پەیوەندی، ئێمە بەوەفا دەناسنەوە
و هەرکەس تاوان بکات، خۆمانی لێ بەدوور دەگرین
ئێمە لەپێشتر لەهەموو خەڵکانین
بەهەمان شێوە کەزێڕ لەپێشترە لەزیو
دوای دوو توبەع دەسەڵات کەوتە دەست ئێمە
دوای داوود پاشایەتی بەئێمە بڕا
پاشاکانی رۆژهەڵات بوونە بەندەی ئێمەی
لەزەفار، زەبووری مەجدەرمان زیندووو کردەوە

تا خەڵکی دوو شارەکە بیخوێننەوە
کاتێك بێژەر دەڵێت کوا کوا
ئێمەیین کەتۆڵە دەستێنینەوە
داخی دڵی خۆمان لەفریوکارەکان وەردەگرینەوە
چوونکە فریوی ئەوان بووە هۆی ڕەنج و ئازاری ئێمە
فەرمانی ئەوانم جێبەجێ کرد و ڕزگارم نەبوو
گومڕاکان بوون کەخۆیان و شکۆی منیان لەناو برد.

دەڵێت: زۆری نەخایاند عەمرۆ کوڕی تەبان ئەسعەدماڵئاوایی لەجیهان کرد.

هوشام کەلبی دەڵێت: عەمرۆ کوڕی تەبان، ناوی موسەبانە لەبەر ئەوەی هێرشی کردە سەر براکەی خۆی و کوشتی. سەبە بەمانای هێرش کردنە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاروباری حەمیریەکان پەرێشان و بڵاو بوونەوە. یەکێك لەحەمیریەکان کە لەبنەماڵەی پاشایەتی نەبوو، بەناوی لەخنیعە یەنوف دوشناتەر، شۆڕشی کرد و پاشایەتی ئەوانی گرتەدەست. چاکەکارانی خەڵکەکەی کوشت وگەمەی بەبنەماڵە گەورەکانی وڵات دەکرد. یەکێك لەحەمیریەکان سەبارەت بە گەندەڵکارییەکانی خەڵك و بڵاوبونەوەی ئەوان و کوژرانی چاکەکارانیان، هۆنراوەیەکی هۆنیوەتەوە بەم ناوەرۆکە:

حەمیر منداڵەکانی خۆی دەکوژێت
و گەورەکانی خۆی دروێنە دەکات
بەدەستی خۆی ریسوایی دەخولقێنێت
و جیهانی خۆی بەشێوەیەکی نەزانانە وێران دەکات
ئەو خراپەکارییەی لەدینەکەی خۆی ئەنجامی دەدات، زیاترە
بەمشێوە بوو کەنەوەکانی پێشین
بەستەم و زێدەڕۆیی خۆیان گرفتاری خراپەکاری بوون
و زیانیان بەرکەوت.

لەخنیعە یەنوف دوشناتەر ستەمی لەحەمیریەکان دەکرد. پیاوێکی خراپەکار بوو و دەڵێن: شێوازەکانی نەتەوەی لوتی زیندووو کردەوە و جگە لەکوشتار و ستەم، کاتێك دەیبیست یەکێك لەمناڵی پاشاکان گەشتۆتە تەمەنی بلۆق، ئەوی داوا دەکرد و

لەماڵێکی تایبەت کەبۆ ئەو کارەی دەروست کردبوو، لەگەڵی دەخەوت و بەمشێوەیە چیتر نەیدەتوانی پاشایەتی بگرێتە دەست. ئەوسا لەسەربانی ماڵەکەیەوە سەیری پاسەوان و سوپاییەکانی دەکرد. میسواکێکی بەدەستەوە دەگرت و دانەکانی پێدەشۆرد و بەمشێوەیە رایدەگەیاند کارەکەی ئەنجامداوە. ئەوسا کوڕەکەی بەرەڵا دەکرد تا لای پاسەوانەکان و خەڵکان تێپەڕێت بۆ ئەوەی هەست بەریسوا بوونی ئەو بکەن. دوایین منالی پاشاکان، زەرعە زونەواس کوڕی تەبان ئەسعەد کوڕی باوکی کەرب کوڕی ملکیکەرب کوڕی زەید کوڕی عەمرۆ زونەلئەزعار برای حسان بوو. کاتێك حسان کوژرا، زەرعە منالێکی کەم تەمەن بوو. کاتێك گەورە بوو، جوانییەکی تایبەتی پێبڕا. عاقڵ بوو. لەخنیعە داوای ئەوی کرد تا ئەو کارەی لەگەڵ بکات کەپێشتر لەگەڵ منالەکانی دیکەی بنەماڵەی پاشایەتی ئەنجامی دابوو. کاتێك نێردراو هات، زەرعە هەستی بەمەبەستەکەی کرد. کێردێکی بچوکی هەڵگرت و خستیە ناو پێپۆشەکەی خۆی. لەگەڵ نێردراو ڕۆشت و ڕۆشتە ناو ماڵەکە. یەنوف دەرگاکەی بەست و لێی نزیك کەوتەوە. زونەواس بەکێرد هێرشی کردەسەر و ئەوی کوشت. فڕیدایە سەربانەکە کەلەوێوە سەیر خەڵك وپاسەوانەکانی دەکرد. میسواکەکەی خستە ناو دەمی. ڕۆشتە لای خەڵك و پێیان وت: زونەواس تەڕە یا وشك؟ زونەواس دەیوت: لەسەرەوە بپرسن کەزونەواس تەڕە یا وشك؟

کاتێك ئەمەیان بیست، ڕۆشتن و سەیریان کرد. سەری بڕاوی لەخنیعەیان لەسەر بانەکەی بینی کەمیسواکی لەدەمدا بوو. حەمیریەکان و پاسەوانەکان شوێنی کەوتن تا پێی گەشتنەوە و وتیان: ڕەوا نییە کەس جگە لەتۆ ببێتە پاشای ئێمە چونکە ئێمەت لەدەست ئەم ناپاکە رزگار کرد. ئەویان وەك پاشای خۆیان دەستنیشان کرد. دوایین پاشای حەمیریەکان بوو. باوەڕی بەئایینی جولەکە هێنا و بەیوسف ناویان برد. حەمیریەکان بەدوای ئەودا باوەڕیان بەئایینی جولەکە هێنا و بۆ ماوەیەك پاشایەتی کرد.

دەستەیەك لەباوەڕداران بەئایینی عیسا لەنەجران نیشتەجێ بوون. باوەڕدار بەئینجیل و کەسانی چاکەکار بوون. گەورەی ئەوان لەکاروباری ئایینی کەسێك بوو بەناوی عەبدالله کوڕی سامر. شوێنی دینەکەیان نەجران و لەوڕۆژگارەدا بەباشترین سەرزەمینی عەرەب هەژمار دەکرا. خەڵکی نەجران و عەرەبەکانی دیکە بتپەرەست

بوون. یەکێك لەشوێنکەوتەکانی عیسا بەناوی فیمیۆن لەناو ئەوان دەرکەوت و پێشنیاری دینەکەی بەخەڵکان کرد و باوەڕیان پێی هێنا.

هوشام دەڵێت: کاتێك زەرعە زونەواس باوەڕی بەئاییني جولەکە هێنا، بەیوسف ناویان برد. ئەو بوو لەنەجران چاڵێکی هەڵکەند و مەسیحیەکانی کوشت.

لەوەهب کوڕی مونبەی یەمەنی دەگێڕنەوە: بڵاوبوونەوەی ئاییني مەسیحی لەنەجران بەهۆی یەکێك لەشوێنکەوتەکانی ئەو ئایینە بوو بەناوی فیمیۆن. پیاوێکی خۆپارێز و خوا پەرەست کەدۆعاکانی گیرادەبوو. بەناو گوندەکاندا دەسوڕایەوە وکاتێك لەگوندێك دەیانناسیەوە، ڕووی لەگوندێکی دیکە دەکرد تا کەس نەیناسێتەوە. لەدەستڕەنجی خۆی ڕۆژی دەخوارد. وەستای بینا کردن بوو. قوڕکاری دەکرد و ڕێزی لەڕۆژی یەکشەممە دەگرت. لەو ڕۆژەدا کاری نەدەکرد و دەڕۆشتە بیابان و تا شەو نوێژی دەخوێند.

فیمیۆن لەیەکێك لەگوندەکانی شام خۆی حەشاردابوو. سەرقاڵی کارەکانی بوو کەیەکێك لەپیاوەکانی ئەو گوندە بەناوی ساڵح ئەوی ناسییەوە. بەرادەیەك ئەوی خۆش دەویست کەهیچ کەس و هیچ شتێکی بەو ئەندازەیە خۆش نەدەویست. بۆ هەر شوێنێك دەڕۆشت، بەدوایدا دەڕۆشت. فیمیۆن هەستی بەساڵح نەکرد تا ئەوەی لەڕۆژێکی یەکشەممە ڕووی لەسارا کرد. ساڵح بەدوای ئەودا ڕۆشت بەڵام خۆی شاردەوە. فیمیۆن بۆ نوێژ وەستا و لەو کاتەی نوێژی دەکرد، ئەژدیهایەك ((مارێکی حەوت سەر))، بەرەو لای ڕۆشت. فیمیۆن کاتێك مارەکەی بینی، نفرینی کرد. مارەکە مرد. ساڵح مارەکەی بینی بەڵام نەیزانی چی بەسەرهات. بۆ گیانی فیمیۆن ترسا و هاواری کرد کەئەی فیمیۆن ئەژدیها بەرەو ڕووی تۆ دێت. فیمیۆن گرنگی پێنەدا و دەستی لەنوێژەکەی هەڵنەگرت. کاتێك شەو داهات و گەڕایەوە، زانی ناسیویانەتەوە. ساڵح زانی فیمیۆن ئەوی بینیوە. قسەی لەگەڵ کرد: ئەی فیمیۆن: سوێند بەخوا کەسم وەك تۆ خۆش نەویستوە و دەمەوێت ببمە هاودەمی تۆ وبۆ هەر شوێنێك دەڕۆیت، لەگەڵتا بێم.

فیمیۆن وتی: ئەگەر بتەوێت. کاری من ئەوەیە کەدەبینیت. ئەگەر گومان دەکەیت، دەتوانی بەرگەی بگریت، لەگەڵما وەرە.

ساڵح بوو بەهاوڕێی سەفەری ئەو. زۆری نەمابوو خەڵکی گوندەکە پێی بزانن.

ئەگەر چاوی بەنەخۆشێك دەكەوت، دۆعای بۆ دەكرد و خواوەند شیفای دەبەخشی بەڵام ئەگەر دەیانویست، بیبەن بۆ لای نەخۆشێك، فیمیۆن، رازی نەدەبوو و نەدەڕۆشت.

یەكێك لەدانیشتووانی گوندەكە، كوڕێكی كوێری بوو. بەدوای فیمیۆندا گەڕا. پێیان وت:

فیمیۆن ناڕواتە لای كەسێك كەبەدوایدا دەگەڕێت، بەڵام بۆ بەدەستهێنانی رۆژی، قورەكاری دەكات.

ئەو پیاوە كوڕەكەی خۆی لەحوجرەی ماڵەكەیدا دانا. بەجل و بەرگ داپۆشی و رۆشتە لای فیمیۆن و وتی: ئەی فیمیۆن دەمەوێت لەماڵەكەی مندا كار بكەیت. فیمیۆن بەرێكەوت تا گەشتە ماڵی پیاوەكە، وتی: ئەو كارەی دەبێت بیكەم، چییە؟

وتی: فلاَن كار و فیسارە كار. و جل و بەرگەكانی لەسەر كوڕەكەی لابرد و وتی: ئەی فیمیۆن یەكێك لەبەندەكانی خواوەند بەمشێوەیە كەدەیبینیت، دۆعای بۆ بكە.

كاتێك فیمیۆن كوڕەكەی بینی، وتی: خواوەندا، دوژمنی نیعمەتەكانی تۆ هێرشی كردۆتە سەر یەكێك لەبەندەكانت تا نیعمەتەكانی تۆ فیڕۆ بكات، شیفای بدە و دەستی دوژمنەكەت كورت بكەرەوە.

كوڕەكە هەستا و شیفا درابوو. فیمیۆن زانی ناسیویانەتەوە. لەگوندەكە ڕۆشت. سالح بەدوایدا رێگەی دەبڕی. لەو كاتەی لەسەر رێگەی شام بوون، لای دارێكی گەورە تێپەڕی، پیاوێك لەدارەكەوە هاواری كرد: تۆ فیمیۆنیت؟

وتی: بەڵێ.

وتی: هەمیشە چاوەڕوانی تۆبووم تا بێیت. كاتێك دەنگی تۆم بیست، ناسیمەوە، مەڕۆ تا بەخاكم بسپێریت، چونكە ئێستا دەمرم.

دەڵێت: ئەو كەسە مرد و فیمیۆن بەخاكی سپارد. ئەوسا ڕۆشت و سالح هاورێیەتی دەكرد تا گەشتنە سەرزەمینی عەرەبەكان. كاروانێك لەعەرەبەكان هێرشیان كردنە سەر و ئەوانیان گرت و لەنەجران فرۆشتیان. خەڵكی نەجران لەو رۆژگارەدا، هاودینی عەرەبەكان بوون. دارخورمایەكی درێژیان دەپەرستی. ساڵانە جەژنێكیان بوو و لەرۆژی جەژن، پارچەی جوان و خشڵی ژنانیان بەدارخورماكەوە هەڵدەواسی و رۆژێكیان لای دارەكە بەسەر دەبرد. یەكێك لەگەورەكانی ئەو خەڵكە، فیمیۆنی كڕییەوە

و یەکیتریان ساڵحی کڕی. شەوانە کەفیمیۆن لەماڵی خاوەنەکەی خۆی نوێژی دەکرد، ماڵەکە نوورانی دەبوو بیٚ ئەوەی چراکان هەڵکرابێتن. کاتێك خاوەن ماڵەکە ئەمەی بینی، سەریسوڕما و لەدینەکەی پرسی. فیمیۆن ئەوی لەدینەکەی خۆی ئاگادار کردەوە و وتی: ئایینەکەی ئێوە ناڕاستە. ئەم دارخورمایە نەسوودی هەیە نەزیان. ئەگەر لەخواوەندی خۆم بپارێمەوە، ئەو دارە لەناو دەبات چونکە خواوەندی تاقانە و بیٚ شەریك، تەنیا خۆیەتی.

خاوەنەکەی وتی: ئەو کارە بکە، چونکە ئەگەر ئەو کارەت کرد، باوەڕ بەدینەکەی تۆ دێنین و دینەکەی خۆمان پشتگویٚ دەخەین.

دەڵێت: فیمیۆن هەستا و دەستنوێژی گرت. دوو رکعەت نوێژی خوێند و لەخواوەند بۆ لەناوبردنی دارخورماکە پاڕایەوە. خواوەند بایەکی رەوانە کرد و دارەکەی لەریشەوە هەڵکەند. خەڵکی نەجران شوێن دینەکەی فیمیۆن کەوتن. ئەوان باوەڕیان بەئایینی عیسا کوڕی مریەم هێنا. دواتر دیاردەکانی ئایینی مەسیحی لەناو ئەواندا بڵاوبوویەوە. سەرچاوەی بڵاوبونەوەی ئایینی مەسیحی لەم رێگاوە بوو.

حەدیسی وەهب کوڕی مونبە سەبارەت بەبەسەرهاتی خەڵکی نەجران بەمشێوە بوو.

لەمحەممەد کوڕی کەعبی قورەزی دەگێڕنەوە: خەڵکی نەجران بتپەرەست بوون و لەیەکێك لەگوندەکانی نزیك نەجران جادووگەرێك دەژیا، جادووی فێری نەوجەوانانی نەجرانی دەکرد. کاتێك فیمیۆن لەو شارە دابەزی، ئەویان بەو ناوەی وەهب کوڕی مونبە ئاماژەی پێدەدات، بانگ نەکرد و وتیان پیاوێك لێرە دابەزیوە. لەنێوان نەجران و ئەو گوندەی جادووگەری لیٚ دەژیا، خێوەتێکی هەڵدا. خەڵکی نەجران گەنجەکانی خۆیان بۆ لای جادووگەر دەنارد تا فێری جادوویان بکات. سامر کوڕەکەی خۆی یانی عەبدالڵەی لەگەڵ گەنجە نەجرانیان دەنارد و کاتێك لای خاوەنی خێوەتەکە تێدەپەڕی، لەنوێژ و پاڕانەوەی ئەو سەریسوڕدەما. دادەنیشت و گوێی لێدەگرت تا ئەوەی باوەڕی هێنا و خواوەندی بەتاقانەی زانی و ئەوی پەرەست. سەبارەت بەناوی گەورەی خواوەند پرسیاری کرد بەڵام فیمیۆن پێی نەوت و وتی: کوڕی برا، تۆ بەرگەی زانینی ئەو ناوە ناگریت و من لەلاوازی تۆ دەترسم. ناوەکەی فێر نەکرد.

سامر باوکی عەبدالڵە گومانی کرد کوڕەکەی هاوشێوەی کوڕەکانی دیکە دەڕواتە

لای جادووگەرەکە. کاتێك عەبدالله بینی، مامۆستاکەی ناوی گەورەی خواوەندی فێر ناکات و لەلاوازی ئەو دەترسێت، چەند تیرێکی ئامادە کرد و لەسەر هەر تیرێك ناوێکی خوای نووسی. ئاگرێکی کردەوە و تیرەکانی یەك یەك خستە ناو ئاگرەکە و کاتێك گەیشتە گەورەترین ناوی خواوەند، تیرەکەی خستە ناو ئاگرەوە، تیرەکە لەئاگرەکە هاتەدەر و نەسووتا. عەبدالله هەستا و تیرەکەی هەڵگرت و ڕۆشتە لای مامۆستاکەی خۆی. پێی وت: کەناوی گەورەی خواوەند دەزانێت کەلەوی دەشاردەوە.

مامۆستاکەی پرسی: ناوەکە چییە؟

عەبدالله وتی: فلان ناوە.

وتی: چۆن زانیت؟

عەبدالله داستانەکەی بۆ باس کرد.

وتی: کوڕی برام، ناوەکە فێر بوویت، بەڵام ئاگاداری خۆت بە هەرچەند گومان دەکەم نەتوانی بەرگە بگریت.

عەبدالله کوڕی سامر کاتێك دەگەڕایەوە بۆ نەجران، بەهەر نەخۆشێك دەگەیشت، دەیوت: بەندەی خوا، ئەگەر خواوەند بەتاقانە بزانیت و باوەڕ بەدینەکەی من بێنیت، داوا لەخواوەند دەکەم لەم گرفتاریە رزگارت بکات.

نەخۆش رازی دەبوو و خواوەندی بەتاقانە دەزانی و باوەڕی دەهێنا. عەبدالله دۆعای بۆ دەکرد و خواوەند شیفای دەبەخشی تا ئەو جێگەی لەنەجران هەر کەسێك نەخۆش بوایە، دەڕۆشتە لای و باوەڕی بەدینەکەی دەهێنا و عەبدالله دۆعای بۆ دەکرد و چاك دەبوویەوە. ئەم هەواڵە بەپاشای نەجران گەیشت. ئەوی بانگ کرد و وتی: خەڵکی شارەکەی منت گومڕا کردووە و بەپێچەوانەی دینی من و دینی باوکانم هەڵس و کەوت دەکەیت. من ئەندامەکانی جەستەی تۆ دەبڕمەوە.

عەبدالله وتی: توانای ئەو کارەت نییە.

پاشا ئەوی بۆ سەر کێوێکی بەرز رەوانە کرد و ئەویان لەسەر لوتکەی کێوەکە هەڵدایە خوار. زیانی بەرنەکەوت. ئەوی بۆ دەریاچەکانی نەجران رەوانە کرد کەهەر کەس دەکەوتە ناوی، دەخنکا، لە دەریاچەکانیش بێ ئەوەی زیانی بەرکەوێت، تەندروست هاتەدەر. کاتێك پاشا زانی ناتوانێت بیبەزێنێت، عەبدالله کوڕی سامر پێی وت: سوێند بەخوا ناتوانیت من بکوژیت تا ئەو کاتەی باوەڕ بەتاقانەی خواوەند و

ئایینەکەی من دێنیت. ئەگەر باوەڕ بەخواوەند بێنیت، دەتوانی من بکوژیت.

پاشا باوەڕی بەتاقانەی خواوەند و عەبداللە کوڕی سامر شایەتوومانی هێنا. پاشا بەداردەستەکەی دەستی زەرەبەیەکی هێواشی لەسەریدا و ئەوی کوشت. پاشاییش لەهەمان ساتدا مرد. هەموو خەڵکی نەجران باوەڕیان بەئایینەکەی عەبداللە کوڕی سامر هێنا. دینی عەبداللە، دینی عیسا کوڕی مریەم و شەریعەتی ئینجیل بوو.

دواتر ئەو ڕێ و رەسم و نەریتانەی لەئایینی مەسیحی دەرکەوت، بەوانیش گەیشت. سەرچاوەی ئایینی مەسیحی لەم ڕێگاوە بوو.

حەدیسی محەممەد کوڕی کەعبی قورەزی و دەستەیەك لەخەڵکان بەمشێوەیە و خواوەند زاناترە.

دەڵێت: زونواس لەگەڵ سوپاکەی خۆی لەحەمیرییەکان و هۆزەکانی یەمەن، هێرشی کردەسەریان. ئەوانی کۆکردەوە و پێشنیاری ئایینی جولەکەی پێکردن. سەرپشکی کردن لەوەی بکوژرێن یا ببنە جولەکە. کوژرانیان هەڵبژارد. چاڵێکیان هەڵکەند و خەڵکی لەناو ئاگردا سووتاند. بەشمشێر ئەوانی کوشت و ئەندامەکانی جەستەی برینەوە تا ئەوەی نزیکەی بیست هەزار کەسی کوشت. یەکێك لەوان بەناوی زو سەعلبان سوار لەسەر ئەسپەکەی، ڕزگاری بوو و ڕوویکردە ریخەڵانەکان.

دەڵێت: لەدەستەیەك لەخەڵکانی یەمەنم بیستوە ئەو کەسەی رزگاری بوو، یەکێك لەخەڵکانی نەجران بەناوی جەبار کوڕی فەیز بوو. بەڵام وتاری ڕاست لای من ئەوەیە کەناوی زو سەعلبانە.

زونەواس لەگەڵ سوپاکەی بۆ سەنعای یەمەن گەڕایەوە و خواوەند سەبارەت بەم داستانە بەپێغەمبەرەکەی خۆی فەرموو:

(( قتل اصحاب الاخدود. النار ذات الوقود. اذهم عليها قعود. و هم على ما يفعلون بالمؤمنين شهود. و مانقمو امنهم الا ان يؤمنوابا لله العزيز الحميد.

واتاکەی: شوێنکەوتەکانی ئاگر لەناوچوون. کاتێك لەسەر لێواری چاڵەکە دانیشتبوون و بینەری ئەو ئەشکەنجەیە بوون کەلەباوەڕدارانیان دەکرد. گوناحیان نەبوو جگە لەوەی باوەڕیان بەپەروەردگاری بەهێز و خاوەن دەسەڵات هێنا بوو.))

یەکێك لەو کەسانەی بەدەستی زونەواس کوژرا، عەبداللە کوڕی سامر سەرۆك و سالاری مەسیحیەکان بوو. بەوتەیەك عەبداللە کوڕی سامر پێشتر کوژرا. پاشایەی

پێش زونەواس، ئەوی کوشت. عەبدالله سەرچاوەی ئەم ئایینە بوو. زونەواس شوێنکەوتەکانی ئەوی کوشت.

بەلآم هوشام کوڕی محەممەدی کەلبی دەڵێت: پاشایەتی یەمەن بەردەوام بوو. کەس چاوی تەماحی تێنەبڕی تا لەڕۆژگاری ئەنەوشیروان کەحەبەشیەکان بەسەر ولآتەکەیاندا زاڵبوون. هۆکاری هاتنی حەبەشیەکان ئەوە بوو: لەوکاتەی زونەواس پاشایەتی یەمەنی دەکرد و باوەڕی بەئاییینی جولەکە هێنابوو، جولەکەیەك بەناوی دوس لەخەڵکانی نەجران ڕۆشتە لای و وتی: خەڵکی نەجران دوو کوڕەکەی ئەویان بەستەم کوشتوە و دژی ئەوان داوای هاوکاری لێکرد. خەڵکی نەجران مەسیحی بوون. زونەواس پشتیوانی لەئاییینی جوولەکە دەکرد. هێرشی کردەسەر نەجران و خەڵکانێکی زۆری کوشت. یەکێك لەخەڵکانی نەجران ڕزگاری بوو و ڕۆشتە لای پاشای حەبەشە و داستانەکەی بۆ گێڕایەوە. ئینجیلی نیشاندا کەبەشێکی سوتێنرا بوو. پاشای حەبەش وتی: من شەڕکەرانی زۆرم هەیە، بەلآم کەشتیم نییە، نامە بۆ قەیسەر دەنووسم کەشتیم بۆ ڕەوانە بکات بۆ ئەوەی شەڕکەرانی پێ بگوازمەوە. نامەی بۆ قەیسەر نووسی و ئەنجیلی سوتاوی بۆ نارد. قەیسەر چەندین کەشتی ڕەوانە کرد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت:

لەڕۆژگاری عومەر کوڕی خەتاب یەکێك لەخەڵکانی نەجران، وێرانەیەك لەوێرانەکانی نەجرانی بۆ مەبەستێك هەڵکەند. عەبدالله کوڕی سامری لەژێر خاکدا دۆزیەوە کەلەژێر زەوی دانیشتبوو. دەستی لەسەر برینەکەی سەری بوو. کاتێك دەستی ئەوی لابرد، خوێن فیچقەی کرد و کاتێك دەستی خستەوە شوێنی خۆی، خوێنەکە وەستا. ئەنگوستیلەیەکی لەدەستا بوو و لەسەری نوسرا بوو: ((ربی الله)) نامەی بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی و لەم ڕووداوە ئاگاداری کردەوە. عومەر لەوەلآمدا بۆی نووسی: بەهەمان شێوە بەخاکی بسپێرن. ئەو کارەیان کرد.

کاتێك خەڵکەکە، سەرکوت کران، دوس زو سەعلبان ڕۆشتە لای قەیسەر فەرمانڕەوای ڕۆم و دژی زونەواس و سوپاکەی داوای هاوکاری لێکرد.

قەیسەر وتی: سەرزەمینی ئێمە لەتۆوە دوورە. ناتوانم سوپا بۆ ئەو ناوچەیە ڕەوانە بکەم. بەلآم پاشای حەبەشە هاودینی تۆیە و لەسەرزەمینی تۆ نزیکترە. نامەی بۆ دەنووسم هاوکاری تۆ بکات و لەو ستەمکارەی خەڵکانی کوشتار کردووە، تۆڵە

سەرنشینەکانی لەدەریادا نوقم بوون. شەش کەشتی و سەرنشینەکانی گەشتنە کەنارەکانی یەمەن و سەرزەمینی عەدەن. هەرز و سەیف کوڕی زی یەزن لەناو ئەواندا بوون.

کاتێك لەسەرزەمینی یەمەن دابەزین، هەرز بەسەیفی وت: چیت هەیە؟

سەیف وتی: هەرچیت بوێت، پیاوی عەرەبی و ئەسپی عەرەبی، پیاوەکانی خۆم دەکەمە هاوەڵی شەڕکەرانی تۆ، یا پێکەوە دەمرین، یا سەرکەوتن بەدەست دێنین.

هەرز وتی: دادپەروەرییە.

سەیف تا ئەو جێگەی دەیتوانی، شەڕکەر و ئەسپی لەخەڵکەکەی خۆی کۆکردەوە. مەسروق کوڕی ئەبرەهە ئاگادار بوویەوە و سوپای حەبەشیەکانی ئامادە کرد. روبەروی ئەوان بوویەوە. کاتێك دوو سوپا لەیەك نزیك کەوتنەوە، هەرز کوڕەکەی خۆی بەناوی نەوزادی لەگەڵ چەند سوارێك رەوانە کرد و وتی: شەڕیان لەگەڵ بکە، تا بزانم شێوەی شەڕکردنیان چۆنە.

نەوزاد ڕۆشت و شەری دەستپێکرد. کەوتە شوێنێك کەنەیتوانی خۆی دەرباز بکات. حەبەشیەکان ئەویان کوشت. ئەمە کینەی هەرزی زیاد و بۆ شەڕ کردن زیاتر پێداگری کرد. کاتێك شەڕکەران بۆ شەڕ ریزیان بەست، هەرز وتی: پاشاکەی ئەوانم نیشان بدەن.

وتیان: ئەو پیاوەی لەسەر فیل دانیشتووە و تاجی لەسەردایە وياقوتێکی سور بەناوچاویەوەیە، دەبینی؟

وتی: بەڵێ.

وتیان: ئەوە پاشاکەیانە.

وتی: با پاشا بێت.

ماوەیەك وەستان. هەرز وتی: ئێستا لەسەر چی دانیشتووە؟

وتیان: سواری ئەسپ بووە.

وتی: با سوار بێت.

ماوەیەکی دیکە وەستان، هەرز وتی: ئێستا لەسەر چی دانیشتووە؟

وتیان: سوار ئێستر بووە.

وتی: کوڕی کەر! ریسوا بوو و پاشایەتییەکەی بەهەمان شێوە. گووێ بگرن،

گەشتنە سەرزەمینی نەجاشی، حەبەشیەکانی سوار کەشتییەکان کرد و لەکەناری مەندەب پێشڕەویان کرد. کاتێك زونەواس ئاگادار بوویەوە، بۆ قیلان یەمەن نامەی نووسی و داوای هاوکاری لێکرد و وتی لەشەڕی حەبەشە و بەرگری کردن لەیەمەن، هێزەکانیان یەکبگرن. رازی بوون و وتیان هەر کەس بەرگری لەولاّتەکەی خۆی بکات، کاتێك ئەمەی بینی، هەزاران کلیلی دروست و باری وشترەکانی کرد. بەرێکەوت تا رووبەرووی دەستەی جەبەشیەکان بوویەوە و وتی: ئەمە کلیلی گەنجینەکانی یەمەنە، ماڵ و زەوی بۆ ئێوە بێت، بەلاّم پیاو و ژن ومناڵەکان مەکوژن. گەورەکەیان وتی: ئەمە بۆ پاشا بنووسە. نامەی بۆ نەجاشی نووسی. نەجاشی فەرمانی پێدان رازی بن. زونەواس حەبەشیەکان بردە ناو سەنعا و بەگەورەی ئەوانی وت: بڕواپێکراوەکانی خۆت ڕەوانە بکە تا گەنجەکان وەربگرن. هاوەلاّنی ئەوی بۆ کۆکردنەوەی گەنجەکان بلاّو کردەوە. کلیلەکانی بەواندا. پێشتر نامەکانی زونەواس بەهەموو شوێنێك گەیشتبوو تا لەولاّتەکەیان هەموو مانگا ڕەشەکان بکوژن. حەبەشیەکانیان کوشت و تەنیا دەستەیەکی کەم لەوان مایەوە.

کاتێك نەجاشی بەم کارەی زونەواسی زانی، سوپایەکی حەفتا هەزار کەسی رەوانە کرد بەسەرکرایەتی دوو سالار یەکیان ئەبرەهە ئەلئەشرەم بوو. کاتێك گەیشتنە سەنعا، زونەواس زانی ناتوانێت لەبەرابەر ئەوان خۆڕاگری بکات. سوار ئەسپەکەی خۆی لەدەریای دا وکۆتایی بەرۆژگاری هات. ئەبرەهە بوو بەپاشای سەنعا و ویلایەتەکانی دەوروبەری. هیچی بۆ نەجاشی رەوانە نەکرد. پێیان وت: ئەبرەهە چیتر گوێڕایەڵی فەرمانەکانی تۆ نییە و گومان دەکات دەتوانێت پشت بەخۆی ببەستێت.

نەجاشی سوپایەکی بۆ سەر ئەبرەهە رەوانە کرد کەسالارەکەی کەسێك بوو بەناوی ئەریات. کاتێك گەیشتە یەمەن، ئەبرەهە پەیامی بۆ نارد: من و تۆ لەیەك دین و یەك دیارین. دەبێت هاودین و هاوولاّتیەکانی خۆمان بپارێزین. ئەگەر رازیت، شەڕی دەستەویەخە دەکەین، هەرکەس بەسەر ئەوی دیکەدا زاڵبوو، پاشایەتی بۆ ئەو بێت. بەمشێوەیە حەبەشیەکان کوشتار ناکرێن. ئەریات رازی بوو. ئەبرەهە مەبەستی فێڵ کردنی کرد. شوێنێکیان دیاری کرد تا لەوێ رووبەرووی یەك ببنەوە. یەکێك لەکۆیلەکانی خۆی لەناو چاڵێکی نزیك شوێنەکە حەشاردا.

کاتێك رووبەروو بوونەوە، ئەریات پێشدەستی کرد و بەرمە کورتەکەی خۆی

لەئەبرەهەیدا. ڕمەکە نەرمی لووتی ئەوی بڕی. لەم کاتەوە پێیان دەوت ئەشرەم کەشەرمی بڕینی لوتیەتی.

کۆیلەکەی لەچاڵەکە هاتەدەر و لەئەریاتیدا. گورزەکەی کاریگەری دانا وئەریاتی کوشت. ئەبرەهە بەکۆیلەکەی خۆی وت: داوای هەرچی دەکەی، بیکە.

کۆیلە وتی: هیچ بووکێك لەیەمەن نەڕواتە لای زاوا مەگەر ئەوەی سەرەتا بێتە لای من.

ئەبرەهە وتی: رازیم.

ڕۆژگارێك بەمشێوەیە تێپەڕی کرد و خەڵکی یەمەن ئەرنەجدە کۆیلەکەی ئەبرەهەیان کوشت. ئەبرەهە وتی: کاتی ئەوە هاتووە چیتر کەسانێکی ئازادە بن.

کاتێك نەجاشی لەکوژرانی ئەریات ئاگادار بوویەوە، سوێندی خوارد هیچ کارێك نەکات تا خوێنی ئەبرەهە دەرێژێت و سەرزەمینەکەی وێران بکات.

کاتێك ئەبرەهە لەسوێندەکەی ئاگادار بوویەوە، نامەی بۆ نووسی: ئەی پاشا، ئەریات بەندەی تۆ بوو و منیش بەهەمان شێوە. ئەریات هاتبوو تا پاشاکەی تۆ ریسوا و سوپاکەی کوشتار بکات. پێم وت دەست لەجەنگ هەڵبگرێت تا کەس بۆ لای تۆ رەوانە دەکەم و ئەگەر فەرمانتدا، چاوپۆشی لەمن بکات و گەرنە هەموو شتێکی تەسلیم دەکەم بەڵام ئەو بۆ شەڕ کردن لەگەڵ من پێداگری کرد. لەگەڵ ئەو شەڕم کرد و بەسەریدا سەرکەوتم. دەستەڵاتی من تایبەتە بەتۆ. بیستوومە سوێندت خواردووە هیچ کارێك نەکەیت تا خوێنی من برێژیت و هێرش بکەیتە سەر سەرزەمینەکەم. دەفرێك لەخوێنی خۆم و کیسەیەك لەخاکی ئەم سەرزەمینەم بۆ رەوانە کردوویت تا سوێندەکەی خۆت بەدیبێنیت. ئەی پاشا، لەبەخشینەکانی خۆت بێ بەشم مەکە چونکە بەندەی تۆم و گەورەیی و دەسەلات تایبەتە بەتۆ.

نەجاشی رازی بوو و ئەوی بەخشی.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: ئەریات چەندین ساڵ لەیەمەن پاشایەتی کرد. بەڵام ئەبرەهەی حەبەشی سەبارەت بەکاری حەبەشیەکانی یەمەن دژایەتی کرد. ئەو یەکێك بوو لەسوپاکەی ئەریات. جیاوازی لەناویاندا دروست بوو. هەرکام پەیوەست بەیەکیان بوون. مەبەستی رووبەروبوونەوە و شەڕیان کرد. کاتێك لەیەك نزیك کەوتنەوە، ئەبرەهە پەیامی بۆ ئەریات رەوانە کرد: لەوەی حەبەشییەکان یەکتر کوشتار بکەن

هیچت دەست ناکەوێت، با تەنیا من و تۆ شەڕ بکەین، هەر کەس بەرابەرەکەی کوشت، پاشایەتی و سوپاکە لەژێر دەستی ئەودا بێت.

ئەریات وەڵامی دایەوە: دادپەروەریە. ئەبرەهە رووبەرووی بوویەوە. ئەو پیاوێکی کورتەبالا و قەڵەو و گۆشتن بوو. بانگەشەی بۆ ئایینی مەسیحی دەکرد. ئەریات پیاوێکی بەهێز و بالابەرز بوو. رمێکی کورتی بەدستەوە بوو. ئەبرەهە لای تەپۆڵکەیەك وەستا تا لەپشتەوە پارێزراو بێت. یەکێك لەکۆیلەکانی خۆی بەناوی عەتودە لەسەر تەپۆڵکەکە بوو. کاتێك لەیەك نزیك بوونەوە، ئەریات بەرمەکەی زەربەیەکی لەسەری ئەبرەهەدا. رمەکە بەرناوچاوی کەوت و برۆ و چاو و لوت و لێوی ئەوی هەڵدڕی. لەبەر ئەمە بەئەشرەم ناویان دەبەن. عتودە کۆیلەکەی ئەبرەهە لەپشتەوە هێرشی کردەسەر ئەریات و ئەوی کوشت. سوپا پەیوەستی ئەبرەهە بوو. حەبەشیەکانی یەمەن لەدەوری ئەو کۆبوونەوە.

ئەشرەم بەعەتودەی وت: دڵت هەرچی دەخوازێت، داوای بکە، ئێستا کەئەوت کوشت، تەنیا ئەوە ماوەتەوە خوێنبایی ئەو بدەین.

عەتودە وتی: دەمەوێت هیچ بووکێك لەخەڵکانی یەمەن نەڕواتە لای زاوا، مەگەر ئەوەی شەوی یەکەم لای من بەسەر ببات.

ئەبرەهە وتی: رازیم.

ئەوەی ئەبەرهە ئەنجامیدا، بێ ئاگادار کردنەوەی نەجاشی بوو. کاتێك نەجاشی ئاگادار بوویەوە، تورە بوو و وتی: بێ فەرمانی من هێرشی کردە سەر ئەمیرەکەم و کوشتی. سوێندی خوارد هێرش بکاتە سەر سەرزەمینی ئەبرەهە و مووی ناوچاوانی بتاشێت. کاتێك ئەم هەواڵەیان بەئەبرەهەدا، سەری تاشی و کیسەیەك لەخۆڵەی یەمەنی بۆ نەجاشی رەوانە کرد. نووسی: ئەی پاشا، ئەریات بەندەی تۆ بوو، منیش بەهەمان شێوە بەندەم. سەبارەت بەفەرمانەکانی تۆ جیاوازی لەنێوان ئێمە سەری هەڵدا. هەردووك گوێڕایەڵ و ملکەچی فەرمانەکانی تۆ بووین، بەلام من بۆ هەڵسوڕان و بەڕێوبردنی کاروباری حەبەشییەکان بەتواناترم. کاتێك لەسوێندی پاشا ئاگادار بوومەوە، سەرم تاشی و کیسەیەك لەخۆڵی یەمەنم رەوانە کرد تا بیخاتە ژێر پێ و سوێندەکەی بەدیبێنێت.

کاتێك نامەکەی بەنەجاشی گەیشت، رەزامەندی خۆی دەربڕی و نووسی:

کاروبارەکانی سەرزەمینی یەمەن راپەڕێنە تا فەرمانەکانم بگات.

کاتێک ئەبرەهە بینی توانیویەتی ڕەزامەندی نەجاشی و پاشایەتی سەرزەمینی یەمەن بەدەست بێنێت، کەسی بۆ لای باوکی موڕە کوڕی زی یەزن رەوانە کرد و هاوسەرەکەی ئەوی کردە هاوسەری خۆی. باوکی موڕە بە زووجەزن ناودەبرا و ڕێحانە کچی عەلقەمە کوڕی مالك کوڕی زەید کوڕی کەهلان بوو. مەعدی کەرب ئەوی کردە هاوسەری باوکی موڕە و لەدوای باوکی موڕە کوڕێك بەناوی مەسروق و کچێك بەناوی بەسباسەی بۆ ئەبرەهە هێنایە دنیا.

باوکی موڕە لەدەست ئەبرەهە هەڵات. لەیەمەن مایەوە و عەتودە، کۆیلەکەی ئەبرەهە لەسەر کارەکەی بەردەوام بوو. یەکێك لەخەڵکانی حەمیر و بەوتەیەك خەسعەم، عەتودەی کوشت.

ئەبرەهە پیاوێکی گەورە و بیرمەند و شەریف بوو. لەسەر باوەڕەکەی خۆی مایەوە و کاتێك هەواڵی کوژرانی عەتودەی بیست، وتی: ئەی خەڵکی یەمەن، پیاوێکی بیرمەند و تێکۆشەر لەناو ئێوە دەرکەوت ئەوەی پێ شەرم بوو کەپیاوان بەشەرمی و شووڕەیی دەزانن. سوێند بەخوا ئەو کاتەی وتم داوای هەرچی دەکەیت، بیکە، ئەگەر دەمزانی ئەوە داواکاریەکەیەتی، ئەو قسەم نەدەهێنایە سەر زمان. سوێند بەخوا خوێنبایی ئەو وەرناگیرێت و بەهۆی کوژرانی ئەو، لەمنەوە زیانتان بەرناکەوێت.

دەڵێت: ئەبرەهە، قەلیسی لەسەنعا دروست کرد. کەنیسەیەك بوو لەو رۆژگارەدا لەهەموو جیهاندا هاوتای نەدەبینرا. نامەی بۆ نەجاشی پاشای حەبەشە نووسی: ئەی پاشا، کەنیسەیەکەم بۆ تۆ دروست کردووە پێش تۆ بۆ هیچ پاشایەکیان دروست نەکردووە. دانانیشم تا ئەوەی عەرەبەکان ناچار دەکەم بۆ حەج کردن، ڕوو لەم شوێنە بکەن.

کاتێك عەرەبەکان سەبارەت بەنامەکەی ئەبرەهە بۆ نەجاشی گفتوگۆیان کرد، یەکێك لەفەرامۆش کارانی تیرەی مناڵەکانی فەقیم تووڕە بوو و ڕووی کردە قەلیس. پیسایی لەناو کەنیسەکەدا کرد و شوێنەکەی بەجێهێشت و گەڕایەوە بۆ سەرزەمینی خۆی. ئەبرەهە ئاگادار بوویەوە و وتی: کێ ئەم کارەی کرد؟

وتیان: یەکێك لەکەسانی خزمەتکاری ماڵەکەی مەککە کەعەرەبەکان زیارەتی دەکەن، ئەم کارەی کرد لەبەر ئەوەی بیستبووی دەتەوێت حەجکەران ناچار بکەیت بۆ

حەج کردن ڕوو لەقەلیس بکەن. مانای کارەکەی ئەوەیە کەقەلیس بۆ حەج و زیارەت شیاونییە.

ئەبرەهە تورە بوو، سوێندی خوارد هێرش دەکاتە سەر مەککە و ماڵی خوا وێران دەکات.

چەند کەسێك لەعەرەبەکان لای ئەبرەهە بوون و چاوەڕوانی بەخششەکانی ئەویان دەکرد. محەممەد کوڕی خوزاعی کوڕی حەزابەی زەکوانی سولەمی لەگەڵ چەند کەسێ لەخەڵکەکەی خۆی و براکەی قەیس کوڕی خوزاعی لەناو ئەواندا دەبینران. لەو کاتەی لە بەردەم بارەگای ئەبرەهە بوون، جەژنی ئەوان نزیك کەوتەوە. ئەبرەهە لەخواردنەکەی خۆی ((مەڕ)) بۆ ئەوانی نارد.

کاتێك خواردنەکەی ئەبرەهەیان بۆ بردن، وتیان: سوێند بەخوا ئەگەر ئەم خواردنە بخۆین، عەرەبەکان تا ڕۆژی کۆتایی سەرکۆنەمان دەکەن. محەممەد کوڕی خوزاعی هەستا و ڕۆشتە لای ئەبرەهە، وتی: ئەی پاشا، ئەمە ڕۆژی جەژنی ئێمەیە. ئێمە لەم ڕۆژەدا تەنیا پەراسوو و دەست دەخۆین.

ئەبرەهە وتی: ئەوەی دەتانەوێت، بۆتانی دەنێرم. خواردنەکەی خۆم لەبەر ئەوە بۆ ئێوە نارد تا ڕێزتان لێبگرم چوونکە پێگەیەکی بەرزتان لای من هەیە.

ئەبرەهە تاجی بەمحەممەد کوڕی خوزاعی بەخشی و ئەوی کردە سەروەری خەڵکانی موزەر. وتی: فەرمانی پێدا پێشنیار زیارەتی کەنیسەکەیان پێبکات. محەممەد کوڕی خوزاعی ڕۆشت تا گەیشتە سەرزەمینی کەنانە. خەڵکی تەهامە دیانزانی مەبەستی محەممەد لەگەڕان و سەردانەکەی چییە. یەکێك لەموزەیل بەناوی عوروە کوڕی حەیازی غەلاسی، تیرێکی بۆ هاویشت و ئەوی کوشت. قەیسی برای هاوڕێیەتی دەکرد و کاتێك براکەی کوژرا، هەڵات. ڕۆشتە لای ئەبرەهە و لەکوژرانی براکەی ئاگاداری کردەوە. تووڕەیی و کینەی ئەبرەهە زیادی کرد و سوێندی خوارد هێرش بکاتە سەر منداڵەکانی کەنانە و ماڵەکانیان وێران بکات.

هوشام کوڕی محەممەدی کەلبی دەڵێت: کاتێك نەجاشی ئەبرەهەی بەخشی و دەسەڵاتەکەی پشت ڕاست کردەوە، کەنیسەی سەنعای دروست کرد. بینایەکی سەرنجراکێش و کەس هاوشێوەی نەبینیبوو. بەزێڕ و ڕەنگە جۆراوجۆرەکان ڕازێنرابوویەوە. نامەی بۆ قەیسەر نووسی و ئاگاداری کردەوە دەیەوێت لەسەنعا

کەنیسەیەك دروست بکات تا شوێنەوارەکانی بۆ هەمیشە بمێنێتەوە. بۆ ئەم کارە، داوای هاوکاری لێکرد. نەجاشی مەرمەڕ و کاشی و پیشەگەری رەوانە کرد. کاتێك بیناکە بەرز بوویەوە، نامەی بۆ نەجاشی نووسی: دەمەوێت حەجکەرانی عەرەب ناچار بکەم، بەمەبەستی حەج کردن رووبکەنە ئەم کەنیسەیە. عەرەبەکان ئەمەیان بیست و بەکارێکی گەورە و ناپەسەندیان زانی. نەیانتوانی خۆراگری بکەنە پیشە. یەکێك لەمناڵەکانی کەنانە، بەرەو یەمەن بەرێکەوت و رۆشتە ناو کەنیسەکە و پیسایی کرد. ئەبرەهە تووڕ و مەبەستی وێران کردنی کەعبە و مەککەی کرد. لەگەڵ حەبەشیەکان بەرێکەوت. سوار فیل ببوو. زونەفری حەمیری رووبەرووی بوویەوە. ئەبرەهە ئەوی ئەسیر کرد و وتی: ئەی پاشا، بەندەی تۆم، مەمکوژە چونکە زیندووو هێشتنەوەم باشترە لەکوشتنم.. ئەبرەهە نەیکوشت. دوای ئەو، نوفەیل کوڕی حەبیبی خەسعەمی رووبەرووی بوویەوە. ئەبرەهە شەڕی لەگەڵ کرد و شکستی بەخۆی و سوپاکەی هێنا. نوفەیل ئەسیر کرا و داوای کرد نەکوژرێت. ئەبرەهە ئەویشی نەکوشت و لەسەرزەمینی عەرەب ئەوی کردە شارەزای رێگە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك ئەبرەهە مەبەستی رۆشتن بۆ مەککەی کرد، فەرمانی خۆ ئامادە کردنی بەحەبەشیەکاندا و فیلی لەگەڵ خۆیدا برد.

دەڵێت: کاتێك عەرەبەکان بیستیان ئەبرەهە دەیەوێتماڵی خواوەند وێران بکات، ئەمەیان بەکارەساتێکی گەورە لەقەڵەمدا و شەڕ کردن لەگەڵ ئەویان بەپێویست زانی. پیاوێك بەناوی زونەفر لەگەورەکان وپاشاکانی یەمەن ، شۆڕشی کرد و خەڵکەکەی خۆی و ئەو عەرەبانەی بۆ شەڕ لەگەڵ ئەبرەهە ئامادەبوون، کۆکردەوە و بڕیاری بەرگری کردن لەماڵی خوایدا. کاتێك رووبەرووی یەکبوونەوە، عەرەبەکان شکستیان خوارد. ئەبرەهە مەبەستی ئەوەی کرد بیکوژێت، وتی: ئەی پاشا، مەمکوژە چونکە ئەگەری هەیە هاورێیەتی من سوودت پێبگەیەنێت.

ئەبرەهە ئەوی نەکوشت و لەخێوەتێك زیندانی کرد. پیاوێکی خۆراگربوو، درێژەی بەرێگەکەیدا و دەیویست کەعبە وێران بکات. کاتێك گەیشتە سەرزەمینی خەسعەم، نوفەیل کوڕی حەبیبی خەسعەمی لەگەڵ دوو هۆزی خەسعەم، شەهران و ناهس، و عەرەبە شوێنکەوتەکانی دیکە، رێگەیان لێگرت. شەڕ دەستی پێکرد و ئەبرەهە شکستی پێهێنا. ئەوی ئەسیر و مەبەستی کوشتنی کرد.

نوفەیل وتی: ئەی پاشا، مەمکوژە، لەسەرزەمینی عەرەبەکان ئەبمە ڕێنیشاندەری تۆ و بەڵێن دەدەم هۆزەکانی شەهران و ناهس ملکەچی فەرمانەکانت بن.

ئەبرەهە ئەوی بەخشی و ئازادی کرد. ئەوی لەگەڵ خۆی برد تا ڕێگەی نیشان بدات. کاتێك گەیشتنە تاییف، مەسعود کوڕی مەعتەب لەگەڵ چەند کەسێك لەهۆزی سەقیف هاتن و وتیان: ئەی پاشا، ئێمە بەندە ملکەچەکانی تۆین و مەبەستی دژایەتی کردنی تۆمان نییە، ماڵی ئێمە ئەو ماڵە نییە بەمەبەستی وێران کردنی هاتوویت. مەبەستیان لەماڵەکەی خۆیان، لات، بوو. ئەو ماڵەی بەدوایدا دەگەڕێیت، لەمەککەیە. مەبەستیان کەعبە بوو. ئێمە چەندین کەس لەگەڵ تۆ ڕەوانە دەکەین تا ڕێگەت نیشان بدەن. ئەبرەهە ئەوانی بەخشی و باوکی ڕەغاڵیان لەگەڵ نارد. ئەبرەهە بەڕێکەوت و باوکی ڕەغاڵ هاوڕێیەتی دەکرد تا گەشتنە مەغمەس. لەوێ باوکی ڕەغاڵ مرد. عەرەبەکان بەرد بەگۆڕەکەیەوە دەنووسێن. ئەو گۆڕەیە خەڵکان لەمەغمەس بەرد بەگۆڕکەیەوە دەنووسێنن.

کاتێك ئەبرەهە لەمەغمەس دابەزی، یەکێك لەحەبەشیەکان بەناوی ئەسوەد کوڕی مەقسودی لەگەڵ دەستەیەك ڕەوانە کرد. بەرەو مەککە بەڕێکەوتن و ماڵ و مەڕوماڵاتی خەڵکانی مەککەی پێش خۆی خست. دووسەد وشتری عەبدولموتەلیب کوڕی هاشم لەناویاندا دەبینرا کە لەورۆژگارەدا گەورە و سەروەری قوڕەیش بوو. قوڕەیش و کەنانە و هوزەیل و خەڵکانی دیکەی ناو حەرەم، مەبەستی جەنگیان کرد بەڵام زانیان ناتوان لەبەرابەر ئەو خۆڕاگری بکەن، لەبەر ئەمە پەشیمان بوونەوە.

ئەبرەهە حەناتەی حەمیری بۆ مەککە ڕەوانە کرد و پێی وت: بەدوای سالار و گەورەی خەڵکەکەدا بگەڕێت و پێی بڵێت پاشا دەڵێت: من مەبەستی شەڕ کردنم نییە، بۆ وێران کردنی ماڵی کەعبە هاتووم و ئەگەر بەرگری نەکەن، پێویستم بەخوێنرێژی نییە. ئەگەر مەبەستی شەڕ کردنی نییە، ئەو بێنە بۆ لای من.

کاتێك حەناتە ڕۆشتە مەککە، پرسی: سالاری و گەورەی مەککە کێیە؟

پێیان وت: عەبدولموتەلیب کوڕی هاشم کوڕی عەبدمەناف کوڕی قوسەی.

حەناتە ڕۆشتە لای و وتەکانی ئەبرەهەی پێ ڕاگەیاند.

عەبدولموتەلیب وتی: سوێند بەخوا مەبەستی شەڕ کردنمان نییە و بەرگەی شەڕ ناگرین. ئەمە ماڵی خوایە و ماڵی ئیبراهیمی خەلیلە. ئەگەر خواوەند پارێزگاری

لێبکات، لەماڵی خۆی کردووە و ئەگەر بخوازێت، ماڵەکە تەسلیم بەئەبرەهە دەکات. ئێمە توانای بەرگری کردنمان نییە.

حەناتە پێی وت: بۆ لای پاشا وەرە تا لەوتەکانی تۆ ئاگاداری بکەمەوە.

عەبدولموتەلیب لەگەڵ دەستەیەك لەکوڕەکانی خۆی بەرێکەوت تا گەیشتە ئوردوگاکەی ئەبرەهە.

پرسیاری زونەفری هاورێی کرد. ئەوانی لەزینداندا بینی و وتی: ئایا لەم بەڵای بەسەر ئێمەدا باریوە، دەتوانیت هاوکاریمان بکەیت.

زونەفر وتی: ئەو کەسەی ئەسیری دەستی پاشایە و شەو و بەیانی چاوەڕوانی کوشتنە، چۆن دەتوانێت هاوکاریت بکات، ناتوانم هیچ کارێك بکەم بەڵام فیلبانەکە هاورێمە و دەتوانم کەسێك بنێرم و پێشنیاری تۆی پێبکەم. داوای لێبکەم داوای مۆڵەتت لەپاشا بکات بۆ ئەوەی بیبینت و لەمەبەستەکانی خۆت ئاگاداری بکەیتەوە و ئەگەر توانی، لای پاشا بۆ تۆ بپارێتەوە.

عەبدولموتەلیب وتی: ئەمە بۆ من بەسە.

زونەفر کەسی بۆ لای ئەنیس رەوانە کرد. هات و پێی وت: ئەمە عەبدولموتەلیب سالاری قوڕەیش و سەرکارواندارى خەڵکانی مەککەیە کەلەدەشت خواردن بەخەڵك و لەکێوەکان خوردان بەئاژەڵە وەحشیەکان دەدات. پاشا دووسەد وشتری گرتووە. مۆڵەتی لەپاشا بۆ وەبگرە و تا دەتوانیت هاوکاری بکە.

ئەنیس وتی: ئەو کارە دەکەم. لەگەڵ ئەبرەهە قسەی کرد و وتی: ئەی پاشا، سالاری قوڕەیش چاوەڕوانی مۆڵەتی تۆیە. ئەو کارواندارى مەککەیە و لەدەشت و کێوەکان خواردن بەخەڵك و ئاژەڵەکان دەدات. مۆڵەتی پێبدە تا نیازەکەی لەگەڵ تۆ باس و چاکەی لەگەڵ بکە.

دەڵێت: ئەبرەهە مۆڵەتی پێدا. عەبدولموتەلیب پیاوێکی چوارشانە و جوان روخسار بوو. کاتێك ئەبرەهە ئەوی بینی، ئەوی بەگەورە بینی و نەیویست لەخوار خۆیەوە دایبنیشێنێت. هەروەها حەزی نەدەکرد حەبەشیەکان ئەو لای تەختەکەی ببینن. لەبەر ئەمە لەسەر تەختەکەی هاتەخوار و لەسەر فەرش دانیشت. ئەوی لای خۆی دانیشاند و بەوەرگێڕەکەی وت: پێی بڵێ با لەمەبەست و نیازەکەی ئاگادارمان بکاتەوە.

عەبدولموتەلیب وتی: نیازم ئەوەیە، پاشا دوسەد وشتری منی گرتووە، بۆم بگەڕێنێتەوە.

کاتێك ئەم قسەی کرد، ئەبرەهە بەوەرگێڕەکەی وت: پێی بڵێ، کاتێك تۆم بینی، حەزم بەدانیشتنی تۆ دەکرد، بەڵام کاتێك ئەم قسەت هێنایە سەرزمان، لێت بێزارم. سەبارەت بەدوو سەد وشترەکەی خۆت قسە دەکەیت بەڵام ئەو ماڵەی ماڵی ئاینەکەی تۆ و باوك و باوکانی تۆیە پشتگوێ دەخەیت لەکاتێکدا دەزانیت من بەمەبەستی وێران کردنی ئەو ماڵە هاتووم.

عەبدولموتەلیب وتی: من خاوەندی وشترەکانم. ماڵەکەیش خاوەندێکی هەیە وپارێزگاری لێدەکات.

ئەبرەهە وتی: ناتوانێت بەرگری لەمن بکات.

عەبدولموتەلیب وتی: تۆ دەزانیت و ئەو. وشترەکانم بۆ بگەڕێنەرەوە.

وەك دەستەیەك لەشارەزایانی مێژوو باسیان کردووە، عەبدولموتەلیب لەگەڵ عەمرۆ کوڕی نەفاسە کوڕی عودەی کوڕی دوئەل کوڕی بەکر کوڕی عەبدمەنات کوڕی کەنانە کە لەو رۆژگارەدا سالاری بەنی کەنانە بوو و لەگەڵ خوەیلد کوڕی وائیلەی هوزەلی سالاری هوزەیل، ڕۆشتنە لای ئەبرەهە و پێیان وت یەك لەسەر سێی سامانی خەڵکانی تەهامە وەربگرێت و بگەڕێتەوە و ماڵەکە وێران نەکات. ئەبرەهە رازی نەبوو. خوا زاناترە.

ئەبرەهە وشترەکانی بۆ عەبدولموتەلیب گەڕاندەوە. کاتێك گەڕانەوە، عەبدولموتەلیب لای قورەیشیەکان کۆبوویەوە و ڕووداوەکانی بۆ باس کردن. فەرمانی پێدان تا لەمەککە بڕۆنەدەر و لەسەر بەرزایی کێوەکان نیشتەجێ بن تا لەزیانەکانی سوپای ئەبرەهە بەدوور بن.

عەبدولموتەلیب ئاڵقەی کەعبەی گرت و چەندین کەس لەگەڵ ئەو لەخوا پاڕانەوە و دژی ئەبرەهە و سوپاکەی داوای هاوکاریان کرد.

عەبدولموتەلیب بەهەمان شێوە کەئاڵقەی کەعبەی بەدەستەوە بوو، شێعرێکی بەم ناوەرۆکە خوێندەوە:

پەروەردگارا، جگە لەتۆ هیچ هیوایەکەم نییە

پەروەردگارا، ماڵەکەی خۆت لەوان بپارێزە

چونکە دوژمنی ماڵەکەی تۆ، دوژمنی تۆیە
ڕێگە مەدە نشینگەکەی تۆ وێران بکەن.

عەبدولموتەلیب ئاڵقەی دەرگاکەی بەردا و لەگەڵ قوڕەیشیەکان پەنایان بۆ کێو و دۆڵەکان برد. چاوەڕوان بوون ئەبرەهە بڕواتە ناو مەککە و چی پێخۆشە، ئەنجامی بدات.

بەرەبەیان ئەبرەهە بۆ ڕۆشتنە ناو مەککە خۆی ئامادە کرد. فیلەکانی تەیار و سوپاکەی ڕازاندەوە. ناوی فیلەکەی مەحمود بوو. ئەبرەهە بڕیاریدا بوو ماڵەکە وێران بکات و بۆ یەمەن بگەڕێتەوە.

کاتێک فیلەکان ڕوویان لەمەککە کرد، نوفەیل کوڕی حەبیبی خەسعەمی هات و لای ئەوان وەستا. گوێچکەی فیلەکەی گرت و وتی: مەحمود بخەوە و بوێرانە بۆ ئەو شوێنە بگەڕێرەوە کەلێوەی هاتوویت چونکە لەشاری پارێزراوی خواوەندیت. ئەوسا گووێچکەی فیلەکەی بەردا و فیلەکە خەوت. نوفەیل کوڕی حەبیب بەخێرایی بەرێکەوت تا گەیشتە سەر بەرزایی کێوەکە.

لەفیلەکەیاندا بۆ ئەوەی هەستێت، هەڵنەستا و بەتەور لەسەریاندا تا هەستێت، بەلام هەڵنەستا. بەدار لەشوێنە نەرمەکانی فیلیان دەژەنی، پیستیان هەڵدڕی تا هەستێت و هەڵنەستا. ڕوویان کردە یەمەن. مەحمود هەستا. ڕوویان کردە شام هەستایە سەر پێ. ڕوویان کردە ڕۆژ هەڵات، مەبەستی ڕۆشتنی کرد بەلام کاتێک ڕوویان کردە مەککە، خەوت.

خواوەند باڵندەکانی لەدەریاوە بۆ سەر حەبەشیەکان ڕەوانە کرد کەهاوشێوەی پەرەسێلکە بوون. هەر باڵندەیەک سێ بەردی هەڵگرتبوو، یەکیان بەدەندووک و دوانیان بەدەستەکانی. بەردەکان بەئەندازەی دەنکە نۆک یا نیسکێک دەبوون. بەردەکان بەر هەر کەسێک دەکەوت، دەیکوشت. بەلام بەردەکان بەهەموویان نەگەیشت، سوپاکە هەڵاتن و بەدوای ئەو ڕێگەدا دەگەڕان کەلێوەی هاتبوون. بەدوای نوفەیل کوڕی حەبیبدا دەگەڕان تا ڕێگەی یەمەنیان نیشان بدات. نوفەیل کاتێک ئازاب و سزای خواوەندی بینی، هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەڕۆکە:

سوێند بەخوا ڕێگەی هەڵاتنتان نییە.
ئەشرەم بەزاو، سەر ناکەوێت.

حەبەشیەکان لەرێگەکاندا هەڵدەهاتن و لەناو گۆلاوەکاندا لەناو دەچوون. ئەبرەهە بەردێکی بەرکەوتبوو. ئەویان لەگەڵ خۆیان برد. پەنجەکانی یەك لەدوای یەك هەڵدەوەرین. کاتێك پەنجەیەکی هەڵدەوەری، ماوەیەك چڵك و خوێنی لێ دەهاتەدەر. کاتێك گەیشتە سەنعا، هاوشێوەی جووجکەی لێهاتبوو. وەك دەڵێن سینەی قەڵشا و دڵی کەوتە خوار و مرد.

دەڵێن: نەجاشی، باوکی سەحم ئەریاتی لەگەڵ چوار هەزار کەس بۆ یەمەن رەوانە کرد و بەسەر ئەو ولاتەدا زاڵبوو. بەخشش بەشاکان بەخشی و هەژارەکانی ریسوا کرد. یەکێك لەخەڵکانی حەبەشە بەناوی ئەبرەهە دژی ئەو شۆرشی کرد. خەڵکی هاندا و ئەریاتی کوشت و دەستی بەسەر یەمەندا گرت. ئەبرەهە بینی خەڵکان لەوەرزی حەج کردن روودەکەنە کەعبە. وتی: خەڵك بۆ کوێ دەرۆن.

وتیان: بۆ زیارەتی ماڵی خوا لەمەککە.

وتی: ماڵی خوا لەچی دروست کراوە؟

وتیان: لەبەرد.

وتی: بەچی داپۆشراوە؟

وتی: لەو جیلانەی لێرەوە دەیبەین.

وتی: سوێند بەمەسیح ماڵێك باشتر بۆ خەڵکان دروست دەکەم.

ماڵێکی لەمەرمەڕی سپی و سور و زەرد و رەش دروست کرد و بەزێر و زیو رازاندیەوە. ناوەکەی پر کرد لەگەوهەر و لەسەر دەرگاکانی وەرەقە و بزمای زێری داکوتی. یاقوتێکی سور و گەورەی لەناو ماڵەکە دانا. پەردەی هەڵواسی، عوود و بخور بەردەوام بەسووتا، دیوارەکانی رەنگ کرد بەشێوەیەك گەوهەرەکان شاردرانەوە. فەرمانیدا تا خەڵك زیارەتی ماڵەکە بکەن. زۆر لەهۆزەکانی عەرەب بۆ چەندین ساڵ زیارەتی ئەو ماڵەیان کرد و کەسان لەوێ بۆ زیارەت کۆبوونەوە و ریۆ و رەسمەکانیان ئەنجامدا.

نوفەیلی خەسعەمی مەبەستێکی خراپی لەسەردا بوو. یەکێك لەشەوەکان کەهەمووان خەوتبوون، هەستا و پیسایی کرد و قیبلەی کەنیسەی پیس کرد. مردارێکی هێنا و لەناو کەنیسەکە فرێیدا. ئەبرەهە ئاگادار بوویەوە و وتی: عەرەبەکان بۆ پشتیوانی کردن لەماڵەکەی خۆیان، ئەم کارەیان کرد. سوێند بەخوا بەرد بەبەردی

ئەو ماڵە وێران دەکەم

نامەی بۆ نەجاشی نووسی و لەمەبەستەکەی خۆی ئاگاداری کردەوە و داوای لێکرد فیلەکەی خۆی (مەحمود) بۆ بنێرێت. فیلێکی گەورە بوو و لەسەر زەوی فیلێکی بەگەورەی و بەهێزی ئەو فیلە نەبینراوە.

نەجاشی فیلەکەی رەوانە کرد. کاتێك فیلەکە گەیشتە یەمەن، ئەبرەهە لەگەڵ خەڵکان بەرێکەوت. پاشای حەمیر و نوفەیل کوڕی حەبیبی خەسعەمی هاورێیەتیان دەکرد. کاتێك لەخەڵکان نزیك کەوتەوە، فەرمانیدا مەڕومالآت و چوارپێکانیان تالآن بکەن. وشترەکانی عەبدولموتەلیبیان گرت. نوفەیل هاورێی عەبدولموتەلیب بوو. سەبارەت بەوشترەکانی خۆی قسەی لەگەڵ کرد. نوفەیل لەگەڵ ئەبرەهە ئاخاوت و وتی: ئەی پاشا، سالاری عەرەبەکان کە لەهەموویان گەورەتر و لەپێشترە و خەڵکان سوار لەسەر ئەسپ دەبات و سامانیان پێدەبەخشێت، بۆ لای تۆ هاتووە.

نوفەیل عەبدولموتەلیبی بردە لای ئەبرەهە، پێی وت: چیت دەوێت؟

عەبدولموتەلیب وتی: دەمەوێت وشترەکانم بۆ بگەرێنیتەوە.

ئەبرەهە وتی: ئەوەی سەبارەت بەتۆ بیستم، فریو بوو، گومانم کرد سەبارەت بەماڵەکە قسەم لەگەڵ دەکەیت.

عەبدولموتەلیب وتی: وشترەکانم بۆ بگەرێنەرەوە و ئەمە تۆ و ئەمە ئەو ماڵەی کەماڵی خوایە و خواوەند خۆی پارێزگاری لێدەکات.

ئەبرەهە فەرمانیدا و وشترەکانیان بۆ گەڕاندەوە. نیشانەی لێدان و تایبەتی کردن بەقوربانی و لەحەرەمدا بەرەڵای کردن تا شتێك لەحەرەم خراپ بکەن و ببنە هۆی تورە بوونی خواوەندی حەرەم.

عەبدولموتەلیب ڕۆشتە ئەشکەوتی حەرا و عەمرۆ کوڕی عائیز کوڕی عیمران کوڕی مەخزوم و مەتعەم کوڕی عودەی و باوکی مەسعودی سەقەفی هاورێیەتیان دەکرد. عەبدولموتەلیب هۆنراوەیەکی هەیە بەم ناوەرۆکە:

خواوەندا هەر کەسێك بارەکەی خۆی دەپارێزێت
تۆیش پارێزگاری لەماڵەکەی خۆت بکە
تا خاچی ئەوان و هێزی ئەوان بەسەر تۆدا زاڵ نەبێت
ئەگەر قیبلەی ئێمە تەسلیمی ئەوان بکەیت، فەرمانی خۆتە.

دەڵێت: باڵندەکان لەدەریاوە هاتن کەهەموویان پەرەسێلکە بوون. هەر باڵندەیەک سێ بەردی هەڵگرتبوو. بەردەکانیان لەئاسمانەوە فرێدایە خوار. بەردەکان بەر هەر کەسێك دەکەوت، دەکوژرا یا شوێنی بەردەکە دەبووە قورحە. ئەمە یەکەم جار بوو ئاوڵە و داری تاڵ دەرکەوت.

بەرد، حەبەشیەکانی کوشت. خواوەند لافاوێکی خرۆشاوی رەوانە کرد و هەموویانی راماڵی.

دەڵێت: ئەبرەهە و پاشماوەی سوپاکەی هەڵاتن. ئەندامەکانی ئەبرەهە یەك لەدوای یەك هەڵوەرین. فیلەکەی نەجاشی، مەحمود، خەوت و نەرۆشتە ناو حەرەم. لەبەر ئەمە زیانی بەرنەکەوت. بەڵام فیلێکی دیکە رۆشتە ناو حەرەم وبەردی بەرکەوت. دەڵێن ژمارەی فیلەکان سیانزە دانە بوو.

عەبدولموتەلیب لەحەرا هاتەخوار و دووان لەحەبەشیەکان مانەوە و سەری ئەویان ماچ کرد و وتیان: تۆ باشتر دەتزانی.

لەموغەیرە کوڕی ئەخنەس دەگێڕنەوە: یەکەم جاری لەو ساڵە ئاوڵە و سورێژە لەسەرزەمینی عەرەبەکان بینرا و یەکەم جاری بوو داری تاڵ یان بینی.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك ئەبرەهە مرد، کوڕەکەی ئەو یەکوسم کوڕی ئەبرەهە پاشایەتی گرتەدەست. حەمیر و هۆزەکانی یەمەن ریسوا بوون و حەبەشیەکاندا بەسەریاندا سەرکەوتن. ژنانی ئەوانیان گرت و پیاوەکانیان کوشتن و منداڵەکانیان بۆ کاری وەرگێران لەنێوان خۆیان و عەرەبەکان ناچار کرد.

دەڵێت: کاتێك خواوەند حەبەشەیەکانی لەمەککە دوور خستەوە و سزای خۆی بەسەردا باراندن، عەرەبەکان کورنوشیان بۆ قورەیش برد و وتیان: کەسانی باوەڕدار بوون و خواوەند بەڵای دوژمنی لەوان دوور کردەوە.

دەڵێت: کاتێك یەکوسم کوڕی ئەبرەهە مرد، مەسروق کوڕی ئەبرەهە پاشایەتی یەمەنییەکانی گرتەدەست. بەڵاکانی خەڵکی یەمەن بەردەوام و زاڵبوونی حەبەشیەکان بەسەر یەمەن لەکاتی مانەوەی ئەریات تا ئەو کاتەی فارسەکان مەسروقیان کوشت و حەبەشیەکانیان دەرپەڕاند، حەفتا و دوو ساڵ درێژەی کێشا. چوار پاشا بەدوای یەکدا هاتن: ئەریات، دوای ئەو ئەبرەهە، دوای ئەو یەکسوم کوڕی ئەبرەهە و دوای ئەو، مەسروق کوڕی ئەبرەهە.

سەیف کوڕی زی یەزنی حەمیری کە بەباوکی مورە ناسرا بوو، ڕۆشتەی لای قەیسەر، پاشای ڕۆم و داوای لێکرد حەبەشیەکان لەولاتەکەی دەربکات و دەست بەسەر سەرزەمینەکەیاندا بگرێت و پاشایەتی بەیەکێك لەرۆمیەکان ببەخشێت. بەلام قەیسەر رازی نەبوو. سەیف کاتێك زانی پاشا مەبەستەکەی ناهێنێتەدی، بەرەو حیرە بەرێکەوت کەنعمان کوڕی مونزەر لەلایەن کەسراوە فەرمانڕەوایەتی ئەو ناوچە وبەشێك لەسەرزەمینی عێراقی دەکرد. سەیف، نەعمانی لەبەلاو گرفتارییەکانی خەڵکەکەی ئاگادار کردەوە.

نەعمان پێی وت: من سالانە دەڕۆمە لای کەسرا، لای من بمێنەرەوە تا کاتی ڕۆشتن، تۆیش لەگەڵ خۆم ببەم. سەیف لای نەعمان مایەوە تا ئەو کاتەی ڕۆشتە لای کەسرا.

کاتێك نەعمان گەیشتە بارەگای کەسرا و لەکارەکانی خۆی تەواو بوو، باسی سەیف کوڕی زی یەزنی کرد و داوای کرد رێگەی بدات مەبەست و نیازەکەی خۆی باس بکات. کەسرا، مۆڵەتی پێدا.

کەسرا لەهەیوانەکەی خۆی دادەنیشت. تاجی پاشایەتی لەوێ بوو. تاجەکە هاوشێوەی دەفرێکی گەورە و بەیاقوت و زەموڕود و زێڕ و مرواری رازابوویەوە و بەزنجیرێکی زێڕین بەتاقی هەیوانەکەوە هەڵواسرابوو چونکە سەری کەسرا توانای قورسایی تاجەکەی نەبوو. تاجەکەیان دادەپۆشی. کاتێك کەسرا لەشوێنەکەی خۆی دادەنیشت و سەری دەخستە ناو تاجەکە، پۆششی سەرتاجەکەیان هەڵدەگرت. هەرکەس دەیبینی، ترس لەدڵی دەنیشت.

کاتێك سەیف کوڕی زی یەزن ڕۆشتە لای کەسرا، کەوتە سەر خاك و وتی: ئەی پاشا، بێگانەکان بەسەر سەرزەمینەکەی ئێمەدا زاڵبوون.

کەسرا وتی: کام بێگانەیە، حەبەشە یا سند؟

وتی: حەبەشە. هاتووم تا دژی ئەوان هاوکاریم بکەیت و لەسەرزەمینەکەی من دەریانپەڕێنیت. پاشایەتی ئەوێ تایبەتیێ بێت بەتۆ.

کەسرا وتی: سەرزەمینی تۆ لەسەرزەمینی ئێمەوە دوورە و زەوییەکانی کەم داهاتە تەنیا بزن و وشتری هەیە و ئێمە پێویستیمان پێی نییە. سوپای فارسەکان لەسەرەزەمینێك کەداهاتی نییە، گیرۆدەی شەڕ ناکەم.

فەرمانیدا و دەهەزار درەم خەڵاتیان پێدا. جل و بەرگی جوانیان لەبەر کرد و کاتێك سەیف کوڕی زی یەزن ڕۆشتەدەر، لەمەهارا درەمەکانی بەسەر خەڵکدا دابەش دەکرد و ژن و پیاو و منداڵ و کۆیلە هەڵیاندەگرتەوە.

بەکەسرایان وت: ئەم عەرەبەی خەڵاتت پێبەخشی، درەمەکانی خۆی لەناو خەڵکدا بڵاو دەکاتەوە و کۆیلە و منداڵەکان هەڵیدەگرنەوە.

کەسرا وتی: ئەم پیاوە شیاوە گرنگی پێبدرێت. بیهێنن.

کاتێك هات، پێی وت: بەخششەکەی منت لەناو خەڵکاندا بڵاو کردەوە؟

وتی: پێویستم بەبەخششی پاشا نییە چونکە کێوەکانی سەرزەمینەکەم زێر و زیوە.

دەیویست بەمشێوەیە پاشا هانبدات چونکە هەستی بەگوێنەدانی ئەو کردبوو، زیادی کرد: هاتمە لای پاشا بەو مەبەستەی دەستی ستەم کورت کاتەوە و لەریسوایی رزگارم بکات.

کەسرا وتی: بمێنەرەوە تا لێکۆڵینەوە لەم کارە بکەم.

سەیف کوڕی زی یەزن لای پاشا مایەوە.

کەسرا سنورداران و راوێژکارانی کۆکردەوە و وتی: سەبارەت بەداوکاری ئەم پیاوە چی دەڵێن؟

یەك لەوان وتی: ئەی پاشا، لەزیندانەکانی تۆدا کەسانێك دەژین کەدەبێت بکوژرێن، ئەوانی لەگەڵدا رەوانە بکە، ئەگەر کوژران، بەمەبەستەکەی خۆت گەشتویت و ئەگەر دەستیان بەسەر وڵاتەکەی ئەواندا گرت، سنوری پاشایەتی خۆتت فراوان کردووە.

کەسرا وتی: بۆچونێکی راستە. پیاوەکانی ناو زیندانەکان ببژێرن.

کاتێك پیاوەکانیان بژارد، هەشتسەد کەس بوون.

کەسرا وتی: بزانن باشترینی زیندانییەکان لەروانگەی بنەماڵەوە کێیە. ئەو کەسە بکەنە سەرکردەی ئەوان.

هەرز لەهەموو زیندانییەکان خاوەن نەژادتر و پیاوێکی بەتەمەن بوو. ئەوی لەگەڵ سەیف رەوانە کرد و سەرکردایەتی بەو بەخشی. کەسەکانی سوار هەشت کەشتی کرد. هەر کەشتیەك سەد پیاوی لەسەر بوو. بەرێکەتن و دەریایان بڕی. دوو کەشتی و

سەرنشینەکانی لەدەریادا نوقم بوون. شەش کەشتی و سەرنشینەکانی گەشتنە کەنارەکانی یەمەن و سەرزەمینی عەدەن. هەزر و سەیف کوڕی زی یەزن لەناو ئەواندا بوون.

کاتێك لەسەرزەمینی یەمەن دابەزین، هەرز بەسەیفی وت: چیت هەیە؟

سەیف وتی: هەرچیت بوێت، پیاوی عەرەبی و ئەسپی عەرەبی، پیاوەکانی خۆم دەکەمە هاوەڵی شەڕکەرانی تۆ، یا پێکەوە دەمرین، یا سەرکەوتن بەدەست دێنین.

هەزر وتی: دادپەروەرییە.

سەیف تا ئەو جێگەی دەیتوانی، شەڕکەر و ئەسپی لەخەڵکەکەی خۆی کۆکردەوە. مەسروق کوڕی ئەبرەهە ئاگادار بوویەوە و سوپای حەبەشییەکانی ئامادە کرد. روبەروی ئەوان بوویەوە. کاتێك دوو سوپا لەیەك نزیك کەوتنەوە، هەزر کوڕەکەی خۆی بەناوی نەوزادی لەگەڵ چەند سوارێك رەوانە کرد و وتی: شەڕیان لەگەڵ بکە، تا بزانم شێوەی شەڕکردنیان چۆنە.

نەوزاد ڕۆشت و شەری دەستپێکرد. کەوتە شوێنێك کەنەیتوانی خۆی دەرباز بکات. حەبەشییەکان ئەویان کوشت. ئەمە کینەی هەزری زیاد و بۆ شەڕ کردن زیاتر پێداگری کرد. کاتێك شەڕکەران بۆ شەڕ ریزیان بەست، هەزر وتی: پاشاکەی ئەوانم نیشان بدەن.

وتیان: ئەو پیاوەی لەسەر فیل دانیشتووە و تاجی لەسەردایە وياقوتێکی سور بەناوچاویەوەیە، دەبینی؟

وتی: بەڵێ.

وتیان: ئەوە پاشاکەیانە.

وتی: با پاشا بێت.

ماوەیەك وەستان. هەزر وتی: ئێستا لەسەر چی دانیشتووە؟

وتیان: سواری ئەسپ بووە.

وتی: با سوار بێت.

ماوەیەکی دیکە وەستان، هەزر وتی: ئێستا لەسەر چی دانیشتووە؟

وتیان: سوار ئێستر بووە.

وتی: کوڕی کەر! ریسوا بوو و پاشایەتییەکەی بەهەمان شێوە. گووێ بگرن،

ئێستا تیرێکی بۆ دەهاوم. ئەگەر بینیتان هاوەڵانی وەستان و جووڵە ناکەن، جووڵە مەکەن و بزانن تیرەکەی منی بەرنەکەوتووە. ئەگەر بینیتان لەدەوری ئەو کۆبونەتەوە، دڵنیا بن تیرەکەی منی بەرکەوتووە و هێرش دەست پێبکەن.

تیری خستە کەوان. وەك وتوویانە، کەوانەکەی بەرادەیەك سەخت بوو کەس نەیدەتوانی بیکێشێت. برۆکانیان بەستەوە. تیرەکەی خستە کەوان و رایکێشا و بەرەڵای کرد. بەر یاقوتەکەی ناوچاوی مەسروق کەوت و لەسەری چەقی و لەپشت سەریەوە هاتەدەر. لەئێسترەکەی کەوتەخوار. حەبەشیەکان لەدەوری ئەو کۆبونەوە و فارسەکان هێرشیان کرد. شکست لەناو حەبەشیەکان بڵاوبوویەوە و کەسانێکی زۆریان لێکوژرا. پاشماوەی سوپاکەیان هەڵات.

هەزر مەبەستی رۆشتن بۆ سەنعای کرد. کاتێك گەیشتە شارەکە وتی: هەرگیز ئاڵای من بەنزمی ناڕواتە ناو ئەو شارە، دەروازەکان بشکێنن. دەروازەی سەنعایان وێران کرد و بەئاڵای شەکاوە ڕۆشتە ناو شارەکە. ئاڵاکەیان لەپێش خۆیەوە دەبرد.

کاتێك هەزر بەسەر یەمەندا زاڵبوو و حەبەشیەکانی دەرپەڕاند، نامەی بۆ کەسرا نووسی: یەمەنم خستە ژێر دەسەڵاتی خۆمەوە و حەبەشیەکانم دەرپەڕاند. سامانێکی زۆری بۆ ڕەوانە کرد. کەسرا نامەی بۆ نووسی: سەیف کوڕی زی یەزن بکەرە پاشای یەمەن و باج و خەراجی لەسەر دیاری بکە تا ساڵانە رەوانەی بکات. فەرمانی گەڕانەوەی بەهەزردا. سەیف پاشایەتی یەمەنی گرتەدەست چونکە باوکی زویەزن یەکێك بوو لەپاشاکانی یەمەن.

حەدیسی کوڕی ئیسحاق سەبارەت بەحەمیریەکان و حەبەشیەکان و پاشاکانیان و ئەو سوپایەی کەسرا رەوانەی کرد، بەمشێوە بوو.

هوشام کوڕی محەممەدی کەلبی سەبارەت بەپاشایەتی یەکسوم و مەسروق، کوڕەکانی ئەبرەهە دەڵێت: داستانەکە بەم شێوەیە: باوکی مورە فەیاز زو یەزن، یەکێك بوو لەگەورەکانی یەمەن و ریحانە کچی زو جەزن هاوسەری بوو. کوڕێکی هێنایە دنیا و ناوینا مەعدیکەرب. ریحانە ژنێکی خاوەن جەماڵ بوو. ئەبرەهە ئەوی لەباوکی مورە داگیر کرد و کردی بەهاوسەری خۆی. باوکی مورە یەمەنی بەجێهێشت و ڕۆشتە لای یەکێك لەپاشاکانی مناڵەکانی مونزەر کەوەك دەڵێن عەمرۆ کوڕی هیند بوو. داوای لێکرد نامەیەك بۆ کەسرا بنووسێت و ئاماژە بەرێز و گەورەیی ئەو بدات و بڵێت بەچ

مەبەستێك ڕوودەكاتە بارەگاكەی.

عەمرۆ وتی: پەلە مەكە. من ساڵانە دەڕۆمە لای پاشا. بەم نزیكانە بەرێدەكەوم.

باوكی موڕە لای ئەو مایەوە و لەگەڵ ئەو بەرەو دەرگای كەسرا بەرێكەوت.

عەمرۆ كوڕی هیند ڕۆشتە لای كەسرا و ئاماژەی بەگەورەیی زو یەزندا و داوای مۆڵەتی بۆ كرد. زو یەزن ڕۆشت و عەمرۆ جێگەی بۆ چۆڵ كرد. كەسرا لەكرداری ئەو گەورەیی زو یەزنی بۆ دەركەوت. ڕێزی لێگرت. دڵنەوایی دایەوە، وتی: نیازەكەی خۆت باس بكە.

زو یەزن وتی: ئەی پاشا، ڕەشەكان بەسەر وڵاتی ئێمەدا زاڵبوون و كارە قێزەونەكان ئەنجام دەدەن كە لەئێستادا ناتوانم ئاماژەیان پێبدەم. شیاو بوو بۆ پاشا بێ ئەوەی داوای هاوكاری لێبكەین، هاوكاریمان بكات. هیوادار هاتووین و هیوادارین خواوەند، بەهاوكاری پاشا، دوژمنەكەمان لەناو ببات و سەركەوتنمان پێببەخشێت و تۆڵەمان بستێنێتەوە. ئەگەر پاشا مەبەستی ئەوەی هەیە ئاواتەكەمان بێنێتەدی، سوپایەك لەگەڵ مندا ڕەوانە بكات تا دوژمن لەسەرزەمینەكەمان دەربەرێنێت و سنوری پاشایەتی خۆی فراوان بكات چونكە داهاتی دیارەكەمان فراوانە و هاوشێوەی ویلایەتەكانی دیكەی عەرەب لەسنوری فەرمانڕەوایەتی پاشادا نییە.

كەسرا وتی: دەزانم سەرزەمینەكەی تۆ داهاتی فراوانە. كام نەتەوەی ڕەش پێست بەسەر ئێوەدا زاڵبوون، حەبەشە یا سند؟

زو یەزن وتی: حەبەشە.

ئەنەوشیروان وتی: دەمەوێت ئاواتەكەت بێنمەدی، بەڵام ڕێگەی سوپا تا سەرزەمینەكەی تۆ دژوارە و پەسەندی ناكەم سوپاكەم بخەمە مەترسییەوە. بیر لەداواكارییەكەی تۆ دەكەمەوە. بەخێر بێیت.

فەرمانیدا ماڵی پێبدەن و ڕێزی بگرن. لای كەسرا مایەوە تا ئەو كاتەی مرد.

زویەزن قەسیدەیەكی بەزمانی حەمیری هۆنییەوە و وەسفی كەسرای كرد. كاتێك وەریانگێڕایەوە، كەسرا پەسەندی كرد.

دەڵێت: ڕێحانە كچی زوجەدن، كوڕێكی بۆ ئەبرەهە هێنایە دنیا و بەمەسروق ناویان برد. مەعدیكەرب كوڕی زویەزنی گەورە بوو و باوەڕی نەدەكرد ئەبرەهە باوكی بێت. ڕۆشتە لای دایكی وپرسیاری كرد: باوكی من كێیە؟

دایکی وتی: ئەشرەم.

وتی: سوێند بەخوا راست نییە. ئەگەر باوکی من دەبوو، فلآن کەس جوێنی پێنەدەدام.

دایکی پێی وت: باوکی تۆ باوکی مورە فەیازە. داستانەکەی بۆ باس کرد. قسەکانی کاریگەری لەسەر کوڕەکەی دانا. بەمشێوەیە مایەوە تا ئەو کاتەی ئەشرەم و کوڕەکەی یەکسوم مردن. کوڕی زویەزن رووی کردە دەرباری پاشای رۆم لەبەر ئەوەی کەسرا کەمتەرخەمی لەداواکارییەکەی باوکی کرد بەلاّم لەوێیش بەمەبەستەکەی خۆی نەگەشت چونکە هاودینی حەبەشیەکان و پشتیوانی لێدەکردن. دوبارە روی کردە کەسرا. رۆژێك کەسرا ڕۆشتەدەر، لەسەر رێگەکەی وەستا و وتی: ئەی پاشا، من لای تۆ میراتێکم هەیە.

پاشا وەستا. بانگی کرد و وتی: کێیت و میراتەکەی تۆ چییە؟

وتی: کوڕی زو یەزن، ئەو پیرەپیاوە یەمەنییەم کەبەڵێنی هاوکاریت پێدا و لەولآتەکەی تۆ سەرینایەوە. بەڵێنەکەی تۆ، میراتی منە و دەبێت بەڵێنەکەت بێنیتەدی.

کەسرا بەزەیی پێیادا هاتەوە و فەرمانیدا سامان و ماڵی پێببەخشن. کوڕەکە ڕۆشتەدەر و درەمەکانی لەناو خەڵکدا بلآو کردەوە. خەڵك درەمەکانیان کۆدەکرەوە و دەیانرفاند. کەسرا پەیامی بۆ نارد: بۆ ئەو کارە دەکەیت؟

وەلاّمی دایەوە: بۆ بەدەست هێنانی سامان نەهاتووم، داوای سوپا دەکەم.

کەسرا وەلاّمی بۆنارد: بمێنەرەوە تا لێکۆڵینەوە بکەم.

کەسرا سەبارەت بەرەوانە کردنی سوپا راوێژی کرد.

موبد وتی: ئەی پاشا، ئەو کۆیلەیە مافێکی هەیە، باوکی لەبەردەرگای پاش مرد چونکە بەڵێنت پێدا. زیندانەکان پڕن لەپیاوی ئازا و دلێر و دەتوانی لەگەڵ ئەو رەوانەیان بکەیت. ئەگەر سەرکەوتن بەدەست بێنن، سنوری پاشایەتی تۆ فراوان دەبێت و ئەگەر بکوژرێن، لەدەست ئەوان رزگار بوویت و خەڵکی ولآتەکەیشت ئاسودە دەبن. پاداشتی ئەمە زانراوە.

کەسرا وتی: بۆچونێکی راستە.

فەرمانیدا و پیاوەکانی ناو زیندانەکانیان کۆکردەوە. هەشتسەد کەس بوون. یەکێك لەسوارچاکەکانی کردە فەرماندەی ئەوان بەناوی وەهرز. کەسرا ئەوی بەبەرابەر

لەگەڵ هەزار پیاو دەزانی. کەرەستەی شەڕی پێدان و ئەوانی سوار هەشت کەشتی کرد. هەر سەد کەس، سوار یەک کەشتی بوو. دو کەشتی لەدەریادا نوقم بوون و شەش کەشتی لەکەنارەکانی حەزەرمەوت لەنگەریان گرت. مەسروق لەگەڵ سەد هەزار کەس لەحەبەشیەکان و حەمیر و عەرەبەکان رووبەروویان بوویەوە. زۆر لەخەڵکان پەیوەستی کوڕی زویەزن بوون. وەهرەز لەکەنارەکان جێگر بوو و پشتی کردە دەریا.

کاتێک مەسروق ژمارەی کەمی ئەوانی بینی، چاوی تەماحی تێبڕین. کەسی بۆ لای وەهرز رەوانە کرد: بەم سوپا کەمە بۆ هاتوویت؟ ژمارەی سوپاکەی من بەوئەندازەیە دەیبینیت. خۆت و هاوەڵانت روبەرووی مەترسی کردۆتەوە. ئەگەر بخوازیت مۆڵەتت پێدەدەم بۆ سەرزەمینەکەی خۆت بگەڕێیتەوە و شەڕت لەگەڵ ناکەم. هیچ کام لەئێوە زیانتان بەرناکەوێت و ئەگەر دەتەوێت شەڕ دەستپێدەکەم. ئەگەر دەخوازیت مۆڵەتت پێدەدەم تا لەبارودۆخی خۆت ورد ببیتەوە و راوێژ لەگەڵ سوپاکەت بکەیت.

وەهرز کارەکەی بەگەورە و دژوار بینی. زانی سوپاکەی ناتوانێت خۆڕاگری بکات. پەیامی بۆ مەسروق رەوانە کرد: لەنێوان خۆم و خۆت کاتێک دیاری بکە. بەڵێن بدە شەڕ نەکەین تا ماوەیەک تێپەڕێت و لەکارەکانی خۆمان بڕوانین.

مەسروق ئەو کارەی کرد. هەرکام لەئۆردووگاکانی خۆیان مانەوە. کاتێک دە رۆژ بەسەر وادەی دیاریکراو تێپەڕی، کوڕی وەهرز سوار ئەسپەکەی خۆی لەسوپای حەبەشیەکان نزیک کەوتەوە. ئەسپەکەی ئەوی بردە ناو ئۆردوگای ئەوان و کوشتیان. وەهرز ئاگادار نەبوو. کاتێک لەکوژرانی کوڕەکەی ئاگادار بوویەوە، کەسی بۆ لای مەسروق رەوانە کرد لەنێوان ئێمەدا پەیمانێک بوو. بۆچی کوڕەکەی منتان کوشت؟

مەسروق وەڵامی دایەوە: کوڕەکەی تۆ هێرشی کردەسەر ئێمە. هاتە ناو ئۆردوگاکەمان و چەند کەسێک لەشەڕکەران هێرشیان کردەسەر و خوێنیان ڕشت. من بەکوشتنی ئەو رازی نەبووم.

وەهرز بەنێردراوی وت: ئەو کوڕی من نەبوو، زیناڕادە بوو. ئەگەر کوڕی من دەبوو، چاوەڕوانی دەکردە پیشە و خیانەتی نەدەکرد تا کاتی دیاریکراو لەپەیمانەکە بەسەر بچێت. فەرمانیدا و جەستەی کوڕەکەیان لەشوێنێک دانا کەدەیتوانی بیبینێت. سوێندی خوارد شەراب نەخواتەوە و رۆن لەسەری نەدات تا کاتی دیاریکراو لەپەیمانەکە بەسەر بچێت. کاتێک یەک رۆژ بۆ کۆتایی کاتەکە مایەوە، فەرمانیدا

کەشتی و هەموو بارەکانی ناو کەشتییەکانیان سوتاند. فەرمانیدا جگە لەجل و بەرگەکانی بەریان، هەموو شتێك بسوتێنن.

فەرمانیدا هەموو خواردنییەکانیان هێنا. بەهاوەڵانی خۆی وت:

لەم خواردنانە بخۆن. خواردیان و کاتێك تێر بوون، فەرمانیدا و خواردنەکەیان کردە ناو دەریا.

وتارێکی پێشکەش کرد و وتی: کەشتیەکانم سوتاند تا بزانن هەرگیز رێگەی گەڕانەوەتان نییە، جلەکانتانم سوتاند تا ئەگەر حەبەشیەکان سەرکەوتن، جلەکانتان نەبێتە هی ئەوان. خواردنەکانم کردە ناو دەریا تا بزانن تەنانەت بەشی یەك رۆژ خواردنتان نییە. ئەگەر پیاون، شان بەشانی من شەڕ بکەن و خۆڕاگر بن. ئەگەر ناتانەوێت شەڕ بکەن، پێم بڵێن تا بەم شمشێرە خۆم بکوژم چونکە هیچ کات خۆم تەسلیمی ئەوان ناکەم. کاتێك من سەرکردەی ئێوەم و ئەو کارە دەکەم، ئێوە چیتان بەسەر دێت.

وتیان: شان بەشانی تۆ شەڕ دەکەین، یا دەمرین یا سەرکەوتن بەدەست دێنین.

بەرەبەیانی رۆژی دیاریکراو، وەهرز هاوەڵانی خۆی رازاندەوە. پشتی کردە دەریا و خەڵکەکەی بۆ شەڕێکی بوێرانە هاندا، وتی: یەکێك لەم دو بەهرەتان پێدەبڕێت: یا بەسەر دوژمندا سەردەکەون یا وەك پاڵەوانەکان دەکوژرێن. کەوانەکانیان ئامادە کرد و وتی: کاتێك فەرمانی تیرهاویشتنم دەرکرد، پێکەوە تیر بهاون. خەڵکی یەمەن پێشتر تیر و کەوانیان نەبینیبوو.

مەسروق لەگەڵ دەستەیەك کەئەم لاولاکەی دیار نەبوو، دەرکەوت. سوار لەسەر فیل و تاجی لەسەردا بوو. یاقوتێکی سوری بەناوچاویەوە هەڵواسیبوو بەگەورەیی هێلکەیەك. هیچ لەمپەرێکی بۆ سەرکەوتن نەدەبینی.

وەهرز بەجوانی نەیدەدی، وتی: گەورەکەیان نیشانی من بدەن.

وتیان: ئەو کەسەیە لەسەر فیل دانیشتووە.

ماوەیەك دواتر مەسروق دابەزی و سوار ئەسپ بوو. بەوەهرزیان وت سوار لەسەر ئەسپە. وتی بڕۆکانی من بەرز بکەنەوە چونکە لەبەر پیری بڕۆکانی کەوتبوە سەرچاوانی. بڕۆکانی ئەویان بەرز کردەوە.

تیرێکی دەرهێنا و خستیە ناو کەوان، وتی: مەسروق نیشانە بکەن. نیشانەیان

کرد. فەرمانی تیر هاویشتنی دەرکرد. کەوانەکەی خۆی راکێشا و تیری هاویشت. تیرەکە ڕۆشت هاوشێوەی بەچکە ئاسکێکی تیژپێ. بەرناوچاوی مەسروق کەوت، لەئەسپەکەی کەوتەخوار. لەو تیرهاویشتنەدا، ژمارەیەکی زۆر لەسوپای دوژمن کوژران. حەبەشیەکان کاتێك بینیان پاشاکەیان کوژراوە، ریزیەکانیان شلەژا و شکستیان خوارد. وەهرز فەرمانیدا لەوساتەدا جەستەی کوڕەکەی بەخاك بسپێرن و جەستەی مەسروق بخەنە شوێنی جەستەکەی. تالآنییەکانی ئوردوگای مەسروقیان کۆکردەوە. سوارکارە فارسەکان پەنجا پەنجاو شەست شەشت، ئەسیریان دەگرت و روبەروی بەرگری و خۆڕاگری نەدەبوونەوە.

وەهرز وتی: دەست لەحەمیری و عەرەبەکان هەڵبگرن. تەنیا ڕەشەکان دیل و کوشتار بکەن. یەك کەس لەوان بەزیندوویی مەهێڵنەوە. یەکێك لەعەرەبەکان سوار لەسەر وشترەکەی خۆی هەلآت. شەو و رۆژێك وشترەکەی غاردا، لەکیسەکەی خۆی تیرێکی بینی، وتی: دایك حیز، ئەم هەموو رێگەیە هاتوویت؟ گومانی کرد تیرەکە شوێنی کەوتووە.

وەهرز ڕۆشتە ناو سەنعا و بەسەردیاری یەمەندا زاڵبوو. کاربەدەستانی خۆی بۆ ویلایەتەکان رەوانە کرد. باوکی ئومەییە کوڕی باوکی سەڵتی سەقەفی سەبارەت بەداستانی کوڕی زویەزن و وەهرز هۆنراوەیەکی هەیە بەم ناوەرۆکە:

دەبێت کەسێك وەك کوڕی زویەزن بەدوای تۆڵەوە بێت.
بۆ تۆڵە سەندنەوە چەندین ساڵی لەدەریا بەسەر برد
کاتێك ریسوا ببوون، رووی لەهێرقل کرد و هیچی دەستنەکەوت
دوای حەوت ساڵ ڕۆشتە لای کەسرا
رێگەیەکی درێژی بڕی.
پیاوە ئازاکانی لەگەڵ خۆی هێنا
بەراستی بۆ سەرزەمینێکی دوور ڕۆشت
کەس بۆ ئەو وەك کەسرا، شای شاکان نەبوو
یا هاوشێوەی وەهرز کەلەرۆژی شەڕ هێرشی برد
خوا پاداشتی چاکەیان بداتەوە ئەو شەڕکەرانەی کەهاتن
لەنێوان خەڵکان کەس وەك ئەوان نابینیت

سالار و چاکەکار و جوان روخسار و سنوردارن
شێرن و لەناو دارستانەکان منالٚ بەخێو دەکەن
بەشێوەیەك تیر دەهاوێژن وەك دەڵێی هەورەکانە
کەبەچڕی و بەخێرایی بەرەو مەبەست دەڕوات
شێرانت بۆ لای سەگە ڕەشەکان رەوانە کرد
پاشماوەکەیان لەسەر زەوی بلاٌو بوونەوە
بخۆرەوە و تاجی پاشایەتیت پیرۆز بێت
لەسەرەوەی کۆشك غەمدان بحەسێرەوە
خۆشی بکە چونکە دوژمنەکەت ریسوا بوو
لەناو ماڵەکەی خۆت بیٚ ترس رابوێرە
چاکە ئەمەیە نەك دو کاسەی دارینی شیر
کەتێکەلٚ بەئاویان کردبێت و هاوشێوەی گمیز بێت.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك وەهرز بۆ لای کەسرا گەڕایەوە و سەیفی کردە پاشای یەمەن، هێرشی کردە سەر حەبەشیەکان و کوشتاری ئەوانی دەستپێکرد. سکی ژنەکانی هەڵدەدڕی تا منالەکان بکوژێت. هەموویانی لەناو برد جگە لەدەستەیەکی کەم کەئەوانی کردە بەندەی خۆی. چەندین کەسی لەوان کردە راکەڕ تا بەڕمەکورتەکان لەپێش خۆیەوە رابکەن. ماوەیەکی نەزۆر درێژ بەمشێوەیە پاشایەتی کرد. رۆژێك کە لەناو راکەڕاندا بوو، بەڕم لێیاندا و کوشتیان. یەکێك لەحەبەشیەکان دژی ئەوان شۆڕش و خەڵکانی زۆری کوشتار کرد. گەندەڵکاری نایەوە. کاتێك ئەم هەواڵە بەکەسرا ئەنەوشیروان گەیشت، وەهرزی بەسوپایەکی چوارهەزار کەسی رەوانە کرد و فەرمانی پێدا: هەرچی ڕەش و دووڕەگە لەیەمەندا هەیە، بچوك یا گەورە، بیانکوژێت. هەرکەس قژی لوول و بەڕەچەڵەك بۆ ڕەشەکان دەگەڕێتەوە، نابێت زیندووو بێت.

وەهرز بەرێکەوت و ڕۆشتە ناو یەمەن. فەرمانەکانی کەسرای ئەنجامدا وهەموو حەبەشیەکانی ئەو سەرزەمینەی کوشت. روداوەکانی بۆ کەسرا نوسی. کەسرا ئەوی کردە کاربەدەستی خۆی لەیەمەن. وەهرز لەوێوە باج و خەراجی بۆ کەسرا رەوانە دەکرد تا ئەو کاتەی مرد. دوای ئەو کەسرا، فەرمانڕەوایەتی بەمەرزبان کوڕی وەهرز

بەخشی. ئەویش ماوەیەك فەرمانڕەوایەتی كرد و مرد. كەسرا دوای ئەو فەرمانڕەوایەتی بە بینگان كوڕی مەرزبان بەخشی. ئەویش دوای ماوەیەك فەرمانڕەوایەتی، مرد. كەسرا فەرمانڕەوایەتی بە خەرخەسرە كوڕی بینگان كوڕی مەرزبان كوڕی وەهرز سپارد. بەڵام كەسرا دواتر لێی توڕە بوو. سوێندی خوارد دەبێت خەڵكانی یەمەن لەسەر شان بیهێنن. ئەو كارەیان كرد و كاتێك گەیشتە لای كەسرا، یەكێك لەگەورەكانی فارس ئەوی بینی و شمشێرێكی باوكی كەسرای لەكەمەر بەست. كەسرا لەبەر شمشێرەكە لەكوشتنی خۆش بوو بەڵام لەسەر كار لایبرد. بازانی بۆ یەمەن ڕەوانە كرد. بازان لەیەمەن مایەوە تا ئەو كاتەی خواوەند، پێغەمبەری ڕەوانە كرد.

دەڵێن: لەنێوان كەسرا ئەنەوشیروان و یەختیانوس پاشای ڕۆم، ئاشتی سەقامگیر بوو بەڵام لەنێوان خالید كوڕی جەبەلە كەیەختیانوس ئەوی كردبووە پاشای عەرەبەكان و شام، و مونزەر كوڕی نەعمان كە لەهۆزی لەخم و بەنوێنەرایەتی كەسرا ئەنەوشیروان فەرمانڕەوایەتی عەمان و بەحرەیین و یەمامە و تاییف و حیجاز و عەرەبەكانی ئەو سنورەی دەكرد، ئاژاوە و دژایەتی ڕوویدا. خالید كوڕی جەبەلە هێرشی كردەسەر سنورەكانی مونزەر و كەسانێكی زۆری لەسوپاكەی ئەو كوشت و سامانی ئەوانی تالأن كرد. مونزەر لای كەسرا سكاڵای كرد و داوای لێكرد نامە بۆ پاشای ڕۆم بنووسێت تا دادی ئەو لەخالید وەربگرێت. كەسرا نامەی بۆ یەختیانوس نووسی و پەیمانەكەی نێوانیانی بیرخستەوە و ئەوی لەكارەكانی خالید كوڕی جەبەلە ئاگادار كردەوە. داوای لێكرد فەرمان بەخالید بدات ئەوەی لەسنوورەكانی مونزەر، تالأنی كردووە، بگەڕێنێتەوە و خوێنبایی عەرەبە كوژراوەكان بدات و دادی خالید وەربگرێت و نامەكەی پشتگوێ نەخات چونكە جیاواز لەم شێوە پەیمانی ئاشتی نێوانیان دەشكێنێت. چەندین نامەی دیكەی لەمبارەوە بۆ یەختیانوس نووسی بەڵام یەختیانوس گرنگی پێنەدا.

كەسرا خۆی ئامادە كرد و لەگەڵ نەوەد و چەند هەزار شەڕكەر هێرشی كردە سەر سنورەكانی یەختیانوس. شاری دارا و ڕەها و مەنبەج و قێنسرین و حەلەب و ئەنتاكیەی گرت كە لەبەناوبانگترین شارەكانی شام بوون. هەروەها فامیە و حمس و زۆر لەشارەكانی نزیكی ئەم شارانەی بەزۆر داگیر كرد. سامانەكانی تالأن و ژن و

منداڵەکانی ئەسیر کرد. هەموو دانیشتووانی ئەنتاکیە دیل کران و بۆ شاری سواد کۆچیان پێکرا. فەرمانیدا لەنزیک شاری تیسبون شارێکی هاوشێوەی ئەنتاکیە دروست بکەن، بەهەمان شێوە کەپێشتر ئاماژەم پێدا، خەڵکی ئەنتاکیەی لەوێ نیشتەجێ کرد. ئەو شارەیە بەرۆمیە ناوی دەبەن. رۆمیەی کردە ویلایەتێك و بۆ پێنج ناوچە دابەشی کرد: ناوچەی نەهرەوانی سەرو، ناوچەی نەهرەوانی ناوەڕاست، ناوچەی نەهرەوانی خواروو، ناوچەی بادرایا و ناوچەی باکسایا. رۆژی بۆ ئەو ئەسیرانە دیاری کرد کە لەئەنتاکییەوە هاتبوون. یەکێك لەمەسیحیەکانی ئەهوازی بەناوی بەراز کردە لێپرسراوی کاروباری ئەوان. ئەم کارەی بۆ بەزەییهاتنەوەی بەئەسیرەکان کرد تا بەهۆی هاودینی ئەوان لەگەڵ بەراز رێگەی سازگاری بگرنەبەر.

یەختیانوس شارەکانی دیکەی شام و میسری لەکەسرا کرییەوە وبەهایەکی زۆری رەوانە کرد. بەڵێنیدا ساڵانە باج رەوانە بکات و کەسرا، چیتر هێرشی نەکردە سەر دیاری رۆم.

کەسرا لەمبارەوە نووسراوێکی نوسی. خۆی و گەورەکانی رۆم مۆریان کرد و ساڵانە باجیان رەوانە دەکرد.

پێش کەسرا ئەنەوشیروان پاشاکانی فارس، بەبەراوەرد بەئاوەدانی و ئاویاری هەر ویلایەتێك یەك لەسەر سێی خەراجیان وەردەگرت و لەویلایەتێکی دیکە یەك لەسەر چوار و لەویلایەتێکی دیکە یەك لەسەر پێنج و لەیەکیتر یەك لەسەر شەش و باج ژمارەیەکی دیاریکراو بوو. پاشا قوباد کوڕی فیروز لەکۆتاییەکانی پاشایەتی خۆی وتی تا زەمین لەدەشت و کێو بپێون تا خەراجەکەی دیاریکراو بێت بەڵام قوباد پێش ئەوەی کاری پێوانی زەوی و زارەکان کۆتایی پێبێت، ماڵئاوایی لەجیهان کرد.

کاتێك کەسرا کوڕی قوباد پاشایەتی گرتەدەست، فەرمانیدا کارەکە تەواو بکەن و دارخورما و زەیتون و سەرەکان بژمێرن.

دواتر بەدەبیرەکانی خۆی وت تا کورتەی ئەوە بخەملێنن. خوانێکی گشتی ئامادە کرد و فەرمانی بەدەبیری خەراجدا ئەوەی سەبارەت بەبەرهەمی زەمین و ژمارەی دارخورماکان و زەیتون و سەرەکان بەدەستی گەشتووە، بخوێنێتەوە و خوێندیەوە.

کەسرا وتی: دەمانەوێت بۆ هەر جەریبێك دارخورما و زەیتون و بۆ هەر سەرێك خەراجێکی دیاریکراو دەستنیشان بکەین و فەرمان بدەین تا بە سێ بەش لەساڵدا

وەریبگرن و لەخەزێنەی دارایی ئێمەدا کۆبێتەوە. ئەگەر لەیەکێك لەسنورەکان یا یەکێك لەویلایەتەکان ناکۆکی دروست بوو کەپێویستمان بەروبەڕوو بوونەوە یا کۆتایی هێنان بەو ناکۆکییە پەیا کرد، سامانی پێویستمان لەبەردەستا بێت و چیتر نیازە بەوەرگرتنی خەراج نەبێت. بۆچونی ئێوە سەبارەت بەم کارە چییە؟

هیچکەس لەئامادەبووان بۆچوونی خۆی دەرنەبڕی. کەسرا سێ جار وتەکانی دوبارە کردەوە. یەکێك لەناو ئەوان هەستا و وتی: ئەی پاشا، خواوەند تەمەنی درێژت پێببەخشێت، چۆن دەتوانرێت بۆ کەسێك کەبمرێت وبەرهەمێك کەلەناو بچێت و روبارێك کەوشك بکات و کانی یا کارێزێك کەئاوی تیا نەمێنێت، باجێکی دیارکراو دادەنرێت؟

کەسرا وتی: ئەی پیاوی شووم، لەچ چینێکی خەڵکانیت؟

وتی: لەدەبیرەکان.

کەسرا فەرمانیدا: بەدەواتەکان ئەشکەنجەی بدەن تا دەمرێت.

دەبیرەکان ئەو کارەیان کرد تا لەبەرچاوی کەسرا بێزاریان لەبۆچونەکەی ئەو دەربڕیبێت.

کەسرا چەند کەسێك لەخاوەن بۆچوونە بیرمەندەکانی هەڵبژارد و فەرمانی پێدان لەرووبەری زەوی و ژمارەی دارخورما و زەیتوون و مرۆڤەکان لێکۆڵینەوە بکەن و بەهەمان ئەندازە کەبەرژەوەندی ژێردەستەکان و ئاسایشی ئەوان پێویست دەکات، خەراج دەستنیشان بکەن و لەکارەکانی خۆیان ئاگاداری بکەنەوە. هەرکام لەوان بۆچوونی خۆی سەبارت لەئەندازەی خەراج وت و بڕیاریاندا بۆ بژێوی مرۆڤەکان و بەروبوومەکان کەگەنم و جۆ برنج و ترێ و سەوزە و خورما و زەیتونە، خەراج دیاری بکەن. بۆ هەر جەریبێك رەز، هەشت درەم و بۆ هەر جەریبێك سەوزە، حەوت درەم، لەهەر چوار دارخورمایەکی پارسی، یەك درەم، لەهەر شەش دارخورمای ئاسای یەك درەم و لە هەر شەش دارزەیتون یەك درەم. خەراجیان لەسەر باخەکانی دار خورما دانا نەك لەسەر دارخورماکان. جگە لەم حەوت بەرهەمە، بەرهەمەکانی دیکەیان لەبەرچاو نەگرت و خەڵك لەبەدەست هێنانی بژێوی بەهێزتر بوون.

بۆ هەموو خەڵکان خەراجێکی ساڵانەیان دیاری کرد جگە لەئەندامانی بنەماڵە گەورەکان و شەڕکەران و هیربودان و دەبیران و ئەو کەسانەی خزمەتی پاشایان دەکرد.

ئەوانیان کردە چەند چین. دوانزە درەم و هەشت درەم و شەش درەم و بەئەندازەی هەژاری و بێ نیازی. بۆکەسانی خوار تەمەن بیست ساڵ و سەروتر لەپەنجا ساڵ خەراجیان دیاری نەکرد.

کەسرایان لەچۆنییەتی وەرگرتنی خەراج ئاگادار کردەوە. پەسەندی کرد و فەرمانی جێبەجێ کردنیدا تا ساڵانە سێ قیست وەربگرن و هەر قیستێك لەماوەی چوار ساڵ و بە((ئەبر ئەسیار)) ناوی برد یانی ئەو کارەی لەسەری رێککەوتوون.

عومەر کوڕی خەتاب کاتێك دەستی بەسەر دیاری فارسەکاندا گرت، بەمشێوەیە خەراجی وەردەگرت و فەرمانیدا لە((ئەهلی زەممە)) ((ئەوانەی بەڵێنیان داوە)) خەراج وەربگرن. هەروەها لەسەر زەوییە بایرەکان ((چۆڵ)) هاوشێوەی زەوییە کشتوکاڵییەکان خەراجی دیاریکرد. لەسەر هەر جەریبێك گەنم یا جۆ یەك پێوانە یا دوپێوانەی دیاریکرد. رۆژی سوپای لەمرێگاوە بەدەست دەهێنا. لەعێراق سەبارەت بەخەراجی زەوی و دارخورما و زەیتون شێوازی کەسرای بەکار نەبرد و ئەوەی کەسرا بۆ بژێوی کەسەکان دیاریکردبوو، لایبرد.

کەسرا فەرمانیدا تا لەنووسراوەکانی ئەو چەندین نوسخە ئامادە بکەن. نوسەخەیەکی لەدیوان دانا و نوسخەیەکی بەکاربەدەستانی لێپرسراوی وەرگرتنی خەراجدا تا لەرووییەوە خەراج وەربگرن. نوسخەیەکی بۆ داوەرەکانی ویلایەتەکان رەوانە کرد و فەرمانیدا رێگەنەدەن کاربەدەستانی وڵات زیاتر لەو بڕەی لەنوسراوەکەدا دەستنیشانکراوە، خەراج لەخەڵکان وەربگرن.

فەرمانیدا هەرکەس بەروبوومە کشتوکاڵییەکانی زیانی پێبگات، بەئەندازەی بەلاً و زیانەکەی لەخەراجەکەی کەم بکەنەوە. هەرکەس لەخەڵکان کەمرد یا تەمەنی لەپەنجا تێپەڕی کرد، باجی لەسەر هەڵبگرن. ئاگاداری بکەنەوە تا فەرمانی پێویست بەکاربەدەستەکانی خۆی بدات و رێگە نەدات لەکەسانی خوار تەمەن بیست ساڵ خەراج وەربگرن.

کەسرا یەکێك لەدەبیرەکانی بەناوی بابەك کوڕی پەیرەوان کەکەسێکی لێهاتوو و شیاو بوو، وەك لێپرسراوی دیوانی سوپا دەستنیشان کرد. بابەك بەکەسرای وت: کاری من راست و بەهێز نابێتەوە مەگەر ئەوەی لەمپەر لە پێش هەر کێشەیەك لابرێت کەبەرژەوەندی وڵاتی بەدواوەیە. کەسرا رازی بوو.

بابەك فەرمانیدا تا لەو شوێنەوەی سەیری سوپاکەیان دەکرد، سەکۆیەکەیان دروست کرد. فەرشێکی گرانبایی راخست و جامێکی پەشمینی دابەسەریا. پشتییەکانیان بۆ پاڵدانەوەی ئەو ئامادە کرد. لەسەر فەرشەکە دانیشت. جارچی ئەو لەناو سوپادا جاڕیدا سوارەکان بەئەسپ و کەرەستەی شەڕ و پیادەکان شمشێر بەدەست بێن. سوپا بەهەمان شێوە کەفەرمانیدابوو، هات بەلاّم کەسرای لەناو ئەواندا نەبینی. فەرمانی ڕۆشتنی پێدان.

ڕۆژی دووەم جارچی وتارەکەی دوبارە کردەوە و سوپا هات. کاتێك کەسرای لەناو ئەواندا نەبینی، فەرمانی ڕۆشتنی پێدان و ڕۆژێکی دیکە هاتن وبەجارچییەکەی خۆی وت جار بدات: کەس لەسوپا و ئەوەی تاج و تەختی هەیە، دوا نەکەوێت چونکە سازان لەم کارەدا نییە. کەسرا ئاگادار بوویەوە، تاجی لەسەرنا و شمشێری لەکەمەر بەست و هاوریٚ لەگەڵ سوپاکە ڕۆشتە لای بابەك. کەرەستەی شەڕی سوارەکان زریٚ و ئانیشك بەند و شمشێر و ڕم و قەڵغان و پشتێن و تەور و تیروکەوان و سی تیر و دوو زێی کەوان کەبەشانیانەوە هەڵواسرا بوو.

کەسرا ئامادە و تەیار ڕۆشتە لای بابەك جگە لەدوو زیٚ هەڵواسراوەکە. بابەك خەتی بەناوەکەیدا نەهێنا و وتی: ئەی پاشا، ئێرە، شوێنی دادپەروەرییە و هیچ سازانێك لەگۆڕدا نییە، هەموو کەرەستەکانی شەڕ لەگەڵ خۆت بێنە.

کەسرا دو زێی هێنا و بەشانییەوە هەڵیواسی. جارچی جاڕیدا و وتی: دلێر و سالاری دلێرەکان، چوار هەزار درەم و یەك درەم. خەتی بەناوەکەی ئەودا هێنا. کەسرا ڕۆشت. بابەك یەك درەم زیاتر لەهەموو شەڕکەرانی بەپاشا بەخشی.

کاتێك بابەك هەستا، ڕۆشتە لای کەسرا و وتی: ئەی پاشا، بۆ کردەوەکەی ئەمڕۆم، داوای لێخۆش بوون دەکەم. لەبەر ئەوە بوو تا ئەو کارەی بەمنت سپارد، ئەنجامی بدەم و ئەوی مەبەستی پاشا بوو، بێتەدی.

کەسرا وتی: هەر شتێك بەرژەوەندی خەڵك و ژێردەستانی بەدواوە بێت، بۆ ئێمە دژوار و ناخۆش نییە.

کەسرا هاوریٚ لەگەڵ یەکێك لەخەڵکانی یەمەن بەناوی سوفیان کوڕی مەعدیکەرب و بەوتەیەك سەیف کوڕی زویەزن سوپایەکی بۆ یەمەن رەوانە کرد. هەموو ڕەشپێستەکانیان لەو وڵاتـەدا کوشت و دەستیان بەسەر ئەووڵاتەدا گرت.

کاتێك دیاری یەمەن، کەوتە سنوری فەرمانڕەوایەتی کەسرا، یەکێك لەسەردارەکانی خۆی بەسوپایەکی گەورە بۆ سەرندیبی هیند رەوانە کرد کەسەرزەمینی گەوهەرە. شەڕی لەگەڵ پاشای ئەو سەرزەمینە کردو کوشتی و سامان و گەوهەری فراوانی بۆ کەسرا ڕەوانە کرد.

کەمتیار لەدیاری فارسەکان نەدەبینرا. بەڵام لەرۆژگاری کەسرا ئەنەوشیروان لەسەرزەمینی تورکەکانەوە، کەمتیارەکان هاتنە ناو سەرزەمینی فارسەکان. کەسرا پەرێشان و موبدی موبدانی بانگ کرد و وتی: بیستوومە ئەم دڕندانە هاتوونەتە وڵاتەکەی ئێمە وخەڵکان لێی دەترسن. ترسیان بۆتە هۆی سەرسوڕمانی ئێمە چونکە ئاژەڵێکی ئاساییە.

موبدی موبدان وتی: ئەی پاشا، خواوەند تەمەنی درێژت پێببەخشێت. لەبیرمەندان و زاناکانم بیستووە ، لەدیارێك کەستەم بەسەر دادپەروەریدا زاڵ ببێت، دوژمن هێرش دەکاتە سەر خەڵکەکەی و روداوە ناسازگارەکان روودەدات. دەترسم ئەم دڕندانە بەم هۆکارە هێرشیان کردبێتە سەر وڵاتەکەی تۆ.

لەهەمان کات کەسرایان ئاگادار کردەوە کەدەستەیەك لەگەنجە تورکەکان هێرشیان کردۆتە سەر سەرزەمینەکەی. فەرمانی بەوەزیر و کاربەدەستەکانی خۆیدا لەکارەکانی خۆیان دادپەروەری بکەنە پیشە و بەهیچ شێوەیەك کارێکی نایاسایی و دوور لەدادپەروەری ئەنجام نەدەن. خواوەند بۆ ئەم کارەی دوژمنی لەوڵاتەکەی دور کردەوە بێ ئەوەی پێویستیان بەشەڕ کردن بێت.

کەسرا چەندین منداڵی بوو کەهەموویان ئەدەب و زانستەکان فێر ببون. دوای خۆی پاشایەتی بەهورموز سپارد کەدایکی کچی خاتون و خاقان بوو. ئەوی بەکەسێکی میانڕەو و دادپەروەر دەزانی و هیوادار بوو پاشایەتیەکە بپارێزێت و بتوانێت کاروباری ژێردەستەکان و خەڵکان بەگشتی بەباشترین شێوە ڕاپەڕێنێت.

لەدایك بونی پێغەمبەر(د.خ) لەرۆژگاری کەسرا ئەنەوشیروان بوو، لەو ساڵەی ئەبرەهە ئەشرەم باوکی یەکسوم هاوڕێ لەگەڵ حەبەشیەکان رووی کردە مەککە و فیلی لەگەڵ خۆی هێنا بەمەبەستی وێران کردنی کەعبە. ئەمە لەساڵی چل و دووەم لەپاشایەتی کەسرا بوو. شەڕی جەبەلە کە لەروداوە بەناوبانگەکانی عەرەبە، لەم ساڵەدا روویدا.

## وتار سەبارەت بە لەدایك بوونی پێغەمبەر(د.خ)

مەخریمە دەڵێت: من وپێغەمبەری(د.خ) خوا، هەردووکمان لە عام الفیل ((ساڵی فیل) چاومان بەدنیا هەڵهێنا.

عوسمان کوڕی عەفان لەقەباس کوڕی ئەشەمی پرسی: تۆ گەورەتری یا پێغەمبەر(د.خ)؟

وەڵامی دایەوە: پێغەمبەر(د.خ) لەمن گەورەتر بوو بەڵام من زووتر لەو چاوم بەدنیا هەڵهێنا. من یەك ساڵ پێش لەدایك بوونی ئەو، پیسایی فیلم بینی کەسەوز بوو، ئومەییە کوڕی عەبد شەمسم بینی کەپیرەپیاوێکی پەککەوتە بوو و کۆیلەکەی ئەوی بەملاولادا دەبرد و کوڕەکەی وتی: ئەی قەباس، تۆ باشتر دەزانی کەچی دەڵێیت.

لەهوشام کوڕی محەممەدی کەلبی دەگێڕنەوە: عەبداللە کوڕی عەبدولموتەلیب باوکی پێغەمبەر(د.خ)، لەساڵی بیست و چوارەمی پاشایەتی کەسرا ئەنەوشیروان چاوی بەدنیا هەڵهێنا و پێغەمبەر(د.خ) لەساڵی چل و دوەمی پاشایەتی کەسرا لەدایك بوو.

لەکوڕی عەباسیش دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(د.خ) لەساڵی فیل چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

باوکی حویرەس دەڵێت: بیستم عەبدولمەلیك کوڕی مەروان بەقەباس کوڕی ئەشەمی وت: ئەی قەباس تۆ گەورەتری یا پێغەمبەر(د.خ)؟

قەباس وتی: پێغەمبەر(د.خ) لەمن گەورەتر بوو بەڵام من بەتەمەنترم، پێغەمبەر(د.خ) لەساڵی فیل چاوی بەدنیا هەڵهێنا و من و دایکم لەسەر پیسایی فیل وەستابووین کەسەوز رەنگە. من ئاوزم هەبوو.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(د.خ) لەساڵی فیل لەرۆژی دووشەممە، دوانزەی رەبیع الاول چاوی بەدنیا هەڵهێنا. لەدایك بوونی ئەو لەماڵێکدا بوو کەبەماڵی کوڕی یوسف بەناوبانگە. دەڵێن پێغەمبەر(د.خ)، ئەو ماڵەی بەعەقیل

کوڕی ئەبی تالب بەخشی و لەدەستی عەقیلدا مایەوە تا ئەو کاتەی مرد. کوڕەکانی ماڵەکەیان بەمحەممەد کوڕی یوسف برای حەجاج فرۆشت. ئەو ماڵەکەی خۆی کە بەماڵی کوڕی یوسف بەناوبانگە، دروست کرد و ماڵەکەی پێغەمبەری لەناو ماڵەکەی خۆیدا جێگە کردەوە. خەیزەرانەکەی جیا کردەوە و کردی بەمزگەوتێك کەنوێژیان تیا دەخوێند.

هەروەها لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: کەسانێك گومانیان کردووە و خواوەند زاناترە کەئامینە کچی وەهب دایکی پێغەمبەر(د.خ)، وتبووی: کاتێ بەپێغەمبەر(د.خ) دووگیان بوو، وەحی لەئاسمانەوە پێگەیشت: منداڵەکەی تۆ دەبێت سەروەری ئەم خەڵکە و کاتێك کەوتە سەرزەوی، بڵێ: ((ئەو لەشەڕی شەیتان و ڕژدی بەران بەخواوەند دەسپێرم)). ناوی بنێ محەممەد. کاتێك دووگیان بوو، نورێکی لێهاتەدەر کەلەوێوە کۆشکەکانی بەسرای شامی بینی، کاتێك منداڵەکەی هێنای دنیا، کەسی بۆ لای باوەگەورێی یانی عەبدولموتەلیب ڕەوانە کرد کوڕەکەم چاوی بەدنیا هەڵهێناوە، وەرە و لێی بڕوانە. عەبدولموتەلیب هات و منداڵەکەی بینی. ئامینە، عەبدولموتەلیبی ئاگادار کردەوە لەوەی لەکاتی دووگیانی بینیبووی وئەو دەنگەی بیستبووی و ئەو ناوەی بۆ منداڵەکە دیاریکرابوو.

عوسمان کوڕی باوکی عاس دەڵێت: دایکم لەکاتی بەدنیا هاتنی پێغەمبەر(د.خ) لای ئامینە کچی وەهب بوو و دەیوت: ماڵەکە نورانی ببوو و ئەستێرەکان بەشێوەیەك نزیك ببوونەوە گومانم کرد بەسەرماندا دەکەونەخوار.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: عەبدولموتەلیب منداڵەکەی هەڵگرت و بردی بۆ لای هوبەل کە لەناوەڕاستی کەعبەدا بوو. لەخواوەند پاڕایەوە و بۆ بەخشینەکەی سپاسی کرد. ئەوسا بۆ لای ئامینە گەڕایەوە و منداڵەکەی تەسلیم کرد. بەدوای دایەنێگ گەڕا تا شیر بەمنداڵەکەی بدات. ژنێك لەمنداڵەکانی سەعد کوڕی بەکر بەناوی حەلیمەی کچی باوکی زوەیبی دۆزییەوە. باوکی زوەیب عەبدالله کوڕی حارس کوڕی شەجنەت کوڕی جابر کوڕی ڕەزام کوڕی ناسرە کوڕی قەسیەت کوڕی سەعد کوڕی بەکر کوڕی هەوازن کوڕی مەنسور کوڕی عیکرەمە کوڕی خەسفەت کوڕی قەیس کوڕی عەیلان کوڕی موزەرە. ناوی هاوسەرەکەی حەلیمە، حارس

کوڕی عەبدولعوزەی کوڕی ریفاعە کوڕی مەلان کوڕی ناسرە کوڕی قەسیەت کوڕی سەعد کوڕی بەکر کوڕی هەوازن کوڕی مەنسور کوڕی عیکرەمە کوڕی خسفەت کوڕی قەیس کوڕی عەیلان کوڕی موزەرە. ناوی برای شیری پێغەمبەر(د.خ)، عەبدالله کوڕی حارس و ناوی خوشکە شیرییەکانی ئەنیسە کچی حارس و جەزامە کچی حارسە وشەیما ناوبانگی دەرکرد. خەڵکەکەی بەم ناوە دەیانناسی. دەڵێن: شەیما لەگەڵ لەپەرەستاری کردنی پێغەمبەر(د.خ) هاوکاری دایکی دەکرد.

لەبەرە کچی باوکی تەجزات دەگێڕنەوە: یەکەم ژن کەشیری بە پێغەمبەر(د.خ) دا، سەوبیە بوو کە لەشیری کوڕەکەی دەرخواردی پێغەمبەر(د.خ) دا. ناوی کوڕەکەی مەسروح بوو. ئەمە چەند رۆژ پێش هاتنی حەلیمە رویدا و پێشتر سەوبیە شیری بەحەمزە کوڕی عەبدولموتەلیب دابوو. دوای ئەوانیش شیری بە باوکی سەلمە کوڕی عەبدولئەسەدی مەخزومیدا.

لە عەبدالله کوڕی جەعفەر دەگێڕنەوە: حەلیمەی سەعدی کچی باوکی زوەیب ودایکی شیردەری پێغەمبەر(د.خ) دەیوت، لەسەرزەمینەکەی خۆیان هاتەدەر و هاوسەرەکەی هاورێیەتی دەکرد. کوڕێکی پێبوو کەشیری پێدەدا. لەگەڵ ژنەکانی مناڵەکانی سەعد کوڕی بەکر هاتبوون تا مناڵەکان بۆ شیردان بەرنەوە. ئەم لەساڵێکی وشکدا روویدا.

دەڵێت: مێچکە کەرێکی سپی و وشترێکان بوو کەگوانەکانی یەك دڵۆپ شیری تیا نەبوو. شەوانە لەتاو گریانی مناڵەکەمان لەبەر برسیەتی، خەومان لێنەدەکەوت. نەمەمکی من و نەگوانی وشترەکە شیری تیا نەبوو بەڵام هیوادار بووین باران ببارێت. لەگەڵ کەرەکەی خۆم بەرێکەوتم بەڵام نەیتوانی بەکاروانەکە بگاتەوە لەبەر ئەوەی لەڕ و لاواز و ببووە هۆکاری ڕەنج و ئازابی ئێمە. کاتێك گەشتینە مەککە، بەدوای مناڵدا دەگەڕایین. پێغەمبەری(د.خ) خوایان بردبووە لای هەموو ژنەکان بەڵام کەسیان وەرینەگرتبوو چونکە وتبویان باوکی نییە. ئێمە چاوەڕوانی بەخششمان لەباوکی مناڵەکان دەکرد و دەمانوت دایك و باوەگەورێی ئەو دەتوانن چیمان پێببەخشن. لەبەر ئەمە وەرگرتنی ئەومان پەسەند نەدەکرد. هەموو ژنەکانی هاورێم، مناڵێکیان وەرگرت جگە لەمن. کاتێك مەبەستی گەڕانەوەمان کرد،

بەهاوسەرەکەم وت: خۆش نییە من شان بەشانی ژنان بگەڕێمەوە و منالّم وەرنەگرتبێت. سوێند بەخوا دەڕۆم و ئەو کوڕە هەتیوە وەردەگرم.

هاوسەرەکەم وتی: وەریبگرە ئەگەری هەیە خواوەند بەهۆیەوە بەخششەکانی خۆیمان پێببەخشێت.

دەڵێت: ڕۆشتم و منالّەکەم وەرگرت لەبەر ئەوەی منالّی دیکەم دەست نەکەوت. کاتێك وەرمگرت وبۆ شوێنەکەی خۆمان گەڕامەوە و ئەوم لەئامێز گرت، مەمکەکانم پڕشیر بوون. شیری خوارد تا تێر بوو. براکەیشی خواردی و ئەویش تێر بوو. خەوتن. پێشتر خەوی نەبوو. هاوسەرەکەم سەیری گوانی وشترەکەی کرد و شیری تیا بینی. دۆشی و خواردی. منیش خواردم و هەر دووکمان تێر بووین. ئەو شەوەمان بەخۆشی بەسەر برد.

دەڵێت: بەرەبەیان هاوسەرەکەم پێی وتم: حەلیمە دەزانی منالّێکی پیرۆزت وەرگرتووە.

وتم: هیوادارم بەو شێوەیە بێت.

دەڵێت: ڕۆشتینەدەر و سوار کەرەکەی خۆمان بووین. منالّەکەمان لەگەڵ خۆمان برد.

سوێند بەخوا کەرەکە لەکاروانەکە دوانەکەوت. هیچ کام لەکەرەکان پێش کەرەکەی من نەدەکەوت بەشێوەیەك هاوەڵانم وتیان: ئەی کچی باوکی زوەیب، چاوەڕێ بە پێکەوە بڕۆین مەگەر بەم کەرە نەهاتیت.

وتم: سوێند بەخوا هەر ئەو کەرەیە.

وتیان: ئێستا کەرێکی زۆر چاپوك و چالاکە.

دەڵێت: ڕۆشتینە دیاری منالّەکانی سەعد. زەوییەك لەوە وشکتر و بێ بەرهەمتر نەبینراوە. بەڵام کاتێك گەڕاینەوە، مەڕەکانم کاتێك شەوانە لەلەوەڕ دەهاتنەوە، تێر و پڕ شیر بوون. دەماندۆشین و دەمانخوارد بەڵام کەسیتر جگە لەئێمە شیری نەدەدۆشی. گوانەکان یەك دڵۆپ شیری تیا نەبوو. خەڵکان ڕۆشتنە لای شوانەکان و وتیان: مەڕوماڵات بۆ شوێنێك ببەن کەمەڕەکانی کچی باوکی زوەیب دەیانبات. بەڵام مەڕەکانی ئەوان برسی دەگەڕانەوە و شیریان تیا نەبوو. تەنیا مەڕەکانی من

تێر و پڕ شیر دەگەڕانەوە. بەمشێوەیە بەردەوام بەخشینەکانی خواییمان پێبڕا تا ئەوەی دوو ساڵ تێپەڕی و ئەوم لەشیر گرتەوە. هیچ منداڵێکی دیکە وەك ئەو گەشەی نەدەکرد چونکە لەمنداڵیدا منداڵێکی ئێسکپان بوو.

ئەوم بردەوە بۆ دایکی و حەزم دەکرد لای ئێمە بمێنێتەوە چونکە خێری زۆرمان لێ بینیبوو. لەگەڵ دایکی قسەمان کرد و وتمان: چی دەبێت ئەگەر کوڕەکەت بەمن بسپێریت تالای من گەورە ببێت چونکە لەوەبا و نەخۆشییەکانی مەککە بۆ ئەو دەترسم. ئەوەندە پێداگریمان کرد تا منداڵەکەی بەئێمە سپارد. چەند مانگ دوای گەڕانەوەمان لەمەککە، ڕۆژێك لەگەڵ براکەی لەپشت خێوەتەکانەوە بوو. براکەی بەڕاکردن هات و بەمن و باوکی وت: دوو پیاوی سپیپۆش هاتن و برا قوڕەیشییەکەی منیان بەپشتا خست، سکیان هەڵدەڕی و هەڵیانکۆڵی.

دەڵێت: من و باوکی ڕامان کرد و ئەومان بینی وەستاوە بەڵام ڕەنگی پەڕیوە، پێمان وت: کوڕم چی ڕوویدا؟

وتی: دوو پیاوی سپی پۆش هاتن و منیان بەپشتا خست، سکیان هەڵدڕیم. بەدوای شتێکدا دەگەڕان کەنەمزانی چییە.

دەڵێت: بەخێرایی بۆ لای خێوەتەکانی خۆمان گەڕاینەوە. باوکی بەمنی وت: حەلیمە دەترسم کوڕەکە شتێکی بەسەر هاتبێت، پێش ئەوەی حاڵی خراپتر بێت، ئەو تەسلیمی بنەماڵەکەی بکەرەوە.

دەڵێت: ئەومان برد تا تەسلیمی دایکی بکەینەوە، وتی: تۆ حەزت دەکرد کوڕەکە لای تۆ بمێنێتەوە، بۆ ئەوت گەڕاندۆتەوە؟

وتم: خواوەند کوڕەکەمی گەورە کرد و من کاری خۆم ئەنجامدا. لەڕوداوەکان دەترسم و ئەوم بۆ تۆ گەڕاندەوە بەهەمان شێوە کەداوات کرد.

وتی: ئەوە ڕاست نییە. داستانەکەم بۆ باس بکە.

دەڵێت: زۆری پێداگری کرد تا ئەوەی ناچار بەسەرهاتەکەم بۆ باس کرد و وتم: لەشەیتان دەترسم.

وتی: سوێند بەخوا شەیتان دەستی بەو ناگات. کوڕەکەم دەبێتە کەسێکی گەورە. دەتەوێت ئەم نهێنییەت بۆ باس بکەم؟

وتم: بەڵێ.

وتی: کاتێك دووگیان بووم، نورێك لەمنەوە هاتەدەر کەکۆشکەکانی بەسرای شامی نیشاندام. سوێند بەخوا هێنانە دنیای ئەو ئاسان و بێ ڕەنج بوو. کاتێك ئەوم هێنایە دنیا، دەستی خستە سەرزەوی و سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە. کوڕەکە دابنێ و بێ ترس بۆ ماڵەکەی خۆت بگەڕێرەوە.

شەداد کوڕی ئەوس دەڵێت: ڕۆژێك لای پێغەمبەر(د.خ) دانیشتبووم کەپیرەپیاوێکی پەککەوتە لەمناڵەکانی عامر هات. سەروەری خەڵکەکەی خۆی و داردەستێکی بەدستەوە بوو. لای پێغەمبەر(د.خ) وەستا، ئەوی بەناوی باوەگەوڕێی بانگ کرد و وتی: ئەی کوڕی عەبدولموتەلیب، بیستومە گومان دەکەیت پێغەمبەری خواییت و خواوەند تۆی بەهەمان دین کەئیبراهیم و موسا و عیسا وپێغەمبەرانی دیکەی ڕەوانە کردووە، ڕەوانە کردووە. بەراستی ئامارژەت بەقسەیەکی گەورە داوە کە پێغەمبەر و خەلیفەکان لەدوو بنەماڵەی مناڵەکانی ئیسرائیل بوون بەڵام تۆ لەم خەڵکەییت کەبەرد و بتیان پەرەستیوە. تۆ و پێغەمبەری لەکوێ؟ بەڵام هەر وتەیەك ڕاستییەکەی لەخۆیدا حەشارداوە، ڕاستی وتار و سەرەتای کارەکەی خۆت بۆ من باس بکە.

پێغەمبەر(د.خ) لەپرسەکەی سەریسوڕما، وتی: ئەی براکەم لەمناڵەکانی عامر، ئەم پرسیارەی پرسیت، وەڵامەکەی دوور ودرێژە، پێویستە دانیشیت. وەرە دانیشە.

پیاو چوارمەشقی دانیشت و خەوت بەهەمان شێوە کەوشتر دەخەوێت.

پێغەمبەر(د.خ) قسەی لەگەڵ کرد و وتی: ئەی برای عامری، ڕاستی وتار و سەرەتای کارەکەی من بەو شێوەیە کە من بانگەشەی باوکم ئیبراهیمم و مژدەی عیسا کوڕی مریەمم و یەکەم مناڵی دایکم. کاتێك بەمن دووگیان بوو، لەقورسی من لای هاوەڵانی خۆی سکاڵای کرد، دواتر دایکم لەخەودا بینی کەنورێکی لەسکدایە. چاوی من بەدوای نوورەکە و نوور لەپێش چاوی مندا بوو. ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواکانی زەوی بۆ من دەرکەوت. دوای ئەوە دایکم منی هێنایە دنیاو گەورە بووم. کاتێك گەورە بووم، لەبتەکانی قوڕەیش و لەهۆنراوە بێزار بووم. لەناو

منداڵەکانی لەیس کوڕی بەکر شیرم خوارد. ڕۆژێك لەگەڵ بنەماڵەکەی خۆم لەدۆڵێکدا لەدەشتێکدا بووین. لەناو دۆڵێك لەگەڵ منداڵانی هاوتەمەنی خۆم گەمەم دەکرد. سێ کەس هاتن و تەشتێکی زیویان پێبوو کەلێوانلێو بوو لەبەفر. منیان لەهاوەڵەکانم جیا کردەوە. ئەوان هەڵاتن تا گەشتنە لێواری دۆڵەکە و بەو سێ کەسەیان وت: چیتان لەم کوڕە دەوێت، ئەو لەئێمە نییە، کوڕی سەروەری قوڕەیشە و باوکی نییە. بۆ شیر خواردن هاتۆتە ئێرە. ئێوە لەکوشتنی ئەو هیچ سودێکتان پێنابڕێت. ئەگەر دەتانەوێت ئەو بکوژن، یەکێك لەئێمە بگرن و لەجیاتی ئەو بیکوژن. ئەم کوڕە ئازاد بکەن چونکە باوکی نییە. کاتێك منداڵەکان بینیان ئەو کەسانە وەڵامیان نادەنەوە، بەراکردن بۆ ناو کەسەکانیان گەڕانەوە و ئەوانیان ئاگادار کردەوە.

یەکێك لەو سێ کەسە هات و زۆر لەسەرخۆ منی خستە سەرزەوی. ئەوسا سکی من تا نزیك کەلەکەم هەڵدڕی. بەردەوام سەیرم دەکرد بەڵام هەستم بەئازار نەدەکرد. دواتر هەموو ریخۆڵەکانی ناو سکی دەرهێنام وبەبەفرەکە شۆردی، خاوێنی کردەوە و لەوشوێنی خۆی دایینایەوە. دوای ئەوە، یەکێتریان هەستا و پێی وت: بڕۆ دواوە. ئەوی لەمن دوور کردەوە و دەستی بردە ناو سکم. دڵی دەرهێنام. سەیرم دەکرد. دڵی قەڵشتم و پەڵە خوێنێکی ڕەشی لێدەرهێنا و فڕیدا. دەستی بۆ دەستی راستی خۆی برد وەك بڵێی شتێکی لێهەڵدەگرت. ئەنگوستیلەیەك لەنووری لەدەستا بوو کەچاوی بینەری زەق دەکرد. بەئەنگوستیلەکەی دڵی منی مۆر کرد کەنوڕانی بوو. بۆ ڕۆژگارێکی درێژ فێنکی ئەو مۆرەم لەدڵمدا هەست پێدەکرد. ئەوسا سێیەم کەس بەهاورێکەی خۆی وت: بڕۆ دواوە. دەستی خۆی خستە سەر سکم تا لای کەلەکەم و بەفەرمانی خواوەند برینەکە سارێژ بوو. دوای ئەوە دەستی گرتم و زۆر بەهێواشی هەڵیساندم. بەو کەسەی وت کەدڵی منی قەڵشت: ئەو لەگەڵ دە کەس لەئۆمەتەکەی خۆی بکێشە. کێشایان و من قورستر بووم. وتی: لەگەڵ سەد کەس بیکێشە. کێشایان ومن قورستر بووم. دوبارە وتی: لەگەڵ هەزار کەس بیکێشە. کێشایان و من قورستر بووم. وتیان: بەسە. ئەگەر هەموو ئۆمەتەکەی بخەنە تای تەرازوێك و ئەم بەتەنیا بخەنە تای تەرازوێك، قورستر دەبێت.

لەئامێزیان گرتم و سەر و ناوچاویان ماچ کردم، وتیان: ئەی خۆشەویست،

مەترسە، ئەگەر بزانیت چی لەرێگاتایە، شادمان دەبیت.

لەوکاتەدا خەڵك هاتن و دایکی شیردەرەم لەپێش هەموویانەوە بوو، هاواری دەکرد: کوڕە ناتەوانەکەم.

منیان گرت و ماچیان کردم، وتیان: چەندە بەختەوەرە ئەو کەسەی لەگەڵ تۆ دەژیت.

دایکم وتی: کوڕە تەنیا کەی من.

منیان گرت و سەرو ناوچاویان ماچ کردم و وتیان: بەختەوەرە ئەو تەنیاییەی کەتۆ بیت. تۆ تەنیا نیت چونکە خواوەند و فریشتەکان و باوەڕدارانی سەرزەوی لەگەڵ تۆن.

دایکم هاواری کرد: ئەی هەتیوەکەی من، لەناو هاورێکانت تۆیان بەناتەوان بینی و مەبەستی ئەوەیان کرد بتکوژن.

منیان لەئامێز گرت و وتیان: بەختەوەرە ئەو هەتیوەی کەتۆ بیت چونکە لای خوا رێزێکی گەورەت هەیە. نازانی چ پاداشتێك لەبەردەمتایە.

منیان بردە لێواری دۆڵەکە و کاتێك دایکم، منی بینی، وتی: کوڕەکەم، تۆ زیندوویت؟ هات و منی لەئامێز گرت. سوێند بەو خوایەی گیانی من بەفەرمانی ئەوە، من لەباوەشی دایکمدا بووم و دەستم لەناو دەستی یەکێك لەوان. گومانم کرد خەڵکان ئەوانیان بینیوە بەڵام نەیانبینین. یەکیان دەیوت: ئەم کوڕە شێت بووە یا جنۆکە دەستی لێداوە، ئەو دەبەینە لای کاهینەکەی خۆمان تا بیبینێت و چارەسەری بکات.

وتم: ئەی فلاّن کەس، لەوەی دەیڵێیت، بەدوورم، ئاوزی من کێشەی نییە، دڵم کێشەی نییە و نەخۆش نیم.

باوکم و هاوسەرەکەی دایکم وتی: مەگەر نابینن وتەکانی هاوشێوەی وتەی بیرمەندانە، هیوادارم هیچ زیانێکی بەرنەکەوتبێت. بڕیاریاندا من بۆ لای کاهین ببەن. داستانەکەی منیان بۆ باس کرد. وتی: بێدەنگ بن تا لەکوڕەکەی ببیستم چونکە خۆی باشتر دەزانێت.

لەمنی پرسی و داستانەکەم لەسەرەتاوە تا کۆتایی بۆ باس کرد. کاتێك

بیستی، هەستا و لەئامێزی گرتم، وتی: هاوار لەنەتەوەی عەرەب، هاوار لەنەتەوەی عەرەب، ئەم کوڕە بکوژن و منیشی لەگەڵدا بکوژن. سوێند بەلات و عوزا ئەگەر نەیکوژن، دینەکەتان دەگۆڕێت وگاڵتە بەئاوزی خۆتان و باوکانتان دەکات. دژایەتیان دەکات و دینێکی تازە لەگەڵ خۆی دێنێت کەهەرگیز هاوشێوەی ئەو دینەتان نەبیستوە.

دایکم هات و منی لەئامێزی ئەو دەرهێنا و وتی: تۆ لەکوڕەکەی من خڵەفاوتر و شێتتریت. ئەگەر دەمزانی بەمشێوەیە قسە دەکەیت، هەرگیز ئەوم بۆ لای تۆ نەدەهێنا. کەس بدۆزەرەوە تا بتکوژێت چونکە ئێمە هیچ کات ئەم کوڕە ناکوژین.

دوای ئەوە منیان بۆ لای بنەماڵەکەم گەڕاندەوە. لەوەی لەگەڵ من کردیان، دەترسام. نیشانەی هەڵدڕینەکەی سکم هێشتا دیار بوو. ئەی برای عامری، ئەمە راستی وتارەکەی منە.

پیاوی عامری وت: سوێند بەو خوایەی جگە لەو خوایەك نییە، کاری تۆ راستە، ئێستا وەڵامی پرسەکانی من بدەرەوە.

پێغەمبەر(د.خ) هەمیشە بەپرسکەری دەوت: چییت پێخۆشە، بپرسە. پیاوی عامری ئەم وتەی بەزاراوی مناڵەکانی عامر هێنایە سەرزمان.

پیاوی عامری وت: ئەی کوڕی عەبدولموتەلیب، پێم بڵێ، زانستی من بەچی فراوان دەبێت؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەفێر بوون.

پیاوی عامری وتی: نیشانەی زانست چییە؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: پرسین.

پیاوی عامری وتی: خراپە بەهۆی چییەوە فراوان دەبێت؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: پێداگری.

عامری وت: پێم بڵێ ئایا چاکەکاری دوای خراپەکاری سوودی هەیە؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەڵێ، تۆبە گوناحەکان دەشواتەوە و کارە چاکەکان خراپەکان دەسڕێتەوە. کاتێك بەندەیەك لەکاتی دەوڵەمەندی خواوەند بپەرەستێت، خواوەند لەکاتی گرفتاری و بەڵا هاوکاری دەکات.

عامری وتی: ئەی کوڕی عەبدولموتەلیب، ئەمە چۆن دەبێت؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەمشێوەیە کەخواوەند دەفەرمێت: سوێند بەمەزنی و گەورەییم، دوو ئەمنییەت بەبەندەکانی خۆم نادەم وبەیەکجار گرفتاری دوو ترسی ناکەم. ئەگەر لەدنیا لەمن بترسێت، ئەو ڕۆژەی بەندەکانم کۆدەکەمەوە، لەئەماندایە. ئەگەر لەدنیا لەئەماندا بێت، ئەو ڕۆژەی بەندەکانم کۆدەکەمەوە، لەمن دەترسێت و ترسەکەی هەمیشەیی دەبێت.

عامری وتی: ئەی کوڕی عەبدولموتەلیب، پێشنیاری چی بەخەڵکان دەکەیت؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: پەرەستی خواوەندی تاقانەی بێ نیاز و ئەوەی هیچ شتێك نەکەنە شەریکی خواوەند و لات و عوزا پشتگووێ بخەن و کتێب و پێغەمبەرانی پێش من پشتراست بکەنەوە و پێنج فەرزە نوێژەکانیان بخوێنن و لەساڵدا یەك مانگ بەڕۆژو بن، زەکاتی سامانەکەیان بدەن تا خوا بەوە بیانپارێزێت و سامانەکەیان فراوان بکات و ئەگەر بتوانن حەج بکەن و لەدوای نزیك بوونەوە غوسڵ و لەش پیسی لەخۆیان دەربکەن و باوەڕیان بەزیندووو بونەوە دوای مردن هەبێت.

عامری وتی: ئەی کوڕی عەبدولموتەلیب، ئەگەر ئەو کارانە بکەم، چ پاداشتێکم پێدەبڕێت؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەهەشتی هەمیشەیی کەجۆگەکان لەوێ ڕەوانن و ئەمە پاداشتی چاکەکارانە.

عامری وتی: ئەی کوڕی عەبدولموتەلیب، ئایا پاداشتی دنیایی هەیە چونکە ئەرخەیانی و ئاسودەی ژیان و بژێویم خۆش دەوێت؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەڵێ، بەختەوەری و سەرکەوتن و زاڵبوون بەسەر وڵاتەکان.

عامری باوەڕی بەدینی ئیسلام هێنا.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك عەبدالله کوڕی عەبدولموتەلیب، باوکی پێغەمبەر(د.خ) کۆچی دوایی کرد، دایکی پێغەمبەر(د.خ)، ئامینە کچی وەهب کوڕی عەبدمەناف کوڕی زوهرە بەپێغەمبەر دووگیان بوو.

بەڵام هوشام دەڵێت: بیست و هەشت مانگ لەتەمەنی پێغەمبەر(د.خ) تێپەڕی کردبوو کەباوکی مرد.

محەممەد کوڕی عومەری واقدی دەڵێت: هاوڕێیانی ئێمە لەمەدا بۆچوونیان جیاواز نییە کەعەبدالله کوڕی عەبدولموتەلیب، هاوڕێ لەگەڵ کاروانی قوڕەیش لەشامەوە هات و لەمەدینە دابەزی. نەخۆش بوو و لەوێ کۆچی دوایی کرد. لەماڵی نابغە لەماڵێکی بچوک بەخاك سپێردرا. کاتێك دەڕۆیتە ناو ماڵەکە، گۆڕەکەی لای راستەوەیە.

لەمحەممەد کوڕی عەمرۆ کوڕی حەزمی ئەنساری دەگێڕنەوە: کاتێك ئامینە دایك پێغەمبەر(د.خ) کۆچی دوایی کرد، تەمەنی پێغەمبەر(د.خ) شەش ساڵ بوو. مەرگی ئامینە لەئەبواء لەنێوان مەککە و مەدینە بوو. پێغەمبەری بۆ مەدینە بردبوو تا خاڵۆکانی خۆی ببینێت کە لەمناڵەکانی عودەی کوڕی نەجار بوون. کاتی گەڕانەوە بۆ مەککە کۆچی دوایی کرد.

لەعوسمان کوڕی سەفوان دەگێڕنەوە: گۆڕی ئامینە لەمەککە لەشەعبی ئەبی زەردایە.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: کاتێك عەبدولموتەلیب کۆچی دوایی کرد، تەمەنی پێغەمبەر(د.خ) هەشت ساڵ بوو.

دەستەیەك وتوویانە: پێغەمبەر(د.خ) لەکاتی مردنی عەبدولموتەلیب دەساڵە بوو.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(د.خ) دوای مەرگی عەبدولموتەلیب ڕۆشتە لای ئەبو تالیب. مناڵەکانی ئەبو تالیب ریپۆقیان بەچاوەوە بوو بەڵام پێغەمبەر(د.خ) پاك و خاوێن بوو.

## ئێستا سەبارەت بەکۆتایی کارەکانی ئەنەوشیروان کوڕی قوباد دەدوێین:

لەهانی مەخزمی دەگێڕنەوە: کەسرا سەد و پەنجا ساڵ ژیا. لەشەوی لەدایك بوونی پێغەمبەر(د.خ) ، هەیوانی کەسرا لەرزی و چواردە دانی لێواری دیوارەکانی رووخا. ئاگری فارسەکان کوژایەوە لەکاتێکدا بۆ ماوەی هەزا ساڵ کوژانەوەی بەخۆیەوە نەبینیبوو. دەریاچەی ساوە ئاوەکەی کەمی کرد و موبدی موبیدەکان لەخەودا بینی وشترە گەورەکان کەئەسپە عەرەبیەکانیان رادەکێشا، لەدیجلە پەڕینەوە و لەناو وڵاتی فارسەکاندا بڵاو بوونەوە.

بەرەبەیان کەسرا لەوەی بینیبووی، ترسی لێنیشت. خۆڕاگری کرد و بەرووی خۆیدا نەهێنا. بەڵام نەیتوانی ئەم روداوە لەوەزیر و سنوردارەکانی خۆی بشارێتەوە. لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت و ئەوانی کۆکردەوە. کاتێك کۆبوونەوە، داستانەکەی بۆ باس کردن. لەم کاتەدا هەواڵی کوژانەوەی ئاگرەکەیان پێگەیشت. خەمەکانی کەسرا زیادی کرد. موبدی موبدان وتی: خواوەند تەمەنی درێژ بەپاشا ببەخشێت، منیش دوێ شەو، خەوم بینی. خەوی وشترەکانی بۆ گێڕایەوە.

کەسرا وتی: ئەی موبدی موبدەکان، ئەمە نیشانەی چییە؟ چونکە موبدی موبدەکان لەمبارەوە لەهەموو کەسان شارەزاتر و زاناترە.

وتی: بەڵایەکە لەلایەن عەرەبەکانەوە.

کەسرا نامەیەکی بەم ناوەرۆکە نووسی: لەکەسرا پاشای پاشاکان بۆ نەعمان کوڕی مونزەر، پیاوێکی زانا رەوانە بکە تا پرسەکانی خۆمانی لێ بپرسین.

نەعمان، عەبدولمەسیح کوڕی عەمرۆ کوڕی حەییان کوڕی بەقیلەی غەسانی رەوانە کرد. کاتێك گەیشتە لای کەسرا، پێی وت: ئەوەی لەتۆی دەپرسم، دەتوانی وەڵامی بدەیتەوە؟

عەبدولمەسیح وتی: پاشا بپرسێت، ئەگەر توانیم وەڵام دەدەمەوە و گەرنە پێی دەڵێم، کێ دەتوانێت وەڵامی پرسەکانی بداتەوە.

کەسرا لەوەی بینیبووی، ئاگاداری کردەوە.

عەبدولمەسیح وتی: لای خاڵی من وەڵامەکانتان دەست دەکەوێت کە لەبەرزاییەکانی شام نیشتەجێیە. ناوی سەتیحە.

کەسرا وتی: بڕۆ بۆ لای و ئەوەی لەتۆم پرسی: لەو بپرسە و وەڵامەکانم بۆ بێنە.

عەبدولمەسیح ڕۆشتە لای سەتیح کە لەسەرە مەرگدا بوو. سڵاوی کرد بەڵام سەتیح نەیتوانی وەڵامی بداتەوە. عەبدولمەسیح هۆنراوەیەکی خوێندەوە کەکورتەی ناوەڕۆکەکەی بەمشێوەیە:

دانای گەورەی یەمەن کەڕە یا بیسەر

پیری تایەفەکە هاتۆتە لای تۆ

کەنێردراوی شای فارسەکانە

کاتێك سەتیح قسەکانی بیست، سەری بەرز کردەوە، وتی: عەبدولمەسیح سوار لەسەر وشتر بۆ لای سەتیح هاتی بەڵام بۆ لای قوربانی هاتوویت، پاشای مناڵەکانی ساسان تۆی ڕەوانە کردووە، بۆ لەرزینی هەیوانی تۆی ناردووە، بۆ کوژانەوەی ئاگرەکە تۆی ناردووە، بۆ خەوی موبد تۆی ناردووە، وشتری قەڵەوی بینیوە ئەسپە عەرەبەکان ڕادەکێشن و دیجلەیان بڕیوە و لەوڵاتەکەی ئەودا بڵاو بوونەتەوە، ئەی عەبدولمەسیح کاتێك خوێندنەوە ((خوێندنەوەی قورئان)) فراوان بێت و خاونی ((داردەست)) بێت و دۆڵی سەماوە ڕەوان بێت و دەریاچەی ساوە ئاوەکەی پاشەکشێ بکات و ئاگری فارسەکان بکوژێتەوە، شام، شامی سەتیح نییە و لەوان بەئەندازەی دانی لێوارەکان پاشا و پاشاژن دەردەکەوێت. هەرچی دەبێت بێت، دێت.

ئەمەی وت و مرد. عەبدولمەسیح گەڕایەوە و هۆنراوەیەکی خوێندەوە کەکورتەی ناوەڕۆکەکەی بەمشێوەیە:

پەلە بکە چونکە تۆ پیاوێکی شارەزا و لێهاتوویت

لەگۆڕان و کەم کردنەوە مەترسە

گەر پاشایەتی منداڵەکانی ساسان لەناو بچێت

ڕۆژگار بەردەوان گۆڕانی بەسەردا دێت

زۆر لەرۆژگارەکان بەمشێوە بوون.

شێرەکانی شکار لەدەسەلاتیان دەترسان

مێهرانی خاوەن کۆشك و براکانی

و هورموزان و شاپور و شاپور

لەوان بوون.

خەڵك ئارەزومەندی سەرکەوتنن

هەرکەس بکەوێتە سەرەوخواری، ریسوا و دورخراوە دەمێنێتەوە

خێر وشەڕ پەیوەستی یەکن

بەدوای خێردا دەڕۆن و لەشەڕ خۆیان بەدوور دەگرن.

کاتێك عەبدولمەسیح بۆ لای کەسرا گەڕایەوە و لەوتەکانی سەتیح ئاگاداری کردەوە: کەسرا وتی: تا ئەو کاتەی چواردەکەس لەئێمە پاشایەتی دەکات، روداوی فراوان روودەدات.

دەڵێت: لەیەك ساڵدا دەکەس لەوان پاشایەتیان گرتەدەست و ئەوانیتر تا رۆژگاری عوسمان کوڕی عەفان بەپاشایەتی گەیشتن.

لەهوشام کوڕی محەممەدی کەلبی دەگێڕنەوە: وەهرز سامان و تالآنییەکانی لەیەمەنەوە بۆ کەسرا رەوانە کرد و کاتێك گەیشتە سەرزەمینی منالەکانی تەمیم، سەعسەعە کوڕی ناجیە کوڕی عەقالی کوڕی موجاشیعی، هانی منالەکانی تەمیمدا هێرش بکەنە سەر کاروانەکەی، بەلآم رازی نەبوون. کاتێك گەیشتە دیاری منالەکانی یەربوع، پێشنیاری ئەو کارەی بەوان کرد بەلآم نەیانوێرا. وتی: ئەی منالەکانی یەربوع، ئەم کاروانە بەسەرزەمینی بەکر کوڕی وائیل تێدەپەڕیت، هێرشی دەکەنە سەر و بۆ شەڕ کردن لەگەڵ ئێوە کەڵکی لێوەردەگرن.

کاتێك منالەکانی یەربوع ئەم قسەیان بیست، کاروانەکەیان تالآن کرد. یەکێك لەمنالەکانی سەلیت بەناوی نەتف، خورجینێکی دەستکەوت کەپڕبوو لەجەواهیر. ئەم وتەیە بوو بەپەند کەگەنجی نەتف بەدەست دێنێت. سەعسەعە سەوەتەیەکی دەستکەوت کەشمشی زیوی تیا بوو. خەڵکانی کاروانەکە رۆشتنە یەمامە بۆ لای هوزە کوڕی عەلی حەنەفی. هوزە جل و بەرگ و توێشووی پێدان و لەگەڵ ئەوان رۆشتە لای کەسرا.

هوزە زمان پاراو بوو. سەرنجی کەسرای راکێشا. کردەوەکانی ئەوی لەگەڵ کەسانی کاروانەکەی خۆی بیرکەوتەوە. داوای رشتەیەکی مرواری کرد و لەسەری ئەوی بەست. عابای گرانبایی پێبەخشی لەگەڵ چەندین جۆری دیکەی جل وبەرگ. لەبەر ئەمە بەهوزەی تاجدار ناوی دەرکرد.

کەسرا پێی وت: ئەوانەی کاروانەکەیان تالآن کرد، لەخەڵکەکەی تۆن؟

هوزە وتی: نە.

وتی: ئاشتی لەنێوان ئێوەدا سەقامگیرە؟

وەڵامی دایەوە: تەنیا مەرگ لەنێوان ئێمەدایە.

وتی: بەمەبەستەکەی خۆت گەشتیت. مەبەستی ئەوەی کرد بەسوپایەك هێرش بکاتە سەر منداڵەکانی تەمیم، پێیان وت: دیاری ئەوان دژوارە و هەمووی سارا و بیابانە کەناتوانرێت رێگاکان بدۆزرێنەوە. سەرچاوی ئاویان چاڵاوەکانە مەترسی ئەوە هەیە کەچاڵاوەکان کوێر بکەنەوە و سوپاکەت لەناو بچێت. ئەوەیان بەباش زانی نامە بۆ کاربەدەستی خۆیان لەبەحرەین بنووسن. کاربەدەستی بەحرەین ئازەر فروز کوڕی جەشنس بوو کە عەرەبەکان بەموکەعبەر ناویان دەبرد لەبەر ئەوەی دەست وپێی ئەوانی دەبڕییەوە و سوێندی خواردبوو کەس لەمنداڵەکانی تەمیم بەزیندوویی نەهێڵێتەوە.

کەسرا نامەی بۆ ئازەر فروز نووسی. پەیکی نارد و داوای هوزەی کرد. دوبارە خەڵاتی کرد و وتی: لەگەڵ نێردراوکەی من برۆ و دڵی خۆت و من ئاسوودە بکە.

هوزە و نێردراوکە بەرێکەوتن تا گەیشتنە لای موکەعبەر. کاتی دروێنە وکۆکردنەوەی بەرهەم بوو. منداڵەکانی تەمیم لەو کاتەدا بۆ توێشو کۆکردنەوە دەرۆشتنە هیجر. جارچی موکەعبەر جاریدا: هەر کەس لەمنداڵەکانی تەمیم لێرەیە، بێت چونکە پاشا فەرمانیداوە توێشو و خواردن لەنێوان ئەوان دابەش بکەن. هەموویان هاتن و ئەوانی لەمەشقەر کۆکردەوە. مەشقەر قەڵایەکە و لەبەرابەر مەشقەر قەڵایەکی دیکەیە بەناوی سەفا. لەنێوان ئەم دوو قەڵایە روبارێك بوو بەموحلیم ناویان دەبرد.

دامەزرێنەری مەشقەر، بسك کوڕی ماهیوزانە کەیەکێك بوو لەسوارچاکەکانی کەسرا. ئەوی بۆ دروست کردنی قەڵاکە رەوانە کرد. کاتێك کارەکەی دەستی پێکرد، پێیان وت: کرێکاران لێرە نامێننەوە مەگەر ئەوەی ژنانیان لەگەڵدا بێت. ئەگەر ئەم کارە بکەیت، بیناکەی تۆ لەزووترین کاتدا تەواو دەبێت و کرێکارەکانیش درێژە بەکارەکانیان دەدەن. ئەو لەسنورەکانی ئەهواز و سواد، ژنە لەشفرۆشەکانی کۆکردەوە و بۆ کرێکارەکانی برد. شەرابی لەلەسەرزەمینی فارس و لەرێگەی دەریاوە هێنا. ئەو خەڵکە لەگەڵ ژنان خەوتن و ژمارەیان زیادی کرد. زۆربەیان لەخەڵکانی هیجر بوون وبە عەرەبی قسەیان دەکرد و ناوی عەبدقەیسیان پێبڕا. کاتێك ئیسلام هات، بەخەڵکانی عەبد قەیسیان وت: ئێوە کەرەستە و ئاسودەی فراوانی ئێمە دەبینن، ئێمە

لەخۆتان بزانن و ژنمان پێبدەن.

وتیان: نا بەمشێوەی ئێستاتان بمێننەوە چونکە برا و خزمانی ئێمەن.

یەکێك لەمناڵەکانی عەبد قەیس وتی: ئەی خەڵکی عەبدقەیس، گوێ لەفەرمانەکانی من بگرن و ئەوان پەیوەستی خۆتان بکەن چونکە نابێت پەیوەندی ئەم کەسانە لەدەست بدەن.

یەکێك لەوان وتی: شەرم ناکەیت پێمان دەڵێیت ئەو کەسانەی رەچەڵەك و نەژادیان زانراوە، پەیوەستی خۆمان بکەین.

وتی: ئەگەر ئەم کارە نەکەن، عەرەبەکانی دیکە ئەوان پەیوەستی خۆیان دەکەن.

وتیان: خەممان نییە.

ئەم خەڵکە لەناو عەرەبەکان بڵاوبوونەوە و دەستەیەك لەوان لەگەڵ عەبد قەیس مانەوە و رەچەڵەکیان بۆ ئەو گەڕاندەوە بەڵام عەبدقەیس حاشای لێکردن.

کاتێك موکەعبەر مناڵەکانی تەمیمی لەقەڵای مەشقەر کۆکردەوە، پیاوەکانی کوشت و کوڕەکانی ئەوانی هێشتەوە. لەو رۆژەدا قەعنەبی ریاحی کوژرا کەسوارچاکی مناڵەکانی یەربوع بوو. دوو کەس لەپیاوەکانی هۆز کەسەرپەرەستی پاشاکانیان دەکرد، ئەویان کوشت. کوڕەکانیان بەکەشتی بۆ سەرزەمینی فارسەکان رەوانە کرد و زۆربەی ئەوانیان خەساند.

هوبەیرە کوڕی جەدیری عەدەوی دەڵێت: دوای ئەوەی ئیستەخر دەستی بەسەردا گیرا، چەند کەسێك لەوان بۆ لای ئێمە گەڕانەوە کەیەکیان خەیات ((بەرگدوور)) بوو.

لەو رۆژەدا عوبەید کوڕی وەهب، یەکێك لەمناڵەکانی تەمیم، هێرشی کردە سەر زنجیری دەرگاکەوە و قرتاندی و خۆی رزگاری کرد. هۆنراوەیەکی خوێندەوە کەناوەرۆکەکەی بەمشێوەیە:

هنیدم بیرکەوتەوە و کاتی بیرهێنانەوەی ئەو نەبوو

کاتێك ئەوم بیر کەوتەوە کەچەندین مانگ رێگە لەیەك دوور بووین

حیجازی خاوەن نەژاد کەکەسەکانی ئەو

لەسەر تەپۆڵکەکانی خەریف نیشتەجێ بوون

ئایا خەڵکەکەی من ئاگادار بوونەوە کەمن لەرۆژی مەشقەر

پارێزگاریم لەشەرەفی خۆم کرد

و بەشمشێر لەزنجیری دەرگاکەمدا

کەهەر دەرگایەکی بەستراوی دەکردەوە.

هوزە کوڕی عەلی لەو ڕۆژەدا سەبارەت بەسەد کەس لەئەسیرەکانی تەمیم قسەی لەگەڵ موکەعبەر کرد کە لەڕۆژی جەژنی مەسیحییەکان ئەوانی بەهوزە بەخشی و ئازادی کردن. ئەعشی لەمبارەوە هۆنراوەیەکی هەیە بەم ناوەڕۆکە:

سەبارەت بەڕۆژی مامڵە لەخەڵکی تەمیم بپرسە

کاتێك دیل بوون و هەموویان ریسوا

لەدڵی مەشقەر و لەزەوییەکی تاریك

و دوای ئەو دژوارییە، ڕێگەی دەرەتانیان نەبوو.

شا وتی: سەد کەس لەوان ئازاد بکە

و سەد کەس لەدیلەکانی ئازاد کرد

هەموویان لەئەسیری رزگاریان بوو

و لەڕۆژی جەژنی مەسیحییەکان ئەوانی کردە هۆکاری نزیك بوونەوە

بۆ ئەم کارەی چاوەڕوانی پاداشتی لەخواوەند دەکرد

بەڵام ئەم نیعمەتەیان لەبیر نییە.

دەڵێت: کاتێك مەرگی وەهرز نزیك کەوتەوە، لەکۆتاییەکانی پاشایەتی ئەنەوشیروان، کەوانەکەی خۆی و تیرێکی داوا کرد، وتی: دامنیشێنن. دایاننیشاند. تیرێکی هاویشت و وتی: بزانن تیرەکە لەکوێ کەوتە خوار، ئەو شوێنە گۆڕی منە.

تیرەکە لەپشت دیر کەوتە خوار. دیر، کەنیسەکەی نزیك نەعمە و ئێستا بەگۆڕی وەهرز ناسراوە.

کاتێك کەسرا لەمەرگی وەهرز ئاگادار بوویەوە، یەکێك لەسوارکارانی خۆی بەناوی زین بۆ سەرزەمینی یەمەن رەوانە کرد. ئەو ستەمکارێکی زێدەڕۆ بوو. کەسرا ئەوی لەسەر کار لابرد و مەرزوانی بۆ فەرمانڕەوایەتی یەمەن دیاری کرد. مەرزوان لەیەمەن مایەوە و منداڵێکی بۆ هاتە دنیا. منداڵەکەی گەورە بوو. کەسرا ئەنەوشیروان مرد. ماوەی پاشایەتی ئەو چل و هەشت ساڵ درێژەی کێشا.

## دوای ئەو هورموز کوڕی کەسرا پاشایەتی گرتەدەست

دایکی هورموز کچی خاقانی گەورە بوو.

لەهوشام کوڕی محەممەدی کەلبی دەگێڕنەوە: هورموز کوڕی کسرا لەئەدەبدا بەهرەوەر بوو. دەیویست لەگەڵ هەژار و دەستکورتەکان بەشێوەیەکی چاکەخوازانە هەڵسوکەوت بکات و سنوری دەسەڵاتی کاربەدەستانی کەم کردەوە و بەم هۆیەوە بوونە دوژمن و نەیاری ئەو. ئەویش دوژمنی کاربەدەستان وکەسانی پایەبەرزی وڵات بوو. هەژارەکان بۆی دەپاڕانەوە و دۆعایان بۆ دەکرد. بەڵێنی چاکەی بەواندا. بەردەوام هەوڵیدەدا بەشێوەیەکی دادپەروەران لەگەڵ ژێردەستەکان هەڵس وکەوت بکات و توندی و سەختی بەرابەر بەگەورەکان نیشان بدات بەهۆی ئەو دەستدرێژیانەی دەیانکردە سەر هەژاران. لەدادپەروەریدا تا ئەو جێگە ڕۆشتە پێش کە لەیەیلاق کاتێك بەرەو ماە دەڕۆشت، فەرمانی بەسوپاکەیدا لەزەوییە کشتوکاڵییەکان خۆیان بەدوور بگرن و زیان لەجوتیار و وەرزێرەکان نەدەن و ئەسپەکانی خۆیان لەزەوییەکانی ئەوان غار نەدەن. کەسانێکی وەك چاودێر دەستنیشان کرد تا هەرکەسێك سەرپێچی فەرمانەکانی کرد، سزا بدرێت. خوسرەوی کوڕی لەناو سوپاکەدا بوو. یەکێك لەئەسپەکانی ئەو لەناو زەوییەکی کشتوکاڵی لەوەڕا و زەوییەکەی لەژێر سمی خۆیدا پێشێل کرد. ئەسپەکەی ئەویان گرت و بردیانە لای ئەو کەسەی هورموز بۆ سزادان دەستنیشانی کردبوو. ئەو نەیتوانی فەرمانی هورموز بەسەر خوسرەودا بسەپێنێت. داستانەکەی بۆ هورموز باس کرد. هورموز فەرمانیدا و هەر دوو گوێی ئەسپەکەیان بڕییەوە و خوسرەویان جەریمە کرد. فەرمانی بەو کەسەدا کە فەرمانەکانی سەبارەت بەخوسرەو جێبەجێ بکات. خوسرەو دەستەیەك لەگەورەکانی بۆ لای هورموز رەوانە کرد تا لەم کارە چاوبپۆشێت، بەڵام رازی نەبوو. داوایان لێکرد لەسزادانی خوسرەو پەلە نەکات تا بڕۆنە لای هورموز. ئەو کارەی کرد. گەورەکان ڕۆشتنە لای هورموز و وتیان: ئەو ئەسپەی زەوییە کشتوکاڵییەکەی پێشێل کردووە، ئەسپێکی سەرکێش و یاخیە و لەهەمان کاتدا رێگەی ئەو کارەیان لێگرتووە. داوایان لەهورموز کرد لەبڕینی

کلك و گوێی ئەسپەکە چاوپۆشێت چونکە ئەمە بۆ خوسرەو شانسێکی باش نییە.

هورموز بەقسەکانی ئەوان رازی نەبوو و فەرمانی برینی کلك و گوێی ئەسپەکەی دەرکرد. هەروەها وتی لەخوسرەو وەك کەسانی دیکە سزا و جەریمە وەربگرن.

هورموز لەرۆژی پێگەیشتنی ترێ سوار و مەبەستی رۆشتن بۆ مەداینی کرد. رێگەکەی بەناو رەز و بێستانەکاندا بوو. یەکێك لەسوارەکارەکانی هاورێی سەیری رەزێکی کرد و بەرسیلەی بینی، چەند بۆڵێکی لێکردەوە. بۆڵە بەرسیلەکانی بەکۆیلەکەیدا و وتی: برۆ لەماڵەوە ئاوگۆشتێك دروست بکە چونکە لەم کاتەدا تام وچێژی تایبەتی دەبێت.

پاسەوانی رەزەکان هات و ئەوی گرت و هاواری کرد. پیاوەکە لەترسی سزای هورموز پشتێنە زێرەکەی خۆی لەجیاتی بەرسیلەکان بەخاوەنی رەزەکەدا و خۆی رزگار کرد. سپاسی خاوەن رەزەکەی کرد کەپشتێنەکەی وەرگرتووە.

دەڵێن: هورموز بەردەوام سەرکەوتوو و بەختەوەر بوو. هەر شتێکی دەویست، بەدەستی دەهێنا. پیاوێکی بیرمەند و فێڵباز و نییەت خراپ بوو. ئەم نەریتەی لەخاڵۆ تورکەکانی خۆی بۆ مابوویەوە. گەورەکانی ریسوا دەکردو لەزاناکان و گەورەکان و بنەماڵە ناودارەکان سیانزە هەزار کەسی کوشت. بەردەوام هاودڵی و هاوخەمی لەگەڵ هەژارەکان دەکرد. ژمارەیەکی زۆر لەکەسە گەورەکانی وڵاتی خستە زیندان و لەکار دووری خستنەوە. سوپای سەر لەنوێ رێکخستەوە و سوارچاکەکانی لابرد. کەسانی دەوروبەر، دڵیان رەش بوو چونکە خوا دەیخواست گۆڕانکاری بەسەر پاشایەتییەکەیان بێت. هەر شتێك هۆکارێکی هەیە. هیربودەکان دژی مەسیحیەکان نامەیەکیان بۆ نووسی. هورموز لەخوارەوە نووسی: ئەگەر تەختی پاشایەتی ئێمە لەسەر دوو پێی کۆنی خۆی بەهێز نەبێت و دوو پایە کۆنەکەی تر، پاشایەتی ئێمە بە لەناو بردنی مەسیحیەکان و شوێنکەوتەکانی ئایینەکانی دیکە کە لەسەرزەمینەکەی ئێمەدا ژیان بەسەر دەبەن، بەهێز نابێت. کارتان بەمەسیحیەکان نەبێت و سەرقاڵی ئەنجامدانی کارە چاکەکان بن تا مەسیحی و شوێنکەوتەکانی ئایینەکانی دیکە بتانبینن و سپاستان بکەن و ئارەزوومەندی باوەڕهێنان بەدینەکەی ئێوە بن.

لەهوشام کوڕی محەممەدی کەلبی دەگێڕنەوە: تورکان دژی هورموز شۆڕشیان دەستپێکرد و بەوتەیەکی دیکە شابە پاشای گەورەی تورکەکان لەساڵی یانزەهەمی

پاشایەتی ئەو هاوریێ لەگەڵ سێسەد هەزار شەڕکەر تا بادغیس وهەرات پێشڕەوی کرد و پاشای رۆم هاوریێ لەگەڵ هەشتسەد هەزار شەڕکەر سنورەکانی بەزاند و مەبەستی هێرش کردنی بوو و شای خەزەر بەسوپایەکی گەورە لەباب و ئەبوابەوە دەرکەوت و خراپەکاری نایەوە و وێرانی دروست کرد. دوو کەس لەعەرەبەکان بەناوی ئەحوەل و عەمرۆ کوڕی ئەزەرق لەگەڵ دەستەیەکی فراوان لەعەرەبەکان لەکەنارەکانی فورات دابەزین و هێرشیان کردە سەر خەڵکانی سواد. دوژمنەکانی هورموز بوێر بوون و هێرشیان کردە سەر سنورەکانی وڵاتەکەی. هێرشەکان بەرادیەك فراوان بوون کەسەرزەمینی فارسیان بەبێژنگی پڕ کون ناو دەبرد. وتیان: دوژمنان بەشێوەیەك دەوری سەرزەمینی فارسیان داوە کەزێی دوو لای کەوان یەك دەگرێتەوە. شابە پاشای گەورەی تورکەکان کەسی بۆلای هورموز و گەورەکانی فارس رەوانە کرد و لەهاتنی خۆی ئاگاداری کردنەوە، وتی: پردەکان چاك بکەنەوە تا بۆ دیاری ئێوە بپەڕمەوە، لەسەر هەر رووبار و ئاوێکی سەر رێگەی من کەپەردتان هەڵنەبەستووە، پردێك هەڵبەستن چونکە دەمەوێت لەسەرزەمینی ئێوەوە هێرش بکەمە سەر رۆمییەکان.

هورموز ترسا و راوێژی کرد. هەمووان وتیان: دەبێت شەڕ لەگەڵ پاشای تورکەکان بکات و ئەو، بەهرام جەشنەسی، کەپیاوێك لەدانیشتوانی رەی و بەچوبین ناویان دەبرد، لەگەڵ دوانزە هەزار کەس بۆ روبەرووی بونەوەی تورکەکانی نارد. بەهرام شەڕکەرانی لەکەسانی بەتەمەن هەڵبژارد و گەنجەکانی پشتگوێ خست.

دەڵێن: لەو کاتەدا هەموو کەسانی ناو دیوانیان بژارد کەحەفتا هەزار کەس بوون. بەهرام لەگەڵ سوپاکەی بەخێرایی رۆشت تا لەهەرات وبادغیس تێپەڕی. شابە ئاگادار نەبوویەوە تا لەنزیك ئوردوگاکەی ئەو ئوردوی لێدا. نامە و شەڕ لەنێوان ئەوان ئاڵوگۆڕ کرا. بەهرام تیرێکی هاوشت و شابەی کوشت.

دەڵێن: لەناو پاشایەتی فارسەکان سێ تیر بەناوبانگە، یەکیان تیرەکەی ئەرشیشاتیر کەلەرۆژگاری مەنوچیهر و ئەفراسیات، ئەوی دیکەیان تیرەکەی سوخرا دژی تورکەکان و سێیەمی تیرەکەی بەهرامی گورە کەشابەی کوشت.

کاتێك شابە کوژرا، بەهرام ئوردووگاکەی تاڵان و لەشوێنەکەی جێگیر بوو. بەرموزە کوڕی شابە کەهاوشێوەی باوکی بوو، هات و لەگەڵ بەهرام شەڕی کرد. شکستی خوارد و لەقەڵایەك خۆی حەشاردا. بەهرام گەمارۆی خستە سەر تا ئەوەی ناچار بوو

خۆی تەسلیم بکات. ئەوی بەئەسیری بۆ لای هورموز رەوانە کرد. گەنجی فراوانی لەقەڵاکەی ئەودا دەستکەوت.

دەڵێن: لەتالآنییەکانی شەڕ، لەسامان و جەواهیر و دەفر و ئاوێنە و کالآکانی دیکە، دوسەد و پەنجا هەزار باری وشتری بۆ هورموز رەوانە کرد. هورموز دەسخۆشی لەبەهرام کرد. بەهرام لەکردەوەکانی هورموز دەترسا. سوپاکەیشی نیگەران بوون. ئەویان لەپاشایەتی لابرد و مەبەستی ڕۆشتنە ناو مەداینیان کرد چونکە لەکار و کردەوەکانی تورە وبێزار بوون، وتیان: پەرویزی کوڕی بۆ پاشایەتی شیاوترە. ئامادەبووانی لای هورموز، هاوکاری بەهرامیان کرد. پەرویز لەترسی باوکی هەڵات و ڕۆشتە ئازەربایەجان. چەند کەسێك لەسنوردار و سوپا سالارەکان لەدەوری کۆبونەوە و پەیمانیان لەگەڵ بەست. گەورە و سەرکردەکان لەمەداین شۆڕشیان کرد. بەندی و بەستام خاڵەکانی پەرویز لەناو ئەواندا دەبینران. هورموزیان لەپاشایەتی لابرد و بەشیش چاویان کوێر ودواتر ئازادیان کرد لەبەر ئەوەی کوشتنی ئەویان بەلاوە گران بوو.

کاتێك پەرویز ئاگادار بوویەوە، لەگەڵ هاوەڵانی خۆی لەئازەربایەجانەوە بەرێکەوت و خێراتر لەبەهرام گەیشت. دەستی بەسەر پاشایەتیدا گرت و دژایەتی بەهرامی کرد. لەکەنارەکانی روباری نەهرەوان روبەڕوی بەهرام بوویەوە. لەکاتی گفتوگۆکان پەرویز بەبەهرامی وت کەئەمانی پێدەبەخشێت وپێگەی بەرز دەکاتەوە و سنوری ویلایەتەکەی ئەو فراوانتر دەکات.

بەڵام بەهرام رازی نەبوو. شەڕ دەستی پێکرد و پەرویز بەناچاری لەدوای شەڕ و پەلامارەکانی شەوانە، هەڵات و بۆ وەرگرتنی هاوکاری رووی لەپاشای ڕۆم کرد.

دەڵێن: دەستەیەك لەپیاوە ئازاکان هاورێیەتی بەهرامیان دەکرد کەسێ کەس لەگەورەکانی تورك لەناو ئەواندا دەبینران کە لەسوارکاری و ئازایەتی کەسی هاوشێوەی ئەوان نەبینراوە. ڕۆژێك دوای هێرشێکی لەناکاو، پەرویز خەڵکانی بۆ شەڕ دژی بەهرام هاندا. خەڵك سستیان لەخۆیان نیشاندا. شەڕکەرانی تورك مەبەستی کوشتنی پەرویزیان کرد. پەرویز روبەرویان بوویەوە و هەرسێکیانی بەدەستی خۆی کوشت و لەگۆڕەپانی شەڕ هاتەدەر. کاتێك لاوازی سوپاکەی خۆی بینی، مەبەستی ڕۆشتن بۆ تیسبونی کرد و ڕۆشتە لای باوکی. بەسەرهاتی خۆی و سوپاکەی و

بەهرامی بۆ باس کرد و داوای بۆچون و چارەسەری لێکرد. وتی: بۆ لای موریەق پاشای رۆم برۆ و داوای هاوکاری لێبکە.

پەرویز ژن و منالەکانی خۆی بردە شوێنێك تا لەدەست بەهرام پارێزراو بن. لەگەڵ دەستەبەکی کەم بەرێکەوت کەبەندی وبەستام و کوردی براکەی بەهرامی چوبین لەناویاندا دەبینران. کاتێك گەیشتە ئەنتاکیە، نامەی بۆ موریەقی پاشای رۆم نوسی. پاشای رۆم وەڵامی دایەوەو و کچە نازدارەکەی خۆی کردە هاوسەری پەرویز کەناوی مریەم بوو.

ساڵەکانی پاشایەتی هورموز کوڕی کەسرا بەوتەیەك یانزە ساڵ و نۆ مانگ و دە رۆژ درێژەی کێشا بەڵام بەوتەی هوشام کوڕی محەممەدی کەلبی ماوەی پاشایەتی ئەو دوانزە ساڵ بوو.

## دوای هورموز، خوسرەو پەرویزی کوڕی پاشایەتی گرتەدەست

خوسرەو پەرویز لەروانگەی بوێری و چارەسەر کردنی کاروبارەکان گەورەتر لەهەموو پاشاکانی فارسە. وەك دەڵێن: هیچ پاشایەك بۆ هێز و بەختەوەری و سەرکەوتن و کۆکردنەوەی گەنج و سامان بەئەندازەی ئەو شانس هاورێیەتی نەکردووە لەبەر ئەمە پێیان دەوت پەرویز کە بەمانای فیروزە ((سەرکەوتوو))

دەڵێن: بەهرامی چوبین فێڵی کرد. هورموز گومانی کرد پەرویز دەوێت لەجیاتی خۆی پاشایەتی بگرێتە دەست. پەرویز لەترسی باوکی بەشێوەیەکی نهێنی بۆ ئازەربایەجان رۆشت ومەبەستەکەی خۆی ئاشکرا کرد. کۆمەڵێك لەسالارەکانی سوپا و کەسانیتر لەدەوری کۆبونەوە و پەیمانیان پێدا هاوکاری بکەن بەڵام پەرویز هیچ کارێکی نەکرد.

دەڵێن: کاتێك ئەزین جەشنش کوژرا کە بۆ شەڕی بەهرامی چوبین رۆشتبوو، سوپاکەی بڵاوەیان لێکرد و بۆ مەداین گەڕانەوە. بەهرام شوێنیان کەوتبوو. کاروبارەکانی هورموز پەرێشان بوو. کچەکەی ئەزین جەشنس کەهاورێی خوسرەو پەرویز بوو، نامەی بۆ نووسی: پاشا بەهۆی کوژرانی ئەزینەوە کاروبارەکانی

لەدەستدا نەماوە و گەورەکانی وڵات بۆ لابردنی ئەو یەکیانگرتووە وئەگەر بەهرامی چوبین زووتر لەو خۆی بەمەداین بگەیەنێت، کاروبارەکان دەگرێتە دەست.

کاتێك نامەکەی بەپەرویز گەیشت، هەرچەندە توانی لەخەڵکانی ئەرمەنییە و ئازەربایەجانی کۆکردەوە و روی کردە مەداین. سەران و گەورەکان لەهاتنی خۆشحاڵ بوون و لەدەوری کۆبونەوە. لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت و وتی: شێوازی پاشایەتی ئێمە چاکەکاری و خێرخوازییە، باوەگەرێی ئێمە، کەسرا ئەنەوشیروان کوڕی قوباد لەجیاتی باوکی ئێوە بوو و باوکی من، هورموز داوەرێکی دادپەروەر، ئێوەیش ملکەچی خۆتان نیشان بدەن.

رۆژی سێیەم رۆشتە لای باوکی و کوڕنوشی بۆ برد و وتی: ئەی پاشا، خواوەند تەمەنی درێژت پێببەخشێت، تۆ دەزانی من لەو بەلای بەسەر تۆدا هێنایان، بێ تاوانم، خۆم شاردەوە و رووم کردە ئازەربایەجان لەبەر ئەوەی لەکوشتنی خۆم بەدەستی تۆ دەترسام.

هورموز وتارەکەی پشتراست کردەوە و وتی: دوو نیازم هەیە، یەکیان ئەوەی تۆڵەی من لەو کەسانە وەربگریت کەمنیان لەسەر کار لابرد و چاویان کوێر کردم و بەزەییت بەواندا نەیێتەوە، ئەوی دیکە ئەوەی کەرۆژانە سێ کەسی بیرمەند بکەیتە هاودەمی من و رێگەیان پێبدەیت لای من کۆببنەوە.

پەرویز لەخۆبوردویی نیشاندا و وتی: ئەی پاشا، خواوەند تەمەنی درێژت پێببەخشێت، بەهرامی بێ دین هێرشی کردۆتە سەرم و لەئێستادا ناتوانم تۆڵەی تۆ لەو کەسانە وەربگرم کەئەو بەلایان بەسەردا هێنابیت، ئەگەر خوا بەسەر دوژمنەکەمدا زاڵمبکات، جێگری تۆم و ملکەچی فەرمانەکانت دەبم.

بەهرام لەهاتنی خوسرەو ئاگادار بوویەوە و زانی کەخەڵکان ئەویان وەك پاشای خۆیان دەستنیشان کردووە. بەسوپاکەی خۆی بەپەلە بەرەو مەداین بەرێکەوت. پەرویز دیدەوانانی دانا و کاتێك بەهرام نزیك کەوتەوە، پەرویز بەرژەوەندی لەئاشتیدا بینی، کەرەستەی شەڕی هەڵگرت و فەرمانی بەبەندی و بەستام و چەند کەسێك لەگەورە بڕواپێکراوەکانی خۆیدا تا کەرەستەی شەڕ هەڵبگرن. بەسوپایەکی هەزار کەسی مەبەستی رووبەرو بونەوەی بەهرامی کرد. خەڵکان دۆعایان بۆکرد. بەندی وبەستام و گەورەکانی دیکەی وڵاتی لەگەڵدابوو. بەرێکەوت تا لەکەنارەکانی نەهرەوان

دابەزی.

کاتێك بەهرام لەهاتنی ئەو ئاگادار بوویەوە، سوار ئەسپێکی ئەبڵەق بوو. سەر رووت هات و نیزەدی جەشنش هاورێیەتی دەکرد. لەگەڵ سێ کەس لەخزمەکانی پاشای تورك کەبەڵێنیان بەبەهرام دابوو پەرویز ئەسیر بکەن. بەهرام بۆ ئەم کارە سامانێکی زۆری پێبەخشیبوون.

کاتێك بەهرام زێر و تاج و چۆنییەتی خۆرازاندنەوەی خوسرەوی بینی کەئالأی کابیان، ئالأی گەورەی فارسەکانی، لەسەر سەری خۆی هەڵکردووە و بەندی و بەستام و گەورەکانی دیکەی وڵات هاورێیەتی دەکەن، خەمبار بوو و بەهاوەڵانی خۆی وت: دایك حیزە دەبینن کەگۆشت و چەوری خستۆتە سەریەك و لەمێردمنداڵی تێپەڕیوە و بۆتە کەسێکی شارەزا، ریشی دەرهێناوە و بۆتە گەنجێکی پیگەیشتوو.

لەوکاتەی بەهرام ئەم قسانەی دەهێنایە سەرزمان و لەسەر کەناری نەهرەوان وەستا بوو، خوسرەو بەیەکێك لەهاوەڵانی خۆی وت: کام یەك لەمانە بەهرامە.

براکەی بەهرام بەناوی کوردی کەتا ئەوکاتەیش ملکەچی فەرمانەکانی خوسرەو بوو، وتی: خواوەند تەمەنی درێژت پێببەخشێت، ئەوەی سوار لەسەر ئەسپە ئەبڵەقەکەیە.

خوسرەو دەستی بەقسە کردن کرد و وتی: بەهرام، تۆ کۆڵەکەی وڵاتەکە و پشتیوانی خەڵکانیت. بۆ راپەڕاندنی کارەکانی ئێمە هەوڵت داوە و کەسێکی بڕواپێکراو بوویت. بڕیارمانداوە لەرۆژێکدا پیرۆزی سوپاسالاری هەموو سەرزەمینی فارس بەتۆ ببەخشین.

بەهرام کە لەخوسرەو نزیك ببویەوە، وتی: بەڵام من بڕیارمداوە تۆ بکوژم.

خوسرەو خەمبار بوو بەڵام بەروخساریەوە دەرنەکەوت. گفتوگۆی ئەوان درێژەی کیشا. بەهرام بەپەرویزی وت: ئەی روسپی زادە کە لەخێوەتی کوردەکان گەورە بوویت!

قسەی لەمشێوەی هێنایە سەرزمان. بەوتەکانی خوسرەو رازی نەبوو. باسی ئیرەشی باوەگەورێی بەهرامیان کرد. خوسرەو پێی وت: ئیرەش ملکەچی فەرمانەکانی مەنوچێهر بوو. بەوپەڕی دڵرەنجانەوە لەیەك جیابوونەوە.

بەهرام خوشکێکی بوو بەناوی کردییە کەژنێکی پێگەیشتوو ئاوزدار بوو. ئەوی

کردبووە هاوسەری خۆی. کردیە بۆ ئیهانە کردنی پاشا، سەرکۆنەی بەهرامی کرد و داوای لێکرد ملکەچی فەرمانەکانی پاشا ببێت.

بەهرام رازی نەبوو. لەنێوان ئەو و خوسرەو پەلامار و هێرشی لەناکاوی شەوانە دەستی پێکرد. رۆژی دوای هێرشی شەو، خوسرەو هاتە ناو گۆڕەپانی شەڕ. کاتێك سێ تورکە شەڕکەرەکە ئەویان بینی، مەبەستی کوشتن و گرتنی ئەویان کرد. خوسرەو هەرسێکیانی بەدەستی خۆی کوشت و خەڵکی بۆ شەڕ کردن هاندا، بەڵام سستی و لاوازی لەواندا بینی. بڕیاریدا بۆ وەرگرتنی هاوکاری بڕواتە لای یەکێك لەپاشاکان. رۆشتە لای باوکی و راوێژی لەگەڵ کرد. باوکی پێی وت بڕواتە لای پاشای رۆم. هاوسەر و منداڵەکانی خۆی بۆ شوێنێکی ئەمن برد ولەگەڵ دەستەیەکی کەم کەبندی و بەستام و کوردی لەناویاندا دەبینران، بەرێکەوت.

کاتێك لەمەداین رۆشتنەدەر، خەڵك ترسان کەبەهرام هورموز بۆ پاشایەتی بگەڕێنێتەوە و لەلایەن خۆیەوە نامە بۆ پاشای رۆم بنوسێت کەئەوان بگەڕێنێتەوە و لەناو بچن. ئەمەیان لەگەڵ خوسرەو پەرویز باس کرد و داوایان لێکرد رێگە بدات هورموز بکوژن. وەڵامی نەدانەوە. بەندی و بەستام و دەستەیەك لەهاوەڵانیان بۆ لای هورموز گەڕانەوە و ئەویان خنکاند و دواتر بۆ لای خوسرەو گەڕانەوە و وتیان بەرێکەوە. بەخێرایی رێگەیان بڕی تا گەشتنە فورات و پەڕینەوە. رێگەی بیابانیان گرتەبەر. پیاوێك بەناوی خورشیدان بەڵەدی رێگاکەیان بوو. گەشتنە خانەقایەك و لەوێ دابەزین. سوپاکەی بەهرام بەسەرکردایەتی پیاوێك بەناوی بەهرام کوڕی سیاوەش گەیشت. کاتێك ئاگادار بوونەوە، بەندی، خوسرەو پەرویزی لەخەو هەستاند و وتی: رێگە چارەیەك بۆ رزگاری کردنی ژیانی خۆت بدۆزەرەوە چونکە دوژمن لەبەر دەرگایە. خوسرەو وتی: رێگە چارەم لا نییە.

بەندی وتی: گیانی خۆی بۆ رزگاری کردنی ئەو دەبەخشێت و وتی جل و بەرگەکانی خۆی لەگەڵدا بگۆڕێتەوە و لەگەڵ ئەوانیتر لەخانەقاکە بڕواتەدەر. ئەو کارەیان کرد وپێش ئەوەی دوژمن بگات، لەناو کێوەکەدا خۆیان شاردەوە. کاتێك بەهرام کوڕی سیاوەش هات، بەندی کەجل و بەرگەکانی پەرویزی لەبەردا بوو، لەسەر بانی خانەقاکەوە دەرکەوت. ئەو گومانەی لای بەهرام دروست کرد کەپەرویزە. داوای لێکرد تا بەیانی مۆڵەتی پێبدات بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی ئاشتیانە خۆی تەسلیم بکات.

بەهرام مۆڵەتی پێدا. دوای ئەوەی بەفێڵەکەی زانی، ئەوی بۆ لای بەهرامی چوبین برد. چوبین ئەوی لای بەهرام کوڕی سیاوەش زیندانی کرد.

دەڵێن: بەهرامی چوبین ڕۆشتە دارالملکی مەداین و لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت. گەورەکان وسەرکردەکان لەدەوری کۆبوونەوە. قسەی دەستپێکردو لەوتەکانیدا ئیهانەی پەرویزی کرد. لەنێوان بەهرام وسەرکردە و گەورەکان گفتوگۆیەکی دووروودرێژی دەستی پێکرد. هیچ کەس پاشایەتی ئەوی پشتراست نەکردەوە، بەڵام بەهرام لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت و تاجی لەسەر نا. خەڵکان لەترسا ملکەچی فەرمانەکانی بوون.

دەڵێن: بەهرام کوڕی سیاوەش لەگەڵ بەندی بڕیاریاندا بەهرامی چوبین بکوژن. بەهرامی چوبین ئاگادار بوویەوە و بەهرامی کوشت. بەندی هەڵات و ڕوی کردە ئازەربایەجان.

پەرویز بەرێکەوت تاگەیشتە ئەنتاکیە، لەوێوە نامەی بۆ موریق پاشای ڕۆم نووسی و دەستەیەك لەهاوەڵانی خۆی بۆ لای ئەو ڕەوانە و داوای هاریکاری لێکرد. موریق ڕازی و کچەکەی خۆی بەناوی مریەمی کردە هاوسەری ئەو. سیادوسی برای خۆی بەسوپایەکی شەست هەزار کەسی ڕەوانە کرد لەگەڵ پیاوێك بەناوی سەرجیس تا کاروبارەکان ڕاپەڕێنێت و پیاوێکی دیکە کەهێزەکەی بەرابەری هەزار پیاو بوو. هاوکاری پەرویزی کرد بەو مەرجەی داوای ئەو باجە نەکات کەباوکی لەپاشاکانی ڕۆمی وەردەگرت.

کاتێك سوپای ڕۆم گەیشتە لای پەرویز، شادمان و فەرمانی حەوانەوەی پێنج ڕۆژەی بەسوپاکەدا. ئەوسا بەناو سوپاکەدا گەڕا و سالارەکانی دەستنیشان کرد. سەرجیس و پیاوە بوێرەکە، هاوڕێیەتی سوپاکەیان دەکرد. سوپا بەرێکەوت تا گەیشتە ئازەربایەجان و لەسارای دەنق دابەزی. ئەبدوییید و یەکێك لەسوپا سالارەکانی ویلایەت بەناوی موسیل هاوڕێ لەگەڵ چل هەزار سوپایی پەیوەستیان بوون. خەڵکان لەفارس و ئیسفەهان و خوراسان بەبەردەوامی لەدەوری پەرویز کۆدەبوونەوە.

بەهرام ئاگادار بوویەوە کەپەرویز لەسارای دەنق دابەزیوە. لەمەداینەوە بەرێکەوت و شەڕ لەنێوان ئەوان دەستی پێکرد. پیاوە بوێرە ڕۆمیەکە لەم شەڕەدا کوژرا.

دەڵێن: پەرویز لەدەرەوەی سوپاکە هاوڕێ لەگەڵ چواردەکەس کەکوردی برای بەهرام و بەندی و بەستان و شاپور ئەندیان و ئەبادور و فەرخوزاد و فەروخ هورموز لەناویاندا دەبینران، لەگەڵ بەهرام شەڕی کرد. شەڕ بۆ شەڕی دەستەویەخە گۆڕا.

بەوتەی ئاگرپەرەستەکان پەرویز کەوتە ناو دۆڵێك. بەهرام شوێنی کەوت و کاتێك گومانی کرد دەتوانێت ئەو بگرێت، شتێك کەکەس نازانێت، ئەوی بۆ سەرەوەی کێوەکە برد.

دەڵێت: ئەستێرە ناسەکان وتبوویان پەرویز بۆ ماوەی چل و هەشت ساڵ پاشایەتی دەکات. پەرویز و بەهرام شەڕی دەستەویەخەیان تاقی کردەوە. پەرویز، ڕمەکەی ئەوی لەپێڵاوەکەی ڕفاند و لەسەری چەقاند. بەهرام ترسا وپەرێشان بوو و زانی ناتوانێت لەبەرابەر پەرویز خۆڕاگری بکات. بەرەو خوراسان بەرێکەوت و لەوێوە بۆ لای تورکەکان. پەرویز بیست هەزار درەمی لەناو سوپاکەدا دابەش کرد. ئەوانی بۆ لای موریق گەڕاندەوە و خۆی گەڕایەوە بۆ مەداین.

دەڵێن: پەرویز فەرمانی بۆ مەسیحیەکان نووسی و ڕێگەی پێدان کەنیسەکان ئاوەدان بکەنەوە و جگە لەئاگر پەرستەکان هەرکەس دەتوانێت باوەڕ بەدینەکەیان بێنێت.

هۆکارەکەی ئەوە بوو، ئەنەوشیروان بەڵێنی بەقەیسەر دابوو، ئەو باجەی وەریدەگرێت بۆ ئەو فارسانەی خەرج بکات کەلەسنوری ڕۆمدا نیشتەجێن وئاتەشکەدەیان بۆ دروست بکات. قەیسەریش ئەو مەرجەی بۆ مەسیحیەکانی سەرزەمینی فارس دیاری کردبوو.

بەهرام لەناو تورکەکان دەژیا. لای پاشاکەیان ڕێزدار بوو. پەرویز فریوی بەکار برد و پیاوێك بەناوی هورموزی بەگەنجێکی فراوان بۆ لای تورکەکان ڕەوانە کرد. گەوهەر و گەنجەکانی بەخاتون ژنی پاشای تورکەکاندا. خاتون کەسی ڕەوانە کرد و بەهرامیان کوشت.

دەڵێت: خاقان لەمەرگی بەهرام خەمبار بوو. کەسی بۆ لای کردییەی خوشك و هاوسەری بەهرام ڕەوانە کرد و هاوخەمی خۆی نیشاندا. داوای لێکرد ببێتە هاوسەری نەتری برای خاقان. خاقان، خاتونی بۆ ئەم کارەی تەلاقدا.

دەڵێن: کردییە بەشێوەیەکی نەرم وەڵامی دایەوە بەڵام ڕازی نەبوو ببێتە هاوسەری

ئەتر. هەموو سوپای براکەی لەسەرزەمینی تورکەکان بردەدەر و ئەوانی لەسنورەکانی فارس نیشتەجێ کرد. ئەتر، بەسوپایەکی دوانزە هەزار کەسی شوێن سوپاکەی کەوت. کردییە ئەتری بەدەستی خۆی کوشت و درێژەی بەرێگەکەیدا. نامەی بۆ کوردی برای خۆی نوسی. کوردی لەپەرویز ئەمانی بۆ وەرگرت. کاتێك گەیشتە لای پەرویز، ئەوی وەك هاوسەری خۆی دەستنیشان و خۆشحاڵی خۆی لەو کارە دەربڕی. هەروەها بۆ سەرکۆنە کردنی بەهرام، سوپاسی کرد.

پەرویز بەچاکی و هاوکاریی موریق پاشای رۆم، پاشایەتی گرتەدەست. دوای ئەوە خوسرەو چواردە ساڵ پاشایەتی کرد. رۆمیەکان موریقیان لەسەر کار لابرد و کوشتیان و پاشماوی دارودەستەکەی ئەویان لەناو برد.

کاتێك خوسرەو ئاگادار بوویەوە کەرۆمیەکان موریقیان کوشتووە، تورە بوو. کوڕەکەی موریق کەپەنای بۆ خوسرەو هێنابوو، وەك پاشای رۆم گەڕاندەوە و سێ لەسەردارەکان و سوپایەکی گەورەی، لەگەڵ ئەودا رەوانە کرد.

ناوی یەکێك لەسەردارەکان رمیوزان بوو. ئەوی بۆ دیاری شام نارد ودەستی بەسەر ئەو سەرزەمینەدا گرت و گەیشتە سەرزەمینی فەلەستین و ڕۆشتە ناو شاری بیت المقدس، ئەسقوف و قەشە و مەسیحیەکانی گرت تا خاچەکەی دەست بکەوێت. خاچەکەیان لەناو سنوقێکی زێر و لەباخێکدا خستبووە ژێر خاك وسەوزەیان لەسەر چاندبوو. رمیوزان پێداگری کرد و بەناچاری شوێنەکەیان نیشاندا. بەدەستی خۆی هەڵیکەند و خاچەکەی بۆ خوسرەو رەوانە کرد. ئەم رووداوە لەبیست و چوارەمین ساڵی پاشایەتی ئەو روویدا.

سەردارەکەی دیکە ناوی شاهین و فەرمانڕەوایەتی رۆژئاوای دەکرد. دەستی بەسەر میسر و ئەسەکەندەریە و دیاری نۆبەدا گرت و کلیلەکانی شاری ئەسکەندەرییەی بۆ خوسرەو نارد. ئەمە لەبیست وهەشتەمین ساڵی پاشایەتی خوسرەو روویدا.

سێیەم سەرداری ناوی فەرهان و پلە وپێگەی شەهر بەرازی بوو. مەبەستی گرتنی قوستەنتینەی کرد. لەسەر کەنارەکانی کەنداو دابەزی و خێوەتی هەڵدا. خوسرەو فەرمانی پێدا بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی موریق دیاری رۆمیەکان وێران و خاپور بکات. کەس لەرۆمیەکان ملکەچی فەرمانەکانی کوڕەکەی موریق نەبوون، بەلأم قوفا

پاشاکەی خۆیان کوشت چونکە خراپەکار و خوانەناس و توانای چارەسەر کردنی کاروبارەکانی نەبوو. هێرقلیان وەك پاشای خۆیان دەستنیشان کرد.

کاتێك هێرقل بینی، سوپای فارسەکان لەدیاری رۆم کوشتار و تالآنی و وێرانی و ئەسیر کردن و بێ ڕێزیان بەرابەر بەرۆمییەکان ئەنجامداوە، لەخوا پاڕایەوە تا خۆی و سوپاکەی لەدەست فارسەکان رزگار بکات. لەخەودا بینی پیاوێکی چوارشانە بەپۆششێکی رازاوە لەشوێنێك، نزیك لەخۆی، لەسەر بەرزاییەك دانیشتووە. یەکێك هاتە لای ئەوان و ئەو پیاوەی لەبەرزاییەکە خستەخوار. بەهێرقلی وت: ئەوم بەدەستی تۆ سپارد. بەلآم کاتێك لەخەو هەستا، خەوەکەی بۆ کەس نەگێڕایەوە. جارێکی دیکە لەخەودا بینی، هەمان پیاو لەشوێنێکی بەرز دانیشتووە و پیاوێکی دیکە هات کەزنجیرێکی درێژی بەدەستەوە بوو. ئەوی کردە ملی پیاوەکە و تەسلیمی هێرقلی کرد و وتی: خوسرەوم بەتۆسپارد، هێرشی بکەسەر چونکە سەرکەوتن بەدەست دێنیت و بەئارەزووی خۆت دەگەییت.

کاتێك چەند جارێك ئەم خەوەی دووبارە بوویەوە، لەگەڵ گەورەکان و راوێژکارانی رۆم باسی کرد و وتیان: سەرکەوتن بەدەست دێنێت و دەبێت هێرش بکاتە سەر خوسرەو.

هێرقل بۆ شەڕ خۆی ئامادە کرد و کوڕەکەی کردە جێگری خۆی لەقوستەنتەنییە. لەرێگەیەك دور لەرێگەکەی شەهر بەراز، بەرەو ئەرمەنییە بەرێکەوت و دوای یەك ساڵ لەنەسیبین دابەزی. کاتێك هێرقل گەیشتە نەسیبین، شەهین فەرمانڕەوای رۆژئاوا لەبارەگای خوسرەودا بوو چونکە پاشا دڵی لەو ڕەش و ئەوی لەفەرمانڕەوایەتی ئەو سنورە دوور خستبوویەوە. شەهر بەراز لەجێگەکەی خۆی ئوردوی لێدا چونکە خوسرەو فەرمانی مانەوەی لەو شوێنە پێدا.

کاتێك خوسرەو لەگرتنی نەسیبین ئاگادار بوویەوە، یەکێك لەسەردارەکانی خۆی بەناوی راهرازی بەسوپایەکی دوانزە هەزار کەسی بۆ رووبەروو بونەوەی هێرقل رەوانە کرد و فەرمانی پێدا لەنەینەوا لەولایەتی موسڵ لەکەنار دیجلە بمێنێتەوە و رێگە نەدات رۆمیەکان لەدیجلە بپەڕنەوە.

ئەوکاتەی خوسرەو لەهەوڵەکانی هێرقل ئاگادار بوویەوە، لەکۆشکی پاشایەتیدا بوو. راهراز فەرمانەکانی بەکار بەست و لەهەمان شوێن ئوردوی لێدا. هێرقل

لەشوێنێکی دیکەوە، لەدیجلە پەڕییەوە و خۆی گەیاندە سوپای فارسەکان. ڕاهراز سیخوڕەکانی ڕەوانە کرد و هەواڵیان هێنا کەسوپاکەی حەفتا هەزار شەڕکەری لەگەڵدایە. ڕاهراز زانی بەو سوپایەی خۆی ناتوانێت لەبەرابەر ئەوان خۆڕاگری بکات. بەردەوام نامەی بۆ خوسرەو دەنووسی کەهێرقل بەسوپایەکی حەفتا هەزار کەسییەوە هێرشی کردووە و سوپاکەی ئەو توانای بەرگری کردنی نییە چونکە ژمارەیان فراوان و کەرەستەی باشیان لەبەردەستایە. خوسرەو بەردەوام وەڵامی دەدایەوە، ئەگەر توانای بەرگری کردنتان نییە، دەتوانن ژمارەیەك لەوان بکوژن و لەم ڕێگادا شەرابی کوژران بنۆشن.

کاتێك وەڵامەکانی خوسرەو بەنامەکانی ڕاهراز بەم ناوەڕۆکە دوبارە بوویەوە، سوپاکەی ڕازاندەوە و لەگەڵ ڕۆمیەکان شەڕی دەستپێکرد. ئەویان لەگەڵ شەش هەزار کەسی دیکەدا کوشت و پاشماوەی سوپاکە شکستیان خوارد. کاتێك خوسرەو لەکوژرانی ڕاهراز و سەرکەوتنی هێرقل ئاگادار بوویەوە، لەرزی و لەکۆشکی پاشایەتیەوە ڕووی کردە مەداین و خۆی لەناو قەڵاکاندا داشارد چونکە توانای بەرگری کردنی سوپاکەی هێرقلی نەبوو. هێرقل تا نزیك مەداین پێشڕەوی کرد. خوسرەو خۆی بۆ شەڕ ئامادە کرد بەڵام هێرقل بۆ سەرزەمینی ڕۆم گەڕایەوە.

دوای ئەوە خوسرەو نامەی بۆ سەردارە تێکشکاوەکان نووسی: ئەو سەردار و شەڕکەرانی لەکاتی شەڕەکان سستی و لاوازیان لەخۆیان نیشاندوە و لەشوێنەکانی خۆیان پاشەکشێیان کردووە، بەو بناسێنن تا بەئەندازەی پێویست سزایان بدات. بەم نامەیە دژایەتی کردنی ئەوانی بۆ خۆی دەستەبەر کرد چونکە بۆ ڕزگار کردنی خۆیان بیریان لەچارەسەر دەکردەوە.

هەروەها نامەی بۆ شەهر بەراز نوسی تا بڕواتە لای و لەم کارەدا بەپەلە بێت. کاروباری ڕۆمیەکانی لەگەڵ ئەودا باس کرد.

دەڵێن: وتاری خواوەند سەبارەت بەپاشایەتی خوسرەو پەرویزی پاشای فارس و پاشای ڕۆم بەو شێوەیە کەدەفەرمێت:

(( الم، غلبت الروم فی ادنی الارض و هم من بعد غلبهم سیغلبون. فی بضع سنین، لله الامر من قبل و من بعد و یومئذ یفرح المؤمنون. بنصر الله ینصر من یشاء و هو العزیز

الرحيم. وعدالله لا يخلف الله وعده ولكن اكثر الناس لا يعلمون.

واتاکەی: ڕۆمیەکان لەنزیك ئەم سەرزەمینە شکستیان خوارد. بەڵام ئەوان دوای ئەم شکستە دوای چەند ساڵێك سەرکەوتن بەدەست دێنن، بۆ کاتەکانی داهاتوو هەموو ڕووداو و کارەکان بەئیرادەی خواوەندە. ئەو ڕۆژە باوەڕداران لەهاوکاری خواوەند شادمان دەبن چونکە هەرکەس بخوازێت، هاوکاری دەکات، لەبەر ئەوەی بەهێز و بەخشندەیە. بەڵێنی خواوەندە و خواوەند بەڵێنەکەی خۆی پشتگوێ ناخات بەڵام زۆربەی خەڵك نازانن.))

ئاماژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەعێکرەمە دەگێڕنەوە: فارسەکان و ڕۆمیەکان لەسەرزەمینێکی نزیك شەڕیان کرد. سەرزەمینی نزیك ئەزرەعاتە کەلەوێ ڕوبەڕوو بوونەوە و ڕۆمیەکان شکستیان خوارد. ئەم هەواڵە بە پێغەمبەر(د.خ) و هاوەڵانی گەیشت کە لەمەککە بوون. ڕووداوەکە بۆ ئەوان دژوار بوو چونکە زاڵبوونی ئاگرپەرستەکانیان بەسەر شوێنکەوتەکانی ئایینی مەسیح پەسەند نەدەکرد. بێ بڕواکانی مەککە شادمان بوون و سەرکۆنەی هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) یان کرد و وتیان: ئێوە شوێنکەوتەی کتێبن و مەسیحیەکانیش بەهەمان شێوە. بەڵام ئێمە و برا فارسەکانمان بەسەر براکانی ئێوەدا سەرکەوتین، ئێوەیش ئەگەر شەڕ لەگەڵ ئێمە بکەن، سەرکەوتن بەئێمە دەبڕێت. ئایەکانی الم غلبت الروم تا غافلون هاتەخوار. ئەبوبەکری سدیق ڕۆشتە لای بێ بڕواکان و وتی: لەسەرکەوتنی براکانتان بەسەر براکانی ئێمە شادمانی مەکەن چونکە سوێند بەخوا، ڕۆمیەکان بەسەر فارسەکاندا سەردەکەون و ئەمە وتەی پێغەمبەرە(د.خ) .

ئەبی کوڕی خەلەف جومەحی هەستا و وتی: ئەی باوکی فوزەیل درۆت کرد.

ئەبوبەکر وتی: ئەی دوژمنی خوا، تۆ درۆزنتریت.

ئەبی وتی: لەگەڵ تۆ تا ماوەی سێ ساڵ لەسەر دەوشتر گرێو بدکەم، ئەگەر ڕۆمیەکان بەسەر فارسەکاندا زاڵبون، من دۆڕاوم و ئەگەر سەرکەوتن بەفارسەکان

بوو، تۆ دۆراوییت.

ئەبوبەکر بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) گەڕایەوە و لەداستانەکە ئاگاداری کردەوە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: من ئەم قسەم هێنایە سەرزمان، چەند ساڵ، لەسێ ساڵەوە تا نۆ ساڵە، مەرجەکە زیاتر بکە و ماوەکە درێژتر.

ئەبوبەکر ڕۆشت و ئەبی بینی. پێی وت: پەشیمان بوویتەوە؟

ئەبوبەکر وتی: نا، مەرجەکە زیاتر دەکەین و ماوەکە درێژتر دەکەینەوە، مەرجەکە سەد وشتر بێت و ماوەکە نۆ ساڵ.

ئەبی وتی: رازیم.

لەعێکرەمە دەگێڕنەوە: لەدیاری فارسەکان ژنێك دەژیا کەمناڵەکانی هەموو پاشا بوێرەکان بوون. خوسرەو ئەوی بانگ کرد و وتی: دەمەیوێت سوپایەك بۆ روبەرو بونەوەی رۆمیەکان رەوانە بکەم و یەکێك لەکوڕەکانی تۆ بکەمە سەرکردەو سالاری ئەوان. بۆچوونی تۆچییە و سالاری بەکامیان ببەخشم؟

دەڵێت: ئەو ژنە کەلەرێوی فێڵبازتر و لەهەڵۆ وریاتر بوو، وتی: فەرخان لەتیر تیژترە و شەهر بەراز، خۆڕاگرە، هەر کامیان دەخوازیت، بیکەسەرکردە و سالار.

خوسرەو وتی: سالاری بەکەسی خۆڕاگر دەبەخشم. سالاری سوپاکەی بەشەهر بەرازدا و ئەو لەگەڵ سوپای فارسەکان بۆ روبەرو بونەوەی رۆمیەکان بەرێکەوت و سەرکەوتنی بەدەست هێنا. خەڵکانی کوشت و شارەکانی وێران و خاپوور و دار زەیتونەکانی بڕییەوە.

بێژەر دەڵێت: ئەم حەدیسەم بۆ عەتای خوراسانی گێڕایەوە، وتی: مەگەر سەرزەمینی شامت نەبینیوە؟

وتم: نە.

وتی: ئەگەر بڕۆیتە ئەو سەرزەمینە، شارە وێران و دار زەیتوونە بڕاوەکان دەبینیت.

دەڵێت: دوای ئەوە رووم کردە سەرزەمینی شام و ئەوەی وتبووی، بەچاوی خۆم بینیم.

لەیەحیا کوڕی مەعمەر دەگێڕنەوە: قەیسەر، پیاوێکی بەناوی قەتمە هاوڕێ

لەگەڵ سوپایەك رەوانە كرد و خوسرەویش شەهر بەراز. لەئەزرەعات و بەسرا روبەرووی یەك بوونەوە كەسەرزەمینێك لەنزیكە شامە. فارسەكان و رۆمیەكان شەڕیان كرد و فارسەكان توانیان سەركەوتن بەدەست بێنن. كافرەكانی مەككە شادمان و موسوڵمانەكان خەمبار بوون. خواوەند ئایەی الم غلبت الروم ی ناردەخوار.

ئەویش ئاماژەی بەگێڕانەویەكی هاوشێوەی گێڕانەوەی عێكرەمە داوە و زیادی كردووە: شەهربەراز بەردەوام هێرشی دەبرد و شارە رۆمیەكانی تالاَن و وێران دەكرد تا گەیشتە كەنداو. لەم كاتەدا خوسرەو مرد و رۆمیەكان ئاگادار بوونەوە و شەهر بەراز و سوپاكەی شكستیان خوارد. رۆمیەكان بەسەر ئەواندا سەركەوتن و شوێنیان كەوتن و ئاشی كوشتاریان لەناو ئەوان خستەگەڕ.

دەڵێت: لەگێڕانەوەی عێكرەمە ئاماژەی پێدراوە، كاتێك فارسەكان بەسەر رۆمیەكاندا سەركەوتن، فەرخان بۆ شەراب خواردنەوە دانیشت و بەهاوەڵانی خۆی وت: لەخەودا بینیم لەسەر تەختی خوسرەو دانیشتووم. ئەم هەواڵە بەكەسرا گەیشت و نامەی بۆ شەهر بەراز نووسی: كاتێك نامەكەی من بەدەستی تۆ دەگات، سەری فەرخان بۆ من رەوانە بكە.

شەهر بەراز لەوەلاَمدا نووسی: ئەی پاشا، كەسێكی هاوشێوەی فەرخانت دەستناكەوێت چونكە شكۆ و بوێری ئەو كاریگەری گەورەی لەسەر سوپای دوژمن هەیە و نابێت ئەم كارە ئەنجام بدرێت.

خوسرەو نووسی: لەناو فارسەكان كەسانی بوێری وەك ئەو فراوانن. لەزووترین كات سەری ئەو رەوانە بكە.

دوبارە شەهر بەراز نامەیەكی بۆ نووسی و بیانووی هێنایەوە.

خوسرەو تورە بوو و وەلاَمی نەدایەوە. پەیكی بۆ لای سوپای فارسەكان رەوانە كرد: من شەهربەرازم لەكارەكەی دورخستۆتەوە و سالاریم بەفەرخان بەخشیوە. نامەیەكی بچوكی بەپەیكەكەدا و وتی: كاتێك فەرخان سالاری گرتە دەست و براكەی ملكەچی خۆی نیشاندا، ئەم نامەی پێبدە.

كاتێك پەیك نامەی بەشەهربەرازدا و خوێندیەوە، وتی: ملكەچی فەرمانەكانم.

لەسەر تەختەکە هاتەخوار و فەرخان لەسەر تەخت دانیشت. پەیک نامەکەی بەفەرخاندا و وتی: شەهر بەراز بێنن. کاتێک شەهر بەرازیان بردە پێش بۆ ئەوەی بیکوژن، وتی: پەلە مەکە، تا وەسیەتی خۆم بنووسم.

فەرخان رازی بوو.

شەهر بەراز داوای کاغەزەکانی خۆی کرد و سێ نامەکەی نیشاندا و وتی: ئەم هەموو نامەم سەبارەت بەتۆ بۆ خوسرەو نوسیوە و تۆ بەیەک نامە دەتەوێت من بکوژیت.

فەرخان پاشایەتی بۆ براکەی گەڕاندەوە و شەهر بەراز نامەی بۆ پاشای رۆم نووسی: کارێکی تایبەتم بەتۆ هەیە وناتوانم بەپەیەک رەوانەی بکەم و ناتوانم بەنامە بینووسم، بۆ بینینی من وەرە و زیاتر لەپەنجا رۆمی لەگەڵ خۆت مەهێنە و منیش پەنجا کەس لەگەڵ خۆم دێنم.

قەیسەر لەگەڵ پێنسەد رۆمی هات و دیدەوانەکانی وەک پێشەنگی خۆی رەوانە کرد چونکە لەفرت وفێڵ دەترسا. دیدەوانەکان ئاگاداریان کردەوە کەزیاتر لەپەنجا پیاوی لەگەڵ نییە.

دوای ئەوە فەرشیان بۆ راخستن و لەخێوەتێکدا چاویان بەیەککەوت. هەرکامیان کێردێکی هەڵگرتبوو. داوای وەرگێرەکانیان کرد. شەهر بەراز وتی: من و براکەم بەبوێری و فرت و فێڵ شارەکانی تۆمان وێران کرد. ئێستا خوسرەو رژدی بەئێمە دەبات و نامەی بۆ نووسیم تا براکەم بکوژم. منی لەسەر کار لابرد و داوای لەبراکەم کرد من بکوژێت. ئەویش رازی نەبوو. هەردووکمان ئەومان لەپاشایەتی لابردووە و دەمانەوێت شان بەشانی تۆ شەڕی لەگەڵ بکەین.

قەیسەر وتی: چاکترین کار، ئەمەیە.

یەکیان بەوی دیکەی وت: نهێنی لەنێوان دووکەسدا بێت چونکە ئەگەر بەدەمی سێیەم کەس بکات، ئاشکرا دەبێت. ئەوی دیکە وتی: رازیم. وەرگێرەکانیان بەکێرد کوشت و خواوەند خوسرەوی لەناوبرد. لەرۆژی حودەیبیە هەواڵ بەپێغەمبەری خوا گەیشت و شادمان بوو.

## گێڕانەوەی ئەو ڕووداوانەی لەکاتی ڕووخانی پاشایەتی فارسەکان بەئیرادەی خواوەند ڕوویاندا و عەرەبەکان بەسەریاندا زاڵبوون کەخواوەند بەهۆی پێغەمبەرەوە، خەلافەت و دەسەلاَت و پاشایەتی پێبەخشیبوون

لەوەهب کوڕی مونبە دەگێڕنەوە: خوسرەو لەسەر دیجلە پردێکی دروست کرد و سامانێکی زۆری لەم ڕێگادا خەرج کرد کەکەس ئەندازەکەی نەدەزانی. هەیوانی ئەو بینایەك بوو کەس هاوشێوەی نەبینیبوو. کاتێك خوانی ڕادەخست و تاجەکەی خۆی هەڵدەواسی و لەهەیوان دادەنیشت، سێسەد و شەست کەسی زانا لەکاهین و ئەستێرەناس و جادوگەر لای ئەو کۆدەبوونەوە.

دەڵێت: یەکێك لەعەرەبەکان بەناوی سایب لەناو ئەواندا دەبینرا کەوەك عەرەبەکانی دیکە پێشگۆیی دەکرد. کەمتر هەڵەی دەکرد و بازان ئەوی لەیەمەنەوە ڕەوانە کردبوو. کاتێك خوسرەو بیری لەئەنجامدانی کارێك دەکردەوە، کاهین و ئەستێرە ناس و جادووگەرانی کۆدەکردەوە و فەرمانی پێدەدان: لەم کارە تێرامێنن و بۆچونی خۆتان باس بکەن.

کاتێك خواوەند پێغەمبەری(د.خ) ڕەوانە کرد، بەرەبەیان هەیوانەکەی خوسرەو، قەڵشتی بردبوو بێ ئەوەی قورسایی لەسەر بێت، بەنداوەکەی دیجلە دارما. کاتێك ئەمەی بینی، خەمبار و وتی: تاقی پاشایەتی من بێ ئەوەی قورسایی لەسەر بێت، قەڵشتی برد و پردەکەی دیجلە دارما و شا تێکشکا. داوای کاهین و ئەستێرەناسەکانی کرد. سایب لەناو ئەواندا بوو، پێی وتن: تاقی پاشایەتی من بێ ئەوەی قورسایی لەسەر بێت، قەڵشتی برد و بەنداوەکەی دیجلە دارما، بۆچونتان سەبارەت بەم ڕوداوانە چییە؟

ئەو دەستە ڕۆشتنەدەر و دەستیان بەلێکۆڵینەوە و تێرامان کرد. کەنارەکانی ئاسمان گیرابوو، زەوی تاریك بەرچاو دەکەوت. لەزانستەکەی خۆیان نوقم بوون. بەلاَم جادووی جادوگەر و کاهینی کاهین و ئەستێرەناسی ئەستێرەناس، دەور و کاریگەرییان نەبوو.

سایب شەوی تاریکی لەسەر تەپۆڵکەیەك بەسەر برد و بینی لەحیجاز بروسکەیەك بەرز بوویەوە تا گەیشتە ڕۆژهەلاَت. بەرەبەیان سەیری ژێرپێی خۆی کرد و باخێکی

سەرسەوزی بینی، بەخۆی وت: ئەگەر ئەوەی بینیم، راست بێت، پاشایەك لەحیجاز دەردەکەوێت و دەگاتە رۆژهەلآت و زەوی لەبەرەکەتی ئەو سەرسەوز دەبێت.

کاتێك کاهین و ئەستێرەناسەکان کۆبوونەوە و بۆچوونەکانی خۆیان باس کرد، سایبیش بینراوەکانی خۆی گێڕایەوە، وتیان: سوێند بەخوا زانستی ئێوە لەکار نەکەوتووە مەگەر بەهۆی رووداوێکی ئاسمانی و ئەویش پێغەمبەرێکە کەرەوانە دەکرێت یا رەوانە کراوە و ئەم پێغەمبەرە پاشایەتی لەناو دەبات. ئەگەر هەواڵی رووخانی پاشایەتییەکەی بەخوسرەو بڵێت، دەتانکوژێت، کەواتە لەسەر شتێك رێککەون تا ئاگاداری بکەینەوە و بۆ ماوەیەك زیان لەخۆمان دوور بکەینەوە.

رۆشتنە لای کەسرا و وتیان: لەم کارە تێراماین و زانیمان ئەو بورجەی تاقی پاشایەتیت بەبەراوەرد کردن و خەملآندنی بینا کردووە و هەروەها ئەو بورجەی بەنداوی دیجلەت تیا دروست کردووە، شوومە و کاتێك شەو و رۆژ سوڕاوە، شانسی شووم بۆ شوێنەکەی خۆی گەڕاوەتەوە و ئەو شتەی لەو بورجەدا بینا کراوە، وێران و خاپور بوە. ئێستا ئێمە بەخەملآندن بورجێکی دیکە بۆ تۆ دەستنشیان دەکەین کەبینای تیا دروست بکەیت و لەوێرانی بەدوور بێت.

بەراوەردیان کرد و وتیان: بیناکەی خۆت لەم بورجەدا دروست بکە. هەشت مانگ بۆ دروست کردنی بەنداوی دیجلە کاری کرد و لەم کارەدا بەئەندازەیەك سامانی خەرج کرد کەس ئەندازەکەی نەدەزانی. کاتێك کارەکە کۆتایی هات، وتی: لەسەر دیوارەکەی بەنداوەکە دابنیشم؟

وتیان: بەڵێ.

فرمووی: فەرش و خوانیان راخست و گوڵیان بەدەوروبەردا پرژاند. فەرمانی کۆبوونەوەی بەسنوردارەکانی خۆیدا. قەشمەرەکان هاتن. بەرێکەوت و لەسەر بەنداوەکە دانیشت. لەوکاتەدابوو کەدیجلە بیناکەی لەژێرەوە برد و لەسەرەمەرگدا ئەویان رزگار کرد. کاتێك هاتەدەر، کاهین و جادووگەر و ئەستێرەناسانی کۆکردەوە و نزیکەی سەدکەس لەوانی کوشت و وتی: ئێوەم قەڵەو کرد و لەهەموو خەڵکان زیاتر لەخۆم نزیکم کردنەوە، رۆژیم بۆ دیاری کردن. ئێستا من دەکەنە گاڵتەجاری دەستی خۆتان.

وتیان: ئەی پاشا، ئێمە هەڵەمان کرد، بەهەمان شێوە کەپێشینانی ئێمەش

هەڵیان کردووە. ئێستا بورجێکی دیکە دەستنیشان دەکەین تا بیناکەی خۆت لەسەر بەخت و شانسی ئەو بورجە دەستنیشان بکەیت.

وتی: ئەوەی دەیڵێن، بیخەنە قۆناغی جێبەجێ کردنەوە.

وتیان: ئەو کارە دەکەین.

وتی: خەملاندن دەست پێبکەن.

کاهین و ئەستێرەناسەکان خەملاندنیان دەست پێکرد و وتیان: بیناکە دەست پێبکە. هەشت مانگی دیکە کاری کرد و بەرادەیەك سامانی خەرج کرد لەژماردن نەدەهات.

کاتێك کاری بیناکە کۆتایی هات، وتی: بڕۆم و لەسەر بەنداوەکە دانیشم؟

وتیان: بەڵێ.

بەڵام لەدانیشتن لەسەر بەنداوەکە دەترسا. سوار ئەسپێك بوو تا بەسواری لەسەر بەنداوەکە تێپەڕێت. لەکاتی پەڕینەوە، دیجلە، ئەوی لەگەڵ بەنداوەکە برد. لەکاتی سەرەمەرگ، ئەویان لەئاو گرتەوە. ئەو دەستەی بانگ کرد و وتی: سوێند بەخوا ئەگەر ڕاستی نەڵێن و درۆکەی خۆتان ئاشکرا نەکەن، هەمووتان دەکوژم، شانتان دەردێنم و دەیخەمە ژێر قاچی فیلەکان.

وتیان: ئەی پاشا، چیتر درۆت لەگەڵ ناکەین. کاتێك تاقی پاشایەتی قەڵەشتی برد و بەنداوەکەی دیجلە داڕما، فەرمانت بەئێمەدا لەزانستەکەی خۆمان ورد ببینەوە تا هۆکارەکەی بزانین. بینیمان زەوی تاریکە و کەنارەکانی ئاسمان گیراوە. زانستی ئێمە بۆ ئەم کارە ناتەوان بوو. جادووی جادووگەر و کاهینی کاهین، کاریگەریان نەبوو. تێگەیشتین ئەم ڕوداوە لەئاسمانەوەیە و پێغەمبەرێك ڕەوانە کراوە یا ڕەوانە دەکرێت. لەبەر ئەمە لەنێوان ئێمە و زانستەکەمان لەمپەریان دروست کرد. ترساین ئەگەر تۆ لەڕوخانی پاشایەتییەکەت ئاگادار بکەینەوە، بمانکوژیت. لەمەرگ بێزاربووین بەهەمان شێوە کەخەڵکان لێی بێزارن. بەدوای مۆڵەتێکدا دەگەڕاین.

خوسرەو وتی: بۆ ئاگادارتان نەکردمەوە تا بیر لەڕێگە چارەیەك بکەمەوە؟

وتیان: ترس ڕێگەی ئەو کارەی پێنەداین.

خوسرەو ئەوانی ئازاد کرد و لەدروست کردنی بەنداوەکە، چاوی پۆشی.

لەحەسەنی بەسری دەگێڕنەوە: هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) لێیان پرسی: ئەی

پێغەمبەری(د.خ) خوا، بەڵگەی خواوەند بۆ خوسرەو سەبارەت بەتۆ چییە؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: خواوەند فریشتەیەکی بۆ لای ئەو نارد کەدەستی لەدیواری ماڵەکەی بردەژوور. نوری لێدەدرەوشایەوە. کاتێك ئەمەی بینی، ترسا. فریشتە وتی: ئەی خوسرەو، مەترسە، خواوەند پێغەمبەرێکی هەڵبژاردووە و کتێبی بەودا رەوانە کردووە، باوەڕ بەئایینەکەی بێنە تا لەم دینا و لەو دنیا پارێزراو بیت.

خوسرەو وتی: با بیر بکەمەوە.

لەعەبدولرەحمان کوڕی عەوف دەگێڕنەوە: خواوەند فریشتەیەکی بۆ لای کەسرا رەوانە کرد. ئەو لەهەیواندا بوو. کەس نەدەڕۆشتە ئەو ژوورە. لەناکاو کەسێکی بینی کە لەسەر سەری وەستاوە و داردەستێکی بەدەستەوەیە. ئەمە لەکاتی رۆژدا بوو، لەکاتی خەوی نیمەڕۆ.

فریشتە وتی: ئەی خوسرەو، باوەڕ بێنە و گەرنە ئەم داردەستە دەشکێنم.

خوسرەو وتی: بهل بهل. فریشتە ڕۆشت. خوسرەو بانگی پاسەوان و پەردەدارەکانی خۆی کرد و پێی وتن: کێ رێگەی دا ئەم پیاوە بێتە لای من؟

وتیان: کەس نەهاتۆتە لای تۆ و ئێمە کەسمان نەبینیوە.

بۆ ساڵێکی دیکە، لەهەمان کاژێر، فریشتە ڕۆشتە لای خوسرەو و قسەکانی دوبارە کردەوەکە: باوەڕ بێنە وەگەرنە ئەم داردەستە دەشکێنم.

خوسرەو وتی: بهل، بهل، بهل، سێ جار وتی و فریشتە ڕۆشت.

خوسرەو پەردەدار و پاسەوانەکانی خۆی بانگ کرد و قسەکانی دوبارە کردەوە.

وتیان: کەسمان نەبینیوە و کەس نەهاتۆتە لای تۆ.

لەساڵی سێیەم، فریشتە لەهەمان کاژێر هات و قسەکانی دووبارە کردەوە کەباوەڕ بێنە، وەگەرنە ئەم داردەستە دەشکێنم.

خوسرەو وتی: بهل، بهل.

دەڵێت: فریشتە داردەستەکەی شکاند و رۆشتەدەر. ئەمە رووخانی پاشایەتییەکەی و شۆڕشی کورەکەی بوو. فارسەکان ئەویان کوشت.

لەباوکی سەلمە کوڕی عەبدولرەحمان دەگێڕنەوە: فریشتە ڕۆشتە لای خوسرەو، دوو دەفری بەدەستەوە بوو، وتی: باوەڕ بێنە، رازی نەبوو. دوو دەفرەکەی شکاند و ڕۆشتەدەر و مەرگی ئەو نزیك کەوتەوە.

لەعەبدولرەحمان کوڕی ئەبی باوکی بەکرە دەگێڕنەوە: خوسرەو شەو لەمەیوانی مەداین خەوتبوو، سوارەکان گەمارۆی کۆشك وپارێزگارییان لێدەکرد. پیاوێك هات وداردەستێکی بەدەستەوە بوو. لەسەر سەری خوسرەو وەستا و وتی: ئەی خوسرەو کوڕی هورموز، من نێردراوی خواوەندم، باوەڕ بێنە. سێ جار وتەکانی دوبارە کردەوە. کسرا لەسەر پشت راکشابوو، ئەوی دەبینی بەڵام وەڵامی نەدەدایەوە. پیاوەکە ڕۆشت.

دەڵێت: خوسرەو سەرکردەی پاسەوانەکانی بانگ کرد و وتی: تۆ رێگەتدا ئەم پیاوە بێتە لای من؟

سەرکردەی پاسەوانەکان وتی: من رێگەم نەداوە و کەس نەهاتۆتە لای تۆ.

دەڵێت: لەساڵی داهاتوو، خوسرەو لەرووداوی ئەو شەوە دەترسا. کەسی بۆ لای سەرکردەی پاسەوانەکان رەوانە کرد کەبەباشترین شێوە پارێزگاری لەکۆشکەکە بکەن و رێگە مەدەن کەس بێتە لای من. سەرکردەی پاسەوانەکان ئەو کارەی کرد. لەکاژێری دیاریکراو، هەمان پیاو لەسەر سەری خوسرەو وەستا. داردەستێکی بەدەستەوە بوو و دەیوت: ئەی خوسرەو کوڕی هورموز، من نێردراوی خواوەندم، باوەڕ بێنە چونکە بۆ تۆ باشترە. خوسرەو، سەیری کرد، وەڵامی نەدایەوە و پیاوەکە ڕۆشت.

دەڵێت: خوسرەو سەرکردەی پاسەوانەکانی بانگ کرد و وتی: مەگەر فەرمانم پێنەدابیت، رێگە نەدەبیت، کەس بێتە لای من؟

سەرکردەی پاسەوانەکان وتی: ئەی پاشا، کەس لای ئێمەوە نەهاتۆتە لای تۆ، بزانە لەکوێوە هاتووە؟

دەڵێت: بۆ ساڵی سێیەم، کەسی بۆ لای پاسەوانەکان و سەرکردەی ئەوان رەوانە کرد و فەرمانی پێدان، ئەمشەو دەوری من بگرن و رێگە مەدەن هیچ ژن یا پیاوێك بێتە لای من.

ئەو کارەیان کرد و لەکاژێری دیاریکراو لەشەو، پیاوەکە لەسەر سەری خوسرەو وەستابوو و دەیوت: ئەی خوسرەو، کوڕی هورموز، من نێردراوی خواوەندم، باوەڕ بێنە، باوەڕ بێنە چونکە بۆ تۆ باشترە. سێ جار وتەکانی دووبارە کردەوە. خوسرەو سەیری دەکرد، بەڵام وەڵامی نەدایەوە.

دواتر پیاوەکە وتی: ئەی خوسرەو، بەوتەکانی من رازی نەبوویت، سوێند بەخوا

تۆ تێکدەشکێنێت بەهەمان شێوە کەمن ئەم داردەستە دەشکێنم. داردەستەکەی شکاند و ڕۆشتەدەر. خوسرەو پاسەوانەکانی بانگ کرد و وتی: مەگەر فەرمانم نەدا ڕێگە نەدەن کەس بێتە لای من؟

پاسەوانەکان وتیان: لای ئێمەوە کەس نەهاتە لای تۆ.

دەڵێت: زۆری نەخایاند کوڕەکەی هێرشی کردەسەر و کوشتی.

لەڕووداوەکانی ڕۆژگاری خوسرەو داستانی هۆزی ڕەبیعەیە و ئەو سوپایەی بۆ شەڕی ئەوان ڕەوانەی کرد. لەزی قار ڕوبەرووی یەکبوونەوە.

دەڵێن: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار بوویەوە خەڵکی ڕەبیعە سوپاکەی خوسرەویان شکستداوە، وتی: ئەمە یەکەمین تۆڵەیە عەرەبەکان لەعەجەمەکانیان وەرگرت وبەهۆی منەوە سەرکەوتنیان پێبڕا. لەبەرابەر دوو دەستەکە، شەڕی قەراقیڕ بوو و شەڕی خوارەوەی زوقار و شەڕی خوارەوەی قەراقیڕ، شەڕی حوبابات، شەڕی زولعەجرەم وشەڕی غەدەوان، شەڕی بەتحای زوقار کەهەموویان لەنزیك دەشتەکانی زوقار ڕویاندا.

لەباوکی عوبەیدە کوڕی موسەنا دەگێڕنەوە: هۆکاری شەڕی زوقار ئەوە بوو نەعمان کوڕی مونزەر لەخمی، عودەی کوڕی زەیدی عیبادی کوشت. عودەی لەوەرگێڕەکانی خوسرەو پەرویز کوڕی هورموز بوو.

سەبارەت بەهۆکاری ڕوودانی ئەم ڕووداوە لەهوشام کوڕی محەممەدی کەلبی دەگێڕنەوە: زەید کوڕی حیما کوڕی زەید کوڕی ئەییووب کوڕی مەحروف کعامر کوڕی عەسییە کوڕی ئەمرۆ ئەلقەیس کوڕی زەید کوڕی مەنات کوڕی تەمیم، سێ کوڕی هێنایە دنیا: عودەی شاعیر کەشاعیر و وتاردەر بوو. کتێبی عەرەبەکان و فارسەکانی خوێندبوویەوە، لەگەڵ عەمار و عەمرۆ.

سێ براکە، برایەکی دیکەیان لەدایکەوە هەبوو بەناوی عودەی کوڕی حەنزەلە لەهۆزی تەی. عەمار لای خوسرەو بوو. یەکێك لەسێ براکە خوازیاری کوشتنی عودەی کوڕی زەید بوو. ئەوی دیکەیان شوێنکەوتەی ئایینی مەسیحی و هەرسێکیان لەگەڵ پاشاکانی ئێراندا بوون. نان و دەسەلاتیان لەوانەوە پێبڕابوو.

کاتێك مونزەر کوڕی مونزەر پاشایەتی گرتەدەست، نەعمانی کوڕی بەعودەی سپارد. ئەوان نەعمانیان گەورە و هۆزی مناڵەکانی مەرینا ئەویان پەروەردە کرد.

منالّەکانی مەرینا لەحیرە نیشتەجیٚ بوون و رەچەڵەکیان بۆ لەخم دەگەڕایەوە. لەبنەماڵە گەورە وگەورە زادەکان بوون. مونزەر کوڕی مونزەر، جگە لەنەعمان باوکی دەکوڕی دیکە بوو. هەموو کورەکانی ئەویان بۆ رەوشەنان(( روگەشەکان)) ناودەبرد لەبەر ئەوەی جوان روخسار بوون. ئەعشی هۆنراوەیەکی بەم ناوەرۆکە هەیە:

کوڕانی مونزەر کەڕوگەشەکانن

بەرەبەیانان شمشێر بەدەست دەڕۆنە ناو حیرە.

نەعمان سورپێست و کورتەباڵا بوو. دایکی سەلما کچی وائیل کوڕی عەتییەی پیشەگەر لەخەڵکانی فەدەك بوو. دایکی ژنی حارس کوڕی حوسن کوڕی زەمزەم کوڕی عودەی کوڕی جەنابی کەلبی بوو. قابوس کوڕی مونزەر مامی نەعمان، عودەی کوڕی زەید و براکانی ئەوی بۆ لای خوسرەو کوڕی هورموز رەوانە کردبوو. کاری دەبیری و وەرگێڕانیان بۆ دەکرد.

کاتێك مونزەر کوڕی مونزەر مرد، کاروباری منالّەکانی خۆی بەئەیاس کوڕی قەبیسەی تایی سپارد. چەند مانگێك بەم کارەوە سەرقالٚ بوو. خوسرەو بەدوای پیاوێك دەگەڕا تا وەك پاشای عەرەبەکان دەستنیشانی بکات، عودەی کوڕی زەیدی بانگ کرد و وتی: لەمنالّەکانی مونزەر کیٚ ماوەتەوە، ئایا دەتوانرێت چاوەڕوانی هیچ شتێکیان لیٚ بکرێت؟

عودەی وتی: لەم بنەماڵە، منالّەکانی مونزەر کوڕی مونزەر بەجێماوەن و هەموویان پیاون.

خوسرەو وتی: کەس بۆ لای ئەوان رەوانە دەکەم. نامەی نووسی و هاتن. ئەوانی لای عودەی کوڕی زەید دابەزاند. عودی زیاتر رێزی لەبراکانی نەعمان دەگرت و وای نیشاندەدا هیچ هیوایەکی بەنەعمان نییە. لەتەنیاییدا بەیەك یەکی ئەوانی وت: ئەگەر پاشا پرسیاری لێکردن، ئایا دەتوانن کاروباری عەرەبەکان سامان بدەن، بڵێن: دەتوانین. بەنەعمانی وت: ئەگەر پاشا سەبارەت بەبراکانت پرسیاری لەتۆ کرد، بڵێٚ، ئەگەر نەتوانم چارەسەری کارەکانی ئەوان بکەم، چۆن دەتوانم بۆ ساماندانی کاری خەڵکان سەرکەوتوو بم.

یەکێك لەمنالّەکانی مەرینا ناوی عودەی بوو. کوڕی ئەوس کوڕی مەرینا و پیاوێکی شاعیر و سەرسەخت بوو. بەئەسوەد کوڕی مونزەری دەوت: دەزانی هیوام

بەتۆیە کەدژایەتی عودەی کوڕی زەید بکەیت چوونکە ئەو خێرخوازی تۆ نییە. بەڵام ئەسوەد گرنگی بەوتەکانی نەدەدا.

کاتێك خوسرەو بەعودەی وت کوڕەکانی مونزەر لای ئەو کۆبکاتەوە، ئەوانی یەك یەك بردە لای خوسرەو. خوسرەو قسەی لەگەڵ کردن. چاوی بەپیاوانێك کەوت هاوشێوەی ئەوانی کەمتر بینیبوو. کاتێك دەیپرسی: ئایا دەتوانی کاروبارەی ناوچەکەی خۆت هەڵسوڕێنیت؟

دەیانوت: دەتوانین.

جگە لەنەعمان، چونکە کاتێك ڕۆشتە لای خوسرەو، خوسرەو پیاوێکی کورتەباڵای بینی، پێی وت: ئایا دەتوانی کاروباری عەرەبەکان راپەڕێنیت؟

نەعمان وتی: دەتوانم.

خوسرەو وتی: چی لەبراکانی خۆت دەکەیت؟

وتی: ئەگەر بۆ کارەکەی ئەوان ناتەوان بم، بۆ کاری خەڵکان ناتەوانترم.

خوسرەو پاشایەتی بەو سپارد. جلوبەرگ و تاجی پاشایەتی پێبەخشی کەبەهاکەی شەست هەزار درەم و بەمرواری و زێر رازێنرابوویەوە.

کاتێك نەعمان لای خوسرەو گەڕایەوە، پاشا بوو. عودەی کوڕی ئەوس کوڕی مەرینا بەئەسوەدی وت: بیرت بێت گوێت لەقسەکانی من نەگرت.

عودەی کوڕی زەید لەکەنیسەیەك خواردنی دروست کرد وکەسی بەدوای کوڕی مەرینا رەوانە کرد کە: لەگەڵ هەرکەس دەخوازیت بۆ لای من وەرە چوونکە نیازم بەتۆیە. کوڕی مەرینا لەگەڵ دەستەیەك هات و لەکەنیسەکە نانیان خوارد و خواردیانەوە. عودەی بەعودەی کوڕی مەرینای وت: ئەی عودەی، تۆ شیاوی بۆ ئەوەی ماف و راستی بناسیت وکەس بەهۆیەوە سەرکۆنە نەکەیت. دەزانم ئارەزوت دەکرد ئەسوەد کوڕی مونزەر و هاوڕێکەی تۆ پاشایەتی بگرێتەدەست نەك هاوڕێکەی من نەعمان. بەڵام بۆ ئەم کارەم سەرکۆنەم مەکە و لەبەر کارێك کەئەگەر خۆت دەبوویت، کاری دڵخوازی خۆتت ئەنجامدەدا، کینەی من لەدڵ مەگرە. دەمەوێت دادپەروەری لەگەڵ من بکەیت.

عودەی کوڕی زەید بۆ پێدانی پەیمان هەستایە سەرپێ و سوێندی خوارد هیچ کات خراپەی نەهێنێتە سەرزمان و ئاژاوەی بۆ نەنێتەوە و چاکەکانی خۆی لەو دریغ

نەکات.

نەعمان ڕۆشت و لەحیرە نیشتەجێ بوو. عودەی کوڕی مەرینا بۆ عودەی کوڕی زەید هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

لەلایەن عودەیەوە بەعودەی بڵێن

ئەگەر هێزت کەمی کرد، نیگەران مەبە

جەستەی ئێمە بێ نیاز، پەکیکەوت

ئەگەر سەرکەویت، سەرکەوتنت گرنگ نییە

ئەگەر بێزار بوویت، کەس سەرکۆنە مەکە

کاتێك بەرهەمی کارەکانی خۆت ببینیت

پەشیمان دەبیتەوە.

عودەی کوڕی مەرینا بەئەسوەدی وت: ئەگەر بەمەبەستی خۆت نەگەشتیت، تۆڵەی خۆت لەم پیاوە مەعدییە وەربگرە کەئەو کارەی لەگەڵ تۆ کرد. پێم وتبووی لەفێڵی خەڵکانی مەعد نابێت بێ ئاگا بیت. پێم وتیت فەرمانەکانی ئەنجام نەدەییت، بەلأم گوێت لەوتەکانی من نەگرت.

ئەسوەد وتی: ئێستا چی دەکەیت؟

عودەی کوڕی مەرینا وتی: دەمەوێت ئەوەی لەماڵ و زەمین و سامان لەبەردەستایە، بۆمنی ڕەوانە بکەیت.

ئەسوەد ئەو کارەی کرد. کوڕی مەرینا ماڵ و سامانی فراوانی بوو. هەر ڕۆژ دیارییەکی بۆ نەعمان دەنارد. لای نەعمان خۆشەویست بوو. کاری پاشایەتی بێ ڕاوێژ کردن بەو ئەنجام نەدەدا و هەرکات لای ئەو باسی عودەی کوڕی زەیدیان دەکرد، بەچاکە ناوی دەبرد و ئاماژەی بەتایبەتمەندییە باشەکانی دەدا و دەیوت: مەعدی بێ فرت و فێڵ نییە.

کاتێك کەسانی دەوروبەری نەعمان پێگەی کوڕی مەرینایان بینی، شوێنی کەوتن. کوڕی مەرینا بەهاوەڵە باوەرپێکراوەکانی خۆی وت: کاتێك من بەئامادە بوونی شا، بەچاکەی وەسفی عودەی کوڕی زەید دەکەم، بڵێن: ڕاست دەکەیت بەلأم کەس لەدەستی ئەو ئاسوودە و لەئەماندا نییە چونکە پاشا، یانی نەعمان، کاربەدەستی ئەوە و ئەو، پاشایەتی بەنەعمان بەخشیوە.

ئەوەندە وتەکانیان دووبارە کردەوە تا ئەوەی نەعمان ڕق و کینەی ئەوی لەدڵ گرت.

دوای ئەوە نامەیەکیان لەزمانی عودەی کوڕی زەید بۆ یەکێك لەهاوەڵانی ئەو نووسی و کەسیان ڕەوانە کرد و نامەکەیان لەڕێگەدا گرت. نامەکەیان بردە لای نەعمان کەخوێندیەوە و تووڕەیی لەچاوانیدا دەخوێندرایەوە. کەسی بۆ لای عودەی ڕەوانە کرد: سوێندت دەدەم بەخوا، بۆ لا من وەرە چونکە تامەزرۆی دیداری تۆم. ئەو لەدەرباری خوسرەو بوو. داوای مۆڵەتی کرد و خوسرەو مۆڵەتی پێدا. کاتێك گەیشتە لای نەعمان، بێ درەنگ ئەوی خستە زیندانەوە. ڕێگەی نەدا کەس هاتوچۆی بکات. عودەی لەزیندان شێعری دەوت. یەکەم شێعری لەزیندان بەم ناوەرۆکە بوو:

خۆزگە هەواڵم لەپاشا دەبوو

هەواڵ بەدوای پرسیار کردن دەست دەکەوێت.

چەندین شێعری هۆنییەوە. کاتێك شێعرێکی دەوت و نەعمان دەیبیست، لەزیندانی کردنی ئەو پەشیمان دەبوویەوە و کەسی بۆ لای ئەو دەنارد و بەڵێنی پێدەدا. بەڵام دەترسا ئەگەر ئازادی بکات، ئاژاوە دروست ببێت.

عودەی هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

لەخەو هەستام و هەورێکم بینی کەهەورە برووسکەی هەڵگرتبوو

سەروتر لەبەرزایی کێوەکان بەرێگەی خۆیدا دەڕۆشت.

هەروەها وتی:

شەوێکی درێژ و تاریکم هەیە. تا کۆتایی.

هەروەها وتی: شەو وڕۆژەکان درێژ بوونەتەوە. تا کۆتایی.

کاتێك پاڕانەوەکانی کاریگەرییان نەبوو، هۆنراوەیەکی هۆنییەوە وبۆ نەعمانی نارد. ئاماژەی بەمەرگدا و پاشا کۆنەکانی بیر خستەوە، سەرەتاکەی بەمشێوەیە:

ئایا کاتی ماڵئاوایی بەرەبەیانە یا شەو. قەسیدەیەکی دووورودرێژە.

دەڵێت: نەعمان بەمەبەستی ڕۆشتن بۆ بەحرەین بەرێکەوت. یەکێك لەغەسانییەکان هات و ئەوەی دەیویست لەحیرە هەڵیگرت. ئەویان بەتاڵانکەری حیرە ناوبرد. کاسەی ئاوداری کوڕی نەعمان سوتا. عودەی هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

ئاگرێك داییسا و هەر دوولای حیرەی سوتاند

و تۆ لەگەشت و گەڕانەکانی خۆت بەردەوام بوویت.

کاتێك ڕۆژگاری زیندانی بوونی عودەی درێژەی کێشا، هۆنراوەیەکی بۆ لای براکەی خۆی نووسی کەلای کەسرا بوو بەم ناوەڕۆکە:

بەو کە لەمن دوورە، بڵێن:

براکەت و پارەی دڵت کەشەیدایی ئەو بوویت

لای پاشایەك بەداد یا ستەم، لەزنجیردایە

ئەگەر لەسەرزەمینەکەی خۆمان بێیتە لای ئێمە

خەوێك دەبینی کەهیچ خەونێکی تیا نەبێت.

کاتێك براکەی عودەی نامەکەی خوێندەوە، ڕۆشتە لای خوسرەو و قسەی لەگەڵ کرد. نامەی نووسی و کەسێکی ڕەوانە کرد. جێگری نەعمان لەدەرگای پاشا بۆی نووسی کەنامەیەکیان بۆ نووسی و دوژمنانی عودەی لەمناڵەکانی بەقیلەی غسان ڕۆشتنە لای نەعمان و وتیان: هەرئێستا بیکوژە. بەڵام ڕازی نەبوو.

نێردراوی شا هات. براکەی عودەی بەرتیلی پێدابوو. پێی وتبوو سەرەتا بڕواتە لای عودەی و بزانێت ئەو چی دەڵێت. نێردراو لەزیندان چاوی بەعودەی کەوت و وتی: بۆ ڕزگاری تۆ هاتووم، چی دەڵێیت؟

عودەی وتی: ئەوە دەڵێم کەتۆ دەخوازیت. بەڵێنی چاکەی پێدا و وتی: لای من مەڕۆ و نامەکە بەمن بدە تا خۆم بۆی بنێرم چونکە سوێند بەخوا ئەگەر تۆ بڕۆیتە لای، دەمکوژێت.

نێردراو وتی: دەبێت نامەکە بۆ پاشا ببەم و تەسلیمی ئەوی بکەم.

سیخوڕەکەی نەعمان پێی وت کەنێردراوی خوسرەو ڕۆشتۆتە لای عودەی و لەگەڵ خۆی دەیبات. ئەگەر نێردراو عودەی ببات، کەس لەئێمە، تۆ وکەسانی دیکە بەزیندوویی ناهێڵێتەوە.

نەعمان دژمنانی عودەی ڕەوانە کرد و ئەویان خنکاندو بەخاکیان سپارد. نێردراو هاوڕێ لەگەڵ نامەکە ڕۆشتە لای نەعمان. وتی: ئەو کارەدەکەم و فەرمانەکان ئەنجام دەدەم. چوار هەزار مسقاڵ و کەنیزێکی بۆ نارد و وتی: کاتێك بەیانی بوویەوە، بڕۆ لەزیندان دەریبێنە.

بۆ بەیانی نێردراو ڕۆشتە زیندان و پاسەوانەکان پێیان وت: عودەی ڕۆژی پێشوو مرد وئێمە لەترسی پاشا، نەمانوێرا باسی بکەین چونکە مەرگی عودەی پەسەند

نەدەکرد.

نێردراو گەڕایەوە بۆ لای نەعمان و پێی وت: کاتێك دوێنێ ڕۆشتمە زیندان، زیندووو بوو.

نێردراو پێی وت: پاشا تۆی بۆ لای من ڕەوانە کرد. پێش ئەوەی بێیتە لای من، ڕۆشتیتە سەردانی عودەی! دڕۆت کرد، داوای بەرتیل دەکەیت و خیانەتت کردۆتە پیشە. ئەوی ترساند و خەڵاتی زیاتر پێبەخشی. ڕێزی لێگرت. نێردراو بەڵێنیدا بەکەسرا بڵێت، عودەی پێش گەیشتنی ئەو، مردبوو.

نێردراو بۆ لای خوسرەو گەڕایەوە. نەعمان لەکوشتنی عودەی پەشیمان بوویەوە. دوژمنانی عودەی بوێر بوون و نەعمان ترسی ئەوانی لێنیشت. یەکێك لەڕۆژەکان کەنەعمان بەمەبەستی ڕاو رووی لەدەشت و کێو کردبوو، کوڕەکەی عودەی بینی کەهاوشێوەی باوکی بوو. وتی:

تۆ کێیت؟

زەید وتی: زەید کوڕی عودەی کوڕی زەیدم.

نەعمان لەگەڵی ئاخاوت. هەستی بەناسکی سرشتی ئەو کرد. لەبینی شادمان و خەڵاتی ودیاری پێبەخشی. بۆ کوژرانی باوکی داوای لێخۆشبوونی کرد. کەرەستەی پێویستی خستە بەردەست و بۆ دەرباری خوسرەوی ڕەوانە کرد: عودەی چاکەخواز و ڕاوێژکاری پاشا بوو، بەڵام مەرگ ئەوی بردەوە و کەس لەمردن ناتوانێت خۆی قوتار بکات. کەس وەك من لەمەرگی ئەو خەمبار نییە. هاوشێوەی ئەوەی دەستێکم لەدەست دابێت. هیوادارم خواوەند جێگەکەی بەکەسێکی هاوشێوەی خۆی پڕبکاتەوە. ئێستا کوڕی عودەی گەورە و کەمتر لەخۆی نییە. ئەوم بۆ لای پاشا ڕەوانە کرد تا ئەگەر خواستی، کاروبارەکانی باوکی بەوبسپێرێت.

کاتێك کوڕەکە گەیشتە لای خوسرەو، کاروبارەکانی باوکی بەوسپارد و مامی ئەوی بۆ کاری دیکە ڕاسپارد. کاروباری تایبەت بەنامەکان کەبۆ سەرزەمینی عەرەبەکان و نەعمان ڕەوانە دەکرا، یەکێك لەئەرکەکانی ئەو بوو. ساڵانە دوو بەچکە ئەسپی مووسوری لەلایەن عەرەبەکانەوە بۆ ڕەوانە دەکرا لەگەڵ کارگی تازە ووشك و پەنیر و چەرم و کاڵاکانی دیکەی سەرزەمینی عەرەب. سەرەتا ئەمە کاری عودەی و دواتر زەید کارەکانی ئەوی ڕادەپەڕاند.

کاتێك زەید، ئەم پێگەی لای خوسرەو بەدەست هێنا، سەبارەت بەنەعمان پرسیاری کرد. زەید بەچاکە وەسفی کرد. چەندین ساڵ لەجێگەی باوکی کاروبارەکانی رادەپەڕاند. خوسرەو ئارەزومەندی بینینی بوو. جار نا جار دەڕۆشتە سەردانی خوسرەو.

پاشای فارسەکان تایبەتمەندی دیاریکراویان بۆ ژنان دەستنیشان دەکرد کەوەك نوسراو لای ئەوان پارێزگاری لێدەکرا. ئەو تایبەتمەندیانەیان بۆ ویلایەتەکان رەوانەدەکرد بەڵام لەسەرزەمینی عەرەب هیچیان نەدەویست و بەدوای هیچ ژنێك نەدەگەران.

خوسرەو داوای ژنی کرد. زەید وەسف و تایبەتمەندی ئاماژە پێدراوی نووسی و ڕۆشتە لای خوسرەو وسەبارەت بەکارەکەی خۆی گفتوگۆی لەگەڵ کرد. وتی: بینیم پاشا سەبارەت بەو ژنانەی دەبێت بەدوایاندا بگەڕێن، نامەی نووسیووە. تایبەتمەندییەکانم خوێندەوە و لەکاری بنەماڵەی مونزەر ئاگاداری دەکەمەوە. دەزانم لای نەعمانی بەندەی تۆ، لەکچەکان و کچە پوورەکانی زیاتر لەبیست ژن ئەم تایبەتمەندییانەیان هەیە.

خوسرەو وتی: سەبارەت بەوان نامە بنووسە.

زەید وتی: ئەی پاشا، خراپترین عادەتی نەعمان و عەرەبەکان ئەوەیە کەخۆیان لەعەجەمەکان بەگەورەتر دەزانن. من حەز ناکەم کچەکان بشارێتەوە. ئەگەر خۆم بڕۆم دەرفەتی ئەم کارەی نابێت. من رەوانە بکە و یەکێك لەپاسەوانەکانی خۆت کەشارەزای زمانی عەرەبی بێت، بکەرە هاوڕێی من.

خوسرەو پیاوێکی کردە هاوڕێی ئەو. زەید زۆر بەرێزەوە هەڵسو کەوتی لەگەڵ دەکرد تا گەیشتنە حیرە. ڕۆشتنە لای نەعمان، کوڕنوشی بۆ برد و وتی: پاشا بۆ خۆی و منداڵەکانی ژنی دەوێت. ڕێزی لەتۆگرتووە و کەسی بۆ لای تۆ ناردووە.

نەعمان وتی: ژنان دەبێت چۆن بن؟

زەید وتی: تایبەتمەندی ئەوان بەمشێوەیە کەلەگەڵ خۆمدا هێناومە. تایبەتمەندییەکان لەوێوە دەستینشان کرابوون کەمونزەری گەورە لەشەڕی حارسی گەورە کوڕی باوکی شیمری غەسانی کەنیزێکی بەئەسیری گرت و پێشکەشی ئەنەوشیروانی کرد. تایبەتمەندی و وەسفی کەنیزەکەی بەمشێوەیە نووسیبوو:

ڕەنگێکی ڕۆشن و جوان، چاو گەش، کوڵم سوور، لوت باریك و قنج، برۆی کێشراو، سپی و ڕەشی چاوەکانی ئاشکرا و دیار، روخسارێکی پان، بەژن ڕێك، قژ ڕەش، سەری گەورە، گوارە لەگوێ، سینەیەکی پان و گەورە، مەمکی وەك هەنار، بازوی ئەستور و قولاپەی پڕ، دەستی ناسك، پەنجەکانی باریك، سکێکی جوان، ناوقەد باریك، گەردن باریك، سمت پان، رانێکی ئەستور، ئەژنۆ خڕ، ملی خڕ، مەچەکی پڕ، پێی ناسك، بەلەنجە و لار، ئەشمیل، گوێرایەڵ، خاوەن نەژاد، ئازار نەدیتوو، بەشەرم، بەرێز، کردار پاك، شەیدای ڕەچەڵەکی باوکی نەك بنەماڵە، بۆ بنەماڵە نەك هۆز، بەئەدەب، خاوەن ئەزمون، زمان کورت، دەنگخۆش کەرازێنەرەی ماڵە و هۆکاری ڕەنجی دوژمن، ئەگەر داوای بکەیت، ئامادەیە و ئەگەر نەتەوێت، چاوەڕوان دەبێت، وردبین و شەرمێون، لێوێکی لەرزان و بیسەر.

کەسرا ئەم تایبەتمەندی و وەسفانەی پەسەند کرد و فەرمانیدا لەدیواندا بینووسن. لەپاشایەك بۆ پاشایەکی دیکە بەمیرات دەمایەوە تا ئەو کاتەی کەوتە بەردەست خوسرەو پەرویز. زەید ئەم تایبەتمەندییانەی بۆ نەعمان خوێندەوە. نەعمان لای دژوار بوو. بەزەیدی وت و نێردراوی دەیبیست: مەگەر لەناو جوان روخسارەکانی سواد و سەرزەمینەکەی خۆی، نیازەکەتان بەدەی ناکرێت؟ لەجیاتی وشەی جوان ((عین)) بەکار هێنا کەوشەیەکی خوازراوە بۆ جوانی.

نێردراو لەزەیدی پرسی: عین چییە؟

زەید وتی: بەمانای مانگایە.

بەنەعمانی وت: خوسرەو بەم کارە دەیویست ڕێز لەتۆ بگرێت. ئەگەر دەیزانی پەسەندی ناکەیت، ئەو نامەی نەدەنووسی.

نەعمان دوو ڕۆژ ئەوانی هێشتەوە و دواتر نامەی بۆ خوسرەو نووسی کەئەوەی پاشا داوای دەکات، لای من دەست ناکەوێت. بەزەیدی وت: لای پاشا، بەڵگە و بیانویەکی شیاو بێنەرەوە.

کاتێك بۆ لای خوسرەو گەڕانەوە، زەید بەنێردراوی وت: ئەوەی بیستت، پاشای لێ ئاگادار بکەرەوە چونکە من دژایەتی قسەکانی تۆ ناکەم. کاتێك ڕۆشتنە لای خوسرەو، زەید وتی: ئەمە نامەی نەعمانە. نامەکەی تەسلیم کرد.

خوسرەو وتی: ئەی زەید، ئەی ئەوەی باست کرد، چی بەسەر هات؟

زەید وتی: وتم کەعەرەبەکان ژن بەکەسانی دیکە نادەن. ئەمە لەبەدبەختی ئەوانە کە برسیەتی و رووتی بەباشتر دەزانن لەتێری و داپۆشراوی. بای ژەهراوی لەنەسیمەکانی ولآتی تۆ بەباشتر دەزانن. ئەم ولآتەی تۆ بەزیندان دادەنێن. لەنێردراوەکەت بپرسە کەچی وت چوونکە من پاشا لەوە بەرێزدارتر دەزانم وتەکەی ئەو بێنمە سەرزمان.

خوسرەو لەنێردراوی پرسی: چی وت؟

نێردراوی وتی: نەعمان وتی: مەگەر مانگاکانی سوادی بەش ناکات وا داوای ژن لەئێمە دەکات؟

خوسرەو تورە بوو. ئەم قسەیە کاریگەری لەسەر ئەو دانا بەلآم وتی: بەندەکان هەندێجار خراپتر لەمە دێننە سەرزمان بەلآم دواتر پەشیمان دەبنەوە. ئەم وتەیە بلآو بوویەوە و بەگوێی نەعمان گەیشت. خوسرەو بۆ چەندین مانگ هیچی باس نەکرد. نەعمانیش چاوەروان بوو تا ئەو کاتەی نامەی خوسرەوی بەدەست گەیشت کەوەرە چونکە پاشا پێویستی بەتۆیە.

کاتێك نامەکەی پێگەیشت، کەرەستەی شەری و پێداویستییەکانی دیکەی هەڵگرت و روی کردە کوێستانی تەی لەبەر ئەوەی فەرعە کچی سەعد کوری حارسە کوری لام هاوسەری بوو و کور و کچێکی بۆ هێنابوویەوە دنیا. هەروەها زێنەب کچی ئەوس کوری حارسە، هاوسەری بوو. لەبەر ئەمە پەنای بۆ هۆزی تەی برد تا جێگەی بکەنەوە و پشتیوانی لێبکەن، بەلآم رازی نەبوون و وتیان: ئەگەر خزم نەدەبوویت، شەرمان لەگەڵ دەکردیت، پێویست ناکات خوسرەو بکەینە دوژمنی خۆمان.

کەس پەنانی بەنەعمان نەدا جگە لەمنالەکانی رەواحە کوری سەعد کەوتیان: ئەگەر بتەوێت، شان بەشانی تۆ شەر دەکەین چونکە لەکاری مەروانی قورەز، قەرزارباری بوون.

بەلآم نەعمان وتی: نامەوێت ئێوە لەناو ببەم چونکە ناتوانن لەبەرابەر خوسرەو خۆراگری بکەن. بەشێوەیەکی نهێنی رویکردە دەشتی زوقار و رۆشتە لای هۆزی منالەکانی شەیبان. هانی کوری مەسعود کوری عامر کوری عەمرۆ و باوکی رەبیعە کوری زوهەلی شەیبانی بینی کەسالارێکی بەرێز بوو. سالاری رەبیعە، قەیس کوری مەسعود کوری قەیس کوری خالید کوری زی ئەلجەدین بوو. کەسرا فەرمانرەوایەتی

ئوبولەی بەو سپاردبوو لەبەر ئەمە نەیویست بنەماڵەکەی خۆی بەو بسپێرێت. دڵنیا بوو هانی کەسانی بنەماڵەکەی لەهەمو زیانەکان دەپارێزێت.

نەعمان بۆ لای خوسرەو بەرێکەوت و زەید کوڕی عودی لەسەر پردی ساباط بینی. پێی وت: نەعمانی بچوك، خۆت رزگار بکە.

نەعمان وتی: ئەمە کاری تۆبوو، سوێند بەخوا ئەگەر رزگارم بوو، ئەو بەڵایەی بەسەر باوکتا هێنام، بەسەر تۆیشی دێنم.

زەید وتی: نەعمانی بچوك! بەشێوەیەك داوم بۆ تەنیویتەوە کەئەسپی سەرکێشیش ناتوانێت بیپچڕێنێت.

کاتێك خوسرەو لەهاتنی نەعمان ئاگادار بوویەوە، کەسی رەاونە کرد و ئەویان بەستەوە و رەوانەی زیندانی خانەقینیان کرد. لەزینداندا مایەوە تا ئەو کاتەی تاعون هات و لەوێ مرد. خەڵك گومان دەکەن مەرگی ئەو لەساباط روویدا. ئەم گومانە لەهۆنراوەیەکی ئەشعیەوە سەرچاوە دەگرێت کەدەڵێت:

خواوەندی خوەرنەق، لەساباط، نەیتوانی لەمەرگ خۆی رزگاربکات.

بەڵام مەرگی ئەو لەخانەقین روویدا و ئەمە ماوەیەك بەر لەهاتنی ئیسلام بوو. زۆری نەخایاند خواوەند پێغەمبەری هەڵبژارد. شەڕی زوقار بەهۆی نەعمانەوە روویدا.

لەباوکی عوبەیدە مەعمەر کوڕی موسەنا دەگێڕنەوە: کاتێك نەعمان عودەی کوشت، براکەی عودی وکوڕەکەی لەدەرباری خوسرەو بوون. ئەو نامەی نەعمان بۆ خوسرەوی نووسیبوو، دەسکاریان کرد کەتووڕەیی خوسرەوی لێکەوتەوە و فەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکرد. کاتێك نەعمان ترسی خوسرەو کەوتە دڵیەوە، سامان و کەرەستەکانی شەڕی خۆی بەهانی کوڕی مەسعود کوڕی عامر کوڕی خوسەیب کوڕی عەمرۆ ئەلموزدەلیف کوڕی باوکی رەبیعە کوڕی زوهەل کوڕی شەیبان کوڕی سەعلەبە سپارد، لەبەر ئەوەی نەعمان دوکچی پێدا بوو.

دەستەیەك وتوویانە: شتەکانی تەسلیمی هانی کوڕی مەسعود نەکرد بەڵکو هانی کوڕی قەبیسە کوڕی هانی کوڕی مەسعود بوو. ئەم وتەیە بڕواپێکراوترە.

کاتێك خوسرەو نەعمانی کوشت، ئەیاس کوڕی قەبیسەی تایی وەك فەرمانڕەوایی حیرە و هەموو ئەو ویلایەتانە دەستنیشان کرد کەسنوری فەرمانڕەوایەتی نەعمان بوو.

باوکی عوبەیدە دەڵێت: کاتێك خوسرەو لەدەستی بەهرام هەڵات، لای ئەیاس کوڕی قەبیسەی تایی تێپەڕی و ئەیاس ئەسپ و وشترێکی پێشکەش کرد. خوسرەو سپاسی کرد. خوسرەو نامەی بۆ ئەیاس نووسی کەمیراتی نەعمان لەکوێیە و وەڵامی دایەوە کەمیراتەکەی بەتایەفەی بەکر کوڕی وائیل سپاردووە.

خوسرەو فەرمانی بەئەیاسدا میراتەکەی نەعمان وەربگرێت و رەوانەی بکات.

ئەیاس کەسی بۆ لای هانی نارد و وتی: ئەو زرێیانەی نەعمان بەتۆی سپارد، رەوانەیان بکە. ئەوکەسەی کەمی دەکاتەوە دەڵێت چوارسەد زرێ بوو و ئەو کەسەی زیادی دەکات دەڵێت هەشسەد زرێ بوو.

هانی نەیویست ئەوەی بەڵێنی پاراستنی داوە، تەسلیمی بکات.

دەڵێت: کاتێك هانی رازی نەبوو، خوسرەو توڕە و وتی: بنەماڵەی بەکر کوڕی وائیل لەناو دەبات. کاتێك ئەم قسەی هێنایە سەرزمان، نەعمان کوڕی زەرعەی تەغلەبی کەلەوێ ئامادە و ئارەزوومەندی لەناوچونی بنەماڵەی بەکر کوڕی وائیل بوو. بەخوسرەوی وت: ئەی پاشای پاشاکان، دەتەوێت پێت بڵێم چۆن دەتولنرێت ئەو بنەماڵەیە ناکاوگیر بکرێن؟

خوسرەو وتی: بەڵێ.

نەعمان وتی: لێیان گەڕێ تا گەرما دەستپێبکات و لەکاتی گەرما بڕۆنە سەر سەرچاوەکانی خۆیان کەپێی دەڵێن زوقار و بەهەمان شێوە کەپەروانە بەدەوری ئاگردا دەسورێتەوە، بەوشێوەی دەتەوێت هێرش بکەرەسەریان. من کاری ئەوان کۆتایی پێدێنم.

دەڵێت: وتەکەی نەعمان کەوتبووی بڕۆنە سەر سەرچاوەکانی ئاوی خۆیان، بەهەمان شێوە کەپەروانە بەدەوری ئاگردا دەسورێتەوە، بۆ خوسرەویان کردە فارسی. چاوەڕوانی کرد تا گەرما دەستی پێکرد. منداڵەکانی بەکر کوڕی وائیل هاتن و لەخوارەوەی زقار دابەزین. کەسرا نەعمان کوڕی زەرعەی بۆ لەناو بردنی ئەوان رەوانە کرد کەیەکێك لەم سێ کارە هەڵبژێرن: یا خۆتان تەسلیمی پاشا بکەن تا ئەوەی پێی خۆشە ئەنجامی بدات، یا لەم سەرزەمینە برۆن یا خۆتان بۆ شەڕ ئامادە بکەن.

خەڵك لەناو خۆیاندا راوێژیان کرد. حەنزەلە کوڕی سەعلەبە کوڕی سەیاری عیجلیان کرد سەرکردەی خۆیان چونکە ئەویان بەکەسێکی پیرۆز دەزانی.

حەنزەلە وتی: تەنیا بەشەڕ کردن رازی دەبین چوونکە ئەگەر خۆتان تەسلیم بکەن، دەتانکوژن و ژن و منداڵەکانتان ئەسیر دەکەن. ئەگەر لەم سەرزەمینە بڕۆن، لەتینواندا لەناو دەچن و منداڵەکانی تەمیم سەرە رێگەتان لێدەگرن و لەناوتان دەبەن. کەواتە خۆتان بۆ شەڕی پاشا ئامادە بکەن.

پاشا کەسی بۆ لای ئەیاس و هامرزی تەستەری کەسالاری پاسەوانەکانی ئەو لەقەتقەتانە بوو، رەوانە کرد هەروەها بۆ لای جەلابزین، سالاری پاسەوانەکانی لەبارق و بۆ قەیس کوڕی مەسعود کوڕی قەیس کوڕی خالید کوڕی زوئەلجەدیم کاربەدەستی ئەو لەدەشتی سەفوان بوو نامەی نووسی تا هەموویان لەدەوری ئەیاس کۆببنەوە. کاتێك هەمووتان کۆبونەوە، سەرکردەی هەمووتان ئەیاس بێت.

فارسەکان بەسوپا و فیلەوە هاتن. سەرکردەکەیان یەکێك لەسوارچاکەکان بوو. پێغەمبەر(د.خ) رەوانە کرابوو. فارسەکان لاواز ببوون. پێغەمبەر(د.خ) سەبارەت بەرووداوەکە فەرمووی: ئێستا، عەرەبەکان تۆڵەیان لەعەجەمەکان سەندەوە. ئەو رۆژە بەیادگار مایەوە کەشەڕەکەی تیاکرا.

کاتێك سوپای فارسەکان نزیك کەوتەوە، قەیس کوڕی مەسعود شەوانە پۆشتە لای هانی و وتی: کەرەستەکانی شەڕی نەعمان بەخەڵکەکەی بدە تا هێزی پێوەربگرن، ئەگەر لەناچوون کەرەستەکانی شەڕیش لەناو دەچن وئەگەر سەرکەوتن بەدەست بێنن، ئەوان بۆ تۆ دەگەڕێننەوە. ئەو کارەی کرد و زرێ و سیلاحەکانی لەناو پیاوە بوێرەکاندا دابەش کرد. کاتێك سوپای فارسەکان لەبەکر کوڕی وائیل نزیك کەوتەوە، هانی وتی: ئەی بەکرییەکان، ئێوان ناتوانن لەبەرابەر خوسرەو و سوپاکەی خۆڕاگری بکەن، بەرەو بیابان بڕۆن. خەڵك بەخێرایی رێگەی بیابانیان گرتەبەر. حەنزەلە کوڕی سەعلەبە کوڕی سەیار توڕە بوو و وتی: دەتەوێت رزگارمان بکەیت یا لەناومان ببەیت.. خەڵکی گەڕاندەوە و بەندی کەژاوەکانی قرتاند بۆ ئەوەی ئەگەر خەڵکان مەبەستی ڕاکردنیان کرد نەتوانن هاوسەرەکانی خۆیان لەگەڵ خۆیان ببەن. ئەویان بەبەندبڕ ناو برد.

حەنزەلە لەدەشتی زوقار خێوەتێکی هەڵدا و سوێندی خوارد تا خێوەتەکە ڕانەکات، ئەویش ڕانەکات. کەسانێك لەخەڵکان رێگەی بیابانیان گرتەبەر بەڵام زۆرینەیان گەڕانەوە. بۆ نیوەی یەك مانگ ئاویان پاشەکەوت کرد. فارسەکان هاتن و

لەخوارەوەی دەشتەکە خێوەتیان هەڵدا. عەجەمەکان لەتاو تینوێتی هاواریان بەرزبوویەوە و نەیانتوانی گەمارۆی سەر بەکرییەکان درێژە پێبدەن و روویان کردە چاڵاوەکان. خەڵکانی بەکر و عیجل و پێشەنگەکان شوێنیان کەوتن. خەڵکانی عیجل پێشڕەویان کرد و پیاوانە هەوڵیاندا. فارسەکان روبەروویان بوونەوە و خەڵکان وتیان: عیجلیەکان لەناوچوون. خەڵکانی بەکر هێرشیان برد و بینیان عیجلیەکان بوێرانە سەرقاڵی شەڕ کردنن. یەکێك لەژنەکانیان هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

ئەگەر سەرکەوتن بەدەست بێنن، بەشتە باشەکەی ئێمە دەگەن

ئەی عیجلیەکان، گیانم بەقوربانتان، پیاوانە هەوڵبدەن

هەروەها بۆ هاندانی شەڕکەران هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

ئەگەر سەرکەوتن بەدەست بێنن، لەئامێزتان دەگرین

فەرەشی گرانباییتان بۆ رادەخەین

و ئەگەر رابکەن، لێتان دوور دەکەوینەوە

دووریەکی بێ تامەزۆریی.

رۆژێك لەسەر چاڵاوەکان شەڕیان کرد. فارسەکان تینوو بوون. رویان کردە شوێن لافاوی زوقار. خەڵکانی ئەیاد کەهاوپەیمانی ئەیاس کوڕی قەبیسە بوون، بەنهێنی کەسیان بۆ لای خەڵکان بەکر رەوانە کرد کەکام رێگەیە پەسەند دەکەن: ئەوەی شەو رابکەین، یا بمێنینەوە و کاتێك روبەروی عەجەمەکان بوونەوە، هەڵبێین.

ئەیادییەکان وتیان: بمێننەوە و کاتێك هاتن، گۆڕەپانی شەڕ بەجێبێڵن و بەمشێوەیە بۆ هەڵاتن ناچاریان بکەن.

بەرەبەیان خەڵکانی بەکر هێرشیان برد. ژنان وەستابوون و پیاوانیان بۆ شەڕ هاندەدا. یەزید کوڕی حیماری سەکونی کەهاوپەیمانی مناڵەکانی شەیبان بوو، وتی: ئەی مناڵەکانی شەیبان، فەرمانی من لەگوێ بگرن و بمکەنە بۆسەی ئەوان. ئەو کارەیان کرد. یەزید کوڕی حیمار ئەسیر کرا. لەشوێنێك لەدەشتی زوقار کەئێستاکە بە((جب)) ناوی دەبەن، بۆسەیان نایەوە و بوێریان لەخۆیان نیشاندا.

باڵی راستی ئەیاس کوڕی قەبیسە، هامرز و باڵی چەپی جەلابزین بوو.

باڵی راستی هانی کوڕی قەبیسە سالاری بەکر یەزید کوڕی مەسهەری شەیبانی وباڵی چەپی حەنزەلە کوڕی سەعلەبە کوڕی سەیاری عیجلی بوو. دەستیان بەگفتوگۆ

و شێعر خوێندنەوە کرد. حەنزەلە کوڕی سەعلەبە هۆنراوەیەکی خوێندەوە کەکورتەی ناوەرۆکەکەی بەمشێوەیە:

هاورێکانتان هاتن و پێویستە تێبکۆشین
بۆ تێنەکۆشم چونکە پیاوێکی دلێرم
تیر لەناو کەوان هاوشێوەی بازووی پیاوە
یا سەختتر
هەواڵەکان ئەوە دەسەلمێنێت
کەمردن هیچ رێگەیەکی دەربازبوونی نییە
مناڵەکانی شەیبان شمشێر بوەشێنن و خۆڕاگری بکەنە پیشە.
هەروەها حەنزەلە هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:
ئەی خەڵکینە، بەشەڕ کردن دڵتان خۆشکەن
چونکە باشترین رۆژی ئەسپ غاردان، ئەمڕۆیە.

یەزید کوڕی موکەسەر کوڕی حەنزەلە کوڕی سەیار هۆنراوەیەکی خوێندەوە، ناوەرۆکەی بەمشێوەیە:

هەرکەس لەئێوە رابکات
لەسنوری و دراوسێ و هاورێکەی هەڵاتووە
من کوڕی ئەوکەسەم بەپێی سرشتی خۆی کارەکانی ئەنجامدا
هەمووان لەسەر نەریتە کۆنەکان دەجووڵێنەوە
هەرچەند دوور بن یا پاك و رەسەن.

فەراس دەڵێت: لەو کاتەی کەحەنزەلەیان دوای هانی وەك سەرکردەی خۆیان هەڵبژارد وبۆ لای ماریەی کچی ڕۆشت، خاوەنی دەکوڕ بوو کەیەك لەوان جابر کوڕی ئەبجەرە. بەندی کەژاوەکەی ئەوی بڕی وکەوتە سەرزەوی. بەندی کەژاوەی ژنانی بڕی وکەوتنە سەرزەوی. کچی قەرینی شەیبانی هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

ئەی مناڵەکانی شەیبان، ریز لەدوای ریز پێشڕەوی بکەن
ئەگەر سەرکەوتن بەدەست بێنن، بەشتەی باشەکەی ئێمە دەگەن.

حەوتسەد کەس لەمناڵەکانی شەیبان قۆڵی کراسەکانی خۆیان بڕی تا بتوانن بەئاسانی شمشێر بوەشێنن و شەڕیان دەستپێکرد.

دەڵێت: هامرز هاواری کرد: مەرد مەرد!

وەبرەد کوڕی حارسەی یەشکری پرسی: چی دەڵێت؟

وتیان: داوای شەڕکەر دەکات.

وتی: دادپەروەرییە. ڕووبەڕوی بویەوە و هامرزی کوشت.

سوەید کوڕی باوکی کاهیل هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەڕۆکە:

وەبرەد لەئێمە بوو کەڕووبەڕووی ئێوە بوویەوە

سنووردار و سوارچاکەکان نزیك مەکەنەوە.

حەنزەلە کوڕی سەعلەبە هاواری کرد: ئەی خەڵکینە، مەوەستن چونکە تیرەکان بەسەرتانا دەبارێت. باڵی چەپی بەکر کەحەنزەلە سەرکردایەتی دەکرد، هێرشی کردە سەر باڵی ڕاستی ئەیاس. سالاری باڵی ڕاستی، هامرز بوو کەبەدەستی وەبرەد کوژرا. باڵی ڕاستی بەکر بەسەرکردایەتی یەزید کوڕی مەسهەر هێرشی کردە سەر باڵی چەپی ئەیاس بەسەرکردایەتی جەلابزین. بۆسەکەی جب زوقار کەسەرکردەکەی یەزید کوڕی حیمار بوو، لەپشتەوەی سوپاوە هێرشی کردەسەر ناوەڕاستی سوپاکە کەئەیاس کوڕی قەبیسە سەرکردایەتی دەکرد. وەك بەڵێنیاندابوو، ڕێگەی هەڵاتنیان لێگرتن. فارسەکان بۆ هەڵاتن ناچار بوون.

سەلیت دەڵێت: ئەسیرەکانی ئێمە کەئەو ڕۆژە لەناو سوپای فارسەکاندا بوون، وتیان کاتێك هەردوو لا ڕووبەڕوی یەك بوونەوە و بەکرییەکان ڕێگەی هەڵاتنیان گرت، وتمان، مەبەستی گەیشتن بەئاویان هەیە و کاتێك شوێنی لافاویان تێپەڕاند و گەشتنە ئەوبەر، وتمان: مەبەستی هەڵاتنیان هەیە. ئەمە لەگەرماری نیمەڕۆدا ڕوویدا. ڕۆژێکی گەرم بوو. دەستەیەك لەخەڵکانی عیجل هاتن هاوشێوەی دەستەی قامیش، کەس پێش و پاش نەدەکەوت. ڕوبەڕویان بوونەوە و یەکتریان هاندەدا. هێرشیان برد. تەنافەکانیان هەڵدا و گیر بوون. دەستیان کێشا و کشانەوە و فارسەکانیان لەنێوان ڕێگەی ئاوی زوقار کوشت تا گەشتنە ڕاحیزە.

فەراس دەڵێت: بیستم تەنیا شوێن فارسەکان دەکەوتن و مەبەستی تاڵانیان نەکرد تا ئەوەی لەئەدەم لەنزیك زوقار چاویان بەیەك کەوت. لەمناڵەکانی عیجل سی سوارە دەبینرا و لەهۆزەکانی دیکەی بەکر شەست سوار. حەنزەلە کوڕی سەعلەبە، جەلابزینی کوشت. شاعیرانی عەرەب سەبارەت بەشەڕی زوقار چەندین هۆنراوەیان هۆنییەوەتەوە.

## گێڕانەوەکان سەبارەت بەو کاربەدستانەی دوای عەمرۆ کوڕی هیندبەنوێنەرایەتی فارسەکان فەرمانڕەوایی سنورەکانی عەرەبیان دەکرد

پێش ئەمە پاشاکانی بنەماڵەی نەسر کوڕی رەبیعە کە تاکاتی مەرگی عەمرۆ کوڕی هیند بەنوێنەرایەتی فارسەکان فەرمانڕەوایی سنورەکانی عەرەبیان دەکرد، ئاماژەمان پێدان و ماوەی فەرمانڕەوایی ئەوانمان دیاری کرد. ئێستا ناوی پاشاکانی ئەم بنەماڵەیە تا کاتی پاشایەتی نەعمان ئاماژە پێدەدەین:

دوای عەمرۆ کوڕی هیند، براکەی قابوس کوڕی مونزەر پاشایەتی گرتەدەست. دایکی قابوس، هیند کوڕی حارس کوڕی عەمرۆ بوو. بۆ ماوەی چوار ساڵ پاشایەتی کرد کەهەشت مانگی لەدەورانی ئەنەوشیروان و سێ ساڵ و چوار مانگی لەدەورانی هورموز کوڕی ئەنەوشیروان بوو.

دوای قابوس کوڕی مونزەر، سەهرەب پاشایەتی گرتەدەست.

دوای ئەو، مونزەر باوکی نەعمان کوڕی مونزەر چوار ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو نەعمان مونزەر باوکی قابوس بیست و دوو ساڵ پاشایەتی کرد: حەوت ساڵ و هەشت مانگی لەرۆژگاری هورموز کوڕی ئەنەوشیروان و چواردەساڵ و چوار مانگی لەرۆژگاری خوسرەو پەرویز.

دوای ئەو لەرۆژگاری خوسرەو پەرویز، ئەیاس کوڕی قەبیسەی تایی، بەبەشداری نەخێرجان نۆ ساڵ پاشایەتی کرد.

بەوتەی کوڕی هوشام یەك ساڵ و هەشت مانگ دوای دەسپێکردنی پاشایەتی ئەو، پێغەمبەر(د.خ) وەك پێغەمبەر(د.خ) رەوانە کرا.

دوای ئەو ئازادبە کوڕی بامان کوڕی مێهربەندادی هەمەدانی بۆ ماوەی حەوت ساڵ پاشایەتی کرد.

دوای ئەو مونزەر کوڕی نەعمان کوڕی مونزە کەعەرەبەکان بەغرور ناوی دەبەن، هەشت مانگ پاشایەتی کرد تا ئەو کاتەی خالید کوڕی وەلید هات و

لەشەڕی جەواسا لەبەحرەیین کوژرا. ئەو دوایین پاشای بنەماڵەی رەبیعە بوو و بەکۆتایی هاتنی پاشایەتی فارسەکان، پاشایەتی ئەوانیش کۆتایی هات.

بەوتەی هوشام، هەموو پاشاکانی حیرە لەبنەماڵەی نەسر و عیبادیەکان و فارسەکان بیست کەس و ماوەی پاشایەتی ئەوان پێنسەد و بیست و دوو ساڵ و هەشت مانگ درێژەی کێشا.

ئێستا ئاماژە بەگێڕانەوەی رواوەکانی مەرزوان کە لەلایەن هورموز و کوڕەکەی پاشایەتی یەمەنی دەکرد، دەدەین هەروەها ئەو کەسەی دوای ئەو هاتە سەرتەخت.

لەهوشام کوڕی محەممەدی کەلبی دەگێڕنەوە: هورموز کوڕی خوسرەو، زینی لەفەرمانڕەوایەتی یەمەن لابرد و مەرزوانی بۆ ئەو کارە راسپارد کەلەوێ مایەوە و منالی هێنایە دنیا. منالەکەی گەورە بوو. لەو خەڵکەکە، یەکێك لەکوێستانەکانی یەمەن بەناوی مەسانع، دژایەتی ئەویان کرد و باج و خەراجیان پێنەدا. مەسانع کێوێکی هەڵەمووت و بەرزە و لەتەنیشت کێوێکی دیکەدایە. ماوەی نێوان ئەو کێوەکە کەمە بەڵام گەشتن بەو کێوە ئەگەری نییە مەگەر تەنیا لەیەك رێگەوە کەیەك پیاو بەتەنیا دەیتوانی پارێزگاری لەورێگەیە بکات.

کاتێك مەرزوان بینی هیچ رێگەیەکی بۆ پەڕینەوە نییە، بەسەر کێوی بەرامبەردا سەرکەوت کەروبەروی قەڵاکەی ئەوان بوو. تەسکترین شوێنی دۆڵەکەی بینی کەشوێنێکی کراوە و هیچ جێگەیەك لەو شوێنە بۆ گرتنی قەڵاکە، گونجاوتر نەبوو. بەهاوەڵانی خۆی وت لەدوو ریزدا بوەستن و پێکەوە هاواریان کرد. ئەسپەکەی خۆی بەخێرایی غارپێدا و قەڵەمبازیدا. لەتەنگایی دۆڵەکە پەڕییەوە و گەشتە لای دەروازەکە. کاتێك حەمیریەکان ئەم کارەی ئەویان بینی، وتیان: ئەمە شەیتانە. مەرزوان لەگەڵیان ئاخاوت و بەفارسی قسەی لەگەڵ کردن. فەرمانی پێدان بازوی یەك ببەستنەوە. دەستەیەك لەوانی کوشت و دەستەیەکی ئەسیر کرد. رووداوەکەی بۆ خوسرەو نووسی. خوسرەو لەکارەکەی ئەو سەریسوڕما و نووسی: کەسێك وەك جێگری خۆت دەستنیشان بکەو وەرە.

دەڵێت: مەرزوان دوو کوڕی بوو. یەکیان ئارەزوومەندی زمانی عەرەبی و هۆنراوەی دەخوێندەوە بەناوی خەرخوسرە. ئەوی دیکەیان سوارچاکێك بوو

کەبەفارسی دەئاخاوت و شێوازی وەرزێرەکانی گرتبوو. مەرزوان، خەرخوسرەی وەك فەرمانڕەوای یەمەن دەستینشان کرد چونکە ئەوی لەهەموو منالەکانی زیاتر خۆشدەویست. بەرێکەوت و لەیەکێك لەسەرزەمینەکانی عەرەب مرد. ئەویان خستە ناو تابوتێك و بردیان تا گەیشتنە لای خوسرەو. کاتێك سنوقەکەیان خستە ناو خەزێنە، لەسەریان نووسی: فلاّن کەس کەفلاّنە کار و فیسارە کاری ئەنجامدا، لەناو ئەم سنوقەدا خەوتووە. داستانی کێوەکەیان نووسی.

خوسرەو لەئارەزومەندی خەرخوسرەو بۆ زمانی عەرەبی ئاگادار بوویەوە کەهۆنراوە دەخوێنێت و نەریت و خووی عەرەبەکانی گرتووە. ئەوی لەسەر کار لابرد و بازانی لەجێگەی ئەو دانا. بازان دوایین کەس لەنوێنەری کارەبەدەستانی فارس بوو کەروی لەسەرزەمینی یەمەن کرد.

خوسرەو لەفراونی سامان وجۆرەکانی جەواهیر کەکۆی کردبوویەوە و ئەو ویلایەتانەی دەستی بەسەردا گرتبوو و لەو سەرکەوتنانەی بەدەستی دەهێنا، لەخۆی بایی و تەماحی زیادی کرد. بەچاوێکی تەماحکارانە سەیری سامانی خەلّکانی دەکرد. وەرگرتنی خەراجی بەیەکێك لەخەلّکانی گوندی خەندەق لەویلایەتی بەهر سیر سپارد کەبەفەروخزاد کوڕی سەمی ناویان دەبرد. فەروخزاد خەلّکانی ئەشکەنجە و ستەمکاری کردەپیشە. سامانی کەسانی بەناڕەوا گرت و کاروباری ئەوانی بەفیڕۆدا. بژێوی ئەوان کەم بوویەوە و بوونە دوژمنی پاشایەتی خوسرە.

هەروەها لەهوشام کوڕی محەممەدی کەلبی دەگێڕنەوە: خوسرەو پەرویز بەرادەیەك مالّ و سامانی کۆکردەوە کەسامانی هیچ کام لەپاشاکانی پێشوو بەئەندازەی سامانی ئەو نەبوو. سوپاکەی تا قوستەنتەنییە و ئەفریقیە گەیشت. زستانی لەمەداین بەسەر دەبرد و هاوێنان لەنێوان مەداین و هەمەدان.

دەڵێن: دوانزە هەزار ژن و کەنیزی بوو. نۆسەد ونەوەد و نۆ فیل و پەنجا هەزار چوارپێی لەئەسپ و ئێستر و ماین، ڕاگرتبوو. ئارەزوومەندی کۆکردنەوەی زێڕ و زیو و دەفرە زێرینەکان و شتی دیکە بوو.

یەکیتر دەڵێت: لەحەرمسەراکەی ئەو سێ هەزار ژن دەبینرا کەلەگەڵیان

دەخەوت. بۆ خزمەت کردن و گۆرانی خوێندن و کارەکانیتر هەزاران کەنیزی بوو. سێ هەزار پیاویش خزمەتیان دەکرد. هەشت هەزار و پێنسەد ئەسپی بۆ سواری راگرتبوو، حەوتسەد و شەست فیل و دوانزە هەزار ئێستر باروبنەکەی ئەویان دەگواستەوە.

فەرمانی دروست کردنی ئاتەشکەدەکانی دەرکرد و دوانزە هەزار هیربۆدی بۆ خزمەت کردنی ئەوان راسپارد. لەساڵی هەژدەمی پاشایەتی فەرمانیدا بەرهەمی خەراج و سەرچاوەکانی دیکەی داهات بژمێرن و ئاگاداری بکەنەوە. لەو ساڵەدا لەخەراج و داهاتەکانی دیکە هەزار و بیست هەزار هەزار زێو کۆکرابوویەوە کەبەرابەرە لەگەڵ شەشسەد هەزار هەزار درەم. سامان وداهاتەکەی بەخەزێنەی شاری تیسبون سپارد کەبەدەستی خۆی بناغەی دارشت و بەناوی بەهار حودی خوسرەو ناوی دەبرد. جگە لەم سامانە، لەسکەی فیروز کوڕی یەزدگێرد و قوباد کوڕی فیروز دوانزە هەزار کیسەی بۆ مابوویەوە کەهەر کیسەیەك چوار هەزار مسقاڵ زیوی تیا بوو کەکۆی گشتی دەیکردە چل و هەشت هەزار هەزار مسقاڵ و بەرابەرە لەگەڵ شەست و هەشت هەزار هەزار و پێنسەد هەزار و چوارسەد و بیست درەم و یەك نیو و یەك لەسەر سێی هەشت درەم بوو. زێر و دەفر و قاپە زێرینەکانی بەئەندازەیەك کۆکردبوویەوە کەجگە لەخواوەند کەسی ژمارەکەی نەدەزانی.

خوسرەو خەڵکانی لاواز و ریسوا کرد. ئەو کارە نەشیاوەکانی کردە پیشە کە لەکردەوەی پاشا دورئەندێشەکان بەدوورە. یاخی بوون و ستەمکاری گەشتە ئەو جێگەی فەرمانی بەزادان فروخ سەرکردەی پاسەوانەکانی خۆیدا، هەموو زیندانی و ئەسیرەکان بکوژێت. کاتێك ژمارەیان کردن سی و شەش هەزار کەس بوون. زادان فروخ ئەوانی نەکوشت و بیانوی هێنایەوە بۆ ئەوەی فەرمانەکانی خوسرەو ئەنجام نەدات.

خوسرەو بەچەند هۆکارێك دوژمنایەتی خەڵکی بۆ خۆی بزواند: یەکیان ئەوەی ریسوای دەکردن و گەورەکانی بەکەم و بێ بەها لەقەڵەم دەدا. هۆکارێکی دیکە ئەوەی فەرخان زاد کوڕی سەمی بەسەر ئەواندا زاڵ کردبوو. سێیەم ئەوەی فەرمانیدا بوو هەموو زیندانییەکان بکوژن. چوارەم ئەوەی بڕیاریدا بوو هەموو ئەو

کەسانەی لەشەڕ لەبەرابەر هێرقل و ڕۆمیەکان گەڕابوونەوە، کوشتار بکات.

دەستەیەک لەگەورەکان بەرەو بابل کەوتنە ڕێ کەشیرویە کوڕی خوسرەو و پەرویز و براکانی لەوێ ژیانیان بەسەر دەبرد. خوسرەو ماموستاکانی ئەدەبی راسپاردبوو، ئەدەبیان فێربکات و سوارچاکەکانی دانا بوو تارێگەی هاتنەدەرەوە لەو شوێنەیان لێ بگرێت. گەورەکان شیرویەیان هێنایە دەر و شەوانە گەیشتە شاری بەردسیر. هەموو زیندانییەکانی ئازاد کرد و هەموو هەڵاتووانی شەڕی ڕۆمیەکان و هێرقل پەیوەستیان بوون و هاواریان کرد: قوبادی شای شاکان. بەرەبەیان ڕویان کردە گۆڕەپانی شەڕ. پاسەوانەکانی کۆشك هەڵاتن و خوسرەو بەشێوەیەکی ترسا ڕۆشتە ناو باغی هینداون کە لەنزیك کۆشکدایە. لەمانگی ئازەر ئەویان گرت و لەپایتەخت، زیندانیان کرد. شیرویە هاتە ناو پایتەخت و گەورەکان لەدەوری کۆبونەوە و ئەویان وەك پاشا هەڵبژارد. شیرویە کەسێکی بۆ لای باوکی نارد وبۆ کارەکانی سەرکۆنەی کرد.

لەهوشام کوڕی محەممەدی کەلبی دەگێڕنەوە: خوسرەو پەرویز هەژدە کوڕی بوو. شەهریار گەورەتر لەهەموویان و زڕ کوڕی شیرن بوو. ئەستێرەناسەکان خوسرەویان ئاگادار کردبوویەوە یەکێك لەکوڕەکانی تۆ، کوڕێك دەهێنێتە دنیا کەوێرانی ئەیوان و روخانی پاشایەتی لەسەر دەستی ئەودەبێت. نیشانەکەی ئەوەیە کەکەم و کورییەك لەجەستەیدا دەبینرێت. خوسرەو، لەبەر ئەمە رێگەی نزیك بوونەوەی کوڕەکانی لەگەڵ ژنان گرت. ماوەیەکی تێپەڕی و کوڕەکانی هیچ ژنێکیان نەبینی. شەهریار لای شیرین سکاڵای کرد و بەپەیام، حەز و تامەزرۆیی خۆی باس کرد. داوای لێکرد ژنێکی بۆ بنێرێت و گەرنە خۆی دەکوژێت.

شیرین وەڵامی دایەوە: ناتوانم هیچ ژنێك بۆ تۆ بنێرم مەگەر ئەوەی کەسێکی گەورە نەبێت و نزیك بوونەوەی تۆ لەکەسێکی بەمشێوە، پەسەند نییە.

شەهریار وتی: هەرچی بێت، تەنیا ژن بێت.

شیرین پەردەدارەکەی خۆی بۆ نارد. دەڵێن ئەو کچی یەکێك لەگەورەکان بوو. شیرین لێی تورە و ئەوی کردبووە یەکێك لەپەردەدارەکانی خۆی. کاتێك کچەکە ڕۆشتە لای شەهریار، لەگەڵی خەوت و بەیەزدگێرد دووگیان بوو. شیریان فەرمانیدا

ئەویان لەسوچێك داشارد تا ئەو کاتەی منالەکەی هێنایە دنیا. بۆ ماوەی پێنج سالْ منالەکەی لەخەلْکان دەشاردەوە. کاتێك خوسرەو لەسەردەمی پیری، خۆشەویستی منالان، کەوتە دلْیەوە، شیرین پێی وت: ئەی پاشا، ئایا دەتەوێت منالی یەکێك لەکوڕەکانی خۆت ببینیت هەرچەندە ئەو کارە پەسەند ناکەیت.

خوسرەو وتی: گرنگ نییە.

شیرین فەرمانی جوان و بۆنخۆش کردن و رازاندنەوەی یەزدگێردیدا. ئەوی بردە لای خوسرەو، وتی: ئەمە یەزدگێرد کوڕی شەهریارە.

خوسرەو ئەوی لەخۆی نزیك و ماچی کرد. خۆشەویستی کوڕەکە کەوتە دلْیەوە و شەوانە ئەوی لای خۆی دەهێشتەوە. رۆژێك کەیەزدگێرد لای خوسرەو گەمەی دەکرد، وتەی ئەستێرەناسەکانی بیرکەوتەوە. ئەوی بانگ کرد و رووتی کردەوە. کەم و کوڕییەکەی لای کەلەکەی منالەکە بینی و توڕە بوو. ئەوی هەلْگرت تا بیکێشت بەزەویدا. شیرین داوێنی ئەوی گرت و سوێندیدا یەزدگێرد نەکوژێت. وتی: ئەگەر بڕیارە بەلایەك بەسەر ئەم پاشایەتیەدا بێت، کەس ناتوانێت رێگری لێ بکات.

خوسرەو وتی: ئەمە ئەو کەسە شوومەیە، منیان لێ ئاگادار کردۆتەوە. بیبەبە با چیتر نەیبینم. فەرمانیدا و ئەویان بۆ سیستان برد.

دەستەیەك وتوویانە: یەزدگێرد لەکاتی شیر خواردن لەسواد لەگوندێك بەناوی خەمانییە ژیانی بەسەر دەبرد.

فارسەکان دژی خوسرەو راپەڕین و ئەویان کوشت. شیرویە هاوکاری ئەوانی دەکرد.

ماوەی پاشایەتی ئەو سی و هەشت سالی خایاند. لەسالی سی و دوەمی پاشایەتی ئەو، پێغەمبەر(د.خ) لەمەککەوە بۆ مەدینە کۆچی کرد.

## دوای ئەو شیرویە پاشایەتی گرتەدەست

ناوی قوباد کوڕی پەرویز کوڕی کەسرا ئەنەوشیروانە.

دەڵێن: کاتێك شیرویە پاشایەتی گرتەدەست و باوکی زیندانی کرد، گەورەکانی وڵات لەدەوری کۆبونەوە و وتیان: ئێمە نابێت دوو پاشامان هەبێت، یا کەسرا بکوژە وئێمە فەرمانەکانی تۆ ئەنجام دەدەین یا دوبارە ئەو بۆ سەر تەختی پاشایەتی دەگەڕێنینەوە و هاوشێوەی پێشو ملکەچی فەرمانەکانی دەبین.

ئەم وتەیە کاریگەری لەسەر شیرویە دانا و فەرمانی بردنی خوسرەوی لەپایتەخت دەرکرد تا لەماڵی پیاوێك بەناوی مارسفەند جێگەی بکەنەوە. ئەویان خستە ناو تابوتێك و سەروروخساریان داپۆشی. دەستەیەك لەسوپاییەکان هاورێیەتیان دەکرد. لەسەر رێگەی لای پینەچییەك تێپەڕین کە لەناو دوکانەی لەسەر رێگە دانیشتبوو. کاتێك سوارەکانی بینی کەپیاوێکی بەستراو و داپۆشراویان پێیە، زانی خوسرەوە. قاڵبی پێڵاوێکی بۆ هاویشت. یەکێك لەسوپاییەکان شمشێری دەرکێشا و پینەچییەکەی کوشت.

کاتێك خوسرەو لەماڵی مارسقەند جێگیر بوو، شیرویە هەموو گەورە و سەرکردەی بنەماڵەکانی کۆکردەوە و وتی: بڕیارمداوە کەسێك بۆ لای باوکم رەوانە بکەم و رێگەی چارەی خۆی، لەخۆی بپرسم.

پیاوێکی بانگ کرد بەناوی ئەسفاز جەشنس لەخەڵکانی ئەردەشێر خەرە. ئەسفاز سەرکردەی دەستەیەك لەسوپاییەکان و کێشەکانی پاشایەتی چارەسەر دەکرد. وتی: برۆ لای باوکم و پێی بڵێ، ئەمن و ئەهیچ کام لەخەڵکان نەبووینەتە هۆکاری ئەو بەڵای گرفتاری بوویت. ئەمە فەرمانی خواوەندە و سزای کارەخراپەکانی خۆت لەم دنیایە وەرگرت. باوکی خۆتت کوشت و پاشایەتیت لێسەندەوە. سەبارەت بەو تاوانێکی گەورەت کرد. لەگەڵ منداڵەکانی خۆت خراپە و ستەمکاریت کردە پیشە و رێگەت پێنەداین لەگەڵ چاکەکاران دابنیشین. هۆکارەکانی دڵخۆشیت لەئێمە گرتەوە. کەسانێکی زۆرت بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ

لەزیندانەکاندا هێشتەوە کە نەدار و هەژار و دوور بون لەکەس و کار، بەدبەخت بوون. هەموو ژنانت تایبەت کردبەخۆت. چاکەت لەگەڵ ئەوان نەکرد. ئەوانت لەکەسانی دیکە درێغ کرد کەدەیانتوانی ببنە خاوەنی ماڵ و منداڵ. لەکاری وەرگرتنی خەراج ستەمت لەژێردەستەکان کرد و بەو پەڕی توندوتیژییەوە ڕێزی کەسانت خستە ژێرپێ. ماڵ و سامانی خەڵکت بۆ خۆت کۆکردەوە و ئەوانت بەرەو لەناوچوون برد. لەسنوری ڕۆم و سنورەکانی دیکە سوپایەکی فراوانت لەبەردەستا بوو. ئەوانت لەماڵ و منالّی خۆیان دوورخستەوە. خیانەتت لەموریق پاشا کرد و ڕێزی چاکیەکانی ئەوت نەگرت لەکاتێکدا پەنای بەتۆدا و بۆ وەرگرتنی پاشایەتی هاوکاری کردی و دوژمنەکەتی لەناو برد و کچە ئازیزەکەی خۆی کردە هاوسەری تۆ. بەلام مافەکانی ئەوت نەناسی و کاتێك داوای خاچەکەی لەتۆ کردەوە، بۆت نەگەڕاندەوە لەکاتێکدا تۆ و خەڵکەکەت پێویستتان پێی نییە. ئەگەر بەڵگەت بۆ کارەکانی خۆت هەیە، باسی بکە و ئەگەر بەڵگەت نییە. تۆبە بکە و داوای بەخشین لەخواوەند بکە تا فەرمانی خۆمان سەبارەت بەتۆ دەربکەین.

ئەسفاز پەیامەکەی شیرویەی هەڵگرت وبەرەو لای خوسرەو کەوتە ڕێ تا پەیامەکە بگەیەنێت. کاتێك گەیشتە ئەو شوێنەی خوسرەویان لەوێ زیندانی کردبوو، جیلنوس سالاری سوپا راسپێردراوانی خوسرەوی بینی و ماوەیەك قسەیان کرد.

ئەسفاز داوای مۆڵەتی لێکرد تا بڕواتە لای خوسرەو و لەپەیامی شیرویە ئاگاداری بکاتەوە.

جیلنوس هات و پەردەی لەبەرابەر خوسرەو هەڵگرت. ڕۆشتە لای و وتی: خواوەند تەمەنت درێژ بکات، ئەسفاز چاوەڕوانی مۆڵەتە و دەڵێت: شیرویە پەیامێکی بەودا ناردووە و داوا دەکات بتبینێت. بۆچوونی تۆ چییە؟

خوسرەو پێکەنی وبەگاڵتەوە وتی: ئەی ئەسفازان جیلنوس، وتەکەی تۆ هاوشێوەی وتەی بیرمەندان نییە. ئەگەر پەیامەکە لەلایەن شیرویە پاشایە، پێویست بەمۆڵەتی ئێمە ناکات و ئەگەر مۆڵەت بەدەستی ئێمەیە، کەواتە شیرویە پاشا نییە. ئەمە هاوشێوەی ئەو پەندەیە کەوتوویانە: خواوەند دەیەوێت و دەبێت. پاشا

فەرمان دەدات و جێبەجێ دەکرێت. پێی بڵێ پەیامەکەی بگەیەنێت.

کاتێك جلینوس ئەم وتارەی بیست، لای خوسرەو ڕۆشت و دەستی ئەسفاز جەشنسی گرت و وتی: هەستە و بڕۆ لای خوسرەو.

ئەسفاز جەشنس هەستا. بانگی یەکێك لەخزمەتکارەکانی خۆی کرد. بالاپۆشەکەی خۆی پێدا و دەسرێکی سپی دەرهێنا و روخساری خۆی پێبەست. ڕۆشتە لای خوسرەو و کاتێك ئەوی بینی، کوڕنوشی برد. خوسرەو پێی وت: هەستە. هەستا و دەست لەسەر سنگ وەستا.

خوسرەو لەسەر سێ ڕاخەرێکی بەزێر چنراو کەهەوریشمیان بەسەردا ڕاخستبوو، دادەنیشت. سێ پشتی بەزێرچنراو لەپشتیەوە بوو. هەرمێیەکی زەردی بەدەستەوە بوو، کاتێك ئەسفازی بینی، چوارمەشقی دانیشت. هەرمێکەی خستە سەر پشتیەکە. کەوتە خوار لەبەر ئەوەی خڕ و پشتیەکە نەرم بوو. کەوتە سەر فەڕشەکە. لەسەر فەڕشەکەیش نەوەستایەوە و کەوتە سەرزەوی و خۆڵاوی بوو. ئەسفاز هەڵیگرتەوە و بەقۆلی کراسەکەی پاکی کردەوە تا بیخاتە بەردەم خوسرەو. خوسرەو بەئیشارە پێی وت دووری بخاتەوە، وتی: لەشوێنێك داینێ.

ئەسفاز لای فەڕشەکە داینا و گەڕایەوە شوێنەکەی خۆی و دوبارە دەست بەسینە وەستا.

خوسرەو ماوەیەك بیری کردەوە. دەستی بەقسە کردن کرد: کاتێك بەدبەختی دەست پێدەکات، بەرێگەچارە، چارەسەر ناکرێت وکاتێك بەختەوەری باوەشت بۆ دەکاتەوە، بەرێگەچارە، لەناو نابرێت. ئەمە فەرمانەکانی ڕۆژگارە. وتی: کوشتن و کەوتن و خۆڵاوی بوونی ئەم هەرمێیە، لەپەیامەکەی تۆ و سەرئەنجامی کارەکان ئاگادارمان دەکاتەوە. هەرمێکە نیشانەی خێرە کە لەسەرەوە کەوتە خوار. لەسەر فەڕشەکەی ئێمە نەمایەوە و کەوتە سەرزەوی. خۆڵاوی بوو و ئەمە نیشانەی ئەوەیە، شکۆی پاشاکان کەوتە دەست خەڵکانی ئاسایی و پاشایەتی ئێمە لەناوچوو و نەکەوتە دەست نەوەکانی ئێمە. کەس پاشایەتی ناگرێتەدەست کەخەڵکی ئەم وڵاتە بێت. ئێستا باسی پەیامەکەی خۆت بکە.

ئەسفاز جەشنس پەیامەکەی شیرویەی باس کرد. هیچ وشەیەکی لەبیر نەکرد و

یەک وشەی زیادەی نەخستە سەر.

خوسرەو وتی: لەوەڵامی ئەمە پەیامە بەشیرویەی تەمەن کورت بڵێ، هیچ بیرمەندێک گوناحی بچوکی کەسێکی دیکە پێش لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوە، بە دڵنیاییەوە ناهێنێتە سەرزمان و بڵاوی ناکاتەوە چ بگات بەو گوناحە گەورەکانی ئامارەی پێداوە و ئێمەی پێ تۆمەتبار دەکات. ئەو کەسەی گۆناحبارێک سزا و سەرکۆنەی دەکات، دەبێت خۆی لەگوناح وخراپە بەدور بگرێت. ئەی تەمەن کورتی نەزان! ئەگەر بەو شێوە دەبووین کەباسی دەکەیت، ڕەوا نییە باس و سەرکۆنەم بکەیت، ئەگەر ئیرادەکانی خۆت نازانیت و لەگوناحەکانی ئێمە دەدوێیت، بیری لەکێشە و ئیرادەکانی خۆت بکەرەوە و دەست لەرەخنە گرتن هەڵگرە چونکە وتاری ناڕەوا، بەنەزان و کەسێکی سست و لەفەرمان و بیروبۆچونەکانی دەتناسێنێت. ئەگەر مەبەستی ئەوە دەکەیت گوناحەکان بخەیتە سەرشانی ئێمە کەببێتە هۆی کوشتنم، ڕەوایە و تۆ بۆ ئەم کارە بەڵگەت هەیە. بزانە هەموو دەوەرانی هاودینی تۆ کوشتنی باوک بەناڕەوا دەزانن و لەتێکەڵ بوون و هاونشینی لەگەڵ چاکەکاران بەدوورن چ بگاتە بەپاشایەتی.

بەڵام سپاس بۆ خوا لەبەر ئەوەی خراپەمان نەکرد کاری ئێمە لەگەڵ خوا و خەڵك و هاودینەکانمان و تۆ و هەموو کوڕەکانمان بەشێوەیەك بووە کەکەمتەرخەمیمان تیا نەکردووە و کەس بەڵگەی دژی ئێمە نییە و ناتوانێت سەرکۆنەمان بکات.

هەرچەند ئەم بەڵگەیە و ئەم وتەیەم کەم وکوڕی تیا نییە، لەگەڵ ئەوەیشدا بۆ ئەو گوناحانەی باسی دەکەیت، ڕوونکردنەوەم هەیە تا نەزانی وبێ ئاوزی و کاروبارەکانی خۆت بزانیت: ئەوەی سەبارەت بەهورموزی باوکم ئامارەت پێداوە، بەمشێوەیە: خراپەکاران و ئاژاوەچییەکان دڵی هورموزیان لەمن ڕەش کرد تا ئەوەی تۆمەتباری کردم و ڕقی لێ هەڵگرتم. کاتێك لەڕق و کینەی ئەو ئاگادار بوومەوە، ترسام و خۆم لەو دوور خستەوە و ڕوم کردە ئازەربایەجان. کێشەکانی ئەو گەورەتر و پاشایەتی پەرێشان بوو. کاتێك ئاگادار بوومەوە، لەئازەربایەجانەوە ملی ڕێگەم گرتەبەر. بەهرامی ڕیاکار کە سەرپێچی فەرمانەکانی دەکرد، لەگەڵ

سوپایەکی فراوان هێرشی کردەسەرم و ئێمەی بۆ بەجێهێشتنی وڵات ناچار کرد. رووومان لەسەرزەمینی رۆم کرد و هاوریّ لەگەڵ سوپایەکی گەورە گەڕاینەوە. شەڕمان لەگەڵ بەهرام کرد و چۆنییەتی لەناوچوونی ئەو لەسەرزەمینی تورکەکان، هەمووان لێی ئاگادارن. کاتێك کاروبارەکان سەقامگیر و پاشایەتی ئێمە بەهێز بوو، بەهاوکاری خواوەند، زیان و بەڵاکانمان لەسەر خەڵکان هەڵگرت و وتمان: باشترین کار ئەوەیە تۆڵەی باوکی خۆمان بستێنینەوە و داوای خوێنەکەی بکەین. هەموو ئەو کەسانەمان کوشت کەلەکوشتنی ئەو بەشدار بوون. کاتێك لەم کارە تەواو بووم، بەمەبەستی خۆم گەیشتم و چارەسەر کردنی کێشەکانم دەستپێکرد. لەبەر ئەمە فەرمانی کوشتنی هەموو ئەو کەسانەم دەرکرد کەلەکوشتن و لەناو بردنی ئەو تاوانبار بوون.

بەڵام بەسەرهاتی کوڕەکانم بەوشێوەیە کەهەموو کوڕەکانم جگە لەوەیان کەخواوەند دەیویست، جەستەی تەندروست و بیّ ئیراد بوو. پاسەوانمان بۆ دانان تا رێگە نەدەن سنورەکانی خۆتان ببەزێنن چونکە دەترسام ستەمکاری لەسەر خەڵکان بکەنەپیشە. بەڵام سەبارەت بەکاری ماڵ و چوارپێ و هەموو نیازەکانی ئێوە، بەرادەیەك سامانمان خەرج کرد کەئەندازەکەی کەس نایزانێت.

بەسەرهاتی تۆ بەوشێوەیە: ئەستێرەناسەکان ئاگاداریان کردمەوە کەمناڵەکەت دژی ئێمە شۆڕش دەکات. بەڵام فەرمانی کوشتنی تۆمان دەرنەکرد بەڵکو رێگەی نزیك بوونەوە لەژنانمان لێگرتی. شیرینی هاوسەرم بۆ ئەم کارە راسپارد چونکە باوەڕم پێی بوو. فەرمیشای پاشای هیند لەساڵی سی و دوەمی پاشایەتی ئێمە، نامەی بۆ نووسیم. لەگەڵ نێردراوان باسی بابەتی جۆراوجۆری کرد وخەڵاتی بۆ من و کوڕەکانم ناردبوو. بۆ هەریەکەتان بەجیا نامەیەکی نووسیبوو. دیارییەکەی تۆ فیل و شمشێر و هەڵۆیەکی سپی و فەڕشێکی بەزێرچنراو بوو. لەژێر نامەکەی تۆ نوسیبووی: ناوەرۆکی ئەم نامەیە لای کەس باس مەکە.

فەرمانمدا نامە و دیارییەکانی هەمووتان بەدەستتان بگات بەڵام نامەکەی تۆ بەهۆی نووسینەکەی خوارەوەی، لای ئێمە مایەوە. دەبیرێکی هیندیم بانگ کرد و نامەکەی بۆ خوێندینەوە کەناوەرۆکەکەی بەمشێوەیە: دڵخۆش و ئەرخەیان بە

چونکە لەمانگی ئازەر و ڕۆژی دیبازەر لەساڵی سی و هەشتەمی پاشایەتی خوسرەو، لەسەر تەختی پاشایەتی دادەنیشیت و پاشایەتی لەدەست دەردێنیت. دڵنیابووم ئەم کارە دەبێتە هۆی لەناوچونی ئێمە بەڵام لەبەخششەکانی تۆم کەم نەکردووە و فەرمانی کوشتنی تۆم دەرنەکرد. نامەی پاشای هیندم بەئەنگوستیلەکەی خۆم مۆرکرد و بەشیرینم سپارد. شیرین هێشتا زیندووە، ئەگەر ئارەزوو بکەیت دەتوانی نامەکە سەبارەت بەمناڵەکەت و خۆتی لێ وەربگریت، تا بیخوێنیتەوە و پەشیمانی بەسەرتا زاڵ ببێت.

سەبارەت بەزیندانییەکان، ئەمە وەڵامی ئێمەیە: پاشاکانی رابردوو لەرۆژگاری کیومەرسەوە تا پاشایەتی بەشتاسب چارەسەری کێشەکانی پاشایەتیان بەدادپەروەری دەکرد و لەرۆژگاری بەشتاسب تا رۆژگاری ئێمە، چارەسەری کێشەکان هاوڕێ بوو لەگەڵ دادپەروەری و خۆپارێزی. ئەگەر ئاوز و زانست و ئەدەبت نییە، لەپیاوانی ئایینی کەکۆڵەکەی ئەم دینەن. بپرسە سەبارەت بەو کەسەی نافەرمانی پاشاکان دەکات و پەیمانی ئەوان دەشکێنێت و دەبێتە هۆی کوژرانی خۆی. تا پێت بڵێن کەسانی لەو چەشنە شیاوی بەخشش و بەزەیی نین، بەڵام من تەنیا ئەو کەسانەم زیندانی کرد کەشیاوی کوشتن و ئەندام برینەوە بوون. زۆر جار وەزیر و گەورەکانی وڵات پێشنیاریان دەکرد ئەوانەی شیاوی کوشتنن، دەبێت زوتر بکوژرێن نەکا بیر لەفرت و فێڵ و کوشتنی پاشا بکەنەوە. ئێمە کەئارەزومەندی پاراستنی ژمارەی دانیشتووان ولەخوێنرێژی بێزار بووین، پەلەمان نەکرد. کاری ئەوانمان بەخواوەند سپارد و لەزینداندا رامانگرتن. تەنیا سزاکەیان ئەوەبوو ڕێگەی گۆشت و شەراب خواردن و بۆن کردنی گوڵەکانمان لێگرتن. لەنەریتە کۆنەکان سەبارەت بەرێگرتنی زیندانییەکان لەچێژ وەرگرتن زێدەرۆییمان نەکرد و خواردن و کەرەستە پێویستەکانمان خستە بەردەستیان. فەرمانمان نەدا ئەوان لەژنەکانیان دوور بکەنەوە و ڕێگەی منداڵ بوونیان لێبگرن.

بیستوومە دەتەوێت زیندانیانی شیاوی کوشتن ئازاد و زیندانەکان خاپور بکەیت. ئەگەر ئەم کارە بکەیت، نافەرمانی خواوەند و خراپەی خۆتت دەوێت و فەرمانە دینییەکان دەخەیتە ژێرپێ و پێچەوانەی نەریت و سونەتەکان

دەجوڵێنیتەوە چونکە خەڵکانی شیاوی کوشتن، شیاوی بەخشش و بەزەیی نین.

بزانە دوژمنانی پاشایەتی هیچ کات لایەنگر و شوێنکەوتەی پاشایەتی نین. یاخیان لەپاشا هیچ کات ملکەچ و گوێرایەڵ نابن چونکە بیرمەندان وتوویانە: سزای تاوانباران دوامەخەن چونکە زیانی دادپەروەری لێدەکەوێتەوە و لەبەرژەوەندی پاشایەتی نییە. ئەگەر لەئازاد کردنی ئەم خراپەکارانە شادمان ببیت، دواهاتەکانی لەپاشایەتی خۆتا دەبینی و زیان بەباوەڕداران و خەڵکان دەگەیەنێت.

بەڵام ئەوەی ئاماژەت پێداوە کەماڵ و سامانی خەڵکان بەزۆر دەگرم و بەستەمکاری کۆمکردۆتەوە نەك لەدیاری دوژمن و بەهۆی شەڕەکانەوە، وەڵامەکەم بەمشێوەیە: باشترین وەڵام بۆ وتەیەك لەرووی نەزانییەوە بێتە سەرزمان، وەڵام نەدانەوەیە، بەڵام بێدەنگ نابم چونکە وەڵام نەدانەوە یانی رازی بوون بەتاوان. بۆ ئەوەی کردومە بەڵگەی بەهێز و ئاشکرام هەیە: وەڵامەکەم ئەمەیە:

ئەی نەزان، پاشایەتی دوای خواوەند، بەماڵ و سوپا بەهێز دەبێت بەتایبەت پاشایەتی دیاری فارسەکان چونکە دوژمنان لەهەموو سنورەکانەوە دەورەیان داوە وبۆ هەڵلوشینی ئەوەی پاشا کۆی کردۆتەوە، ئامادەن. بەرگری کردن لەبەرابەر دوژمن تەنیا بەسوپای فراوان و کەرەستەی شەڕی پێویست ئەگەری هەیە و سوپای فراوان و کەرەستەی پێویست تەنیا بەماڵ و سامانی فراوان کۆدەبێتەوە و سامانی فراوان تەنیا بەهەوڵدان و تێکۆشین لەوەرگرتنی خەراج دەستەبەر دەبێت. ئەمە دیاردەیەکی تازە نییە و لەم کارەدا هاوشێوەی پاشاکانی پێش خۆمان کارەکانمان راپەڕاندووە چوونکە ئەوانیش ماڵ و سامانیان کۆکردۆتەوە تا بۆ بەهێزی کردنی سوپا هاریکاریان بێت. بەهرامی ریاکار هاورێ لەگەڵ سوپاکەی کەشیاوی کوشتن بوون، هێرشیان کردە سەر خەزێنەکانی ئێمە و بەفیڕۆیاندا. لەخەزێنەکان جگە لەو سیلاحانەی کەتوانای هەڵگرتن و تیژکردنەوەیان نەبوو، بەجێنەما. کاتێك پاشایەتیمان وەرگرتەوە و پاشایەتی سەقامگیر و بەهێز بوو و خەڵکان گوێرایەڵی خۆیان نیشاندا، سوپاسالارەکانمان بۆ ناوچەکانی دەوروبەر رەوانە کرد و فەرمانڕەوامان بۆ ویلایەتەکان دەستنیشان کرد. سنورەکانمان بەسنوردارەکان و کاربەدەستە بوێرەکانی خۆمان سپارد و ئەوانمان بەسوپا، بەهێز کرد کەپاشاکان و

دوژمنانیان لەناو برد. لەساڵی سیانزەیەمی پاشایەتی ئێمە، بەردایەك لەوانیان کوشت و ئەسیر کرد کەلەسنوری دیاری خۆیان بەترسەوە ژیانیان بەسەر دەبرد چ بگاتە بەوەی هێرش بکەنە سەر دیاری ئێمە یا کارێکی ناپەسەند و نەشیاو ئەنجام بدەن. هەروەها لەم ساڵانەدا زێڕ و زیو و جواهیرە و تاڵانییەکان لەناو خەزێنەکانی ئێمە کۆبوونەوە کەفراوانییەکەی، خەڵکان لێی ئاگادارن. لەساڵی سیانزەیەمی پاشایەتی فەرمانمدا نەخشی تازە ئامادە و لەزیوەکان سکە لێبدەن. بەرادەیەك سکە لەناو خەزێنە و گەنجینەکانی ئێمە کەڵەکە بوو کەجگە لەوەی بۆ بژێوی و پێداویستیەکانی سوپا تەرخانمان کرد، دوسەد هەزار کیسەی زیو مایەوە کەسەد هەزار مسقاڵ بوو. کاتێك بینیمان سنورەکان پارێزراو و دوژمنمان لەدیاریەکەمان، دورکردۆتەوە و دۆڵ و دەربەندەکان ئەمن و چوار ناوچەکەی وڵات، ئارامی باڵی بەسەردا کێشاو و خەڵك ترسیان لەفڕاندنی سامانی خۆیان نییە، فەرمانماندا، پاشماوەی خەراجی ساڵەکانی دیکە وەربگرن و ئەو زیو و زێڕ تاڵانیانەی لەخەزێنەکانی ئێمە تاڵان کراوە، بگەڕێننەوە بەشێوەیەك لەکۆتایی ساڵی سی پاشایەتی فەرمانمدا تا دووبارە نەخشی تازە ئامادە و سکەی زیو لێبدەن. لەخەزێنەکانی ئێمە جگەی لەوەی بۆ سوپا و پێداویستییەکانی تەرخان کرا، چوارسەد هەزار کیسەی زیو مایەوە کەهەزار هەزار مسقاڵ و شەشسەد هەزار مسقاڵ بوو. ئەمە بێجگە لەوسامانەی لەپاشای رۆمەوە دەستمان کەوت لەو کەشتیانەی با هێنای و بەتاڵانی ناومان برد. لەساڵی سییەم پاشایەتی تا ساڵی سی و هەشتەم کەئەم ساڵەیە، بەردەوام ماڵ و سامانی ئێمە فراوان و ئاوەدانی ویلایەت و ئاسودەی خەڵکان بەگشتی و بەهێزی سنورەکان زیاتر بووە.

بیستوومە لەرووی ناپیاوەتی دەتەوێت، لەسەر داوای یاخیان، ئەم سامانە بڵاو بکەیتەوە و لەناوی ببەیت. ئاگادارت دەکەمەوە ئەم گەنج و سامانە بەگیان و مەترسی فراوان کۆکراوەتەوە تا بەهۆیەوە دوژمنان لەوڵاتەکەمان دوور بکەینەوە چونکە دوور کردنی دوژمنان لەرۆژگارەکاندا، دوای هاوکاری خواوەند ، تەنیا بەسامان و سوپای فراوان ئەگەری دەبێت و سوپا تەنیا بەسامان بەهێز دەبێت. ئەگەر سامان فراوان نەبێت، هیچ ئەنجامێکی نابێت. کەواتە ئەم سامانە بڵاوە

مەکەرەوە و دەستدرێژی مەکەسەر چونکە پاڵپشتی پاشایەتی و هۆکاری بەهێزی خۆت و لاوازی دوژمنە.

ئەسفاز بۆ لای شیرویە گەڕایەوە و لەوتەکانی خوسرەو ئاگاداری کردەوە بێ ئەوەی هیچی لێ کەم بکات یا وشەیەکی بخاتەسەر. گەورەکانی فارس گەڕانەوە و بەشیرویەیان وت ئێمە پێویستمان بەدوو پاشا نییە یا فەرمانی کوشتنی خوسرەو دەربکە تا ملکەچی فەرمانەکانی تۆ بین یا تۆ لەسەر کار لادەبەین و دەبینەوە بەندەی خوسرەو.

ئەم وتەیە کاریگەری لەسەر شیرویە دانا و فەرمانی کوشتنی خوسرەوی دەرکرد. ئەو کەسانەی خوسرەو ئازاری پێگەیاندبوون، خۆیان بۆ کوشتنی ئەوهەڵبژارد. هەر کەس دەڕۆشتە لای خوسرەو، جوێنی پێدەدا و کەس نەیتوانی بیکوژێت تا ئەوەی گەنجێك بەناوی هورموز کوڕی مەردانشا بۆ کوشتنی ئەو هات.

مەردانشا فەرمانڕەوای خوسرە لەویلایەتی نیمروز و گوێڕایەڵ و چاکەخوازی ئەو بوو. خوسرەو دوو ساڵ پێش لەدەستدانی پاشایەتی، سەرئەنجامی کاری خۆی لەئەستێرەناسەکان پرسی. پێیان وت: مەرگی ئەو لەلایەن نیمروزەوەیە. دڵی لەمەردانشا ڕەش و پیس بوو. لێی ترسا چونکە پیاوێکی گەورە بوو. لەو ناوچەیە کەس هێزی و دەسەلاتی ئەوی نەبوو. نامەی بۆنوسی تا بێت و کاتێك هات بەدوای بیانوێك دەگەڕا تا بیکوژێت بەلام هیچی دەستنەکەوت. شەرمی دەکرد چونکە لەخزمەتەکانی ئاگادار بوو. بڕیاریدا بیهێڵێتەوە و فەرمانیدا دەستی ڕاستی ببڕنەوە و لەجیاتی ئەم کارە، سامانێکی فراوانی پێببەخشن. بیانوی دۆزیەوە دەستی ڕاستی ئەوی بڕی.

بڕینی دەست وپێ لەگۆڕەپانی شاییدا ئەنجام دەدرا. ئەو ڕۆژەی خوسرەو فەرمانیدا دەستی مەردانشا ببڕنەوە کەسی ڕەوانە کرد تا بزانێت چی دەڵێت و خەڵکان چۆن باسی ئەم ڕوداوە دەکەن. کاتێك دەستی ڕاستی مەردانشایان بڕییەوە، بەدەستی چەپی هەڵیگرت و ماچی کرد و بەدەم فرمیسکەوە دەیوت: هاوار لەبەخشندەکەم، هاوار لەتیر هاوێژەکەم، هاوار لەخەت نووسەکەم، هاوار لەشمشێر وەشێنەکەم، هاواری لەیاریکەرەکەم، هاوار لەنازیزەکەم.

کاتێك نێردراو گەڕایەوە و خوسرەوی لەوتەکانی ئەو ئاگادار کردەوە، پەشیمان بوویەوە و یەکێك لەگەورەکانی بۆ لای ئەو نارد و پەشیمانی خۆی دەربڕی و پەیامیدا هەرچی بوێت، پێی دەبەخشێت.

مەردانشا لەوەڵامدا وتی: ئەی پاشا، بەخششەکانی تۆ دەزانم و سپاست دەکەم. دڵنیام ئەم کارەت بەبێزارییەوە ئەنجامدا، قەزار و قەدەرە. ئێستا داوای شتێك دەکەم و سوێند بخۆ پێمی دەبەخشیت. دەبێت کەسێکی باوەڕپێکراو لەسوێندەکەی تۆ ئاگادارم بکاتەوە تا داواکارییەکەی خۆم باس بکەم.

نێردراو ڕۆشت و خوسرەوی ئاگادار کردەوە. خوسرەو چەندین جار سوێندی خوارد کەمەردانشا داوای هەرچی بکات بەو مەرجەی زیانی پاشایەتی تیا نەبێت، پێی دەبەخشێت. یەکێك لەسالارەکان ئەم پەیامەی بۆ مەردانشا برد.

مەردانشا داوای کرد بیکوژن تا لەشەرمی بڕینی دەستی ڕزگاری بێت. خوسرەو بەبێزارییەوە فەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکرد چونکە نەیویست سوێندەکەی بشکێنێت.

کاتێك مێهر هورموز کوڕی مەردانشا ڕۆشتە لای خوسرەو، پرسیاری ناوی خۆی و باوك و پێگەی ئەوی کرد. لەوەڵامدا وتی: مێهر هورموز کوڕی مەردانشا فەرمانڕەوای نیمروزم.

خوسرەو وتی: تۆ کوڕی پیاوێکی شەریف و شارەزاییت. من بەشێوەیەکی شیاو پاداشتی خزمەت و چاکیەکانی ئەوم نەدایەوە. کارەکەت ئەنجام بدە.

مێهرهورموز بەتەور چەندین گورزی لەملیدا بەڵام کاریگەری دانەنا.

خوسرەو گەڕا. قەڵغانێکی لەسەر بازوی خۆی بینی، هەرکاتێك بەشمشێر لێیان دەدا، شمشێرەکە کاریگەری دانەدەنا. قەڵغانەکەی داکەند و مێهرهورموز زەربەیەکی دیکەی لێدا و کوشتی.

کاتێك شیرویە لەهەواڵی کوشتنی خوسرەو ئاگادار بوویەوە، یەخەی خۆی دڕی و دەستی بەگریان کرد و وتی: جەستەی ئەو بۆ دیفن کردن ببەن. گەورەکان و خەڵکان بەشداریان لەرێ ورەسمی بەخاك سپاردنی ئەو کرد. شیرویە فەرمانی کوشتنی بکوژەکەی باوکی دەرکرد.

ماوەی پاشایەتی خوسرەو سی و هەشت ساڵ درێژەی کێشا و لەمانگی ئازەر لەرۆژی مانگ، کوژرا.

شیرویە حەڤدە براکەی خۆی کوشت. ئەم کارەی بەراوێژ لەگەڵ فیروزی وەزیر و هاندانی شەمتا کوڕی مەرزین کاربەدەستی کۆکردنەوەی خەراج ئەنجامدا. دواتر گیرۆدەی نەخۆشییەکان و خۆشی لەدنیا نەبینی. مەرگی ئەو لەکۆشکی پاشایەتی روویدا.

شیرویە بۆ بنەماڵەی ساسان شووم بوو چونکە براکانی خۆی کوشت. خوشکەکانی توران و ئازەرمیدۆخت ڕۆشتنە لای و بەتوندی قسەیان لەگەڵ کرد. وتیان: تەماحی پاشایەتی بێ سەرئەنجام دەستی تۆی بەکوشتنی باوك و براکانت پیس کرد و گوناحێکی گەورەت ئەنجامدا.

کاتێك ئەم قسانەی بیست، دەستی بەگریان کرد و تاجی فرێدا و پاشماوەی تەمەنی بەڕەنج و خەمەوە بەسەر برد.

دەڵێن: شیرویە هەر کەسێك لەبنەماڵەکەی خۆی بینی، فەرمانی کوشتنی دەرکرد. لەرۆژگاری ئەو تاعون بلاّو بوویەوە و ژمارەیەکی زۆر لەفارسەکان مردن.

ماوەی پاشایەتی شیرویە هەشت مانگی خایاند.

## دوای ئەو ئەردەشێر پاشایەتی گرتەدەست

ئەو کوڕی شیرویە کوڕی پەرویز کوڕی هورموز کوڕی ئەنەوشیروانە. منداڵێکی کەم تەمەن و بەوتەیەك حەوت ساڵی بوو کەگەورەکانی فارس ئەویان وەك پاشا دەستینشان کرد لەبەر ئەوەی لەبنەماڵەی پاشایەتی کەس نەمابوویەوە. پیاوێك بەناوی مەهازەر جەشنس سەرپەرەستی کردنی ئەوی گرتەئەستۆ و بەشێوەیەك کاروبارەکانی راپەڕاند کەکەم تەمەنی ئەردەشێر دەرنەکەوت. شەهر بەراز هاوڕێ لەگەڵ ئەو سوپایەی خوسرەو پەیوەستی کردبوو و بە((نیکروزان)) ناوی دەبرد، لەسنورەکانی رۆم بوو. خوسرەو و شیرویە لەکار پێویست و گرنەکان راوێژیان لەگەڵ دەکرد. کاتێك گەورەکانی فارس سەبارەت بەپاشایەتی ئەردەشێر راوێژیان لەگەڵ نەکرد، بیانوی دەست کەوت و سەرکۆنە کردنی دەست پێکرد. شۆڕشی کرد و خوێنی ڕشت و تەماحی پاشایەتی لا دروست بوو. دەیویست لەپێگەی بەندایەتییەوە بگاتە پاشایەتی. ئەردەشێری ریسوا کرد چونکە کەم تەمەن بوو. سنورەکانی خۆی بەزاند و سەبارەت بەپاشایەتی خۆی، راوێژی لەگەڵ چەندین کەس کرد. لەگەڵ سوپاکەی خۆی بەرێکەوت.

مەهازەر جەشنس دیوار و دۆڵەکانی شاری تیسبونی بەهێز کرد و پاشماوەی بنەماڵەی پاشایەتی و هاوسەرەکانیان و ماڵ و چوارپێکانی ئەوانی بۆ شاری تیسبون برد. شەهر بەراز لەگەڵ شەش هەزار کەس لەفارسەکان کە لەسنورەکانی رۆم بوون، هاتن و لای تیسبون ئوردویان لێدا و گەمارۆی خستە سەر شارەکە. شەڕی دەست پێکرد و مەنجەنیقی دانا بەڵام نەیتوانی هیچ کارێك بکات. کاتێك نەیتوانی دەست بەسەر شارەکەدا بگرێت، فرت و فێڵی بەکار برد و نیوخوسرەو سەرکردەی پاسەوانەکانی ئەردەشێر و نامدار جەشنس کوڕی ئازەر جەشنسی سوپاسالاری نیمروزی فریودا تا دەرگای شارەکەیان بۆ کردەوە. هاتە ناو شارەکە و دەستەیەك لەگەورەکانی گرت و کوشتی. سامانی ئەوانی تاڵان و ژنەکانی ریسوا کردن. فەرمانی کوشتی ئەردەشێر کوڕی شیرویەیان دەرکرد. ئەمە لەساڵی دووەمی

پاشایەتی ئەو و لەمانگی بەهمەن و لەرۆژی ئەبان و لەئەیوانی خوسرەو شای قوباد روویدا.

ماوەی پاشایەتی ئەردەشێر کوڕی شیرویە یەك ساڵ و شەش مانگ بوو.

شەهر بەراز پاشایەتی گرتەدەست

ناوی فەرخان ماە ئیسفەنداره. لەبنەماڵەی پاشایەتی نەبوو بەڵام خۆی وەك پاشا ناساند. کاتێك لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت، سکی ئاوسا بەشێوەیەك نەیتوانی بڕواتە شوێنی دەست بەئاو گەیاندن. لەبەر ئەمە داوای تەشتێکی کرد و لەبەردەم تەختەکەی داینا و پیسایی تیا کرد.یەکێك لەخەڵکانی ئیستەخر بەناوی فەسفورخ کوڕی ماخرشیدان و دوو کوڕەکەی دوای کوژرانی ئەردەشێر و هاتنە سەرتەختی پاشایەتی شەهر بەراز، توڕە و ئەم کارەیان پەسند نەکرد. سوێندیان خوارد و بەڵێنیاندا بیکوژن. هەر سێکیان لەپاسەوانەکانی پاشا بوون. رەسم بەو شێوە بوو کاتێك پاشا بەرەو تەختی پاشایەتی بەرێدەکەوت، پاسەوانەکان بەریز، زریێ و قەڵغان و شمشێر و رم بەدەست دەوەستان و کاتێك پاشا دەگەیشتە بەردەمیان، سەریان دادەنەواند هاوشێوەی سوجدە بردن. شەهر بەراز دوای چەند رۆژێك لەپاشایەتی، مەبەستی ئەوەی کرد لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشێت. فەسفروخ و براکانی نزیك لەیەك بوون. کاتێك شەهر بەراز گەیشتە بەردەمی فەسفروخ، گورزێکی لێوەشاند. براکانیشی ئەو کارەیان کرد. ئەمە لەمانگی ئیسفەندارمەز و لەرۆژی دیبدین رویدا. شەهر بەراز کوژرا و لەئەسپەکەی کەوتەخوار. تەنافێکیان کردە قاچی و بەم لاولادا رایاندەکێشا. یەکێك لەگەورەکان بەناوی زازان فروخ کوڕی شەهرداران وپیاوێك بەناوی ماهیای کەراهێنەری ئەدەبی سوارکاران بوو، هاوڕێ لەگەڵ دەستەیەك لەگەورەکان و سەرانی بنەماڵەکان لەکوشتنی ئەودا هاودەست بوون. هەروەها هاوکاری کوشتنی بکوژەکانی شیرویە کوڕی ئەردەشێریان کرد و دەستەیەك لەگەورەکانیان کوشت و پوراندۆختیان وەك پاشای خۆیان هەڵبژارد.پاشایەتی شەهر بەراز چل رۆژی خایاند.

## دوای ئەو پوراندۆخت پاشایەتی گرتەدەست

ئەو کچی خوسرەو پەرویز کوڕی هورموز کوڕی کەسرا ئەنەوشیروان بوو.

دەڵێن: ئەورۆژەی پاشایەتی گرتەدەست، وتی: نییەتی خێرم هەیە و بەدادپەروەری فەرمانڕەوایی دەکەم. پێگەی شەهریەرازی بەفەسفروخدا و کاروباری وەزارەتی بەو سپارد. لەگەڵ ژێردەستەکان شێوازێکی پەسەند کراوی گرتەبەر و دادپەروەری دەکردە پیشە. فەرمانی لێدانی سکەی تازە و نۆژەن کردنەوەی پردەکانی دەرکرد و پاشماوەی خەراجی بەخشی. نامەی بۆ سنورەکان نووسی و چاکەخوازی خۆی بەرابەر بەکۆمەڵانی خەڵك نیشاندا و بەسەرهاتی کوژراوانی بنەماڵەکەی باسکرد و وتی: هیوادارە خواوەند لەرۆژگاری ئەو ئاسایش و ئارمی بڵاو بکاتەوە بۆ ئەوەی بزانن فراوان کردنی سنوری وڵات و سەرکەوتن لەشەڕەکان و ئاژاوە نانەوە و بوێری تەنیا ڕێگەچارەسەری تایبەت بەپیاوان نییە بەڵکو هەمووی بەفەرمانی خواوەند ئەنجام دەدرێت. فەرمانیدا ملکەچی خۆیان نیشان بدەن و چاکەخوازی بن.

پورانی خاچی تەسلیمی پاشای رۆم کردەوە و هاورێ لەگەڵ گەورە قەشەیەکی مەسیحی بەناوی ئیشوعهب رەوانەی کرد. ماوەی پاشایەتی ئەو یەك ساڵ و چوار مانگ درێژەی کێشا.

دوای ئەو چەشنسدە
پاشایەتی گرتەدەست

ئەو لەکوڕە پورە دوورەکانی پەرویز بوو. ماوەی پاشایەتی ئەو کەمتر لەیەك مانگ درێژەی کێشا.

دوای ئەو ئازەرمیدۆخت
پاشایەتی گرتەدەست

ئەو کچی خوسرەو پەرویز کوڕی هورموز کوڕی کەسرا ئەنەوشیروانە.

دەڵێن: یەکێك لەجوانترین ژنانی فارس بوو. کاتێك پاشایەتی گرتەدەست، وتی: درێژە پێدەری ڕێچکە و شێوازی باوکی خۆم دەبم. هەر کەس پێچەوانەی ئێمە بجووڵێتەوە، خوێنی دەرێژین.

دەڵێن: لەو کاتەدا گەورەی فارسەکان فەروخ هورموز سوپاسالاری خوراسان بوو. کەسی ڕەوانە کرد و داوای کرد ئازەرمیدۆخت ببێتە هاوسەری ئەو. پەیامیدا: ڕەوا نییە شاژن ببێتە هاوسەری کەسێك بەڵام دەزانم ئەم داواکارییەت تەنیا بۆ تێر کردنی نیازەکانی خۆتە، فلان شەو وەرە بۆ لای من.

فەروخ هورموز ئەو کارەی کرد و لەشەوی دیاریکراو ڕۆشتە لای. ئازەرمیدخۆت بەسالاری پاسەوانەکانی خۆی وتبوو، شەو لەکاتی چاوپێکەوتن بیکوژێت. سەرکردەی پاسەوانەکان فەرمانەکەی ئەنجامدا وکوشتی. فەرمانیدا بیبەن لەگۆڕەپانی شارەکە فڕیبدەن. بەرەبەیان فەروخ هورموزیان بەکوژراو بینی. شاژن فەرمانیدا جەستەی بشارنەوە و زانیان تاوانێکی گەورەی ئەنجامداوە.

ڕۆستەم کوڕی فەروخ هورموز ئەو کەسەی لەرۆژگاری دواتر یەزدگێرد، بۆ شەڕی عەرەبەکان ڕەوانەی کرد، لەخوراسان جێگری باوکی بوو. کاتێك لەکوشتنی

باوکی ئاگادار بوویەوە، هاوڕێ لەگەڵ سوپایەکی گەورە ڕوی لەمەداین کرد. چاوی ئازەرمیدۆختی دەرهێنا و کوشتی و بەوتەیەك زەهرخواردی کرد. پاشایەتی ئازەرمیدۆخت شەش مانگی خایاند.

دوای ئەم ڕوداوە، گەورەکان، خوسرەو کوڕی مێهرجەشنسیان هێنا کە لەنەوەکانی ئەردەشێر و نیشتەجێی ئەهواز بوو. ئەویان وەك پاشا هەڵبژاردو تاجیان کردەسەر. لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت بەڵام چەند ڕۆژێك دواتر کوژرا.

بەوتەیەك دوای ئازەرمیدۆخت، خەرزاد خوسرەو پاشایەتی گرتەدەست. ئەو لەمناڵەکانی پەرویز و لەقەڵای سەنکان لەنزیك نەسیبین ئەویان دۆزییەوە. کاتێك هاتە مەداین، چەند ڕۆژێك پاشایەتی کرد. بەڵام دواتر دژایەتیەکان دەستی پێکرد و ئەویان لەسەر کار لابرد.

ئەوانەی وتوویانە دوای ئازەرمیدۆخت، خوسرەو کوڕی مێهر جەشنس پاشایەتی گرتەدەست، دەڵێن: دوای کوژرانی ئەو دەستەیەك لەگەورەکانی فارس بەدوای کەسێك لەبنەماڵەی پاشایەتیدا دەگەڕان تا بیکەنە پاشای خۆیان یا کەسێك کە لەرێگەی ژنانەوە خزمایەتی لەگەڵ ئەم بنەماڵەیە هەبێت. کەسێك بەناوی فیروز کەنیشتەجێی میسان و کوڕی میهران جەشنس و بەجەشنسدە ناویان دەبرد، هێنایان و بەدڵخواز پاشایەتیان تەسلیم کرد.

دایکی فیروز سەهار بەخت کچی یەزداندار کوڕی کەسرا ئەنەوشیروان بوو. فیروز سەری گەورە بوو. کاتێك تاجی کردەسەر، وتی: چەندە تەنگ و تەسکە., گەورەکان ئەم قسەیان بەخراپە لێکدایەوە و دوای چەند ڕۆژ، کوشتیان. بەوتەیەك هەمان سات کەئەم قسەی هێنایە سەرزمان، کوژرا.

بەوتەی ئەمان، دوای کوژرانی فیروز، یەکێك لەگەورەکانی فارس بەناوی زازی هات و فەروخزاد خوسرەوا کوڕی خوسرەوی هێنایە تیسفون. زازی لەناوچەی ڕۆژئاوا لەنزیك نەسیبین لەشوێنێك بەناوی دژسەنگ سەرپەرەستی کاروباری ئەسیرەکانی دەکرد. کاتێك شیرویە براکانی خۆی کوشت، فەروخزاد خوسرەوا پەنای بۆ ئەو برد.

فەروخزاد بۆ ماوەیەکی کورت پاشایەتی کرد. دواتر خەڵکان دژایەتی و سەرپێچی فەرمانەکانی ئەویان کرد. بەوتەیەك ئەویان کوشت.

ماوەی پاشایەتی ئەو شەش مانگی خایاند.

دەستەیە وتوویانە: خەڵکی ئیستەخر یەزدگێرد کوڕی شەهریار خوسرەو کە لەکاتی براکوژییەکەی شیرویە، پەنای بۆ ئەو شارە بردبوو، دۆزیانەوە و کاتێك ئاگادار بوونەوە خەڵکانی مەداین دژایەتی فەروخزاد خوسرەوا دەکەن، یەزدگێردیان بۆ ئاتەشکەدەکەی ئەردەشێر برد و تاجیان خستەسەر لەکاتێکدا هێشتا لەتەمەنی لاویدا بوو. دواتر ئەویان بردە مەداین و فەروخزاد خوسرەویان بەفرت و فێڵ کوشت دوای ئەوەی بۆ ماوەی یەکساڵ پاشایەتی کرد. کاروباری پاشایەتی بۆ یەزدگێرد ئارامی گرت بەڵام پاشایەتی ئەو بەبەراوەرد لەگەڵ باوەکانی خەو و خەیاڵ بوو وگەورەکانی فارس کاروبارەکانی وڵاتیان هەڵدەسووڕاند لەبەر ئەوەی یەزدگێرد هێشتا لاو بوو. وشیارتر و زیرەکتر لەهەموو وەزیرەکان، زازی بوو.

وڵاتی فارس بەهێز و دوژمنان لەهەر لایەکەوە قووت بوونەوە و دەستدرێژیان دەست پێکرد. وێرانیان دروست کرد و دوای دوو ساڵ لەپاشایەتی یەزدگێرد و بەوتەیەك دوای چوار ساڵ، عەرەبەکان هێرشیان کردە سەر سنورەکانی وڵاتی فارس. ماوەی ژیانی یەزدگێرد تا ئەو کاتەی کوژرا، بیست و هەشت ساڵ بوو. بەخواستی خوا کۆتایی داستانەکان سەبارەت بەیەزدگێرد و منداڵەکانی ئەو لەکاتی گێرانەوەی فراوان بوونی سنووری موسوڵمانان باس دەکەین.

بەوتەی جولەکەکان لەهاتنە خوارەوەی ئادەم بۆ سەرزەوی تا کاتی کۆچی پێغەمبەر(د.خ) چوار هەزار و شەشسەد و چل و دوو ساڵ و چەند مانگە. بەگومانی ئەوان، ئەم ماوەیە لەتەوراتدا ئاماژەی پێدراوە.

بەوتەی مەسیحیەکان ئەم ماوەیە پێنج هەزار و نۆسەد و نەوەد و دوو ساڵ و چەند مانگە و گومان دەکەن لەتەوراتی یۆنانیدا ئاماژە بەم بابەتە دراوە.

بەڵام بەوتەی زەردەشتیەکان ئەم ماوەیە چوارهەزار و سەد و هەشتا و دوو ساڵ و دە مانگ و نۆزدە ڕۆژە و ماوەی دوای کۆچیان تا کاتی کوژرانی یەزدگێرد پێ

زیاد کردووە کەسی ساڵ و دوو مانگ و پانزە رۆژە. ئەمە دەسپێکی میژوو لەکیومەرسەوەیە چونکە ئەوان کیومەرس بەئادەم دەزانن کەهەموو منالەکانی ئادەم رەچەڵەکیان بۆ ئەو دەگەڕێتەوە بەهەمان شێوە کە لەم کتێبەدا ئاماژەمان پێدا.

پێشتر ئاماژەمان پێدا دەستەیەك لەشارەزایانی میژووی ئیسلام بۆچوونیان سەبارەت بەم بابەتە چۆنە و ئاماژەمان بەوتاری دەستەیەك لەواندا کەدەڵێن: لەئادەمەوە تا نوح دەسەدەیە و سەدە سەد ساڵە. لەنوحەوە تا ئیبراهیم دەسەدەیە و هەر سەدەیەك سەد ساڵە و لەئیبراهیمەوە تاموسا کوڕی عیمران دە سەدەیە هەر سەدەیەك سەد ساڵە.

ئاماژەدان بە بێژەری ئەم وتەیە

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: ماوەی نێوان ئادەم و نوح دە سەدەیە و هەموویان پێغەمبەرانی راستی بوون.

هەروەها لەعەمرۆ کوڕی واقدی ئەسلەمی دەگێڕنەوە: لەئادەمەوە تا نوح دەسەدەیە و هەر سەدەیەك سەد ساڵە و لەنوحەوە تا ئیبراهیم دەسەدەیە و هەر سەدەیەك سەد ساڵە و لەئیبراهیمەوە تا موسا کوڕی عیمران دەسەدەیە و هەر سەدەیەك سەد ساڵە.

لەسەلمانیش دەگێڕنەوە: لەمحەممەد تا عیسا، شەشسەد ساڵە.

لەعەوف دەگێڕنەوە: لەموسا تا عیسا شەشسەد ساڵە.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: لەموسا تا عیسا کوڕی مریەم هەزار و حەوتسەد ساڵ و لەم ماوەدا چەندین پێغەمبەری دیکە رەوانە کراون کەژمارەیان یەکهەزار پێغەمبەر لەمناڵەکانی ئیسرائیلە جگە لەو پێغەمبەرانەی بۆ نەتەوەکانی دیکە رەوانەکراون. لەلەدایك بوونی عیسا تا پێغەمبەر(د.خ) پێنسەد و شەست و نۆ ساڵە کە لەسەرەتاکەی سێ پێغەمبەر رەوانە کران بەهەمان شێوە کەخواوەند دەفەرمێت:

(( اذ ارسلنا اليهم اثنين فكذبوهما فعززنا بثالث.

واتاکەی: کاتێك دوو پێغەمبەران بۆ رەوانە کردن و ئەوانیان بەدرۆزن لەقەڵەمدا، بەسێیەم پێغەمبەر، ئەوانمان بەهێز کرد.))

ئەو کەسەی بۆ پشتراست کردنەوەی وتەکانی دوو پێغەمبەرەکەی دیکە هات، شەمعون بوو کەیەکێکە لەحەوارییەکان وئەو سەردەمی خواوەند تیایدا هیچ پێغەمبەرێکی رەوانە نەکرد، چوارسەد و سی و چوارساڵە. ئەو کاتەی عیسا بۆ ئاسمان بەرز کرایەوە، سی و دوو ساڵە بوو. ماوەی پێغەمبەرایەتی ئەو سێ مانگ و خواوەند جەستەی ئەوی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و تا ئێستایش زیندووەوە.

لەوەهب دەگێڕنەوە: لەساڵەکانی تەمەنی دنیا پێنج هەزار و شەششەد ساڵ تێپەڕیوە.

عەبدالله کوڕی بوسر دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) بەمنی فەرموو، ساڵەکانی تەمەنت دەگاتە سەدەیەك. ئەو بۆ ماوەی سەدەیەك ژیا.

ئەمە ئەو گێرانەوە و حەدیسانەیە زاناکانی ئیسلام ئاماژەیان پێداوە بەڵام جیاوازییەکان لەمبارەوە فراوانە. واقدی لەدەستەیەك لەشوێنکەوتەکانی حەدیس دەگێڕنەوە: ساڵەکانی تەمەنی دنیا تا لەدایك بوونی پێغەمبەری ئێمە چوار هەزار و شەششەد ساڵ بوو بەڵام لەهوشام کوڕی محەممەدی کەلبی دەگێڕنەوە: تەمەنی جیهان تا کاتی لەدایك بوونی پێغەمبەر(د.خ) ، پێنج هەزار وپێنسەد ساڵ بوو. لەوەهب کوڕی مونبە دەگێڕنەوە: هەموو تەمەنی جیهان شەش هەزار ساڵ و تا رۆژگاری پێغەمبەر(د.خ) پێنج هەزار و شەششەد ساڵ بوو. مردنی وەهب لەساڵی سەد و چواردەی کۆچی و پاشماوەی تەمەنی ئەو بەوتەی ئەو لەم کاتەی ئێستای ئێمە، دوسەد و پانزە ساڵە. ئەم گێرانەوەی وەهب، لەگەڵ ئەو گێرانەوەی لەکوڕی عەباس ئاماژەیان پێداوە، چوونییەکە.

دەستەیەك وتوویانە: لەکاتی دابەزینی ئادەم تا رۆژگاری پێغەمبەر(د.خ)، شەش هەزار و سەد و سیانزە ساڵە. لەدابەزینی ئادەم تا سەردەمی تۆفان دوهەزار و دوسەد و شەست و پێنج ساڵ. لەسەردەمی تۆفان تا لەدایك بوونی ئیبراهیم هەزار و شەششەد و نۆ ساڵ و لەلەدایك بوونی ئیبراهیم تا ئەو کاتەی موسا کوڕی عیمران منداڵەکانی ئیسرائیلی لەمیسر بردەدەر، پێنسەد و شەست وپێنج ساڵ و لەکاتی هاتنەدەری منداڵەکانی ئیسرائیل لەمیسر تا دروست کردنی بیت المقدس کە لەساڵی چوارەمی پاشایەتی سلێمان کوڕی داوود بیناکرا، شەششەد و سی و

شەش ساڵ و لەبینای بیت المقدس تا پاشایەتی ئەسکەندەر حەوتسەد و حەفدە ساڵ و لەپاشایەتی ئەسکەندەر تا لەدایك بوونی عیسا کوڕی مریەم سێسەد و شەست و نۆ ساڵ و لەلەدایك بوونی عیسا تا سەردەمی پێغەمبەر(د.خ) پێنسەد و یانزە ساڵ و لەهەڵبژاردنی پێغەمبەر تا کۆچی ئەو بۆ مەدینە، سیانزە ساڵ.

دەستەیەك لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: لەئادەم تا نوح هەزار و دوسەد ساڵ و لەنوح تا ئیبراهیم هەزار و سەد و چل و سێ ساڵ و لەئیبراهیم تا موسا پێنسەد و حەفتا و پێنج ساڵ و لەموسا تا داوود سەد و حەفتا و نۆ ساڵ و لەداوودەوە تا عیسا هەزار و پەنجا و سێ ساڵ و لەعیسا تا محەممەد شەشسەد ساڵە.

لەدەستەیەك لەشوێنکەوتەکانی کتێب دەگێڕنەوە: لەئادەم تا تۆفان هەزار و دوسەد و پەنجا و شەش ساڵ و لەتۆفان تا سەردەمی مەرگی ئیبراهیم هەزار و بیست ساڵ و لەکاتی مردنی ئیبراهیم تا ئەو کاتەی مناڵەکانی ئیسرائیل ڕۆشتنە ناومیسر حەفتا و پێنج ساڵ و لەڕۆشتنی منالەکانی ئیسرائیل تا هاتنەدەری موسا لەمیسر چوارسەد و سی ساڵ و لەهاتنەدەر لەمیسر تا دروست کردنی بیت المقدس پێنسەد و پەنجا ساڵ و لەبینای بیت المقدس تا پاشایەتی بەخت نەسر و وێرانی بەخت نەسر چوارسەدو چل و شەش ساڵ و لەپاشایەتی بەخت نەسر تا پاشایەتی ئەسکەندەر چوارسەد و شەست و سێ ساڵ و لەپاشایەتی ئەسکەندەر تا ساڵی دوسەد و شەشی کۆچی، هەزار و دوسەد و چل و پێنج ساڵە.